كۆماری عێراق
وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئاینی
بووژاندنەوەی کەلەپووری ئیسلامی
- ٢٣ -

# إقتران النيرين في مجمع البحرين



دانراوی
مامۆستا مەلا رەشید بەگی بابان

لێکۆڵینەوەی
محمد علی قەرەداغی

بەرگی سێیەم
١٤٠٥هـ ١٩٨٥م

کۆماری عێراق
وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی
بووژاندنەوەی کەلەپووری ئیسلامیی
- ٢٣ -

# إقتران النيرين في مجمع البحرين

دانراوی
مامۆستا مەلا رەشید بەگی بابان

لێکۆڵینەوەی
محمد علی قەرەداغی

بەرگی سێیەم

چاپی یەکەم ١٤٠٥ ك ١٩٨٥ ز

الجمهورية العراقية
وزارة الاوقاف والشؤون الدينية
إحياء التراث الاسلامي
- ٢٣ -

# إقتران النيرين
# في
# مجمع البحرين

تأليف
ملا رشيد بيگ بابان

تحقيق
محمد علي القرەداغي

الجزء الثالث

١٤٠٥هـ ١٩٨٥م

**خوێنەری ئازیز !**

لەم دەرفەتەدا کە دەمەوێ بەرگی سێهەمی ئەم کتێبەت پێشکەش بکەم ، نە تۆیش‌و نە منیش چاوەڕوانی ئەوەمان نەدەکرد کە ماوەی دە (١٠) ساڵ دوای بەرگێك بەرگێکی دیکە دەربچێت ، بەڵام کارەکە لە دەستەڵاتی مندا نەبووو ، وام پێخۆش بوو کە وشکەی نەکەوێت‌و تۆی ئازیز لە بەرگێك نەبووبیتەوە بەرگەکەی دیکەت لە بەردەستدا بێت .

هەرچۆن بێت وا دەرفەتم چنگ‌کەوت‌و توانیم ئەم بەرگە ئامادە بکەم . ئەم ماوە درێژە گەلێ کار رووی‌داوە . لەوانە لە مەیدانی رۆشنبیریی کوردیدا رەورەوە بەرەوپێشەوە چوەو ، فرە راو بیری لە دوای خۆیەوە بەجێ هێشتوە . ئاڵوگۆری نووسینەوەی دەقی کوردی‌و بیرو‌را دەربارەی رێنووس لەم دەساڵەدا زۆری لەسەر گوتراوەو زۆری لەسەر نووسراوە ، دیارە منیش ـ وەك نووسەرێکی کورد ـ لەم دەنگوباسانە بەدوور نەبووم ، بۆیە بێگومان جیاوازی رێنووسی نێوان ئەم بەرگەو بەرگەکانی دیکە کارێکی شاراوە نی‌یە .

یەکێك لەو جیاوازییانە شێوەی نووسینی ناو ـ اعلام ـ ەکانە ، کاتی خۆی وام بریار دابوو بە زۆری ناوەکان بە عەرەبی وەك خۆیان بنووسم ، بەڵام لێرەدا ئەو رایەم گۆڕی‌و بەزۆری بەپیتەکانی خۆیان بەڵام بە رێنووسی کوردی دەیان‌نووسم .

لە بەرگی دوەمیشدا ـ لە بەشێکی‌دا ـ لە باتی ـ ﷺ ـ و ـ رضي الله تعالى عنه ـ کورتکراوەی ئەم دوو رستە واتە (ص ،ر) یان (خ ،د) م دانابوو ، بەڵام لێرەدا هاتمە سەر ئەوە کە لەو رایە پاشگەز ببمەوەو ، دانەر چۆنی نووسیوە وای بنووسمەوە .

هەندێك قسەو باسی دیكەیش هەیە كە لە بەرگی دوەمدا لەسەرم نووسیون و وەڵامم داونەتەوە .

لێرەیشدا جارێكی دیكە چاوەڕوانی ی خۆم بۆ راو سەرنجی راست و دڵسۆزانە رادەگەیەنم ، بۆ ئەوەی لە بەرگەكانی دیكەدا - خوایار بێت - سوودیان لێوەربگرم ، تائەم كتێبە بە جوانترین شێوە پێشكەشی ئێوەی ئازیز بكەم .

**محەمەدعەلی قەرەداغی**

ومن معجـزاته ـ عليـه الصـلاة والسـلام ـ اخبـاره عن اشـراط الساعة ، ووقوع كثير منها الى الآن ، والآن نحن في بعضها .

مجمع البحرين ، اشراط وفتن ، ٢٤/٨/١٩٤٠ شه‌نبه .

النوع الرابع من المعجزات
بسم الله الرحمن الرحيم
الحمد لله رب العالمين ، صلاة الله وسلامه على رسوله الكريم ، وعلى آله وصحبه اجمعين .

٧٢١/١ عن ابي هريرة [رضي الله تعالى عنه] ان رسول الله ﷺ قال : بادروا بالاعمال فتنا كقطع الليل المظلم ، يصبح الرجل مؤمنا ، ويمسي كافرا ، ويمسي مؤمنا ويصبح كافرا ، يبيع دينه بعرض من الدنيا
م ـ ١/٤٩٧
تەرجەمە :
پێغەمەر ﷺ فەرمووی : بە ئەعمالی صالیحە دەست پێشکەریی بکەن لەو فیتنە زۆرانە کە وەك پارچە پارچەی شەوی تاریك وانە ، پیاو [یەعنی ئینسان] سبەینێی بەسەرا بێ بە موسوڵمانی ئێوارێی بە کافریی بەسەرا بێ ، یا فەرمووی : ئێوارێی بە موسوڵمانەتی بەسەرا بێ و سبەینێی بە کافرێتی لێ ئەبێتەوە ، دینی بە مەتاعی دنیا ئەفرۆشێ .
٧٢٢/٢ عن حذيفة [بن اليمان ـ رضى الله تعالى عنهما] قال : حدثنا رسول الله حديثين [في الامانة ورفعها] قد رأيت احدهما ، وانا انتظر الآخر .
١ ـ حدثنا : ان الامانة نزلت في جذر قلوب الرجال [اصل قلوبهم] ، ثم نزل القرآن فعلموا من القرآن وعلموا من السنة .

٢ ـ ثم حدثنا عن رفع الامانة ، فقال : ينام الرجل النومة فتقبض الأمانة من قلبه ، فيظل اثرها مثل الوكت [سواد في اللون ـ ئالّو بوّلّ بوونى خورما ـ] ثم ينام الرجل النومة فتقبض الأمانة من قلبه فيظل اثرها مثل اثر المجل ـ نصر وعلم ـ [بلوّق] كجمر دحرجته على رجلك فنفط [بوو به بلوّق] فتراه منبراً [مرتفعا] وليس فيه شيئ ، ثم اخذ [رسول الله ـ ﷺ ـ] حصى ودحرجه على رجله . فيصبح الناس يتبايعون ، لايكاد احد يؤدي الأمانة حتى يقال : ان في بني فلان رجلا امينا ! حتى يقال للرجل : ما أجلده ! ما أظرفه ! ما أعقله ! وما في قلبه مثقال حبة من خردل من ايمان . [قال حذيفة]: ولقد اتى علي زمان وما ابالي ايكم بايعته ، لئن كان مسلماً ليردنه علي دينه ، ولئن كان نصرانيا او يهوديا ليردنه علي ساعيه ، واما اليوم فما كنت لابايع الا فلانا وفلانا

ح ـ ١٠/١٧٨ م ـ ٩/٢ ح ـ ٩/٢٧١ جه

تەرجەمە :

حوذەيفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ دوو حەديثى بۆ فەرمووين دەرحەق ئەمانەت و نەمانى ئەمانەت ، من يەكێكم دى و مونتەظيرى ئەوى تريانم :

١ ـ قسەى بۆ فەرمووين كە ئەمانەت نازڵ بۆتە ناوين دڵى ئينسانەوە ، لە دواييا قورئان نازڵ بوو ، قورئان فێربووين ، سوننەت فێر بووين .

٢ ـ لە دواييا لە نەمانى ئەمانەت قسەى بۆ فەرمووين ، فەرمووى : ئينسان دەفعەيێك ئەنوێ ئەمانەت لە دڵى لائەبرێ ، جێ شوێنى ئەمانەتەكە خاڵ خاڵ ئەبێ وەك ميوەى ئاڵو بوّڵى لێ بێ . لە دواييدا دەفعەيێكى تر ئەنوێ ئەمانەت لە دڵى دەرئەهێنرێ ، شوێن ئەمانەتەكە وەك بلۆقى لێ بێ ، وەك چۆن پشكۆيێ ئاگر بەسەر پێتا بتلێنى يەوەو بلۆق بكا ئەى بينى كە شوێن ئاگرەكە بەرزبوەتەوەو هيچى تيا نى يە [دڵى

ئینسانیش لە ئەمانەت خالّی ئەبیّو هیچی تیا نـامێنیّ] پێغەمـەر ـ ﷺ ـ بەردێکی بچکۆلانەی هەلگرتو بەسەر پێی موبارەکیا گێرا ، تەصویری پشکۆ ئاگرەکەی پێکرد ، ئینسان وای لیّ بێ خریدو فرۆخت ئەکەن هیچ کەسێکیان نابێ کە ئەمانەت بەجێ بێنیّ ، بە نەوعێکی وا کە ئەلّێن : لە فلاّن طائیفەدا پیاوێکی . ئەمین هەیە ، یەعنی تاق‌تاقە ئەمین ئەمێنیّ ، وای لیّ بێ کە دەرحەق پیاوێك ئەلّێن : چەندە عاقلّە ! چەندە ظەریفە ! چەندە ئازایە ! کەچی بە قـەد دەنکە خـەرتەلیّ ئیمـان لە دلّیـا نیّیە .

حوذەیفە (رضی الله تعالی عنه) ئەفەرمویّ : من زەمانێکم بەسەرا هات موبالاتم نەدەکرد کە لەگەلّ هەرکامێکتان خریدو فرۆخت بکەم [یەعنی هەموو کەس ئەمینو بەدین بوو ، خەیانەتیان نەدەکرد] ئەگەر ئەوی من خریدو فرۆختم لەگەلّ ئەکرد موسوڵمان بوایە دینی ئەوی ئەگێرایە سـەر من ، نەیەهێشت خەیانەتم لیّ‌بکا ، ئەگەر گاور یا جوو بوایە مەئموورى ئەو وەظیفەیە ئەیگێرایەوە لە خەیانەت . [یەعنی ئێش بەدەستیش هەموو موسوڵمانو ئەمینو بەدین بوون] ئەمما ئیمرۆ وامە کە فلاّنو فلاّن نـەبیّ خریدو فرۆخت لەگەلّ کەسا ناکەم . [خەلّق ئەوەندە ناپاكو خائینە] .

صدق رسول الله ﷺ دەمێکە ئەو زەمانە هاتووەو ئێستەیش ئێمە لەو زەمانەداین ، بە هەر نەوعیّ پارەو مەنفەعەتی خەسیسـە بێتە دەستـەوە حەرام بیّ ـ خوا نەخواستە ـ ، حەلاّل بیّ ، بە دزیی بیّ ، بە حیزبی بیّ ، مالّی دۆست بیّ ، یا مالّی دوشمن . . . دۆستی بە راست کوانیّ ؟ شێخ رەضا ـ رحمه الله ـ :

راست لە دنيادا نەماوە . . الخ[1]

٧٢٣/٣ عن حذيفة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كنا عند عمر [بن الخطاب رضي الله تعالى عنه] فقال : ايكم سمع رسول الله ﷺ يذكر الفتن ؟ فقال قوم: نحن سمعناه ، فقال : لعلكم تعنون فتنة الرجل في اهله وماله وجاره ؟ قالوا : اجل . قال : تلك تكفرها الصلاة والصيام والصدقة . ولكن ايكم سمع النبي ﷺ يذكر الفتنة التي تموج موج البحر ؟ قال حذيفة : فاسكت القوم . فقلت : انا . فقال : انت لله ابوك ! [حيث اتى بمثلك ولدا] قال حذيفة : سمعت رسول الله ﷺ يقول : تعرض الفتنة على القلوب كالحصير عودا فعودا . [تظهر لها فتنة بعد اخرى ، وعودا عودا تعود اليها مرة بعد اخرى ، عوذا عوذا . يستعاذ منه] فاى قلب اشربها نكت فيه نكتة سوداء ، واي قلب انكرها نكت فيه نكتة بيضاء حتى تصير علىٰ قلبين : على ابيض مثل الصفا فلا تضره فتنة مادامت السماوات والارض ، والآخر اسود مربادا كالكوز مجخيا [ما ملأ منكوسا] لا يعرف معروفا ولا ينكر منكرا الا ما اشرأب من هواه . قال حذيفة : وحدثته ان بينك وبينها بابا مغلقا يوشك ان يكسر ، قال عمر : اكسر ألا ابا لك ؟ فلو انَه فتح لعله كان يعاد ، قلت : لا بل يكسر وحدثته : ان ذلك الباب رجل يقتل او يموت حديثا ليس بالاغاليط ، قال ابو خالد : فقلت لسعد : يا أبا مالك ! ما اسود مربادا ! قال : شدة البياض في سواد [تصحيف ، صوابه : شبه البياض في السواد ، لان شدة البياض في السواد تسمى بلقا في الجسم ، وحوراً في

---

(١) مەبەستی ئەمە یەکێك لە تاکە شیعرەکانی شێخ رەزایە ، کە لە دیوانە چاپەکەیدا بەم جۆرەیە :

صاغ لە دنیادا نەماوە ، گەر قصەی صاغت دەوێ
بێ هەزارت پێ نیشان دەم گەر قوروصاغت دەوێ !

بڕوانە : دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانی ، چاپی دووهەم ، ل : ٩٦

العين ، والربدة بياض يسير يخالط السواد ، من نووي] قال : قلت : فما الكوز مجخياً ؟ قال : منكوسا . م ـ ٢/٨

**تەرجەمە :**

حوذەیفە ـ رضی الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : لە خذمەت عومەرا بووین ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : کامتان لە پێغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ تان بیستوە کە ذیکری فیتنەی فەرمووبێ ؟ قەومەکە فەرموویان : ئێمە لێمان بیستوە . وە ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : رەنگە مەقصوودتان فیتنەی ئینسان بێ لە خوصووصی ماڵو منالّو دراوسێوە . فەرموویان : بەڵێ . فەرمووی : ئەو فیتنەیە نوێژو رۆژوو صەدەقە ئەبن بە کەفارەتی . ئەمما کێ لە پێغەمەری ـ صلی الله علیه وسلم ـ بیستوە کە ذیکری ئەو فیتنەی فەرموو بێ کە وەکوو شەپۆلی بەحر شەپۆل بدا ؟ حوذەیفە فەرمووی : خەڵقەکە بێدەنگ بوون . من وتم : من لێم بیستوە . فەرمووی : باوکت هەر ـ هی خوابێ کە ئەولادی وەك تۆی لێ بوە !

وە حوذەیفە فەرمووی : لە پێغەمەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ م بیست کە فیتنە بەسەر دڵا رائەنگێورێ ، وەك حەصیر قامیش ، قامیش ، یەك لە دوای یەك ، بەیەکەوە ئەنووسێنرێن بیلا فاصیله . . ئەو فیتنەیەیش بیلا فاصیله یەك لە دوای یەك بەسەر قەلبی ئینسانا یێن ، هەر دڵێ لەو فیتنانە بخواتەوە ، یەعنی بچێتە ناوی‌یەوە لکەی رەش رەشی تیا پەیدا ئەکا هەر دڵێ لەو فیتنانە قەبووڵ نەکا خۆیی لێ لادا نوقطەیەکی سپی تیا پەیدا ئەکا ، تا دڵی ئینسانان ئەبن بە دوو نەوع : دڵێکیان وەك بەردێکی سپی و صافو لووس ئەبێ کە هیچ ناگرێتە خۆی ، پاكو تەمیز هیچ فیتنەیێ ضەرەری پێ ناگەیەنێ تا ئەرزو ئاسمان بمێنن . قەلبەکەی

تر رەش ئەبێو دێزو بۆز ئەبێ ، وەك گۆزەی دەمەونوخوون کراوە هیچ خێری تیانامێنێ غەیری هەواو هەوەسی نەفسانی ، نە چاك ئەزانێ بیکا ، نە خراپ ئەزانێ خۆی لێ بپارێزێ .

حوذەیفە ئەفەرموێ : عەرزی ئیمامی عومەرم کرد : کە لە بەینی تۆو ئەو فیتنەیەدا دەرگایێ هەیە نزیکە کە بشکێنرێ ، حەضرەتی عومەر ـ رضی الله تعالی عنه ـ فەرمووی : بێ باوك بی ! ئەشکێنرێ ؟ ئەگەر بکرایەوە ئومێد بوو کە دابخرێتەوە . وتم : خەیر هەر ئەشکێنرێ ، هەم قسەم بۆ کرد کە ئەو دەرگایە پیاوێکە ئەکوژرێ یا ئەمرێ .

[شك الراوی] قسەیێکم بۆ کرد کە حەقیقەتەو غەلەط نییە .

٤/٧٢٤ حذيفة [رضى الله تعالى عنه] قال :"كنا جلوسا عند عمر بن الخطاب ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقال : ايكم يحفظ قول رسول الله ـ ﷺ ـ في الفتنة ؟ قلت : انا كما قاله (ﷺ) قال : انك عليه او عليها مقالة لجريءٌ . قلت : فتنة الرجل في اهله وماله وولده وجاره يكفرها الصلاة والصوم والصدقة والأمر والنهي . قال : ليس هذا اريد ، ولكن الفتنة التي تموج كما يموج البحر . قال : ليس عليك منها بأس يا امير المؤمنين . ان بينك وبينها بابا مغلقا . قال : ايكسر ام يفتح ؟ قال : يكسر . قال : اذا لا يغلق ابدا [قال شقيق] :"قلنا : اكان عمر [رضي الله تعالى عنه] يعلم الباب ؟ قال : نعم ، كما ان دون الغد الليلة ، اني حدثته بحديث ليس بالاغاليط ، فهبنا ان نسأل حذيفة [رضي الله تعالى عنه] فسألنا مسروقا ، فسأله فقال : الباب عمر [ رضي الله تعالى عنه] ح ـ ١/٤٦٩ ، خ ـ ٦/٤٤ ، ح ـ ٤/٣٣٤/٣٢ ، ح ـ ١٠/١٨١ ، م ـ ١٠/٣٥٥ .

تەرجەمە :

حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : لە خدمەت ئیمامی عومەرا ـ رضي الله تعالى عنه ـ دانیشتبووین ، فەرمووی : کێ قسەی پێغەمەری ـ ﷺ ـ لە دەرحەق فیتنە حیفظ کردوە ؟ عەرزم کرد : من وەك فەرموویەتی . فەرمووی : لە حوضووریا لەسەر قسەکردن لە خذمەتیا جورئەتکاری بیلێ ! وتم : فیتنەی ئینسان لە خوصووصی ماڵو مناڵو دراوسێ . . نـویـژو رۆژووو صـەدەقـەو ئـەمـربـەمـەعـرووفـو نەهی لەمونکەر مەحوی ئەو فیتنە ئەکاتەوە . فەرمووی : مەقصوودی من ئەو فیتنەیە نی یە . . مەقصوودی من فیتنەییکە کە شەپۆل بدا وەك بەحر چۆن شەپۆل ئەدا . حوذەیفە ـ رضی الله تعالى عنه ـ فـەرمووی : یـا ئەمیرەلموئمینین ئەو فیتنەیە ضەرەرێکی بۆ تۆ نی یە ، لە بەینی زەمانی تۆو ئەو فیتنەیە دەرگایەکی داخراو هەیە . فەرمووی : ئەو دەرگایە ئەکرێتەوە یا ئەشکێنرێ ؟ وتم : خەیر ئەشکێنرێ . فەرمووی : کە وابێ ئیـتر بە ئەبەدی داناخرێتەوە .

لە حوذەیفەمان پرسی : ئایـا ئەو دەرگـایەی ئـەزانی کە کێیـە ؟ فەرمووی : بەڵێ وەك چۆن ئەیزانی کە لە پێش سبەینێوە ئیمشەو هەیە . من حەدیثێکم بۆ ریوایەت کرد کە راست بێو خەطای تیا نەبێ .

شەقیقی راوی ئەڵێ : ئێمە هەیبەتمان لێ کـرد کە لێی بپـرسین . ئەمرمـان بە مـەسرووق کـرد لێی پرسێ . فـەرمووی : ئـەو دەرگایـە حەضرەتی عومەرە ـ رضی الله تعالى عنه ـ .

**٥/٧٢٥ عن ابن عمر [رضي الله تعالى عنهما] عن النبي ـ ﷺ ـ قال : ان الاسلام بدأ غريبا وسيعود كما بدأ وهو يأرز [ينضم ويجتمع] ـ فيه حركات الراء ـ بين المسجدين كما تأرز الحية في جحرها م ـ ٢/١٧**

٧٢٦/٦ عن ابی هریرة [رضي الله تعالى عنه] قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : بدأ الاسلام وسيعود كما بدأ غريبا ، فطوبى للغرباء م ـ ١٧/٢ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئیسلام بە غەریبی ظوهووری کرد ، لە دواییا غالّب بوو زۆر کەس ئیمانی هێنا ، لەمەولا چۆن بە غەریبی ظوهووری کردبوو بەو نەوعە کەم ئەبێتەوەو ضەعیف ئەبیّو ئەبێتەوە بە غەریب ، وەك ئەووەڵجاری لیّ یێتەوە ، لە کەم کەسا ئەمێنیّ ، لە بەینی کەعبەو مەسجیدی نەبەوییا گینڵە ئەخوا چۆن مار لە کونی خۆیا گینڵە ئەخوا .

لە حەدیثی ئەبو هورەیرەدا ئەفەرمویّ : (طوبى) [یەعنی فەرەحو چاورووني و چاکی و خێرو غیبطەو کەرامەت و بەهەشتو درەختی طوبا] بیّ بۆ ئەوانەی کە غەریبن [کە لەو وەختەدا موحافەظەی ئیمانی خۆیان ئەکەن] . لە ریوایەتێکی تری ئەبوهورەیرەدا لە باتی ئیسلام ئیمانی فەرموە .

٧٢٧/٧ عن حذيفة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال النبي ـ ﷺ ـ احصوا [اكتبوا] لي من تلفظ بالاسلام من الناس . فكتبنا له الفا وخمسمائة رجل ، فقلنا : نخاف ونحن الف وخمسمائة ؟ فلقد رأيتنا ابتلينا حتى ان الرجل ليصلي وحده وهو خائف ح ـ ١٦٨/٥ ، وفي رواية : فوجدناهم خمسمائة . ن .

٧٢٨/٨ ولفظ مسلم عنه : قال : كنا مع رسول الله ـ ﷺ ـ فقال : احصوا لي كم يلفظ الاسلام ؟ قال : فقلنا : يا رسول الله اتخاف علينا

ونحن ما بين الستمائة الى السبعمائة ؟ فقال : انكم لا تدرون لعلكم ان تبتلوا . قال : فابتلينا حتى جعل الرجل منا لا يصلي الا سراً .
م ـ ٢/٢١ . ن ، ج . ح ـ ٥/١٦٩ احمد .

تەرجەمە :

حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ بووین فەرمووی : چەند کەس تەلەفوظ بە ئیسلام ئەکا بۆم بنووسن [لە موسلیما : بۆم بژمێرن] هەزارو پێنصەدمان بۆ نووسی . عەرزمان کرد : بۆ ئێمە ئەترسین کە هەزارو پێنصەدین ؟

[لە موسلیما : لە مابەینی شەشصەد تا حەوصەدین . فەرمووی : ئێوە نازانن بەڵکە موبتەلا ئەبن . ] حوذەیفە فەرمووی : موبتەلا بووین بە نەوعێ کە بەدزییەوە نەبێ کەس نوێژی نەدەکرد .

قەسطەلانی ئەڵێ : موحتەمەلە ئەمە ئیشارەت بێ ئەلای خەلافەتی ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ کە = دەربارەی ئەمیرەکانی کووفە وەك وەلیدی کوری عەقەبە رووی دا . . کە نوێژەکانی دوا دەخست ، یان باش نەیدەکردن . جا هەندێ لە پیاوچاکان بەدزییەوە نوێژیان دەکرد ، دواییش لە ترسی فیتنە لە پشتی ئەوەوە نوێژەکەیان دەکردەوە . =

راویی ئەم حەدیثە ئەعمەشە ئیختیلافی ئەصحابو ئەعمەش کە محەمەدی بنی مەیموون ریوایەتی (٥٠٠) ئەبو موعاویە (من ٦٠٠ الى ٧٠٠) سوفیانی ثەوریی ریوایەتی (١٥٠٠) ئەکا . سوفیان لە هەموویان حافیظترە ، تەئویلیش کراوە ریوایەتی (٥٠٠) جەنگی (٦٠٠ ـ ٧٠٠) جەنگینو غەیرەجەنگی (١٥٠٠) لەگەڵ ئەطرافو ئەکناف . (من قسطلاني) .

٧٢٩/٩ عن انس [رضی الله تعالی عنه] ان رسول الله ـ ﷺ ـ قال : لا تقوم الساعة حتی لایقال في الارض الله الله .
وفي اخری عنه : قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : لا تقوم الساعة علی احد یقول : الله الله . م ـ ٢/٢٠

تەرجەمە :
پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : قیامەت هەڵناستێ تاوەکوو وای لێ بێ کە لە ئەرزا کەس ئەڵلا ئەڵلا ناڵێ . لە ریوایەتەکەی ترا ئەفەرموێ : قیامەت لەسەر کەسێ هەڵناستێ کە بڵێ ئەڵلا ئەڵلا .

١٠/ ٧٣٠ ابو هریرة ـ رضي الله تعالی عنه ـ یقول : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : والذي نفسي بیده لیوشكن ان ینزل فیكم ابن مریم حكما مقسطا ، فیكسر الصلیب ، ویقتل الخنزیر ، ویضع الجزیة ، ویفیض المال حتی لا یقبله احد م ـ ٢/٣٨ ، ح ـ ٤/٢٦٨ ، ح ـ ٥/٤٢٠ جه [اقسط : عدل ، والقسط : العدل . وقسط یقسط : جار . نووي] .

تەرجەمە :
پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : قەسەم بەو ذاتەی کە نەفسی من لە دەستی قودرەتیایە نزیکە کە ئیبن و مەریەم [علیهما السلام] بێتەخوارێ [لەسەر شەریعەتی من] ئەبێ بە حاکمێکی عادیل : چەلیپا ئەشکێنێ ، بەراز ئەکوژێ [یەعنی بەوە بەیانی بوطلانی ئیعتیقادی نەصارا ئەکا] ، جیزیە لەسەر غەیرەموسلیم هەڵئەگرێ ، [یەعنی غەیری ئیسلامەتی هیچی تر قەبووڵ ناکا] ، ماڵ زۆر ئەبێ حەتا هیچ کەس قەبووڵی ناکا ، لە ریوایەتێکی ترا ئەفەرموێ : وای لێ بێ کە سەجدەیەك لە دنیاو مافیها چاکتر ئەبێ ، [یەعنی دین بەقیمەت ئەبێ ، دنیا قیمەتی نامێنێ] .

ئـەبو هـورەیرە ئـەفەرمـوێ : ئەگـەر حەز ئـەکەن ئـەم ئایـەتە بخوێننەوە : هیچ کەس نی یە لە ئەهلی کیتاب کە ئیمانی پێ نەیێنێ لە پێش مردنی حەزرەتی عیسادا[1] .

لای غەیری ئەبوهورەیرە مەعنای ئایەتەکە وایە کە هەموو ئەهلی کیتاب لە پێش مردنی خۆیا ئیمانی پێ ئەهێنێ ، ئەو وەختە ئەگا کە عەبدەو بەشەرەو رەسوولی خودایە ، نە قسەی جوولەکەیە نە قسەی نەصارایە .

ئەمما ئیمانی دوای غەرغەرە چ فائیدەی هەیە ؟ !

۱۱ / ۷۳۱ وعنه قال رسول الله ـ ﷺ ـ : والله لينزلن ابن مريم حكما عـادلا ، فليكسرن الصليب ، وليقتلن الخنـزير ، وليضعن الجـزية ، ولتتركن القلاص [جمع قلوص من الابل كالفتاة من النساء ، والحدث من الرجال] فلا يسعى عليها ، ولتذهبن الشحناء [اي العداوة] والتباغض والتحاسد ، وليدعون الى المال فلا يقبله احد م ـ ۲ / ٤٠

تەرجەمە :

وشتری نێرو مێی جەهێڵ تەرك ئەكرێ[2] ، کەس ئیشی پێ ناکا ، دوشمنایەتی ، بوغضی یەکتری ، حەسەدبەیەکتری بردن نامێنێ ، خەڵق بانگ ئەکرێ کە ماڵی بدەنێ هیچ کەس قەبووڵی ناکا [یەعنی هەموو کەس لە ئیش ئەگا رەغبەتی دنیایی نامێنێ] .

---

(۱) سوورەتی نیساء ، ئایەتی ۱۰ .

(۲) دانەر ـ خ ـ لێرەدا تەنها تەرجەمەی زیادەی ریوایەتەکەی دوایی کردوە ، ئیتر باسی چەلیپاو ، بەرازو ، . . ی نەکرد ؛ چونکە پێشتر تەرجەمەی کردن .

٧٣٢/١٢ عن ابي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : كيف انتم اذا نزل ابن مريم [عليه السلام] فيكم وامامكم منكم ؟ م ـ ٢/٤١ ، ح ـ ٤٢١/٥ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئێوە چۆنن کە ئیبن ومەریەم ـ عليهما السلام ـ نوزوول بکا لە ناو ئێوەداو ئیمامی ئێوەیش لە نوێژا لە ئێوە بێ ؟ یەعنی یەکێ لە ئێوە کە حەزرەتی مەهدی‌یە حەزرەتی عیسا ئیقتیدای پێ ئەکا ، [چونکی ئەگەر لە ئەوەڵەوە حەزرەتی عیسا ـ عليه السلام ـ ببێ بە ئیمام خەڵق ئەکەوێتە شوبهەوە : ئایا دینێکی تازەی هێناوە یا نائیبی پێغەمەرە ـ ﷺ ـ لە ئیجرای ئەحکامی قورئانو سوننەتی پێغەمەر ا ـ ﷺ ـ ؟ بۆ دەفعی ئەو شوبهە ئەو نوێژە نابێ بە ئیمام . ابن الجوزي نقله القسطلاني]

٧٣٣/١٣ عن ابي هريرة [رضى الله تعالى عنه] ان رسول الله ـ ﷺ ـ قال : كيف انتم اذا نزل فيكم ابن مريم فأمكم منكم ؟ [قال الوليد بن مسلم] فقلت لابن ابي ذئب : ان الاوزاعي حدثنا عن الزهري عن ابي هريرة : وامامكم منكم ! [يعني لا فامكم منكم] قال ابن ابي ذئب : تدري ما (امكم منكم) ؟ قلت : تخبرني ؟ قال : فامكم بكتاب ربكم ـ تبارك وتعالى ـ وسنة نبيكم ـ ﷺ ـ م ـ ٢/٤٢ .

تەرجەمە :

نەوەویی ـ رحمه الله ـ لەم سوئاڵو جوابە بەحثی نەکردوە لەم مەوقیعەدا ، نازانم لە جێی تر بەحثی لێ کردوە یا نا ؟ مەعنای حەدیثەکەیشی بەیان نەکردوە . ظاهیری مەعنای حەدیثەکە وەك حەدیثەکەی پێشوە ، یەعنی : لەگەڵ وجوودی حەزرەتی عیسادا ـ عليه

السلام ـ هەر لەم ئوممەتە ئەبێ بە ئیمام وەك لەو حەدیثەكە ییت .

مەعنای (ابن ابي ذئب) وا ئـەگەیێنێ كـە حەزرەتی عیسـا ـ علیه السلام ـ ئەبێ بە ئیمام لەسەر ئەحكامی شەریعەتی ئێمە . ئەم مەعنای هەم خیلافی ظاهیری ئەم حەدیثەو تەصریحی حەدیثی دوایی یەو ، لەفظی (منكم) یش بە (معلق) ئەمێنێتەوە ، ئەوەندەی پێ ئەوێ كـە مەعنـای صەحیح ئەبێ (وامكم كاحد منكم) دەلیلیش لەسەر ئەم حەذفە نی یە . هەم قسەكەی (ابن ابی ذئب)یش جوابی وەلیدی تیا نی یە . وەلید بە ئیبن و ئەبی ذیئب ئەڵێ : ئەوزاعی (امامكم)ی ریـوایەت كـردوە ، تۆ (أمكم) ریوایەت ئەكەی .

رەنگە لەبەر ئەم ئیشكالەبێ بوخاری ئـەم طەریقـەی ئیبن و ئەبی ذیئبەی ریوایەت نەكردوە (!) نەوەویش بۆیە قسەی لێ نەكردوە .

مـەقصوودی پێغـەمەر ـ ﷺ ـ وایـە ئیبن ومـەریـەمیش ـ علیهـما السلام ـ نوزوول بكا شەریعەتی من نەسخ نابێتەوەو باقی یە ، هەر بـە شەرعی من عەمەل ئەكرێ ، لە ئێوە ئیمامەتیتان بۆ ئەكا عیسایش ـ علیه السلام ـ لە ئێوە ئەبێ .

**١٤/٧٣٤ جابر بن عبد الله ـ رضي الله تعالى عنهما ـ يقول : سمعت النبي ـ ﷺ ـ يقول : لاتزال طائفة من امتي يقاتلون عن الحق ظاهرين الى يوم القيامة . قال : فينزل عيسى بن مريم ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فيقول اميرهم : تعال صل لنا ! فيقول : ان بعضكم على بعض امراء تكرمة هذه الأمة . م ـ ٢/٤٣**

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەفەرموێ : طائیفەیێ لە ئوممەتی من لەسەر حەق هەر حەرب ئەکەن و غاڵب ئەبن تا رۆژی قیامەت . فەرمووی : ئەمجا حەزرەتی عیسای ئیبنی مەریەم ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ نازڵ ئەبێ . ئەمیری ئەو لەشکرە کە لەو وەختەدا لەسەر حەق حەرب ئەکەن عەرزی حەزرەتی عیسا ئەکا ئەفەرموێ : تەشریفت بێ نوێژمان پێ بکە . ئەفەرموێ : خەیر [خۆتان نوێژ بۆ خۆتان بکەن] چونکی بەعزێ لە ئێوە ئەمیری بەعزەکەی ترتانن . ئەوە ئەفەرموێ لەبەر ئیکرامگرتنی ئەم ئوممەتە .

ئەم حەدیثە مەعناکەی (ابن ابي ذئب) رەد ئەکاتەوە . ئەم حەدیثەو حەدیثەکانی پێشوو دەلالەت ئەکەن لەسەر :

١ ـ نوزوولی حەزرەتی عیسا ـ عليه الصلاة والسلام ـ
٢ ـ لەسەر بەقای شەریعەتی محەمەد ـ عليه الصلاة والسلام ـ .
٣ ـ لەسەر خورووجی مەهدیی ـ رضي الله تعالى عنه ـ .
٤ ـ لەسەر تابیع بوونی حەزرەتی عیسا ـ عليه السلام ـ بە شەریعەتی ئێمە .
٥ ـ لەسەر ئەمە کە ئەهلی حەق دائیما غالبن ، لازم نی یە لە هەموو جێیێ بێ ، چونکی فەرموویەتی طائیفەیێ . حەربیش عامە لەمە : بە زمان بێ ، یا بە سەیفو سینان بێ . غەلەبە لازم ناکا بەسەر هەموو کافرانا بێ ، غەلەبەی ئەو طائیفەی کە حەرب ئەکا بەسەر موقابیلی یا کافی یە .

٧٣٥/١٥ مغيرة بن شعبة [رضي الله تعالى عنه] عن النبي ـ ﷺ ـ قال : لايزال ناس [طائفة ح ـ ١٠/٣١١ وهم اهل العلم خ معلقا . هم اصحاب الحديث ت] من امتي ظاهرين [على الحق م] حتى يأتيهم امر الله

[حتى تأتيهم الساعة م] وهم ظاهرون . ح ـ ٦/٧٢ ، ح ـ ١٠/٣١١ ، م ـ ٨/١٣١ .

وعن جابر بن سمرة ، وعن ثوبان ، وعن معاوية ، وجابر بن عبدالله ـ رضي الله تعالى عنهم ـ بالفاظ متقاربة م ـ ٨/١٣٠/١٣١ .

٧٣٦/١٦ معاوية يقول : سمعت النبي ـ ﷺ ـ يقول : لا تزال من امتي امة قائمة بامر الله لا يضرهم من خذلهم ، ولا من خالفهم حتى يأتيهم امر الله وهم على ذلك . قال عمير [بن هانئ راوي الحديث] : فقال مالك بن يخامر : قال معاذ [بن جبل رضي الله تعالى عنه] : وهم بالشام ، فقال معاوية : هذا مالك يزعم انه سمع معاذا يقول وهم بالشام ح ـ ٦/٧٣ ، م ـ ٨/١٣٢ .

[وفي حديث ابي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ للطبراني : يقاتلون على ابواب دمشق وما حولها . وعلى ابواب بيت المقدس وما حوله ، لايضرهم من خذلهم ظاهرين الى يوم القيامة . قسطلانى] .

٧٣٧/١٧ عبدالرحمن بن شماسة المهري قال : كنت عند مسلمة بن مخلد وعند عبدالله بن عمرو بن العاص [رضى الله تعالى عنهما] ، فقال عبدالله : لا تقوم الساعة الا على شرار الخلق هم شر من اهل الجاهلية ، لايدعون الله بشيئ الا رده عليهم ، فبينما هم على ذلك أقبل عقبة بن عامر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقال له مسلمة : يا عقبة ! اسمع ما يقول عبدالله . فقال عقبة : هو اعلم ، واما انا فسمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : لا تزال عصابة من أمتي يقاتلون على امر الله قاهرين لعدوهم ، لا يضرهم من خالفهم حتى تاتيهم الساعة وهم على ذلك ، فقال عبدالله : اجل . ثم يبعث الله ريحا كريح المسك ، مسها مس الحرير ، فلا تترك نفسا في قلبه مثقال حبة من الايمان الا قبضته ، ثم يبقى شرار الناس عليهم تقوم الساعة م ـ ٨/١٣٢

تەرجەمە :

(١) موعاوية - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : لە پێغەمەرم بیست - صلی الله تعالی علیه وسلم - ئەیفەرموو : لە ئوممەتی من ئممەتێك بە دەوام ئەمری خوا رائەگرێ بەجێی ێنێ ، ئەوانەی لە موعاوەنەتیان ئەکشێنەوەو موخالەفەتیان ئەکەن زەرەریان پێ ناگەیێنن تا قیامەتیان بۆ یێ و ئەوان لەسەر ئەو حاڵەن کە موعاوەنەتی حەق ئەکەن .

کە حەزرەتی موعاویە ئەم حەدیثەی ریوایەت ئەکرد مالیکی کوڕی (یخامر) وتی : کە مەعاذی بنی جەبەل - رضي الله تعالی عنه - فەرمووی : ئەوانە کە موعاوەنەتی حەق ئەکەن لە شامن ؟ موعاویە - رضي الله تعالی عنه - فەرمووی : ئەمە مالیکە ، ئەڵێ : کە لە مەعاذم بیستوە ئەیفەرموو ئەوانە لە شامن .

١٨ / ٧٣٨ قال رسول الله - صلی الله تعالی علیه وسلم - : **من یرد الله به خیرا یفقهه في الدین ، ولا تزال عصابة من المسلمین یقاتلون علی الحق ظاهرین علی من ناوأهم [اي عاداهم] الی یوم القیامة . م - ٨ / ١٣٢ .**

پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : هەرکەسێ خوا ئیرادەی خەیری پێ بکا ئەو کەسە ئەکا بە عالم لە دینا ، جەماعەتێ لە موسوڵمانان هەر لەسەر حەق شەڕ ئەکەن بە لیسان یا بە سینان غالب ئەبن بەسەر دوشمنیانا تا رۆژی قیامەت .

(٢)[١] عەبدورەحمانی بنی شەماسەی میهری ئەفەرموێ : لە لای مەسلەمەی کوری موخەللەد بووم عەبدوڵلای بنی عەمری بنی عاصی لە

(١) دانەر - خ - لە پێشدا سێ حەدیثی بەیەکەوە نووسی ، دوایی دەستی کرد بە تەرجەمەکردنیانو ، ژمارە (١) حەدیثی موعاویە بـو ، ئەمـەیش لێرەدا ژمارە (٢) هەرچەند حەدیثی ١٨ / ٧٣٨ی نووسی .

لا بوو ، عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : قیامەت بەسەر خرابترینی خەڵقا نەبێ کە کوففارن هەڵناسێ . ئەوانە لە ئەهلی جاهیلی یەت خرابترن ، هیچ دۆعایێ ناکەن کە خوای ـ عز وجل ـ نەیداتەوە بەسەریانا . لەو وەختەدا عەقەبەی بنی عامیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ کە لە فوضەلای ئەصحابی کیرامە ، تەشریفی هات ، مەسلەمە پێی وت : ئەی عەقەبە گوێت لێیە عەبدوڵلا ئەڵێ چی ؟ عەقەبە فەرمووی : ئەو لە منی چاکتر ئەزانێ . ئەمما من لە پێغەمەرم بیست ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەیفەرموو : جەماعەتێکی بە قووەت لە ئوممەتی من هەر لەسەر حەق ، هەر لەسەر ئەمری خوا شەڕ ئەکەن قەهری عەدووی خۆیان ئەکەن تا قیامەتیان بۆ یێ و ئەوان ئێشتا لەسەر ئەو حاڵە ئەبن . عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : بەڵێ وایە . لە دوایی یا خوا بایێکی بۆنخۆشی لە ئاوریشم نەرمتر ئەنێرێ ، هیچ نەفسێ نایێڵێتەوە کە بە قەد حەببەیێ ئیمان لە دڵیا بێ و قەبضی نەکا ، لە دوای ئەوە خرابترینی خەڵق کە کوففارە ئەمێننەوەو قیامەتیان بەسەرا هەڵەسێ .

١٩/٧٣٩ عن سعد بن ابي وقاص [رضي الله تعالى عنه] قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : لا يزال اهل الغرب ظاهرين على الحق حتى تقوم الساعة . م ـ ٨/١٣٣

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەهلی غەرب تا قیامەت ظاهیر ئەبن لەسەر حەق .

غەرب : دوو مەعنایان لێ داوەتەوە : (عەرەب) ئەگەر موراد لەو غەرب بێ کە بە دۆلکەی گەورە دەڵێن کە ئاوی پێ هەڵەێنجن بۆ باغ و ئەراضی ، یائەو جێگەی کە رۆژی لێ ئاوا ئەبێ . مەعاذ ـ رضي الله تعالى عنه ـ وەك لە حەدیثەکەی پێشووا بەیان کرا ـ ئەوانە لە شامن ، لە حەدیثێکی ترا لە (بيت المقدس)ن . بەعضێك ئەڵێن : ئەهلی شامن ، بەعضێك ئەڵێن : میللەتی ئازان هەر میللەتێ بێ . (من نووی) .

٢٠/٧٤٠ عن ابي هريرة [رضي الله تعالى عنه] ان رسول الله ـ ﷺ ـ قال : لا تقوم الساعة حتى تطلع الشمس من مغربها ، فاذا طلعت من مغربها آمن الناس كلهم اجمعون ، فيومئذ لا ينفع نفسا ايمانها لم تكن آمنت من قبل او كسبت في ايمانها خيرا . م ـ ٢/٤٥

تەرجەمە :

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : تا رۆژ لە مەغریبەوە هەڵنەیێ قیامەت هەڵناستێ ، کە رۆژ لە مەغریبی یەوە هەڵهات هەموو ئینسـان ئیمان یێنن [چـونکی لێیان مـەعلووم ئەبێ کـە حەشرو نەشرو قیامەت هەیە] ئەو رۆژە ـ یەعنی ئەو وەختە ـ هەرکەسێ لەوەپێش ئیمانی نەهێنابێ ئیمانی ئەو رۆژەی فایدەی پێ نادا ، یا ئیمانی هێنابێ‌و ، لەو ئیمانهێنانەدا کەسبی عەمەلی چاکەی تیـا نەکـردبێ ئەو وەختە عەمەلی چاکە بکا عەمەلەکەی فایدەی نابێ . [یەعنی کە رۆژ لە مەغریبەوە هەڵهات کەسێ کە ئیمانی نەهێنابێ لەوەپێش ئەو وەختە ئیمان بێنێ ئیمانەکەی بێ فائیدەیە ، لە عەذابی ئەبەدی نەجاتی نابێ ، کەسێکیش ئیمانی هێنابێ‌و دوای ئیمانهێنانەکەی عەمەلی چاکەی نەکردبێ ، هـەر ئیمانی هێنابێ‌و بەس . لەو وەختەدا کە رۆژ لە مەغـریب هەڵهـات ئەو کەسە بێنێ دەست بکا بە عەمەلی چاکەکردن با ئیمانەکەی فائیدەی پێ بدا لە خولوود نەجاتی ببێ ، ئەمما ئەو عەمەلەی لەو وەختە دا دەست ئەکا بە کردنی بێ‌فائیدە ئەبێ . .

ئایەتەکە (لف و نشر)ە ، لەففـەکەی مـوجمەلـەو ، نەشـرەکەی موفەصەلە ، یاخۆ لـە بابی ئیکتیفـایە وەك (سـرابیل تقیكم الحـر ، اي والبرد) مەعنای وا ئەبێ ئیمانو عەمەل فائیدە نادا بە کەسێ کە لەوەپێش ئیمانو عەمەلی نەبووبێ ، ئیمانی نەبووبێ ئەو وەختە ئیمان بێنێ ئەو ئیمانە

فائیدەی نی یە . ئیمانی بووبیٚو عەمەلی نەبووبیٚ لەو وەختەدا دەست پیٚ بکا ئەو عەمەلە فایدەی بۆ نابیٚ . ئەصلی وا بوە (لا ینفع نفسا ایمانها ولا عملها لم تکن الخ . .) مەعنای وا نی یە کەسیٚ ئیمانی نەبووبیٚ ئیمان بیێنیٚ ، یا ئیمانی بووبیٚو عەمەلی نەبووبیٚ ئیمانەکەی فائیدەی نابیٚ ، تاکوو ئەصحابی کەبیرە موخەللەد بن وەك موعتەزیلە ئەلێن . ئەحادیثی شەفاعەتو ئایاتی تری قورئان (ان الله لا یظلم مثقال ذرة) ، (من کان في قلبه ذرة من خیر . .) حەدیثی (عتقاء الله) ، (فمن یعمل) . . هەموو دەلالەت ئەکەن لەسەر ئەمە کە (صرف) ئیمان مونجی یە ، عەینی ئەم حەدیثە لە حەدیثێکی دریٚژا بیٚت (ان شاء الله) . لە ئیمانا . . نەفسی ئیمان ئینسانی پیٚ نەجات ئەبیٚ رابورد .

٧٤١/٢١ عن ابي هريرة [رضي الله تعالی عنه] قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : ثلاث اذا خرجن لا ینفع نفسا ایمانها لم تکن آمنت من قبل او کسبت في ایمانها خیرا : طلوع الشمس من مغربها ، والدجال ، ودابة الارض م ـ ٢/٤٦

تەرجەمە :

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : کە پیٚغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : سیٚ شت هەن کە خورووجیان کرد کەسیٚ کە ئیمانی نەهیٚنابیٚ تا ئەو وەختە . . ئەو وەختە ئیمان بیێنیٚ ئیمانی فائیدەی بۆی نابیٚ ، کەسیٚکیش ئیمانی هیٚنابیٚ لەوەپیٚش ئەمما لە زەمانی ئەو ئیمانەدا هیچ عەمەلی چاکەی نەبووبیٚ کە یەکیٚ لەو سیٚ شتە ظوهووری کرد دەستکا بە چاکەکردن ئەو چاکەیە فایدەی بۆی نابیٚ . ئەو سیٚ شتە :

١ ـ لە مەغریبەوە رۆژ هەلاٚتن .

٢ ـ دەججال .

٣ ـ دابة الارض .

٧٤٢/٢٢ عن ابي ذر [رضي الله تعالى عنه] ان النبي ـ ﷺ ـ قال يوما : اتدرون اين تذهب هذه الشمس ؟ قالوا الله ورسوله اعلم . قال : ان هذه تجري حتى تنتهي الى مستقرها تحت العرش ، فتخر ساجدة ، فلا تزال كذلك حتى يقال لها : ارتفعي ارجعي من حيث جئت . فترجع فتصبح طالعة من مطلعها ثم تجري لا يستنكر الناس منها شيئا حتى تنتهي الى مستقرها ذاك تحت العرش فيقال لها : ارتفعي اصبحي طالعة من مغربك فتصبح طالعة من مغربها فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : اتدرون متى ذاكم ؟ ذاك حين لا ينفع نفسا ايمانها لم تكن آمنت من قبل اوكسبت في ايمانها خيرا . م ـ ٤٧/٢

٧٤٣/٢٣ وعنه قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ لابي ذر حين غربت الشمس : تدري أين تذهب ؟ قلت : الله ورسوله اعلم . قال : فانها تذهب حتى تسجد تحت العرش ، فتستأذن فيؤذن لها ، ويوشك ان تسجد فلا يقبل منها ، وتستأذن فلا يؤذن لها ، يقال لها : ارجعي من حيث جئت فتطلع من مغربها ، فذلك قوله ـ تعالى ـ : ﴿والشمس تجري لمستقر لها ، ذلك تقدير العزيز العليم﴾[1] . ح ـ ٢٤٨/٥ ، م ـ ٤٧/٢ د ، ت ، ن . ذكره البخاري ايضا ـ في التفسير ، وفي التوحيد .

وعنه قال[2] : سألت رسول الله ـ ﷺ ـ عن قول الله ـ جل وعلا ـ : ﴿والشمس تجري لمستقر لها . .﴾ قال مستقرها تحت العرش . م ـ ٤٨/٢ ، خ ـ ٢٩٩/٧ ن .

---

(١) سوورەتی یاسین ، ئایەتی : ٣٨

(٢) دەبوو لێرەدا ژمارەی حەدیث هەبوایە ، بەڵام کە نی یە وەك خۆی نووسیمان .

تەرجەمە :

ئەبوذەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : [كە رۆژ ئاوابوو . اخرى] پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەزانن ئەم رۆژە بۆ كوێ ئەچێ ؟ وتيان : خواو رەسوولی خوا لە هەموو كەس عالمترن . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەم رۆژە هەروا ئەڕوا تا ئەگاتە ئەو جێيەی كە قەراری لێ ئەگرێ لە ژێر عەرشا ، ئەو وەختە بە سوجدەدا ئەكەوێ ، هەر لە سوجدەدا ئەبێ تا ئەمری پێ ئەكرێ كە : بەرزبەرەوە بگەڕێرەوە بۆ ئەو جێيەی كە لێی هاتووی ، ئەگەڕێتەوە بۆ مەشريق ، هەر وەقت لە كوێ هەلاتوە لێی هەلێبێ و دەست ئەكا بە جەرەيان كەس فەرق بەوەی ناكا لێی ناشلەژێ كە بۆچ موددەیێ تەئەخخوری بوو .

تا ئەگاتەوە ئەو موستەقەررەی لە ژێر عەرشايە ئەمری پێ ئەكرێ كە : بەرزەبەرەوە لە سوجدە ، لە كوێ ئاوابووی هەر لەوێوە هەلبێ ! ئەمجا لە مەغريب طولووع ئەكا . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەزانن ئەوە كە لە مەغريب طولووع ئەكا كەيە ؟ ئەوە ئەو وەختەيە كە هيچ كەس ئيمانی نەفعی پێ نادا كە لەوەپێش ئيمانی نەهێنابێ يا ئيمانی هێنابێ و عەمەلی نەبووبێ عەمەلی ئەو وەختەی فائيدەی بۆی نابێ .

لە حەديثەكەی دوەما ئەبوذەر ئەفەرموێ : لە وەختی رۆژ ئاوادا كە پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێی فەرمووم : ئەزانی ئەم رۆژە بۆ كوێ ئەچێ ؟ وتم : خواو رەسوولی خوا ئەزانن . . فەرمووی : هەروا ئەڕوا تا سوجدە بەرێ لە ژێر عەرشا، ئيذن ئەخوازێ بۆ سوجدە ، ئيذن ئەدرێ نزيكە [يەعنی قيامەت نزيكە]كە سوجدە بەرێ و لێی قەبووڵ نەكرێ ، ئيذن بخوازێ بۆ

سـوجدەو ئيـذن نەدرێ ، ئـەمري پێ ئـەكـرێ لـە كـوێـوە هـاتـووی بگەڕێرەوەو ، ئەمجا لە مەغريبەوە طولووع ئەكا . ئەوە فەرموودەی خوايە كە فەرمووی : رۆژ هەروا ئەڕوا هەڵبێ و ئاوا ئەبێ ، تا ئەگاتە قەرارگای خۆی ، ئەو هەڵاتن و ئاوابوونەی كە گەیی یە قەرارگای ، لە مەغريبەوە طولووعكردنی تەقديری خواییێكە كە عەزيزو غالبە بەسەر هەموو شتێكاو بە هەمووشت عالمە .

(٣) ئەبوذەڕ ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ﴿و الشمس تجری لمستقر لها﴾م لە پێغەمەر پرسی ـ ﷺ ـ فەرمووی : جێ وەستانی رۆژ لە ژێر عەرشایە .

ئيضاحی ئەم حەدیثانەو ئەو ئايەتی سـوورەتی ياسينـە ئەمـەيە : نەوەوی ـ رحمه الله ـ ئەم حەديثانەی ئيضاح نەكردوە . قەسـطەلانيش شيفای دەرد ناداو ، لە بەيضاوی يەوەيشی نـەقڵ كـردوە بينای لـەسەر ريوايەت نەكردوە .

ظاهيری ئاياتی قورئان و ئەحاديثی شەريفە مانگ و رۆژو هـەموو ئەستێرە (بالذات) حەرەكە ئەكەن لە ئاسمانەكانا .

لای حوكەمای قەديم هەر ئاسمانەكان حەرەكەت ئەكەن مانگ و رۆژو ئەستێرەكان وەك بزمار پياچەقيون بە واسيطەی ئـاسمانـەكانـەوە حەرەكەت ئەكەن ، لای ئەوان ئاسمان هەيە ئينكاری ناكەن .

حوكەمای ئێستە ئينكاری ئاسمانەكان ئەكەن ، ئاسمانيان لـە لا نی يە ، چونكی تەماسيان ناكەن ، ئاسمانەكانيش ئەوەنـدە لەطيفن لـە هەوا لەطيفترن بە چاوو دووربين نەيان بينيوە ، ئەڵێن : هەر ئەستێرەكان بە دەورەی رۆژا ئەگەڕێن . رۆژيشيان لە لا ثابيتە نابزوێ ، ئەرزيش ئەستێرەيەكە بە دەوری رۆژا ئەسووڕێتەوە ، بەوە فوصـوولی ئەربـەعە

پەیدا ئەبێ ، بە دەوری خۆیشیا لـە بیست‌وچوار سـەعاتـا دەفعەیێـك ئەسووڕێتەوە ، بەوە شەوو ڕۆژ ئەبێتەوە . دوو نەوع حەرەکەی هەیە : وەك خولخولۆکە بە دەوری خۆیا ئەسووڕێتەوە . بە ساڵێکی شەمسیش بە دەوری ڕۆژا ئـەسووڕێتـەوە ، هەر کـامێکیان بێ تـەقدیـری عەزیـزی عەلیمە ، حەقیقەتەکەی هەر خوا ئەیزانێ کە ئیجادی کردوە .

مەعنای ئایەتەکە وایە قورصی ڕۆژ ـ یەعنی مانگیش ـ هەر ئەڕۆن طولووع و غورووب ئەکەن تا ئەو وەختەی کە خوا ئیرادە ئەکـاو ئەرزو ئاسمان ئەپێچێتەوە ، ئەو وەختە قەرار ئەگـرن ، طولـووع و غورووب ناکەن ، شەوقیان نامێنێ ، وەك ئینسان ئەمرن ، ئـەکوژێنـەوە لە ژێـر عەرشا دائەنرێن . (ذاتا) ئێستەیش لە ژێر عەرشان . ئیذن‌خواستن بە لیسانی حاڵە یا قالە مومکینە خوا عەقڵ و شوعـووریان بـداتێ ، قووەی نـاطیقەیـان بداتێ ، چـۆن گڵی مـردوو ئەکـا بە : ئینسـانی عاقـڵ ، بە حەیوانات ، بە حەشەرات ، بە درەخت‌و گیا ، بە چەند هەزار نەوع شت . وە یاخو موراد لەوە تەصویرو تەمثیلە دەلالەت لەسـەر کەمـالی قودرەتی خوا ئەکا .

مانگ‌و ڕۆژ و ئەستێرە هەموو بە دەوام لە حەرەکەتان ، وەستانیان نی‌یە بە هیچ ئانێ ، هەموو ئانێ لە طولووع و غورووبان ، لە جێیێ هەڵێن لە جێیێ ئاوا ئەبن ، ئەو مەدارەی کە لەسەری حەرەکەت ئـەکەن بـە قەدەر (اجزای لا یتجزا)ی چەند ئەوەندە ئوفوق هەیە هەموو بەیەکەوە نووساون لە کوللی ئوفوقێکی بە دەوام بەنیسبەت جێیێ طولووع ئەکەن‌و بە نیسبەت جێیێ غورووب ئەکەن . یەعنی کوللی جوزئێکی ئەو مەدارە هەم مەشریقە هەم مەغریبە ، هەڵاتن‌و ئاوابوونیان حەرەکەیە ، حەرەکە حادیثە موحدیثێکی بێ ئەوێ کە ئیحداثی بکا ، قابیلی‌یەتی ئەو حادیثە بۆ

ئیحداث سوجدەیە ، تەئثیری موحدیث ئەمرە بە طولووع و غورووب ، ئیذنە بە سوجدە ، برانەوەی تەعەلووقی قودرەتی ئیلاهي بە طولووع و غورووب موستەقەری مانگ و رۆژو ئەستێرەیە وەك چرایێ بیکووژێنییەوە چۆن هەموو جێیێ تاریك ئەبێ ، یەعنی ئەوی پێی رووناك بوو بێتەوە ئەوانیش لە حەرەکە ئەکەون ، ئەو موستەقەری رۆژە کە لێی ئەگەڕێتەوە ئاخر موستەقەری نییە ، چونکی دوای گەڕانەوەی رۆژ دووبارە لە جێی پێشووی حەرەکەت ئەکەن تا حەشرو نەشر ئەبێتەوە ئەمجا یەکجاریی رائەوەستن . ﴿اذا الشمس كورت ، واذا النجوم انكدرت﴾[1] .

لام وایە ئەمە مەعنایێکی واضیحە .

٧٤٤/٢٤ عبدالرحمن بن غنم الاشعري قال : حدثني ابو عامر ، أو ابو مالك الاشعري - رضي الله تعالى عنهما - [عند ابي داود ابو مالك من غير شك] والله ماكذبني سمع النبي - ﷺ - يقول : ليكونن من أمتي اقوام يستحلون الحِر ، والحرير ، والخمر ، والمعازف ، [الات اللهو] ولينزلن اقوام الى جنب علم يروح عليهم [الراعي] بسارحة لهم يأتيهم [المحتاج] لحاجة فيقولوا : ارجع الينا غدا فيبيتهم الله [عليهم] ويضع العلم [يوقعه عليهم] ويمسخ آخرين [ممن لم يقع العلم عليه] قردة وخنازير الى يوم القيامة . ح - ٣٠٤/٨

**تەرجەمە :**

لە ئوممەتی من بەعضێ قەوم ئەبن فەرج حەلاڵ ئەکەن ، ئاوریشم حەلاڵ ئەکەن ، شەراب حەلاڵ ئەکەن ، ئالاتی لەهو حەلاڵ ئەکەن ، [ئەمانە ئێستە هەموو مەوجوودن] بەعضێ قەوم لە پەنا کێوێکا

(١) بڕوانە : سوورەتی تەکویر ، ئایەتی : ١و٢ .

هەڵەدەن ، ئێواران حەیوانی دۆشەنی‌یان بۆ ئەبرێتەوە ، موحتاج ئەچنە لایان بۆ ئیحسان پێیان ئەڵێن : سبەینێ وەرنەوە ئەتانـدەینێ . [رەدیان ئەکەنەوە بە مەحروومیی] خـوا ـ عز وجـل ـ شەو ئـەدا بەسـەریانـا ، شاخەکەیان بـەسەرا ئـەرووخێنێ ، ئەوانی تـر کە نـەبووبن بـەژێرەوە مەسخ ئەکاتەوە بە مەیموونو بەراز تا رۆژی قیامەت . یا حەقیقـەت یا دڵیان وا لێ ئەکا .

**٧٤٥/٢٥ سالم بن عبدالله بن عمر [رضي الله تعالى عنهم] يقول : يا اهل العراق ! ما اسألكم عن الصغيرة واركبكم للكبيرة . سمعت ابي عبدالله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] يقول : سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول ـ ان الفتنة تجيئ من ههنا ، واومأ بيده نحو المشرق من حيث يطلع قرنا الشيطان ، وانتم يضرب بعضكم رقاب بعض ، وانما قتل موسى [عليه السلام] الذي قتل من آل فرعون خطأ . فقال الله ـ عـز وجل ـ ﴿وفتناك فتونا﴾[1] م ـ ١٠/٣٦٧**

**تەرجەمە :**

سالمی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهم ـ بە ئەهلی عێراقی ئەفەرمـوو : ئەی ئـەهلی عێـراق من سوئـالی صەغیرەتان لێ ناکـەمو کەبیـرەتان پێ ئیـرتیکاب بکـەم [یەعنی ـ والله اعلم ـ ئەگەر لە صەغیرەتان بپرسمەوە ئـەتانکـەم بە گـژ ئەوانـەدا کە ئیرتیکابی صەغیرە ئەکەن ، ئیختیلاف ئەکـەوێتە بـەینتانـەوەو ئەبێ بـە سـەبەبی شـەرو شۆڕو یـەکترکـوشتن ، کە کـەبیرەیـە] لـە بـاوکم کـە

(١) سوورەتی : طاها ، ئایەتی ٤٠ .

عەبدوڵلای کوڕی عومەرە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ م بیستوە کە ئەیفەرموو : لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ م بیستوە ئەیفەرموو : کە فیتنە لەوێوە بێ ، بەدەستی موبارەکی ئیشارەتی بۆ طەرەفی مەشریق کرد ، ئەو جێگەیەی کە دووشاخی شەیطانی لێ هەڵبێ [موراد لە طولووعی شاخی شەیطان فیتنەو ئیتباعی ئەغوای شەیطانە] . ئێوە بەعضێکتان لە گەردنی بەعضێکتان ئەدەن بە عەمدەن . حەزرەتی مووسا بە خەطەء پیاوێکی کافری کوشت لە ئالی فیرعەون خوا ـ عز وجل ـ پێی فەرموو : نەفسی کەمت کوشت ! [بەوە ترس و خۆفت لێ نیشت کە بتکوژن ، غەمت لێ نیشت] لە غەم نەجاتمان دایت ، بە گەلێ فیتنە موبەتەلامان کردی .

[یەعنی حەزرەتی مووسا ـ علیه الصلاة والسلام ـ بە خەطەء پیاوێکی کافری کوشت کە ئەمری پێ نەکرابوو بیکوژێ . خوا ـ عز وجل ـ ئەوە بە فیتنە ناو ئەبا ئێوە کە هەموو خۆتان بە موسوڵمان دائەنێن بە عەمد لەسەر هیچ یەکتری ئەکوژن ، لە مەشریقی مەدینەیشن چۆن نابێ بەو فیتنەی کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ خەبەری لێ داوە ؟] .

حەدیثی ظوهووری فیتنە لە مەشریقەوە هەر لە عەبدوڵلاوە لە موسلیما لەم صەحیفەدا چەند ریوایەتی تر کراوە ، مەئالیان هەموو یەکە .

ئەم حەدیثە کافی یە . لە ئیمانیشا بەعضێکی رابورد .

**٧٤٦/٢٦ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت : سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : لا يذهب الليل والنهار حتى تُعْبَد اللات والعزى ! فقلت : يا رسول الله ان كنت لأظن حين انزل الله ﴿هو الذي ارسل رسوله بالهدى ودين الحق ليظهره على الدين كله ، ولو كره المشركون﴾[1] ان ذلك تام ، قال : انه سيكون من ذلك ما شاء الله ، ثم يبعث الله ريحا**

(١) سوورەتی (صف) ئایەتی : ٩ .

طيبة ، فتوفى كل من في قلبه مثقال حبة من خردل من ايمان ، فيبقى من لا خير فيه ، فيرجعون الى دين آبائهم . م ـ ١٠ /٣٦٨

**تەرجەمە :**

حەزرەتی عائیشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ م بیست ئەیفەرموو : شەوو رۆژ نابرێتەوە تا (لات)و (عوززا) ئەپەرسترێن ! عەرزم‌کرد : یا رەسوولەڵڵا کە ئایەتی : «خوا ئەو خوایە کە پێغەمەری خۆیی لەگەڵ هیدایەت‌و دینی حەقا نارد تاکو ئەو رەسوولە یا ئەو دینی حەقە غاڵب بکا بەسەر هەموو دینێکا ، با موشریکیش پێیان ناخۆش بێ»ی نازڵ‌کرد وام ظەن ئەبرد کە ئەوە تەواوە ، ئیتر لات‌و عوززا ناپەرسترێن . فەرمووی : لەوەی کە دینی حەق غاڵب ئەبێ بەسەر ئەدیانی باطیلەداو تەرکی بتپەرستیی ئەکرێ ئەوەندەی خوا ئیرادە بکا ئەبێ ، لە دوای ئەوە خوا باییکی خۆش ئەنێرێ هەرکەسێ بەقەد دانەی خەردەلێ ئیمان لە دڵیا بێ قەبضی رۆحی ئەکا ، ئەوانە ئەمێننەوە کە لە دڵیانا هیچ خێر نەبێ ، ئەوانە ئەگەرێنەوە سەر دینی باوك‌و باپیریان .

٧٤٧/٢٧ ابو هريرة [رضي الله تعالى عنه] عن النبي ـ ﷺ ـ قال : لا تذهب الايام والليالي حتى يملك رجل يقال له : (الجهجاه) . قال مسلم : هم اربعة اخوة : شريك ، وعبيدالله ، وعمير ، وعبدالكريم ، بنو عبدالمجيد . م ـ ١٠ / ٣٧٠ .

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : شەوو رۆژ نابرێنەوە تا پیاوێکی جەهجاە ناو ئەبێ بە پادشا [ی ئیسلام] . موسلیم ئەفەرموێ : ئەوانە چوار بران شورەیك ، عوبەیدوڵڵا ، عومەیر ، عەبدولکەریم ، کوڕی

عەبدولمەجیدن .

[ئەو جەهجاهە کامیانە ؟ یەکێکیانە ؟ یا هەموویانە یەك لە دوای یەك ئەبن بە پادشاه ؟ نەوەوی هیچ ئیضاحێ ناکا]

۷٤۸/۲۸ وعنه ان رسول الله ـ ﷺ ـ قال : لا تقوم الساعة حتى يخرج رجل من قحطان ، يسوق الناس بعصاه . م ـ ۱۰/ ۳۷۰ ، ح ـ ۱۰/ ۱۹٤ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : قیامەت هەڵناستێ تا پیاوێ لە قەحطان خورووج ئەکا ، خەڵق بە عەصا سەوق ئەکا .

نەوەوی مەعنای لێناداتەوە . بە دارکاریی ئیدارەی مەملەکەت ئەکا ؟ یا بە عەصاکەی ئیشارەت ئەکا : وا بکەنو ، وابڕۆن . یا بە عەدالەت حوکم ئەکا ؟ یەعنی وەکوو شوان . (احتمالات) .

۷٤۹/۲۹ ابو هريرة عن النبي ـ ﷺ ـ [ورضي عنه] : يخرب الكعبة ذو السويقتين [قاچ باریك] من الحبشة . م ـ ۱۰/ ۳۷۰ ، ح ـ ۳/ ۱۵۵ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : (ذووسوەیقەتەین) لە حەبەشە کەعبە خراپ ئەکا .

۷۵۰/۳۰ عن ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] عن النبي ـ ﷺ ـ قال : من كره من اميره شيئا فليصبر ، فانه من خرج من السلطان [من

فارق الجماعة . اخرى م ـ ٨/ ٥٠] شبرا مات ميتة جاهلية .
ح ـ ١٠/ ١٦٢/ ٢١١

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : هەرکەسێ لە ئەمیری شتێکی دی کە لای ناخۆش بوو صەبری لەسەر بکا ، چونکی هەرکەسێ بستێ لە سولطان ـ لە جەماعەت ـ جویێببێتەوەو بمرێ بە مردنی جاهیلیەت ئەمرێ .

ئیطاعەی پادشاو ئومەرا لە غەیری ئیشی حەرام ومەکرووها بیلا قەیدو شەرط واجبە ، حەتتا لە موباحیشا کە ئەمری پێ‌کرد ئەبێ بە واجب . ئەو پادشایە ، یا ئومەرایە با خۆیشی فاسقو فاجیر بێ لەوەدا صەبر بکاو لە ئیطاعەی نەچێتە دەرێ بەو بەهانەیە ، چونکی لە موخالەفەی فیتنەی گەورەتری لێ پەیدا ئەبێ .

موخالەفەی ئەمیر حەرامە لە (خلاف الشرع)ا .

٧٥١/٣١ جنادة بن ابي امية قال : دخلنا على عبادة بن الصامت [رضي الله تعالى عنه] وهو مريض ، فقلنا : أصلحك الله ! حدثنا بحديث ينفعك الله به سمعتَه من النبي ـ ﷺ ـ قال : دعانا النبي ـ ﷺ ـ فبايَعنا [او بسكون العين] فقال فيما أخذ علينا : ان بايعنا على السمع والطاعة في منشطنا ومكرهنا ، وعسرنا ويسرنا ، وأَثَرة علينا [وبضم فسكون] ، وان لا ننازع الامر اهله الا ان تروا كفرا بواحا [ظاهرا صريحا] عندكم من الله فيه برهان . ح ـ ١٠/ ١٦٢ ، م ـ ٨/ ٣٨ .

[وزاد احمد عنه : وان رايت ان لك في الامر حقا فلا تعمل بذلك الرأي ، بل اسمع واطع الى ان يصل اليك بغير خروج عن الطاعة . وعند ابن حبان عن جنادة : وان اكلوا مالك وضربوا ظهرك قسطلاني]

**تەرجەمە :**

جەنادەی کوڕی ئەبی ئومەییە ئەفەرموێ : چووینە خدمەت عوبادەی بنی صامیت ـ رضي الله تعالى عنه ـ نەخۆش بوو عەرزمانکرد : خوا ئیصلاحت بکا شیفات بدا ! حەدیثێکمان بۆ ریوایەت بکە خوا بەو حەدیثە نەفعت پێ بگەیێنێ ، حەدیثێك کە لە پێغەمەرت ـ ﷺ ـ بیستبێ ، فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ [شەوی عەقەبە] بانگی کردین موبایەعەی لەگەڵ کردین لەو شەرطەدا کە لەگەڵی کردین موبایەعەی لەگەڵ کردین فەرمووی : لەسەر گوێلەئەمرگرتن ، لەسەر ئیطاعەتی ئەمرکردن لە خۆشیمانا ، لە تاڵیمانا ، لە فەرەحیمانا ، لە تەنگانەمانا ، لەوەدا ، خەڵقمان بەسەرا تەرجیح بدرێ ، لەسەر ئەمە کە هیچ مونازەعە لەگەڵ ئەهلی خۆیا نەکەین لەسەر موڵك مەگەر کوفرێکی ئاشکارا ببینین کە لە لای ئێوە کوفرییێتی ئەو شتە ئاشکارا بێ و لە طەرەف خوا ـ عز وجل ـ ەوە دەلیل لەسەر کوفرییێتی ئەوە ببێ وەك نەصی قورئان یا حەدیث [یەعنی ئیشی ئومەرا تەئویل هەڵبگرێ موخالەفەیان حەرامە لە مەعصییەت و کوفرا ئیطاعەیان دروست نییە] .

لە ریوایەتی ئیمامی ئەحمەدا ئەوەی لێ زیادکردوە : ئەگەر لات وابێ کە لە ئیمارەتا تۆیش حەقێکت هەیە بەو رەئیو ئیعتیقادەت عەمەل مەکە تا = پێت ئەگا = بەبێ ئەمە کە لە ئیطاعەت بچییە دەرەوە .

لە ئەحمەدو ئیبن و حیببان لە جەنادەوە ئەو زیادەی هەیە کە : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : با ماڵیشت بخۆن ، با پشتیشت دارکاری بکەن .

٧٥٢/٣٢ عن اسید بن حضیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ان رجلا [اتى النبي ـ ﷺ ـ فقال : یا رسول الله استعملت فلانا ولم تستعملني . . الخ

اخرى خ] من الانصار [هو نفسه] قال : يا رسول الله : الا تستعملني كما استعملت فلانا [قيل : هو عمرو بن العاص ـ رضي الله تعالى عنه ـ] ؟ قال : ستلقون بعدي أُثْرة [وبفتحتين] فاصبروا حتى تلقوني على الحوض . ح ـ ١٤٨/٦ ، ح ـ ١٦٣/١٠ ، ت ، ن .

تەرجەمە :

ئوسەیدی بنی حوضەیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : پیاوێ لە ئەنصار عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ : یا رەسوولەڵڵا فلاّن کەست کرد بە عامیل و منت نەکرد ! فەرمووی : کە لە مەولا چاوتان پێ ئەکەوێ کە خەڵقتان بەسەرا تەرجیح ئەدرێ ، صەبر بکەن تا لەسەر حەوزی کەوثەر بە من ئەگەن[1] .

٧٥٣/٣٣ عن ابي هريرة [رضي الله تعالى عنه] عن النبي ـ ﷺ ـ قال : يقبض العلم ، ويظهر الجهل والفتن ، ويكثر الهَرْج ، قيل : يا رسول الله وما الهرج ؟ فقال هكذا بيده فحرفها ، كانه يريد القتل . ح ـ ١٨٠/١ ، م ـ ١١٢/١٠

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : عیلم وەرئەگیرێتەوە ، جەهل دەرەکەوێ ، فیتنە دەرەکەوێ ، هەرج زۆر ئەبێ . عەرزیان کرد : یا رەسوولەڵڵا هەرج چی یە ؟ بە دەستی موبارەکی ئیشارەتی فەرموو و دەستی وەرگێرا وەك لە شتێ بدا ، (کانە) ئیرادەی قەتلی فەرموو . یەعنی کوشتن زۆر ئەبێ .

(١) لە ریوایەتێکیانا هەندێ زیادە هەیە لێرەدا باسی نەکرد .
ئەمە پوختەکەیەتی :
وتی : ئەی پێغەمەری خوا منیش ناکەی بە کاردار وەك فلاّنت ـ کە رەنگیشە عەمری کوڕی عاص بێ ـ کرد بە کاردار ؟

٧٥٤/٣٤ عن انس [رضي الله تعالى عنه] قال : لاحدثنكم حديثا لا يحدثكم احد بعدي [غيري . اخرى] سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : من اشراط الساعة ان يَقلَّ العلمُ [ان يرفع العلم ويثبت الجهل . اخرى] ويظهر الجهل ، ويظهر الزنا ، وتكثر النساء ، ويقل الرجال حتى يكون لخمسين امرأة قيم واحد . ح ـ ١/١٧٧

تەرجەمە :

ئـەنەس ـ رضي الله تعـالى عنه ـ فـەرمووی : حـەدیثێكتان بـۆ ریوایەت ئەكەم كە لە دوای من [لە ریوایەتەكەی ترا : غەیری من] كەس ئەو حەدیثـەتان بـۆ ریوایـەت ناكـا . لە پێغـەمەر ـ ﷺ ـ م بیست كـە ئەیفەرموو : لە ئەشراطی ساعەتە كە : عیلم كەم ئەبێ جەهل [ثابیت ئەبێ] ظاهیر ئەبێ ، زینا ئاشكارا ئەبێ ، ژن زۆر ئەبێ تا وای لێ ئێ كە پەنجا ژن یەكێك ئەبێ كە بەسەریانەوە بگەڕێ و ئیشیان جێ بەجێ بكا ، چاوەنواریان بكا .

غەیری ژنزۆربوون بەو دەرەجەیە تـەحەقـوقی كردوە ، ژنیش دەستی كردوە بە زۆربوون ، پیاویش لە كەمی یایە .

٧٥٥/٣٥ عن ابي هريرة [رضي الله تعالى عنه] عن النبي ـ ﷺ ـ قال : يتقـارب الزمـان ، ويلقى الشحّ [البخـل] ، وتـظهـر الفتن ، ويكـثر الهرْج ، قالوا : يا رسول الله ايُّمَ [اى شيٌ هو] ؟ قال : القتلَ ، القتل . ح ـ ١٠/١٦٦ ، م ـ ١٠/١١٢

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : زەمان لێك نزیك ئەبنەوە .

[ئەمە گەلێ مەعنای لێدراوەتەوە :

١ ـ شەوو رۆژ بەرابەر ئەبێ بە دائیم .
٢ ـ قیامەت نزیك ئەبێ .
٣ ـ شەوو رۆژ كورت ئەبنەوە .
٤ ـ شەرو فەساد یەك لەدوای یەك یێن .
٥ ـ دەوڵەتان زووزوو مونقەریض ئەبن .
٦ ـ عومر كورت ئەبێتەوە] .

بەخیلی ئەخرێتە دڵی خەڵقەوە [ئێستە وایە] فیتنە زۆر ئەبێ ، هەرەج زۆر ئەبێ . عەرزیان كرد : هەرەج چی‌یە ؟ فەرمووی : كوشتنە ، كوشتنە . [هەمووی مەوجوودە] .

٧٥٦/٣٦ عن الزبير بن عديّ قال : أتينا انس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ فشكونا اليه ما يلقى من الحجاج ، فقال : اصبروا فانه لا يأتي عليكم زمان الا الذي بعده شرٌ منه حتى تلقوا ربّكم ، سمعته من نبيكم ـ ﷺ ـ ح ـ ١٦٨/١٠ ت

تەرجەمە :

زوبەیری بنی عەدیی ئەفەرموێ : هاتینە خدمەت ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ شكاتی ئەوەمان لا كرد كە لە حەجاجەوە گرفتاری بووین ، فەرمووی : صەبر بكەن هیچ زەمانێ نی‌یە كە بێت و زەمانی دوای ئەو لەو خراپتر نەبێ ، لە پێغەمەرم[1] بیست ـ ﷺ ـ .

---

(١) بە گوێرەی (سمعته من نبيكم) دەبوو بینووسیایە : (لە پێغەمەرتانم بیست) .

٧٥٧/٣٧ عن ابي هريرة [رضي الله تعالى عنه] عن النبي ـ ﷺ ـ قال : لا يشير احدكم على اخيه بالسلاح ، فانه لا يدري لعل الشيطان ينزع في يده فيقع في حفرة من النار . ح ـ ١٠/١٦٩ ، م ـ ١٠/٥٣ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : هیچ کەسێ لە ئێوە بە سیلاح ئیشارەت نەکاتە برای دینی خۆی ، نازانێ بەڵکە شەیطان لە دەستی ئەترازێنێ لە برای دینییەکەی ئەکەوێو بەو واسیطە ئەکەوێتە چاڵێکی ئاگرەوە . [وقووعی بوە] .

٧٥٨/٣٨ عن ابي الاسود قال : قطع [افرد] على اهل المدينة بعث [جيش] فاكتتبت فيه ، فلقيت عكرمة [مولى ابن عباس ـ رضي الله عنهما ـ] فاخبرته ، فنهاني اشد النهي ، ثم قال : أخبرني ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ان اناسا من المسلمين كانوا مع المشركين يكثرون سواد المشركين على رسول الله ـ ﷺ ـ فيأتي السهم فيرمى فيصيب احدهم فيقتله ، او يضربه فيقتله . فانزل الله ـ تعالى ـ : ﴿ان الذين توفاهم الملائكة ظالمي انفسهم﴾(١) . ح ـ ١٠/١٧٧ ن ، م ـ ٧/٩٠ .

تەرجەمە :

ئەبولئەسوەد ئەڵێ : لە ئەهلی مەدینەبۆ شەڕکردن لەگەڵ ئەهلی شام بۆ موعاوەنەتی (ابن الزبير رضي الله تعالى عنهما) لەشکرێ جوێکرایەوە . من لەو لەشکرەدا نووسرام . تووشی عەکرەمەی مەولای ئیبنوعەباس بووم ـ رضي الله تعالى عنهما ـ خەبەرم دایێ ، نەهییێکی زۆر بە شیددەتی لێکردم . وتی : ئیبنوعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ خەبەری داومێ : کە بەعزێ کەس لە موسوڵمانان لە ناو

(١) سوورەتی : نیساء ، ئایەتی : ٩٧ .

موشريكين بوون ، ئێشتا هيجرەتيان نەكردبوو ، لەشكرى موشريكانيان زۆر ئەكرد كە شەر بكەن لەگەڵ پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ . لە غەزاى بەدرا لەگەڵ موشريكەكان هاتن . ئەمما بۆيە نەبوو كە خۆيان لەگەڵ پێغەمەرا ـ ﷺ ـ حەرب بكەن ، هەر بۆيە بوو كە موشريكەكان لە پێش چاوى موسوڵمان زۆر بكەن . لە طەرەف موسوڵمانانەوە تير ئەهاوێژ را لە يەكێكيان ئەكەوت ئەيكوشت . يا موسوڵمانێ بە شير لێى ئەدا ئەيكوشت . خوا ـ عز وجل ـ ئەم ئايەتەى نازڵ كرد : ئەوانە كە مەلائيكە قەبضى رۆحيان ئەكاو بەزۆركردنى لەشكرى كوففار لە پێش چاوى موسوڵمانانا ظوڵميان لە خۆيان كردوە . . مەلائيكەكان پێيان ئەڵێن : ئێوە لە چيا بوون ؟ يەعنى موسوڵمان بوون يا كافر بوون ؟ بۆچى لەشكرى كافرانتان زۆر كرد ؟ بۆ هيجرەتتان نەكرد ؟ بە مەلائيكەكان ئەڵێن : لە ئەرزا ضەعيف بووين نەمانتوانى موعاوەنەتى موسوڵمانان بكەين . مەلائيكەكان پێيان ئەفەرموون : ئەرزى خوا واسيع نەبوو كە هيجرەتى تيا بكەن ؟ ئەو موسوڵمانانە مەئوايان جەهەنمە . چ مەنزڵێكى خراپە كە ئەيچنێ ؟ ! يەعنى لەسەر ئەمە كە هيجرەتيان نەكردوە موعەذەب ئەبن .

مەقصوودى عەكرەمە وايە : ئەو موسوڵمانانە كە تەكثيرى سەوادى كافرانيان كردوە مەقصووديان وا نەبوە كە لەگەڵ ئيسلاما حەرب بكەن موعەذەب بىن ئێوەيش با مەقصوودتان حەرب نەبێ ، چونكە لەشكرى ئەهلى فيتنە زۆر ئەكەن موستەحەقى عەذاب ئەبن . ئەمما ئەم دوو مەسئەلەيە لەيەك جوێن . ئەمان لەشكرى عەبدوڵلاى كورى زوبەير زۆر ئەكەن ، لەگەڵ غاصيبى خيلافەتا حەرب ئەكەن .

قیاسی فیرقەی باغی یە لە پێغەمەرو ئەصحابی ـ ﷺ ، ورضي الله عنهم ـ قیاسی (ابن الزبیر) ـ رضي الله تعالى عنه ـ کە ئەووەڵ مەولوودێکە لە ئیسلاما بوە لە دوای هیجرەتو ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە دەستی موبارەکی و بە تفی موبارەکی گۆشی کردوە . . لە موشریکینو کوففاری قورەیش ، ئەمجا خاریجیێکی وەك عەکرەمە ئەتوانێ بیکا ؟ !

حەدیثەکەی راستە ئیبنو عەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لە تەفسیری ئایەتەکەدا سەبەبی نوزوولی بەیان کردوە . حادیثەکە لە وەقعەی بەدرا بوە ، ئیبنو عەباس ئەو وەختە منالّ بوە لای دایکی بوە ، حاضری وەقعە نەبوە تەفسیرەکەی مورسەلی صەحابی یە . تا لە پێغەمەر ـ ﷺ ـی نەبیستبێ وای تەفسیر نەکردوەتەوە .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ دوّعای بوّ فەرموە : (اللهم علمه الكتاب ، اللهم فقهه في الدين)ی فەرموە . ئەمما ئیستیعمالی ئەو حەدیثە لەو مەوقیعەدا خەطاییێکی عەظیمە ! ح ـ ١/ ١٧١ ، ح ـ ١/ ٢٢٩ . حەججاجی بنی یوسفو شەددادی بنی عەبدولمەلیك چوّن قیاس ئەکرێن لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ؟ !

٧٥٩/٣٩ عن سلمة بن الأكوع [رضي الله تعالى عنه] انه دخلَ على الحجاجِ ، فقال : يا ابن الأكوع ! ارتددت على عقبيك تعربت ! [ما اساء ادبه مع فارس رسول الله ـ ﷺ ـ الذي هو من شجعان الصحابة ؟ !] قال : لا ، ولكن رسول الله ـ ﷺ ـ اذن لي في البدو .

وعن يزيد بن ابي عبيد [مولى سلمة] قال : لما قتل عثمان بن عفان ـ رضي الله تعالى عنه ـ خرج سلمة بن الأكوع الى الربذة ، وتزوج هناك امرأة وولدت له اولادا ، فلم يزل بها حتى أقبل قبل ان يموت بليالٍ ،

فنزل المدينة . ح ـ ١٠/١٧٨ ن م ـ ٨/٦٠ في المغازي ، لكن الجزء الاول منه ، ولم اصادف الجزء الثاني من مسلم هناك .

**تەرجەمە :**

(سلمه بن الاكوع ـ رضي الله تعالى عنه ـ) ئەفەرموێ : چوومە لای حەجاجی بنی یوسف لە دوای شەهادەتی (ابن الزبیر) ـ رضي الله تعالى عنهما ـ کە بوو بە ئەمیری حیجاز . وتی : (یا ابن الاکوع) پاشەوپاش لەدین وەرگەراوی بووی بە بادیە نشین ! فەرمووی : خەیر وەرنەگەراوم ، ئەمما پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئیذنی داوم کە لە بادیەدا ئیقامەت بکەم .

یەزیدی بنی عوبەیدی مەولای سەلەمە ـ رضي الله عنه ـ ئەڵێ : کە ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ شەهیدکرا . . سەلەمە ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە مەدینە تەشریفی چوو بۆ رەبذە ـ کە دێیەکە لە بەینی مەکەو مەدینەدایە ـ لەوێ ژنی هێناو منالی لێی بوو . تا چەند رۆژێ لە پێش وەفاتیا تەشریفی عەودەتی کردەوە بۆ مەدینە .

**٤٠/٧٦٠** عبدالله بن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ عن النبي ـ ﷺ ـ انه قام الى جنب المنبر [وفي اخرى م ـ ١٠/٣٦٧ عند باب حفصة . وفي اخرى م ـ ١٠/٣٦٧ عند باب عائشة ـ رضي الله تعالى عنهما] فقال : الفتنة ههنا [وفي اخرى : راس الكفر ههنا . (ئەساسی کوفر لەوێوەیە) .] من حيث يطلع قرن الشيطان ، او قال قرن الشمس . [شك الراوي] . ح ـ ١٠/١٨٠ ، م ـ ١٠/٣٦٦ .

**تەرجەمە :**

پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی لای مینبەرەوە راوەستابوو ، دوو دەفعە فەرمووی : فیتنە لێرەوەیە ، فیتنە لێرەوەیە . ئەو جێیەی کە شاخی شەیطانی لێ هەڵیێ . یا فەرمووی : شاخی رۆژی لێ هەڵیێ ، چونکی رۆژپەرست کە رۆژ هەڵهات سوجدەی ئەبەنە بەر ، ئیطاعەی ئەمری شەیطان ئەکەن ، (کانە) شاخی شەیطانی لێ‌هەڵهاتوە .

٧٦١/٤١ عن ابي وائل قال : قيل لأسامة : الا تكلم هذا ؟ [يعني عثمان بن عفان - رضي الله تعالى عنهما - في توليه اقاربه الاموية ، وفي شأن أخيه لأمه الوليد بن عقبة وغير ذلك . . . مما انكر الناس عليه] قال : قد كلمته ما دون ان افتح بابا اكون اول من يفتحه ، وما أنا بالذي اقول لرجل بعد ان يكون اميرا على رجلين : انت خير ، بعدما سمعت من رسول الله - ﷺ - يقول : يجاء برجل فيطرح في النار ، فيطحن فيها كطحن الحمار برحاه [معلوما ومجهولا] فيطيف به اهل النار فيقولون : اي فلان الست كنت تأمر بالمعروف وتنهى عن المنكر ؟ فيقول : انى كنت آمر بالمعروف ولا افعله ، وانهى عن المنكر وافعله . ح - ١٠/١٨٤ ، م - ١٠/٤٣٢ سبق في صفة النار . قسطلانى : فتندلق اقتابه بطنه [فتخرج امعاؤه] فيدور بها كما يدور الحمار بالرحى فيجتمع اليه . م

تەرجەمە :

ئەبو وائیل ئەڵێ : عەرزی ئوسامەی کوڕی زەیدی خۆشەویستی پێغەمەر - ﷺ ورضي الله عنهما - کرا بۆ قسە ناکەی لە خدمەت ئیمامی عوثمانا - رضي الله تعالى عنه - [کە هەر کەس و کاری خۆی لە بەنی ئومەیی یە ئەکا بە ئەمیر ، وەلیدی برای دایکیی ئەو شەرابی خواردوەتەوە داری حەدی لێ نادا ؟ هەم بۆ خوصووصی تریش کە خەڵق لێی بەگلەیین ؟] فەرمووی : قسەم بە سیرِی لە خدمەتیا کردوە بێ ئەمە

کە دەرگایێ لە فیتنە بکەمەوە کە ئەوڵ کەسێ بم کە ئەو دەرگایە بکاتەوە ، منیش ئەو کەسە نیم کە بە کەسێ کە بکرێ بە ئەمیری دوو کەس بڵێم : لە خەڵق چاکترە ، لە دوای ئەوەی کە لە پێغەمەرم بیست ـ ﷺ ـ ئەیفەرموو : پیاوێ یێنرێ فرێ ئەدرێتە ناو ئاگرەوە ئەهاڕرێ وەك چۆن کەر ئاش ئەگێڕێ تۆشتی پێ هاڕرێ (!) ئەویش وەك ئەو شتە لە ئاگرا ئەهاڕرێ .

یا مە عنای : ئەهاورێتە ناو ئاگرەوە شت ئەهاڕێ وەك چۆن کەر ئاشێ ئەگێڕێ ئەسووڕێتەوە بە دەوری ئاشەکەدا ئەمیش بەو نەوعە یا ئەهاڕێ یا ئەهاڕرێ . ئەم مەعنایە موافیقی لەفظی موسلیمە کە ئەفەرموێ : ورگی ئەدڕێ ریخۆڵەو ناوزگی دەردەپەڕێ لە جەهەننەما ئەیسووڕێنێتەوە وەك کەر ئاش ئەگێڕێ .

ئەو کەسە خەڵقی ناو جەهەننەم دەورەی ئەگرن لێی ئەپرسن : ئەی فلان تۆ لە دنیادا ئەمرت بە چاکەو نەهیت لە خراپە نەدەکرد ؟ یەعنی بۆچ ئەم حاڵەت بەسەرا هاتوە ؟ ئەڵێ : لە دنیا ئەمرم بە چاکە ئەکردو نەمەکرد . نەهیم لە خراپە ئەکردو کەچی خۆم ئەمکرد !

موناسەبەی ئەم قسەی ئوسامە بە موعامەلەی ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنهما ـ چی یە ؟ جوابه محول الى (سلام) ـ سلمه الله ـ فليكتبه هنا[1] .

**٧٦٢/٤٢ عن ابي بكرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : لقد نفعني الله بكلمة ايام الجمل، لما بلغ النبي ـ ﷺ ـ ان فارسا ملّكوا ابنة كسرى [شيرويه بن خسرو پرويز ، بن هرمز . اسمها بوران] قال : لن يفلح قوم ولوا امرهم امرأة ح ـ ١٠/١٨٥**

---

(١) ئەم شوێنەی کە بۆ مامۆستا مەلا سەلامی بڕداوە وەك خۆی ماوەتەوە .

ولفظه في ، ح ـ ٦/٤٤٩ : قال : لقد نفعني الله بكلمة سمعتها من رسول الله ـ ﷺ ـ ايام الجمل ، بعدما كدت ان الحق باصحاب الجمل ، فاقاتل معهم ، قال : لما بلغ رسول الله ـ ﷺ ـ ان فارسا قد ملّكوا عليهم بنت كسرى [بوران بنت شيرويه ، بن خسرو پرويز] قال : لن يفلح قوم ولوا امرهم امرأة . ح ـ ٦/٤٤٩ .

وذلك ان شيرويه [طمع في شيرين زوج ابيه خسرو] فقتل اباه وقتل اخوته ، وعلم خسرو ان العامل في قتله ابنه ، واراد ان يقتله قبل موته ، فعمل حقا كتب عليه : «حق الجماع ، من تناول منه كذا جامع كذا» ، فقرأه شيرويه فتناول منه ، فلم يعش بعد ابيه الا ستة اشهر ، فلما مات لم يخلف اخا ، وليس له ولد ذكر ، وكرهوا اخراج الملك عن ذلك البيت فملّكوا اخته . معجزة للنبي ـ ﷺ ـ لما مزّق كتابه ـ عليه الصلاة والسلام ـ قسطلاني .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ کاغەذی بۆ پادشای ئەطراف و ئەکناف ئەنووسی ، دەعوەتی ئەکردنە سەر ئیسلامەتی ، کاغەذیشی بۆ خوسرەوی پەرویز نووسی . دەستی شکێ کاغەذەکەی دران ! پێغەمەر ـ ﷺ ـ دۆعای لێ‌کرد ، فەرمووی : خوایا ئەوانیش پارچە پارچە بکە ! شێرۆی کوڕی خوسرەویش حەزی لە شیرینی باوەژنی خۆی کردبوو ! ئەوان مەجووسی بوون کچ و خوشك و ژنی باوکیان مارەئەکرد لە خۆیان . تا خوسرەویش بمایە شیرین و موڵکی باوکی دەست شێرۆ نەدەکەوت . باوك و براکانی خۆی کوشت ! خوسرەو لە پێش مردنیا فەرقی بەوە کرد کە بە دەسیسەی شێرۆ کوژراوە . بۆ ئینتیقام قوتوویەکی بە دروستکردن دا ، پڕی کرد لە زەهر ، سەری نایەوە و لە سەری نووسی : قوتووی جیماع ،

هەرکەسێ ئەوەندەی لێ بخوا ئەوەندە جیماعە ئەکا . شیرو کە خەزانەی باوکی گەڕا ئەو قوتوەی کەوتە بەرچاو ، لێی خوارد ، شەش مانگ دوای باوکی ژییا . ئەویش چوە لای باوکی ، تاجی ئاگری نایەسەرو لەسەر تەختی ئاگر لە جەهەننەما دانیشت . نێرینەیان نەما بیکەن بە پادشـا . بۆرانی خوشکی شیرۆیان کرد بە پادشا . ئەم خەبەرە بە پێغەمەر ـ ﷺ ـ گەیی ، فەرمووی : قەومێ ئیشی موڵکیان تەسلیم بە ژن بکەن و بیکەن بە سەرداری خۆیان ئەو قەومە فەلاحی نابێ .

ئەبوبەکرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ . ئەم فەرموودەی پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە (وەقعەی جەمەل)ا کە حەزرەتی عائیشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ بوو بە سەرکردەی ئۆردوو لەگەڵ ئیمامی عەلی یا ـ رضي الله تعالى عنه ـ حەرب بکا نەفعی پێدام لە دوای ئەمە کە نزیك بوو منیش ئیلتیحاق بکەم بە حەزرەتی عایشە بۆ حەربی ئیمامی عەلی ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئـەم فەرمـوودەی پێغەمـەرە ـ ﷺ ـ منی لەوە گێـڕایەوە ، چونکی زانیم کە حەزرەتی عایشە موەففەق نابێ .

٧٦٣/٤٣ عبدالله بن زياد الاسـدي قال : لما سار طلحة والزبـير وعائشة [رضي الله تعالى عنها وعنهما] الى البصرة بعث عليّ عمار بن ياسر وحسن بن علي [رضي الله تعالى عنهم] فقدما علينـا الكوفـة ، فصعدا المنبر ، فكان الحسن بن علي فوق المنبر في اعلاه ، وقام عمار اسفل من الحسن ، فاجتمعنا اليه ، فسمعت عمارا يقول : ان عائشة [رضي الله تعالى عنها] قد سارت الى البصرة ، ووالله انها لزوجة نبيكم ـ ﷺ ـ في الدنيا والآخرة ، ولكن الله ـ تبارك وتعالى ـ اِبتلاكُم ليعلم اياه تطيعون ام هي ؟ [رضي الله عنها وعنهم اجمعين] ح ـ ١٨٦/١٠ .

تەرجەمە :

عەبدوڵلای بني زیادی ئـەسەدیی : کـە طەلحـەو ، زوبەیـرو ، عائیشه - رضي الله تعالی عنهم - چوون بۆ بەصرە ئیمامی عەلی عەمارو حـەسەنی کـوڕی خۆیی نارد [بۆ کـووفە کـە خەڵق کـۆبکـەنـەوە بـۆ موعاوەنەتی] تەشریفیان هاتنە لای ئێمە بۆ کۆفە ، تەشریفیان سەرکەوتنە سەر مینبەر . حەزرەتی حەسەن - رضي الله تعالی عنه - لەسەر مینبەرەکە لای سـەرووەوە بـوو ، حـەزرەتی عـەممار لای خـوارووی حـەزرەتی حەسەنەوە راوەستا ، ئێمەیش لێی کۆبووینەوە ، گوێم لێ بوو عـەممار ئەیفەرموو : حەزرەتی عائیشە تەشریفی چوە بۆ بەصرە بۆ حەرب لەگەڵ ئیمامی عەلیدا . وەڵلاهی حەزرەتی عائیشە ژنی پێغەمەری ئێوەیە - صلی الله تعالی علیه وسلم - لە دنیاو ئاخیرەتا [یەعنی بـەخورووجی لـەسەر ئیمامی عەلی لە ژنێتی پێغەمەر - ﷺ - ناکەوێ] . ئەمما خوای - تەبارەك وەتەعالا - ئێوەی موبتەلا کردوە تاکوو بە علیمی حاڵی لێی مەعلووم ببێ کە تابیعی خوا ئەبن - یەعنی بەمە کە موعاوەنەتی ئیمامی عەلی بکەن - یا تابیعی حەزرەتی عائیشە ئەبن ؟

[کە ئیمامی عوثمان - رضي الله تعالی عنه - شەهید کرا حەزرەتی عائیشە تەشریفی لە مەککە بوو ، خەڵقیش بەیعەتیان بە حەزرەتی عەلی کـردبوو ، طـەلحـەو زوبـەیـریش لـەوانـە بـوون کـە بـەیعـەتیـان پێ کردبوو . ئیذنیان لێ خواست بۆ عومرە چوون بۆ مـەککە ، حـەزرەتی عـائیشە خـەبەری شـەهیدبـوونی ئیمامی عـوثمانی پێگـەیی . خەڵقی تەرغیبو تەشویق کرد بۆ خوێنی ئیمـامی عوثمـان : طەلحـەو زوبەیر مولاقاتیان کرد لەگەڵ حەزرەتی عائیشە ، ئەوانیش ئیتیفاقیان لەگەڵا کرد بـۆ خوێنی ئیمـامی عوثمـان تا قـاتیلەکان بکـوژن ، حەزرەتی عـائیشە وشترێکی لە پیاوێکی عورەینە کڕی بە دووصەد دینار ، ناوی عەسکەر

بوو . حەزرەتی عائیشە سواری ئەو وشترە بوو ، بۆیە پێی ئەڵێن (وەقعەی جەمەل) لە مەککەو مەدینە سێ هەزار کەس تابیعی بوون ، طەلحەو زوبەیریش لە خدمەتیا بوون ، حەرەکەتیان کرد بۆ بەصرە سەر ئیمامی عەلی ، کە گەیینە ئاوی حەوئەب سەگی ئەوێیان پێ وەڕی . حەزرەتی عائیشە پرسی : ئەم ئاوە چە ئاوێکە ؟ عەرزیان کرد : کە ئاوی حەوئەبە . فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ رۆژێ بە ئێمەی فەرموو ـ یەعنی ئەزواجی طاهیرات ـ چۆنە یەکێ لە ئێوە سەگی حەوئەبی پێ بوەڕێ ؟

بەزار لە حەدیثی ئیبن و عەباسەوە : کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە ئەزواجی طاهیراتی فەرموو : ئێوە کامتان صاحیبی جەمەلی (اَدْبَبن !) . . . خورووج ئەکا تا سەگی حەوئەبی پێ ئەوەڕێ ، لای راستو چەپیەوە زۆر کەس ئەکوژرێ ، نزیك ئەبێ کە خۆیشی بکوژرێ ، نەجاتی ئەبێ .

ئیمامی عەلیش لە مەدینەوە لەگەڵ نۆصەد سوارا تەشریفی چوو بۆ بەصرە ، کە گەیی یە بەصرە قەیسی بنی قەیسی بنی عوببادو عەبدوڵلای بنی کەواء عەرزیان کرد : کە خەبەری هاتنی خۆتمان بدەرێ ، لە دوای قسەیێکی دوورو درێژ بەحثی لە طەلحەو زوبەیر کرد ، فەرمووی : لە مەدینە بەیعەتیان پێکردم لە بەصرە لێم هەڵگەڕانەوە .

لە ریوایەتی ئیبن و لەیلادا ئەفەرموێ : کە ئیمامی حەسەن ـ رضي الله تعالى عنه وعنهم ـ فەرمووی : کە حەزرەتی عەلی ئەفەرموێ : خوا بێنمەوە فیکری ئەو پیاوەی کە بە تەواوی ریعایەتی ئەمری خوا بکا کە هیچ کەس فیرار نەکا ئەگەر مەظڵووم بم خوا موعاوەنەتم ئەکا ، ئەگەر ظاڵم بم خوا لە موعاوەنەت مەحروومم ئەکا . وەڵلاهی طەلحەو زوبەیر ئەوەڵ کەسێ بوون کە بەیعەتیان پێکردم کەچی عەهدو پەیمانیان شکان بێ ئەمە

کە من ماڵێ بۆ خۆم تەخصیص بکەم ، یا حوکمێکی ئیلاهی بگۆڕم بەوە دوانزە هەزار کەس تابیعی بوون .

٧٦٤/٤٤ عن ابي وائل شقيق بن سلمة قال : كنت جالسا مع ابي مسعود وابي موسى وعمار [رضي الله تعالى عنهم] حيث بعثه علي الى اهل الكوفة [يستنفرهم . أخرى خ] فقال ابو مسعود [لعمار] : ما من اصحابك احد الا لو شئت لقلت فيه غيرَك ، وما رأيت منك شيئا منذ صحبت النبي - ﷺ - اعيب عندي من استسراعك في هذا الامر . قال عمار : يا ابا مسعود وما رايت منك ولا من صاحبك هذا شيئا منذ صحبتما النبي - ﷺ - اعيب عندي من ابطائكما في هذا الأمر .

[تعييب ابي مسعود عمارا للاحاديث التي في حمل السلاح على الأخ المسلم . وتعييب عمار ابوي موسى ومسعود لتركهما نصر الامام الحق على البغاة والخارجين على الجماعة ، ومخالفة ﴿فقاتلوا التي تبغى﴾[1]] فقال ابو مسعود ـ وكان موسرا ـ : يا غلام ! هات حلتين ، فأعطى احداهما ابا موسى والاخرى عمارا ، وقال : روحا فيه الى الجمعة .

ح - ١٠/١٨٧

تەرجەمە :

شەقیق ئەڵێ : کە حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەمماری نارده لای خەڵقی کووفە کە بیان هێنێتە دەرێ بۆ حەربی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ لای ئەبوو مەسعوودو ، ئەبو مووساو ، عەممار دانیشتبووم . ئەبو مەسعوود بە عەمماری وت : ئەگەر هەوەسم بێنێ غەیری تۆ هیچ کەسێ نی‌یە لە ئەصحابی تۆ کە نەتوانم عەیبێکی لێ دەربهێنم . تۆ لەو

(١) ئایەتی (٩) سوورەتی (حجرات) .

وەختەوە کە صوحبەتت لەگەڵ پێغەمەرا کردوە ـ ﷺ ـ هیچ شتێکم لێ نەدیوی کە لە لای من عەیبتر بێ لەوە کە لەم ئیشەدا عەجەلەت کرد ، چونکە بەرەورووی موسوڵمانـان سیلاح دەرکێشـان حەرامـەو پێغەمـەر ـ ﷺ ـ نەهی لێ کردوە . عەممار فەرمووی : ئەی ئەبـو مەسعـوود لەو وەختەوە تۆو رەفیقەکەت کە ئەبو مووسایە صوحبەتی پێغەمەرتان کردوە ـ ﷺ ـ هیچ شتێکم لێ نەدیون کە لە لای من عەیبتر بێ لەوە کە لەم ئیشەدا سستێتیتان کرد کە نوصرەتی ئیمامی حـەقتان نـەدا کە لـەگەڵ فیـرقەی باغیەدا شەڕ ئەکاو موخالەفەتی ئایەتی : ﴿وان طائفتـان من المؤمنین﴾[1] تان کرد . ئەبو مەسعوود دەوڵەمەند بوو فەرمووی : ئەی غولام ! دوو دەست لیباس بێنە ، دەستێکی دا بـە عەممـارو دەستێکیشی دا بە ئـەبو مووسا ، فەرمووی : پێوە بچن بۆ جومعە . رۆژی جومعە بوو .

[عەلای بنی محەمەد لە باوکی یەوە ریوایەت ئەکا : ئیمامی عەلی لە زاویەدا بوو ، پیاوێ هاتەخدمەتی وتی : لەسەر چی شەڕ لەگەڵ ئەمانە ئەکەی ؟ فەرمووی : لەسەر حەق . وتی : ئەوانیش ئەڵێن : کە خۆیان لەسەر حەقن ! فەرمووی : لەسەر ئەوە شەڕیان لەگەڵ ئەکەم کە لە جەماعەت جوێبوونەوە بەیعەتیان هەڵوەشانوە .

طـەبەرانی ئـەڵێ : ئەوەڵی حـەرب کە واقیـع بوو منـاڵی هەردوو طەرەف دەستیان کرد بە جوێندان بە یەکتری و تیرهاویتن بۆ یەکتری . لە دوایی یـا عەبـدو بێ عەقڵەکـانیان دەستیـان پێکـرد ، ئـاگـری حـەرب هەڵگیرسا . ئەصحابی عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ خەنـدەقیان بـە دەوری بەصرەدا هەڵکەنـدبوو ، بـەعزێکیـان کوژران ، بـەعزێکیـان هاتنەدەرێ . ئەصحابی ئیمامی عەلی غاڵب بوون . مونادیێ بـانگی

(١) سوورەتی (حجرات) ئایەتی (٩) .

کرد : شوێن ئەوە مەکەون کە پشتی هەڵکردوە ، بریندار مەکوژن ، مەچنەماڵی هیچ کەسێ . . . لە دواییدا خەڵقی کۆکردەوەو بەیعەتیان پێکرد . ئیبن و عەباسی کرد بە ئەمیری بەصرەو خۆی گەڕایەوە بۆ کووفە .

لە عەبدورەحمانی کوڕی ئەبزارەوە ریوایەت ئەکەن ، کە عەبدوڵلای کوڕی بودەیل لە دوای غاڵب بوون چووە خزمەت حەزرەتی عایشە ، حەزرەتی عایشە لە کەژاوەدا بوو عەرزی کرد : ئەی (ام المؤمنین) ئەزانی کە لەو وەختەدا ئیمامی عوثمان شەهیدکرا هاتمە خدمەتت عەرزم کردی : ئەمرم بە چی پێ ئەکەی ؟ فەرمووت : لە عەلی جوێمەبەرەوە . حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ سوکووتی کرد . عەبدوڵلای کوڕی بودەیل وتی : وشترەکە سەرببڕن ، سەریان بڕی . من و محەمەدی برای حەزرەتی عایشە دابەزین کەژاوەکەمان هەڵگرت و بردمان لە بەردەمی ئیمامی عەلیمان دانا ، ئەمری کرد بردیان لە ماڵێکا دایان نا .

ئەحنەف ئەڵێ : ئەوەڵ کەسێ کە لە لەشکری حەزرەتی عایشەدا شەهید بوو طەلحە بوو . زوبەیریش هەرای کرد لە (وادی السباع) ا شەهید کرا . طەلحە تیرێکی (لاعیە)ی بۆ هات بردیانە بەصرە لەوێ وەفاتی کرد .

لە وەقعەی جەمەلا ـ ئەڵێن ـ دە هەزار لە طەرەفەین نیواونیو شەهید کرا . بەعزێ ئەڵێن : تەنها لە لەشکری عایشە سێنزە هەزار ، لە لەشکری حەزرەتی عەلی هەزار کەس شەهیدکران . بەعزێك ئەڵێن : لە بەصرە دە هەزار ، لە کووفە پێنج هەزار . (والحاصل) لە طەرەفەین زۆر شەهید کرا ـ رضي الله تعالى عن الجميع ـ .

طەلحە ـ رضي الله تعالى عنە ـ لە غەزای ئوحودا دەستی خۆی کرد بە قەڵغان موحافەظەی پێغەمەری پێکرد ـ ﷺ ـ .

زوبەیر ـ رضي الله تعالى عنە ـ حەواریی پێغەمەرە ـ ﷺ ـ بێ ئەمە لەگەڵ ئیمامی عەلیدا شەڕ بکەن هەردوکیان گەڕانەوە ، هەردوکیان شەهید بوون .

حەزرەتی عائیشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ یش لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ یان پرسی : کێت خۆشەوێ ؟ فەرمووی : عایشە . وتیان : لە پیاوان ؟ فەرمووی : باوکی عایشە .

ئیمامی عەلی ـ رضي الله تعالى عنە ـ پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە خەیبەرا فەرمووی : سبەینێ بەیداخەکە ئەدەم بە کەسێ خواو پێغەمەری خۆش بوێو خواو پێغەمەریش ئەویان خۆش بوێ . بەیداخەکەی دا بە ئیمامی عەلی .

(ان شاء الله) لە مەناقیبا فەضائیلی ئەصحاب مەعلووم ئەبێ کە هەموویان مەحبووبی خوان ، لە عەیب بەرین . ـ رضوان الله علیهم ـ .

وەقایعی بەینی صەحابە قسەلێنەکردنی باشە . وەقعەیێکی رابوردوە ، نەشری لە بەینی عەواما زەرەری هەیەو فائیدەی نی یە . دەخلی بەسەر دینەوە نی یە ، دەخلی بەسەر حەدیثەوە نی یە ، چونکی لام وایە هەرچی لە دوای وەفاتی پێغەمەر ـ ﷺ ـ بووبێ حەدیث نی یە . نە قەولی یە ، نە فیعلی یە ، نە تەقریری یە ، نە حادیثەیێکە مەنسووب ببێتە ئەلای زەمانی سەعادەتو ، مەصلەحەت وایە ئەم نەوعە قسانەی لێدەرێنن . ئەمما چونکی ئیلتیزامی تەرجەمەی بوخاریم کردوە نووسیومە .

٧٦٥/٤٥ عن ابي بكرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : اخرج النبي ـ ﷺ ـ ذات يوم الحسن فصعد به المنبر ، فقال : ابني هذا سيد ، ولعل الله ان يصلح به بين فئتين من المسلمين ح ـ ١٢٨/٦٧/٦ صدق رسول الله ـ ﷺ ـ فوقع كما قال .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ رۆژێ حەزرەتی حەسەنی ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە ماڵ بردە دەرێ سەری خستە سەر مینبەری نەبەویی ، فەرمووی : ئەم کوری منە سەییدە ، گەورەیە . ئومێدم وایە کە خوا بە واسیطەی ئەمەوە صوڵح بخاتە بەینی دوو فیرقەی موسوڵمانانەوە .

ئەم حەدیثی پێغەمەرە ـ ﷺ ـ صەریحە لەوەدا کە وەقعەی بەینی موعاویەو عەلیو عائیشە ـ رضي الله تعالى عنهم ـ حەزرەتی عائیشەی مەحبووبەی پێغەمەر ـ ﷺ ـ ورضي عنها ـو موعاویە لەمەوە کە خورووجیان لەسەر ئیمامی عەلی کردو حەربیان لەگەڵا کرد . . لە دین پێی ناچنە دەرەوە پێیشی گوناهبار نابن .

ئەبوبەکەرە : بەکەرە : چەرخی بیرە کە ئاوی پێ هەڵەهێنجن لە بیر . ناوی نوفەیعەی کوری حەرثی کوری کەلەدەیە . لە موحاصەرەی طائیفا خۆی بەو چەرخەدا لە قەلعەی طائیف داهێشتە خوارێ . هاتە خدمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ بۆیە ناونرا بە ئەبوبەکەرە . ـ رضي الله تعالى عنه ـ زۆر موحیببی ئەهلی بەیت بوە . لە حەربی بەینی صەحابەدا بێطەرەف بوە .

عن ابي موسى[1] [اسرائيل بن موسى البصري] قال : سمعت الحسن [البصري] يقول : استقبل والله الحسن بن علي معاوية [رضي الله عنهم] بكتائب امثال الجبال [منهم اربعون الفا بايعوه على الموت] فقال

(١) ژمارەی بۆ ئەم حەدیثە دانەناوە .

عمرو بن العاص [محرضا لمعاوية على قتال الحسن] : انى لأرى كتائب لا تولي حتى تَقْتُل اقْرانها . فقال له معاوية ـ وكان والله خير الرجلين [لانه يطلب الصلح ، والآخر يحرضه على القتال] ـ : اي عمرو ! ان قَتَلَ هؤلاء هؤلاء ، وهؤلاء هؤلاء من لي بامور الناس ، من لي بنسائهم ، من لي بضيعتهم ؟ [من لذراري المسلمين ؟ اخرى خ] فبعث اليه رجلين من قريش من بني عبد شمس : عبدالرحمن بن سمرة ، وعبدالله بن عامر ابن كُرَيْز . فقال : اذهبا الى هذا الرجل فاعرضا عليه ، وقولا له واطلبا اليه . فاتياه ، فدخلا عليه فتكلما ، وقالا له ، وطلبا اليه . فقال لهما الحسن بن علي [رضي الله تعالى عنهما] : انا بنو عبدالمطلب قد اصبنا من هذا المال وان هذه الامة قد عاثت في دمائها . قالا : فانه يعرض عليك كذا وكذا ، ويطلب اليك ويسألك [راجع تأريخ الكامل . وهذه المسائل بالتأريخ اليق منه بالحديث . ولكن فيه تصديق الحديث الأول وبيان المعجزة] قال : فمن لي بهذا ؟ قالا : نحن لك به . فما سألهما شيئا الا قالا نحن لك به . . فصالحه . فقال الحسن : ولقد سمعت ابا بكرة [رضي الله تعالى عنه] يقول : رأيت رسول الله ـ ﷺ ـ على المنبر والحسن بن علي الى جنبه وهو يقبل على الناس مرة وعليه اخرى ، ويقول : ان ابني هذا سيد ولعل الله ان يصلح به بين فئتين عظيمتين من المسلمين . خ ـ ٤/ ٤١٠ ، ح ـ ٦/١٢٨ ، ح ـ ١٠/ ١٩٠ . ولما صالح قال له اتباعه : يا عار المؤمنين ! فقال ـ رضي الله تعالى عنه ـ : العار خير من النار ! قسطلاني ١٠ ـ ١٩٠ . د ، ت ، ن .

**تەرجەمە :**

حەسەنی بەصری ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : وەڵڵاهی حەسەنی کوڕی عەلی موقابەلەی موعاویەی کرد ـ رضي الله تعالى عنهم ـ بە لەشکرێ وەکوو کێو وابوو [چل هەزاری لەسەر مردن موبایەعـەیان لەگەڵ کردبوو] عەمری کوڕی عاص وتی : وەڵڵاهی لەشکرێك ئەبینم تا ئەقرانی خۆی نەکوژێ پشت هەڵناکا . موعاویە ـ کە وەڵڵاهی چاکترینی ئەو دوو پیاوە بوو ، کە موعاویەو عەمرن ـ بە عەمری وت : ئەی عەمر ! کە ئەمانە ئەوانەی کوشتو ، ئەوانەیش ئەمانەی کوشت کێ ئەبێ بـە کەفیلی ئیش و کاری خەڵق ؟ کێ ئەبێ بە کەفیلی ژنەکانیان کە چاوێرییان بکا ؟ کێ ئەبێ بە کەفیلیماڵو ئەراضی یان ؟ [کێ ئەبێ بە کەفیلی مناڵیان کە بە ضائیع نەچن ؟] عەمـر[1] وتی : من . [یەعنی مـەترسـە شەڕی لەگەڵ بکە ئەگەر شتێکی وا رووی دا من ئەبم بە کەفیلی ماڵو مناڵیان ، صوڵحی لەگەڵ مەکە . بۆیە حەسەنی بەصری ـ رحمه الله ـ فەرمووی : موعاویە لە عەمر چاکترە] .

موعاویە [بە گوێی عەمری نەکرد طالیبی صوڵح بوو بۆ بۆ خاطری ئەمە خوێن نەڕژێ] دوو پیاوی لە قورەیش لە بـەنی (عبدالشمس) کـە عەبدورەحمانی کوڕی سومرەو ، عەبدوڵڵای کوڕی عامیرن ناردە خدمەت حەزرەتی حەسەن ـ رضي الله تعالى عنه ـ پێی وتن : بچنە لای ئەو پیاوە صوڵحی عەرض بکەن ، قسەی لـەگەڵا بکـەن ، طەلـەبی صوڵحی لێ بکەن . هەردوکیان چوونە خدمەتی ئیمامی حەسەن ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزیان کرد ، طەلەبی صوڵحیان لێکرد . فەرمووی : ئێمە کـە

(١) لە دەقی عەرەبی یەکەدا ئەم قسەی عەمرە نی یە . کە (عەمروتی : من) .

بەنو (عبدالمطلبين) ئێمە لەم ماڵە ئینتیفاعمان لیٚ کردوه[1] . ئەم ئوممەتە بە خوێنی یەکتری رژانن بەفەسادا چوون ، بۆ طەماعی دنیایی ناگەرێنەوە . عەرزیان کرد : کە موعاویە ئەوەندەو ئەوەندەت عەرض ئەکا ، طەڵەبی صوڵحت لیٚ ئەکا . حەزرەتی حەسەن ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئەگەر صوڵحی لەگەڵ بکەم کیٚ ئەبیٚ بە کەفیل کە ئەمانەم بداتیٚ ؟ وتیان : ئێمە ئەبین بە کەفیل . (والحاصل) حەزرەتی ئیمام هەرچی طەڵەب کردو کردی بە شەرطی صوڵح ئەوان ئەیانوت : ئێمە کەفیلین [چونکە وەکیلی موطڵەق بوون] صوڵحی لەگەڵ کردن . ئەویش وەفای بە وەعدەکەی کرد[2] ـ رضي الله تعالى عنهما ـ [حەسەنی بەصری ـ رضي الله عنه ـ حەدیثەکەی پێشوو لە ئەبوبەکرەوە ریوایەت ئەکا مەعنای لێدراوەتەوە] .

**٤٦/٧٦٦ ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ يقول : قال رسول الله ـ ﷺ ـ اذا انزل الله بقوم عذابا اصاب العذاب من كان فيهم ، ثم بعثوا على اعمالهم . ح ـ ١٠/١٨٨ ، م ـ ١٠/٣٤٣ .**

**وفي السنن الاربعة من حديث ابي بكر الصديق ـ رضي الله تعالى عنه ـ : انه سمع رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : ان الناس اذا رأوا المنكر فلم يغيروه أوشك ان يعمهم الله بعذاب . قسط ـ ١٠ ـ ١٨٨ .**

**تەرجەمە :**

---

(١) لێرەدا تەرجەمەکە بزرکاوە ئەیتوانی بفەرموێ : (ئێمە کە . . . ئینتیفاعمان لەم ماڵە کردوە) .

(٢) دانەر ـ خ ـ وەك زیادەکەی قەسطەلانی لەبیرچووبیٚ وایە . ئەمە تەرجەمەکەیەتی :
کاتیٚ حەزرەتی حەسەن صوڵحی لەگەڵکردن کۆمەڵەکەی وتیان : ئەی رسوایی موسوڵمانان ! جا حەزرەتی حەسەن فەرمووی : رسوایی لە ئاگر باشترە !

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : کە خوا ـ عز وجل ـ عەذابێکی ناردە سەر قەومێ ئەو عەذابە هەرکەسێ لە ناو ئەو قەومەدا بێ ئەیگرێ ، لە دواییدا هەرکەس لەسەر عەمەلی خۆی زیندووئەبێتەوە .

ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە پێغەمەرم بیست ـ ﷺ ـ ئەیفەرموو : ئینسان کە مونکەریان دیو تێکیان نەدا نزیکە خوا عەذابێکی عومومی یان بۆ بنێرێ . [وەك ئێستە یەك لەسەر یەك]

٧٦٧/٤٧ قال حرملة ـ مولى اسامة ـ قال : ارسلني اسامة الى علي [رضي الله تعالى عنهما] وقال : انه سيسألك الآن : ما خلّف صاحبك ؟ فقل له : يقول لك : لو كنت في شدق الأسد لأحببتُ ان اكون معك فيه ، ولكن هذا امر لم أرهُ ، فلم يعطني شيئا فذهبت الى حسن وحسين وابن جعفر [رضي الله تعالى عنهم] فاوقروا الي راحلتي . ح ـ ١٠/١٩٠

تەرجەمە :

حەرمولەی مەولای ئوسامەی خۆشەویستی پێغەمەر ـ ﷺ ـ وتی : ئوسامە ناردمی یە خذمەت حەزرەتی عەلی کە شتێکی بداتێ ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی : ئێستە لێت ئەپرسێ : کە بۆچی رەفیقەکەت تەخەللوفی کرد ، نەهاتە موعاوەنەتم ؟ عەرزی بکە کە ئەڵێ : ئەگەر لالەغاوەی شێرا بوویتایە وام حەزەکرد کە لە خذمەتتا بوومایە . ئەمما شەڕکردنی موسوڵمانان لەگەڵ یەکتری شتێکە من نەمدیوە .

[ئوسامە ـ رضي الله تعالى عنه ـ پێغەمەر ـ ﷺ ـ ناردییە سەر قەومێ ، دایان بەسەر قەومەکەدا شکانیان ، پیاوێکی مەرداس ناوی ئازاو شەجیع ئوسامەی شوێن کەوت ، کە تەنگی پێ هەڵچنی وتی : (لا اله الا الله) ئوسامە ـ رضي الله تعالى عنه ـ گوێی نەدایێ و کوشتی . عەرزی پێغەمەر کرا ـ ﷺ ـ زۆری تەکدیری ئوسامە کرد . لەسەر ئەوە

ئـوسامـە ـ رضي الله تعالى عنـه ـ سوێنی خـوارد کە هیـچ مـوسـوڵمـانێ نەکوژێ . لەبەر ئەوە لە وەقعەی حەزرەتی عەلی و موعاویەدا ـ رضي الله تعالى عنهما ـ تابیعی هیچ طەرەفێ نەبوو ، خۆی پارازت] .

حەرمولە ئەڵێ چوومە : خذمەت حەزرەتی ئیمامی عەلی قسەکەی ئوسامەم عەرزکرد . حەزرەتی عەلی هیچی نەدامێ ، چوومە خذمەت حەزرەتی حەسەن و حسەین و عەبدوڵلای کوری جەعفەری برای ئیمامی عەلی ـ رضي الله تعالى عنهم ـ وشترەکەیان بۆ گران بار کردم .

**٤٨/ ٧٦٨ عَن نافع قال : لما خلع اهل المدينة يزيد بن معاوية جمع ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ حشمه وولـده فقال : اني سمعت النبي ـ ﷺ ـ يقول : ينصب لكل غادر لواء يوم القيامة ، وانا قد بايعنا هذا الرجل على بيع الله ورسوله ، واني لا اعلم عُذْرا [غَدْرا ، نسخة] اعظم من ان يبايع رجل على بيع الله ورسوله ، ثم ينصب له القتال ، واني لا اعلم [في المغازي قسطلاني : ولم اجد الا احاديث لواء الغدر ليس فيها قصة خلع يزيد] احدا منكم خلعه ولا بايع [غيره] في هذا الأمر الا كانت الفيصل [القاطعة] بيني وبينه ح ـ ١٠/ ١٩١**

**تەرجەمە :**

نافیع مەولای ئیبن و عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : کە ئەهلی مەدینە ـ رضي الله عنهم ـ کە یـەزیدی کـوری موعـاویەیـان خەلع کرد لە پاشایەتی . . ئیبن و عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ خەدەم و حەشەم و ئەولادەکانی کـۆکردەوەو فـەرمووی : لـە پێغەمـەر ـ ﷺ ـ م بیست ئەیفەرموو : خوا لە ڕۆژی قیامەتا بۆ کوللی کەسێ کـە عەهـدو پەیمان هەڵبوەشێنێ بایداخێکی بۆ هەڵەکا ، ئێمە موبایەعەمان لەگەڵ ئەو پیاوەدا کردوە لەسەر موبایەعەی خواو رەسوولی ، هیچ عوذرێ یا غەدرێ

لەوەگەورەتر نییە کە ئینسان لەسەر بەیعی خواو رەسوولی بەیعەت لەگەڵ کەسێ بکاو لە پاشا حەربی لەگەڵ دامەزرێنێ ، هەرکەسێ لە ئێوە (مطلع) ببم بە سەریا کە خەلعی بکاو بەیعەت بە کەسێکی تر بکا ئەو خەلع و بەیعەتە ئەبێ بە سەبەبی جوێیێتی لە بەینی من و ئەوا .

سەبەبی خەلعی یەزید ئەوەیە کە طەبەری ذیکری کردوە کە یەزید عەماری کوڕی مامە حەمەی خۆیی کرد بە ئەمیری مەدینە . عەماری مامە حەمە جەماعەتێکی لە ئەهلی مەدینە نارد بۆ لای یەزید . لەو جەماعەتەدا عەبدوڵڵای کوڕی غەسیلی مەلائیکەو ، عەبدوڵڵای کوڕی عەمری مەخزوومی مەوجوود بوون کە گەیینە لای ، یەزید ئیکرام و نەوازشی کردن ، خەڵاتی کردن ، کە گەڕانەوە بۆ مەدینە عەیبیان لە یەزید دەرهێنا کە شەرابی خواردۆتەوەو ئەوەو ئەوە ئەکا . . لەسەر ئەوە ئەهلی مەدینە یەزیدیان خەلع کرد ، عەماریان دەرکرد . ئەو وەختە ئیبن و عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ حەشەم و ئەولادەکانی کۆکردەوەو نەصیحەتی کردن کە ئەم خەبەرە بە یەزید گەیی لەشکرێکی لەگەڵ موسلیمی کوڕی عوقبەدا ناردنەسەر ، ئەمری پێکرد تا سێ رۆژ دەعوەتیان بکاتەوە سەر ئیطاعە ، ئەگەر نەگەڕانەوە حەربیان لەگەڵ بکا ، کە غالب بوون سێ رۆژ سەرو ماڵ و عیرضی مەدینەییان بۆ حەڵاڵ بکا ، لێیان نەپرسێتەوە .

موسلیم لە دوای سێ رۆژ کە دەعوەتی کردن و نەهاتنەوە سەر ئیطاعەت حەربی لەگەڵا کردن ، لەشکری موسلیم غەڵەبەی کرد ، سێ رۆژ کوشتاریان کرد لە ئەهلی مەدینە ، دە هەزار پیاوو ژن و منالیان کوشت .

حەنظەلە شەهید کرا ، بەقایای موهاجیرو ئەنصارو ئەجیللەی

تابیعین ـ رضي الله تعالى عنهم ـ شەهید کران ، هەر ئەوانە هەزارو حەوصەد صەحابەو تابیعین بوون . تەحقیری مەسجیدی نەبەوی یان کرد ، ئەسپیان تیا لنگ دا ، حەمەلەی قورئانیان کوشت ، چەند ذەواتێکیان لە ژێدا شکەنجە دا ، شەهید کرد . لە هەزار زیاتر کچیان بێ بن کرد ، ئەوانی مابوونەوە بە کورهو ناحەز بەیعەتیان کرد . ناوی ئەم وەقعەیە وەقعەی (حرە)یە کە مابەینی دووشاخی مەدینەیە . . مەدینە چۆڵ بوو ، ماڵیانو میوەی باغو باغاتیان مایەوە بۆ طەیرو درندە . وەك پێغەمەر ـ ﷺ ـ خەبەری لێدابوو . (من قسطلاني) .

٤٩/٧٦٩ عن ابي المنهال [سيال بن سلامه] قال : لما كان ابن زياد ، ومروان بالشام ووثب ابن الزبير [رضي الله تعالى عنهما] بمكة ، ووثب القراء [وهم الخوارج] بالبصرة ، فانطلقت مع ابي الى ابي برذة [رضي الله تعالى عنه] الاسلمي حتى دخلنا عليه ، وهو جالس في علية [غرفة] له من قصب فجلسنا اليه ، فانشأ ابي يستطعمه الحديث فقال : يا ابا برذة الا ترى ما وقع فيه الناس ؟ فاول شئ سمعته تكلم به اَنِّي احتسبت عندالله أني اصبحت ساخطا على احياء من قريش ، انكم يا معشر العرب كنتم على الحال الذي علمتم من : الذلّة ، والقلّة ، والضلالة ، وان الله انقذكم بالاسلام وبمحمد ـ ﷺ ـ حتى بلغ بكم ما ترون [من : العزة ، والكثرة ، والهداية] وهذه الدنيا التي أفسدت بينكم ، ان ذاك الذي بالشام [مروان بن الحكم] والله ان يقاتل الا على الدنيا ! وان هؤلاء الذين [وفي اخرى : ان الذين حولكم يزعمون أنهم قراؤكم . يعني الخوارج] والله ان يقاتلون الا على الدنيا ، وان ذاك الذي بمكة [يعني ابن الزبير ـ رضي الله تعالى عنهما ـ] والله ان يقاتل على الدنيا . ح ـ ١٠/١٩٢ .

تەرجەمە :

ئـەبولمينهـال ئەفـەرموێ : کـە یەزیـد مردو ، ئیبن و زیـاد ـ کـە عەبدوڵلایە ـ و مەروانی کوڕی حەکەم لە شام بوون و ، مەروان قیامی کرد لە شاما بۆ پاشایەتی ، عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قیامی کرد بۆ خەلافەت . قوڕای بەصـره ـ کە خـەواریجن ـ لە بەصره قیامیان کرد بۆ پاشایەتی . من و باوکم ـ کە ـ سەلامەیە ـ هەڵساین چووینە خدمەت ئەبوبەرزەی ئەسلەمی ـ رضي الله تعالى عنه ـ لەماڵی خۆیا لـە ژێر سێبـەری کۆشکێکی قـامیشینا دانیشتبـوو ، لە خـدمەتیـا دانیشتین . باوکم طەڵەبی حەدیثی لێکرد ، فەرمووی : یـا ئەبـوبەرزە چاوت لێیە کە چی کەوتوەتە بەینی خەڵقەوە ؟ خەڵق کەوتوونە ناو چە شەڕو شۆڕێ ؟ ئەوەڵ کەلیمەیێ کە لێم بیست ئەوە بوو کە فەرمووی : من لە لای خوا ئەوەم مەطلووبەو بە ئەوابی ئەزانم کە رقم لە قەبائیـلی قورەیش هەڵساوە ، ئێوە ـ ئەی جەماعەتی عەرەب ـ لەسەر حاڵێ بوون کە ئەیزانن لە : ذیللەتا بوون ، کـەم بوون ، فـەقیر بـوون ، گومـراە بوون . خوا عەزیزی کردن ، غاڵبی کردن ، زۆری کردن ، هیدایەتی دان بە ئیسلامەتی و بە محەمەد ـ ﷺ ـ لەو حاڵە نەجاتی دان تا گەیینە ئەم دەرەجەیە کە ئەیبینن ، ئەم دنیایە کە فەسادی خستوەتە بەینتانەوەو ئێوەی تێك داوە ، ئەوەی کە لە شامە ـ وەك مەروان ـ وەڵلاهی هەر بۆ دنیا شەڕ ئەکا ! ئەو خاریجییانەی کە خۆیان بە قوڕرا ناو ئەبەن و لـە بەینتـانان وەڵلاهی هەر بۆ دنیا شەڕ ئەکەن ! ئەوی کە لـە مەککـەیە وەك (ابن الزبير) ـ وەڵلاهی بۆ دنیا شەڕ ئەکا !

**٥٠/٧٧٠ عن حذيفة بن اليمان ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : ان المنافقين اليوم شر منهم على عهد النبي ـ ﷺ ـ كانوا يومئذ يسرون [الكفر] واليوم يجهرون ح ـ ١٩٢/١٠ ن .**

**تەرجەمە :**

حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : مونافیقی ئیمرۆ خراپترن لە مونافیقی زەمانی پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەو وەختە کوفریان ئەشاردەوە وە ئیمرۆ ئاشکارای ئەکەن .

مەعنای نیفاق لەم حەدیثەدا وا نی یە کە ئیمان ئیظهار بکاو لە باطینا کافر بێ ، چونکی ئەوانەی کە حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ناویان ئەبا بە مونافیق لە ظاهیرو باطینا موسوڵمان بوون ، ئیمانیان بوە بە پێغەمەر ـ ﷺ ـ و بە قورئانو ئەحادیث . کە وابێ مەعنای مونافیق ئەوەیە کە لە دڵیا شتێك ببێ و خیلافی ئەوە ئیظهار بکا ، وەك بەیعەت بە یەکێ بکاو لە پاشا هەڵیوەشێنێ ، یا ئیظهاری صەداقەتی دۆستێ بکاو لە (نفس الامر) ا دوشمنی بێ ، مەعنای خراپێتیان چی یە ؟ ئەوەیە کە مونافیقانی پێشوو زەرەریان کەمتر بوە ، هی ئەو زەمانە ئەو فیتنە عەظیمانەیان خستوەتە بەینی موسوڵمانەوە .

**٧٧١/٥١ وعنه قال : انما كان النفاق على عهد النبي ـ ﷺ ـ فاما اليوم فانما هو الكفر بعد الايمان . ح ـ ١٩٣/١٠**

**تەرجەمە :**

حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : نیفاق لە عەهدی پێغەمەرا بوو ـ ﷺ ـ ئەمما ئیمرۆ نیفاق نی یە ، کوفری (بعد الایمان)ە ، موراد لە کوفر کوفری حەقیقی نی یە . یەعنی سەتری عەداوەت ناکرێ ، بە ئاشکرا ئەچن بە گژ ئەئیمەی دینا ، بە گژ برای دینا . . . لە بەر طەمەعی دنیا .

٧٧٢/٥٢ عن ابي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـ ﷺ ـ قال : لا تقوم الساعة حتى يمر الرجل بقبر الرجل فيقول : يا ليتني مكانه ! ح ـ ١٠/١٩٣ ، م ـ ١٠/٣٦٨ .

٧٧٣/٥٣ وعنه قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : والذي نفسي بيده ! لا تذهب الدنيا حتى يمر الرجل على القبر ، فيتمرغ عليه ، ويقول : يا ليتني كنت مكان صاحب هذا القبر ، وليس بـه الـدين الا البـلاء . م ـ ١٠/٣٦٩ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : قەسەم بەو ذاتە کە نەفسی من لـە دەستیایە ! دنیا ناروا ـ لە ریوایەتەکەی ترا ـ قیامەت هـەڵناستێ تـا ئەو وەختە کە پیاو ـ یەعنی ژنیش ـ بە لای قەبرا رائەبوورێ خۆی بـەسەر گڵەکەیا ئـەتلێنێتەوە ، ئـەڵێ : کاشکی لـە جێی صاحیبی ئـەم قەبـرە بوومایە ، چونکی دین بۆئەوغەیری بەڵا هیچی تر نی‌یە . ئێستە وایە .

٧٧٤/٥٤ وعنه ان رسول الله ـ ﷺ ـ قال : لا تقوم الساعة حتى تضطرب اَلَيات نساء (دوس) على ذي الخُلُصة وذو الخَلُصة [وبفتح فسكون] طاغية دوس [يعني خلصة طاغيتهم ، وسمي المكان الذي ـ فيه ـ بذي الخلصة] التي كانوا يعبدون في الجاهلية [بتبالة‌م] موضع باليمن] م ـ ١٠/٣٦٧ ، ح ـ ١٠/١٩٣ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : قیامەت هەڵناستێ تا ئەو وەختە کە کەفەڵی ژنانی دەوس هەڵتەك‌هەڵتەکی ئەیێ بە دەوری (ذو الخلصە)دا ، (خلصە) بتی دەوسە لە زەمانی جاهیلیەتا ئەیانپەرست . لە تەبالەیە کە

جێیەکە لە یەمەن ، یەعنی خەڵق ئیرتیداد ئەکەن ئەچنەوە سەر بتپەرستیی . لە پێش چاومانە ، ئەبینین . (صدق رسول الله ـ ﷺ ـ)

٧٧٥/٥٥ وعنه قال قال رسول الله ـ ﷺ ـ لا تقوم الساعة حتى تخرج نار من ارض الحجاز تضيئ اعناق الابل ببصرى حوران . م ـ ٣٦٦/١٠ ، خ ـ ١٩٥/١٠ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : قیامەت هەڵناستێ تا ئەووەختە ئاگرێ لە ئەرزی حیجاز ظوهوور ئەکا شوعلەو رووناکیی ئەدا لە ملی وشتر لە شاری حەورانا .

لە قەسطەلانیدا حیکایەتێ ئەکا کە ئەم ئاگرە بوە . لەو صەحیفەدا .

٧٧٦/٥٦ عن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ عن النبي ـ ﷺ ـ قال : كأنّي به اسود افحج [متكبرا في مشيته تداني صدور قدميه وتباعد عقباه] يقلعها حجرا حجرا . ح ـ ١٥٤/٤ .

وفي حديث غريب عن علي ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : استكثروا من الطواف بهذا البيت قبل ان يحال بينكم وبينه ، فكأني برجل من الحبشة اصلع . او قال : اصمع [گوێ کەڕیلە] حمش الساقين ، قاعد عليها ، وهي تهدم .

وروي عنه مرفوعا من طريق آخر . من قسطلاني .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : (كأنه) من لە پێش چاومە ئەو کەسەی

کە بەیت ئەڕووخێنێ ، ڕەشە ، موتەکەببیرە لە ڕۆیینیا ، پەنجەی هەردوو پێی نزیکی یەك ، پاژنەکانی بڵاو دائەنێ ، بەرد بەرد هەڵی ئەکەنێ .

لە حەدیثە مەوقووفەکەدا ئەفەرموێ : طەوافی ئەم بەیتە زۆر بکەن لە پێش ئەمەدا کە مانیعێ بکەوێتە بەینی ئێوەو ئەوەوە نەیێڵێ کە طەواف بکەن . (کأنه) من لای ئەو پیاوەم لە حەبەشە کە تووکی ناوەڕاستەو پێشی سەری هەڵوەریوە ، کەڕیلەیەو ، قاچ باریکەو ، لەسەر بەیت دانیشتوەو بەیت ئەڕووخێنێ .

ئەم حەدیثە بە مەرفووعیش لە ئیمامی عەلی‌یەوە ـ رضي الله تعالی عنه ـ ڕیوایەت کراوە ، مەوقووفیش بێ چونکی لەوانە نی‌یە کە عەقڵ ظەفەری پێ بەرێ و مەوقووفی صەحابی‌یە بە مەرفووع حسێبە .

۷۷۷/۵۷ عن ابي هريرة [رضي الله تعالى عنه] قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : يوشك الفرات ان يحسر يكشف عن كنز [جبل . اخرى م] من ذهب ، فمن حضره فلا يأخذ منه شيئا . ح ـ ۱۹٦/۱۰ ، م ـ ۳۵۷/۱۰ د ، ت .

۷۷۸/۵۸ وعنه ان رسول الله ـ ﷺ ـ قال : لا تقوم الساعة حتى يحسر الفرات عن جبل من ذهب ، يقتل الناس عليه ، فيقتل من كل مائة تسعة وتسعون ، ويقول كل رجل منهم : لعلي اكون انا الذي انجو . م ـ ۳٥٦/۱۰ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : نزیکە کە فورات خەزێنەی ئاڵتوون ـ لە ڕیوایەتەکەی ترا ـ : شاخێکی ئاڵتوون دەربخا . هەرکەسێ حازر بێ لەوێ هیچی لێ هەڵنەگرێ .

ـ لە ریوایەتەکەی‌ترا ـ : قیامەت هەڵناستێ تا ئەو وەختە کە فورات شاخێکی ئاڵتوون دەرەخا ، لەسەر ئەوە خەڵق ئەکوژرێ ، لە هەر صەد کەس نەوەودو نۆی لێ ئەکوژرێ ، کوللی کەسێ لەوانە ئەڵێ : بەڵکو من دەرەچم نەجاتم ئەبێ .

**٧٧٩/٥٩ ـ عن عبدالله بن الحرث بن نوفل ، قال : كنت واقفا مع ابي بن كعب [في ظل أُجُم ـ بضمتين : الحصن نووي ـ حسان ، اخرى م] فقال : لا يزال الناس مختلفة اعناقهم في طلب الدنيا ؟ قلت : اجل . قال : اني سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : يوشك الفرات ان يحسر عن جبل من ذهب ، فاذا سمع به الناس ساروا اليه ، فيقول : من عنده لئن تركنا الناس يأخذون منه ليُذْهبَنَّ به كله ، قال : فيقتتلون عليه ، فيقتل من كل مائة تسعة وتسعون م ـ ١٠/٣٥٧ .**

**تەرجەمە :**

عەبدوڵڵای کوری حەرث ئەڵێ : لە خدمەت ئوبەیي بنی کەعبا لە سێبەری قەڵای حەسانا راوەستابووین ، فەرمووی : خەڵق هەر لە طەلەبی دنیادا یێن‌و ئەچن ، ملی بۆ درێژ ئەکەن ؟ وتم : بەڵێ ، فەرمووی : لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ م بیست فەرمووی : نزیکە کە فورات شاخێکی ئاڵتوون دەربخا ، کە خەڵق بیستیان بۆی ئەچن ، ئەوانەی لە لاین ئەڵێن : ئەگەر بێڵین خەڵق بیبەن هەمووی ئەبرێ ، شەری لەسەر ئەکەن ، لە کوللی صەدێ نەوەدو نۆی لێ ئەکوژرێ .

**٧٨٠/٦٠ ـ حارثة بن وهب [رضي الله تعالى عنه] قال : سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : تصدقوا ، فسيأتي على الناس زمان يمشي بصدقته فلا يجد من يقبلها . قال مسدد (حاریثە برای دایکی**

عوبەیدوڵلای کوڕی ئیمامی عومەرە) قاله ابو عبدالله البخاري نفسه . =
= ح ـ ۱۰/۱۹۹ =
تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : صەدەقە بکەن ! ئینسان زەمانێکی بەسەرا یێ صەدەقە بە خەڵقەوە دەگێڕێ کەسی دەست ناکەوێ کە لێی قەبووڵ بکا .

[لە زەمانی عومەری بنی عەبدولعەزیزا ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەم حاڵە واقیع بوە ، دوای شەهادەتی چوەوە سەر حاڵی پێشووی] .

عەداڵەت بەرەکەت ئەخاتە ناو هەموو شتێك ، ئەوەندە بە بەرەکەتە گورگێ مەڕێکی خوارد شوانەکەی خەبەری دا بە وەفاتی عومەری بنی عەبدولعەزیز ـ رضي الله تعالى عنه ـ . لە موددەی حەیاتیا گورگ مەڕی نەخوارد .

٧٨١/٦١ ـ عن ابي هريرة [رضي الله تعالى عنه] ان رسول الله ـ ﷺ ـ قال : لا تقوم الساعة حتى تقتتل فئتان عظيمتان [علي واعوانه ـ رضي الله تعالى عنهم ـ ومعاوية واقرانه] تكون بينهما مقتلة عظيمة [قتل من الطرفين سبعون الفا او اكثر] دعوتهما واحدة هي تأييد الحق [والحق مع علي ـ رضي الله تعالى عنه ـ] .

(۲) وحتى يبعث دجالون كذابون كلهم يزعم انه رسول الله [لعنهم الله] الى هنا ح ـ ٦٠/٥٤

(۳) حتى يقبض العلم وتكثر الزلازل .

(٤) ويتقارب الزمان .

(٥) وتظهر الفتن .

(٦) ويكثر الهرج وهو القتل .
(٧) وحتى يكثر فيكم المال ، فيفيض حتى يهم رب المال [يحزنه] من يقبل صدقته ، وحتى يعرضه فيقول الذي يعرضه عليه : لا اِرْبَ لي به .
(٨) وحتى يتطاول الناس في البنيان .
(٩) وحتى يمر الرجل بقبر الرجل فيقول : ياليتني مكانه .
(١٠) وحتى تطلع الشمس من مغربها ، فاذا طلعت ورآها الناس آمنوا اجمعون ، فذلك حين لا ينفع نفساً ايمانها لم تكن آمنت من قبل أو كسبت في ايمانها خيرا . [من هنا الى الأخير م ـ ١٠/٤١٣] او لتقومن الساعة ونشر الرجلان ثوبهما بينهما ، فلا يتبايعانه ولا يطويانه . ولتقومن الساعة وقد انصرف الرجل بلبن لقحته [اللبون من النوق] فلا يطعمه . ولتقومن الساعة وهو يليط حوضه فلا يسقى فيه . ولتقومن الساعة وقد رفع أُكْلَته [لقمته] الى فيه فلا يطعمها [يعني ان القيامة تقوم بغتة] ح ـ ١٠/١٩٧ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : تا دوو فیرقەی گەورە لە ئیسلام لەگەڵ یەك شەڕ نەکەن قیامەت هەڵناستێ لە بەینیانا ، شەڕێك و کوشتارێکی زۆر ئەبێ ، وەك موعاویەو ئیمامی عەلی ـ رضي الله تعالى عنهما ـ [بەوە موعاویەو ئەتباعی لە ئیسلامەتی ناچنە دەرێ] .

ئیددیعای هەردوکیان یەکێکە ، هەرکەس ، بە ئیعتیقادو ئیجتیهادی خۆی ، لەسەر حەق شەڕ ئەکا با دەعوای موعاویە باطیل بێ لە (نفس الامر)ا .

[حەتا بە ئیعتیرافی خۆیشی کە حەق بە طەرەفی حەزرەتی

عەلی‌یایەو ، ئەو ئەهلترەو لایەقترە بە خەلافەت . قسطلاني م ـ ۱۰/۱۹۷]

تا نزیك سی دەججالی درۆزن کە هەموویان ئیددیعای ئەوە ئەکەن کە رەسوولولڵان [ئەمما رسول الشیطانن] ظوهوور نەکا قیامەت هەڵناستێ . ئەم دەججالانە غەیری دەججالی مەشهوورن ؛ چونکی ئەو ئیددیعای خواییێتی ئەکا .

خاریق ئەنوێنێ ئەگەر ئیددیعای پێغەمەرێتی بکا ناتوانێ خاریق بنوێنێ .

تا بە ئینقیراضی عولەما عیلم ئینقیراضی نەبێ قیامەت هەڵناستێ ، تا زەلزەلە زۆر نەبێ قیامەت هەڵناستێ .

ئێستە عیلمیش نەماوە ، زەلزەلەیش زۆرە ئەبینین . ئیمساڵ لە مەلاطی یەوە گرتی تا ساحیلی بەحری سیاە ، چەند شارو دێ وێران بوو ، چەند هەزار کەس مرد ، چەند هەزاری بێ سەقەط بوو .

زەمان لێك نزیك ئەبێتەوە ـ یەعنی خەڵق ئەوەندە ئەکەونە فەرەح و روفاهی یەتەوە نازانن چۆن وەقتیان لێ ئەروا ، ئەویش لە زەمانی مەهدیدا ئەبێ ـ یا مەعنای وایە زەمان ئەشوبهێن بە یەکترێ . یەك لە دوای یەك خراپتری تیاییێتە وجوودەوە ، یا بە دەوام شەوو رۆژ بەرابەر ئەبن . تا فیتنە زۆر نەبێ ، تا قەتڵ زۆر نەبێ . . . هەمو و زۆر بوون . تا ماڵ زۆر نەبێ و وەك ئاوی جاری نەبێ ، لە بەر فیتنە ئەوەندە زۆر ئەبێ کەس نایپەرژێتە سەرماڵ . صاحێبی ماڵ مەحزوون ئەبێ کە کەس نابێ صەدەقەی لێ قەبوول بکا ، زەکات ئەدا بە موستەحەق ئەڵێ : ئەمرۆ ئیحتیاجم پێی نی‌یە ، چی لە ماڵ بکەم ؟ تا ئەمانە نەبێ قیامەت هەڵناستێ .

تا خەڵق لە خانووو بینادا دەستدرێژی نەکا [هەرکەس ئەڵێ ئەبێ خانووی من لە خانووی ئەوی تر بەرزتر بێ] قیامەت هەڵناستێ . تا وای لێ نەیێ کەسێ کە بە لای قەبرێکا رابووریێو نەڵێ کاشکی من لە جێی ئەو بوومایە [یەعنی لەبەر شەڕو شۆڕو خراپەی زۆرو نارەحەتی خەڵق هەموو کەس تەمەننای مردن ئەکا] قیامەت هەڵناستێ . تا رۆژ لە مەغریبەوە طولووع نەکا قیامەت هەڵناستێ . کە رۆژ لە مەغریبەوە طولووعی کرد تا ئەو وەختە ئینسان ئیمانی نەهێنابێو ئەو وەختە ئیمان بێنێ . . . ئیمانەکەی فائیدەی نابێ . یا ئیمانی بووبێو عەمەلی چاکەی نەبووبێ کە چاوی بەو رۆژگەرانەوە کەوت دەست بکا بە عەمەلی چاکەو لە خراپە لابدا . . ئەو عەمەلانەی فائیدەی بۆی نابێ .

قیامەت کوتوپڕ هەڵەستێ کەس بە خۆی نازانێ ؛ دوو کەس تۆپە کووتاڵیان لێك کردۆتەوە خریدو فرۆختیان لە بەینا نابێو ناپێچنەوە قیامەت هەڵەستێ . لە ناوگەلە وشتری شیری دۆشیوە تامی ناکاو قیامەت هەڵەستێ . حەوز سواغ ئەداو ئاوی لێ ناخواتەوەو حەیوانی لێ ئاو ناد ا قیامەت هەڵەستێ . لوقمەی کردوە هەڵیبریوە بییا بۆ دەمی نایگەیێنێتە دەمی و طەعامی ناکا قیامەتی لێ هەڵەستێ .

ئێمە گەلێ (اشراط) مان بە چاوی خۆمان دیوە ، ئەمما ئومێدم وایە (ان شاء الله) قیامەت لە ئێمە هەڵنەستێ ؛ چونکی لە حەدیثایە قیامەت وەختێ هەڵەستێ ئەوی بڵێ (الله ، الله) نامێنێ ، (الحمد لله) ئەوانە لە سێصەد ملیۆن زیاترن . (فقط من مات فقد قامت قیامته) مردن کوتوپڕ بێ ئەگەر ئەو کوتوپڕ نەبێ نەخۆشیەکەی کوتوپڕ بێ .

**٦٢/٧٨٢ ـ وعنه قال : قال رسول الله - ﷺ - : والذي نفسي بيده ! لا تذهب الدنيا حتى يأتي على الناس يوم لا يدري القاتل فيم قَتَل ، ولا**

المقتول فيم قُتِل . فقيل : كيف يكون ذلك ؟ ! قال : الهرج ، القاتل والمقتول في النار . م ـ ١٠/٣٦٩

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : قەسەم بەوەی نەفسی من لە دەستی قودرەتیایە ! دنیا ناڕوا تا بەسەر ئینسانا رۆژو زەمانێ نەیێ قاتیل نازانێ بۆچی قەتلی کردوە ، مەقتوول نازانێ بۆچی کوژراوە . عەرزیان کرد : ئەوە چۆن ئەبێ ؟ فەرمووی : هەرجە . [یەعنی خەڵق تێکەڵو پێکەڵ ئەبن ، لەسەر هیچ ئەچن بە گژ یەکا ، قەصدی قەتڵی یەکتری ئەکەن] کوژراوو پیاوکوژ هەردوکیان لە ئاگران .

[لەم نەوعە زۆرمان دیوەو ئەیشی بینین ، چۆن ئەبێ پێغەمەر ـ ﷺ ـ خەبەری لێداو نەبێ ؟ (صدق ﷺ ـ روحي واهلي ومالي فداه)]

٧٨٣/٦٣ ـ عن عبيدالله بن القبطية ، قال : دخل الحرث بن ابي ربيعة ، وعبدالله بن صفوان ـ وانا معهما ـ على ام سلمة ام المؤمنين [رضي الله تعالى عنها] فسألاها عن الجيش الذي يخسف به ، وكان ذلك في أيام ابن الزبير [رضي الله تعالى عنهما] فقالت : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : يعوذ عائذ بالبيت فيبعث اليه بعث ، فاذا كانوا ببيداء من الارض خسف بهم . فقلت : يا رسول الله فكيف بمن كان كادها ، قال : يخسف به معهم ، ولكنه يبعث يوم القيامة على نيته ، وقال ابو جعفر [احد الرواة] : هي بيداء المدينة . م ـ ١٠/٣٤٦

٧٨٤/٦٤ ـ عبدالله بن صفوان يقول : اخبرتني حفصة [رضي الله تعالى عنها] انها سمعت النبي ـ ﷺ ـ يقول : ليؤمَّنَّ هذا البيت جيشٌ يغزونه ، حتى اذا كانوا ببيداء من الارض يخسف بأوسطهم وينادي اولُهم

آخرَهُم ثم يخسف بهم ، فلا يبقى الا الشريد الذي يخبر عنهم . فقال رجل : اشهد عليك انك لم تكذب على حفصة ، واشهد على حفصة انها لم تكذب على النبي - ﷺ - . م- ١٠ /٣٤٧

٧٨٥/٦٥ - يوسف بن ماهَك قال : اخبرني عبدالله بن صفوان عن ام المؤمنين : ان رسول الله - ﷺ - قال : سيعوذ بهذا البيت - يعني الكعبة - قوم ليست لهم مَنْعة [اى من يحميهم] ولا عدد ، ولا عدة ، يبعث اليهم جيش حتى اذا كانوا ببيداء من الارض خسف بهم . قال يوسف : واهل الشام يومئذ يسيرون الى مكة ، فقال عبدالله بن صفوان : اما والله ! ما هو بهذا الجيش م- ١٠ /٣٤٧

٧٨٦/٦٦ - عائشة [رضي الله تعالى عنها] قال : عبث رسول الله - ﷺ - في منامه [اضطرب بجسمه ، او حرك اطرافه ، كأنه يأخذ شيئا او يدفعه] فقلنا : يا رسول الله صنعت شيئا في منامك لم تكن تفعله . فقال : العجب ! ان ناسا من امتي يؤمون بالبيت برجل من قريش قد لجأ بالبيت ، حتى اذا كانوا بالبيداء خسف بهم ، فقلنا : يا رسول الله ان الطريق قد يجمع الناس ، قال : نعم فيهم المستبصر [لاراءة الجيش الطريقَ] ، والمجبور ، وابن السبيل ، يهلكون مهلكا واحدا ، ويصدرون مصادر شتى يبعثم الله على نياتهم . م- ١٠ /٣٤٨

تەرجەمە :

چوار حەدیث لە سێ زەوجی پێغەمەر - ﷺ - لەیەك حادیثەدا بە فەرقێكی كەمی لەفظیی ، هەموو مەعنای مەقصودیان یەكێكە .

مەعنای حەدیثی حەزرەتی عایشە - رضي الله تعالى عنها - وایە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ ڕۆژێ یا شەوێ کە نوستبوو بە دەم خەوەوە حەرەکەتێکی کرد ، وەك شتێك بگرێ یا دەفعی کا ، کە خەبەربۆوە عەرزمان کرد : (یا رسول الله) لە نوستنتا شتێکت کرد کە نەتکردبێ ، فەرمووی : عەجایب ! لەشکرێ ـ بەعزێ کەس لە ئوممەتی من قەصدی بەیت ئەکەن [غەزای بەیت ئەکەن] ، بۆ پیاوێ لە قورەیش ئیلتیجای بە بەیت کردوە [قووەتیان نی‌یە ، عەدەدیان نی‌یە ، تەداروکی ئەسبابی حەربیان نی‌یە] تا ئەگەنە دەشتی مەدینە هەموویان بە ئەرزا ئەچنە خوارێ نقوم ئەبن . [فەرقەی ناوەڕاستیان بە ئەرزا ڕۆئەچن ، ئەوەڵیان ئاخریان بانگ ئەکا ، هەموویان ژێرەو زەبەر ئەبن بە ئەرزا ، یەکێ نەبێ کە هەڕای‌کردوەو خەبەر ئەباتەوە هیچیان لێ دەرناچێ .

لە حەدیثی (ام السلمە)دا ئەفەرموێ وتم : (یا رسول الله) ئەی ئەوە کە بە زۆر براب‌ێ ؟] حەزرەتی عائیشە ئەفەرموێ : (یا رسول الله) ڕێگە ئەنواعی خەڵق کۆ ئەکاتەوە . یەعنی هەموو نەوعە ڕێبوارێ پیائەڕوا ، ئەی ئەوانە چی ؟ فەرمووی : بەڵێ ئەوەی تیایە کە ڕێ پێنیشان بدا ، ئەوانەی تیان کە بە زۆر براون ، ڕێبواریان تیایە . . . چاك و خراپ هەموو بە یەك دەفعە بەهیلاکا ئەچن ، لە حەشرا هەرکەس بە نەوعێ ئەگەڕێتەوە لای خوا ـ جل جلالە ـ خوا هەرکەسێ لەسەر نیەتی خۆی زیندووی ئەکاتەوە .

لە حەدیثی یوسفا ئەڵێ : لەو ڕۆژانەدا ئەهلی شام بۆ مەکە ئەچوون بۆ سەر عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر ؟ لە جوابیا عوبەیدوڵلای کوڕی صەفوان وتی : خەیر ، وەڵلاهی ! ئەو جەیشە ئەم جەیشە نی‌یە .

[قسەکەی عوبەیدوڵلا ڕاستە ، ئەم جەیشەی عەبدولمەلیکی مەروان لە مەعی‌یەتی حەججاجا ناردی‌یە سەر (ابن الزبير) لە دنیادا

خەسف نەبوون ، لە ئاخیرەتا خەسفی ناو ئاگری جەهەننەم ئەبن . یەعنی خواهشگەرەکانیان . ئەمە تا ئێستە نەبیسراوە کە وقووعی بووبێ . موحەققەقە کە ئەبێ ، رەنگە لە ئاخری زەمانا بێ] .

٧٨٧/٦٧ ـ ابو هريرة [رضي الله تعالى عنه] قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : انها ستكون فتن ، القاعد فيها خير من القائم ، والقائم فيها خير من الماشي ، والماشي فيها خير من الساعي ، من تشرف لها يستشرفه ، ومن وجد فيها ملجأ فليعذبه . م ـ ٣٤٩/١٠ ، ح ـ ٥١/٦ ، ح ـ ١٧٣/٦ .

٧٨٨/٦٨ ـ ابو هريرة [رضي الله تعالى عنه] پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : تكون فتنة النائم فيها خير من اليقظان ، واليقظان فيها خير من القائم ، والقائم فيها خير من الساعي ، فمن وجد ملجأ او معاذا فليستعذ . م ـ ٣٤٩/١٠ ، ح ـ ١٧٤/٦

٧٨٩/٦٩ ـ عثمان الشحام ، قال : انطلقت انا وفرقد السنجي الى مسلم بن ابي بكَرة [رضي الله تعالى عنه] وهو في ارضه فدخلنا عليه ، فقلنا : هل سمعتَ اباكَ يحدث في الفتن حديثا ؟ قال : نعم سمعتُ ابا بكَرة يحدث قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : انها ستكون فتن ، الا ثُمَّ تكون فتنةٌ ، القاعد فيها خير من الماشي فيها ، والماشي فيها خير من الساعي اليها ، الا ! فاذا نزلت او وقعت فمن كان له ابل فليلحق بابله ، ومن كانت له غنم فليلحق بغنمه ، ومن كانت له ارض فليلحق بارضه ، قال : فقال رجل : يا رسول الله أرأيت من لم تكن له ابل ، ولا غنم ،

ولا ارض ! قال : يعمد الى سيفه فيدق على حده بحجر ، ثم لينج ان استطاع النجاء ، اللهم هل بلغت ؟ اللهم هل بلغت ؟ اللهم هل بلغت [ثلاثا] ؟ قال : فقال رجل : يا رسول الله ارأيت ان أُكْرِهتُ حتى ينطلق بي الى احدِ الصَّفين ، او احدى الفئتين فضربني رجل بسيفه ، او يجيٌ سهم فيقتلني ؟ قال : يبوء باثمه واثمك ، ويكون من اصحاب النار .

م ـ ۳٤۹/۱۰

تەرجەمە :

ئەبو بەکەرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بە تەحقیق گەلێ فیتنە ئەبێ ، خەبەرتان بێ ! لە دوای ئەو فیتنانە فیتنەیێك ئەبێ ، ئەوی تیا دانیشتبێ چاکترە لەوەی تیایا بڕوا ، ئەوی تیایا بڕوا چاکترە لەوەی کە بۆی هەڕاکا . خەبەرتان بێ ! کە ئەو فیتنەیە نازڵ بوو ، یا فەرمووی : واقیع بوو ، ئەوی وشتری هەیە بچێ بۆ لای وشترەکانی ، ئەوی مەڕی هەیە بچێ بۆ لای مەڕەکانی ، ئەوی ئەرزێکی هەیە بچێ بۆ ئەرزەکەی [تێکەڵ بە ئەهلی ئەو فیتنە نەبێ] . پیاوێ عەرزیکرد : (یا رسول الله) ئەگەر کەسێ نە وشتری بوو ، نە مەڕی بوو ، نە ئەرزی بوو [چی بکا ؟] فەرمووی : بچێ بە لای شیرەکەیەوە ، دەمی بە بەردێ بشکێنێ . ئەگەر توانی نەجاتی خۆی بدا لەو فیتنەیە نەجاتی خۆی بدا ، خوایا ئایا تەبلیغم کرد ؟ خوایا ئایاتە بلیغم کرد ؟ خوایا ئایا تەبلیغم کرد ؟ ئەبوبەکەرە فەرمووی : پیاوێکی تر عەرزیکرد : خەبەرم بدەرێ : ئەگەر بە زۆر بردمیان بۆ یەکێ لەو دوو صەففە ، یا عەرزیکرد : بۆ یەکێ لەو دوو جەماعەتە ، یەکێ بە شیر لێی دام ، یا تیرێ هاتو کوشتمی ؟ یەعنی گوناهم هەیە یان نا ؟ فەرمووی : ئەو کەسە کە ئەتکوژێ ئەگەر تۆ بە ناحەق ئەوت بکوشتایە

چەندی گوناه هەیە ئەو گوناهەو گوناهی خۆی کە تۆ بە ناحەق ئەکوژێ ئەبا بۆ خۆیو ، لە ئەصحابی ئاگر ئەبێ .

لە حەدیثەکەی ئەوەڵی ئەبوهورەیرەدا ئەفەرموێ : هەرکەسێ کە ملی بۆ بەرزکاتەوەو ملی بۆ درێژ کا ئەو فیتنەیە ئەیکێشیتە لای خـۆی . هەرکەسێ مەلجەئێکی ببێ پەنای بەرێتە بەر خۆیی لێ بپـارێزێ . لـە حەدیثەکەی تریا ئەفەرموێ : لەو فیتنەدا نوستوو لە بێدار چاکترە ، بێدار لە راوەستاو چاکترە . . . . الخ .

مەذهەبی بەعزێ لە ئەصحابی کیرام وایە دروست نییە کە ئینسان داخڵی هیچ فرقەیێ ببێ لە وەختی فیتنەی موسوڵمانان . حەتا بچنە سەر ماڵەکەی کە ئەگەر داخڵی طەرەفێ نەبێ بیکوژن دروست نییە بۆی کـە مودافەعەی نەفسی بکا ، وەك مەذهەبی ئەبوبەکرەو ئەمثالی ـ رضي الله تعالى عنهم ـ . مەذهەبی ئیبن‌وعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ یش وایە . ئەمما مودافەعەی نەفس دروستە .

مەذهەبی موعظەمی صەحابەو تابیعین‌و عامەی عولەمای ئیسلام نوصرەتی حەق واجبە لەبەر ئایەتی (وان طائفتان من المؤمنين اقتتلوا . . . الاية)[1] .

مەذهەبی صەحیح ئەمەیـە ئەم ئـەحادیثـانە تـەخصیص ئەکـەن بەوانەوە کە هەردوو طەرەف هیچ تەئویلیان بە دەستەوە نەبێو ، ئەوانەی کە حەق بەدەستیان بوو مەعلووم نەبووبێ بۆچی ئەگەر نوصرەتی حەق نەدرێ ئەشقیاو ئەهلی بەغی‌و فەساد زۆر ئەبن‌و فەسادی زۆر ئەکەن ، وەك ئێستە .

---

(١) سوورەتی : حوجورات ، ئایەتی : ٩ .

صاحب من صاحب اصحاب رسول الله ـ ﷺ ـ ؟ فيقـولون : نعم ، فيفتح لهم . وعن جابر مثله ، وليس فيه الثالث . ح ـ ٦/٤٨/٧٧ وفي الجهاد .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : زەمانێ بەسەر خەڵقـا یێت بەعـزێ طائیفە غەزا ئەکەن پێیان ئەڵێن : ئەصحابی پێغەمەرتان تیایە ؟ ـ ﷺ ـ ، ورضي عنهم ـ ئـەڵێن : بـەڵێ . فەتحیـان بـۆ ئـەکـرێ بـە بـەرەکـەتی ئەصحاب ، لە دوایی یا زەمانێ بەسەر ئینسانانا یێ قەومێ غەزا ئەکەن لێیان ئەپرسن : ئەصحابی ئەصحابی پێغەمەرتان تیایە ؟ ـ ﷺ ـ ورحمهم الله ، ورضي الله عنهم ـ ئەڵێن : ئا . فەتحیان بۆ ئـەکرێ . لـە دواییا زەمانێ بەسەر ئینسانـانا یێت قـەومێ غەزا ئـەکەن لێیـان ئەپـرسێ : ئەصحابی ئەصحابی ئەصحابی پێغەمەر ـ ﷺ ـ ، ورضي عنهم ، ورحمهم الله ـ تان تیا هەیە ؟ ئەڵێن : بەڵێ . فەتحیان بۆ ئەکرێ .

یـەعنی ئەصحـاب هەمـوویان بـاشن ، بێ غەشن . تـابیعینیش ئەکثەریان باشە . تابیعینی تابیعینیش باشیان زۆرە . بە بەرەکەتی چاکی ئەو زەمانە خوا نەصرەتی موسوڵمانان ئەدا ئەگەر خەڵق هەموو پەیرەوی قورئانو سونەت بکا دنیا دوشمنیان بێو گەلەکۆمەکیان لێ بکـەن قەط ناشکێن . ئەمما هەیهات . خوا ئیصلاحی حاڵی موسوڵمانان بکا .

۸۲۲/۱۰۲ ـ عن زينب بنت جحش [امنا ام المؤمنين ـ رضي الله تعالى عنها ـ] : ان النبي ـ ﷺ ـ دخل عليها فزعا يقول [قد استيقظ من النوم وهو يقول . اخرى م] : لا اله الا الله من شر قد اقترب ؛ فتح اليوم من ردم يأجوج ومأجوج مثل هذا ، وحلق باصبعه [الابهام] وبالتي تليها .

فقالت زينب : فقلت : يا رسول الله انهلك وفينا الصالحون ؟ قال : نعم اذا كثر الخبث . ح ـ ٦/٥٠ ، م ـ ١٠/٣٤٤/٣٤٥ ، ح ـ ١٠/١٦٤/٢٠٦ [فزعا محمرا وجهه يقول . اخرى . م]

تەرجەمە :

حەزرەتی زەینەبەی دایکمان ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی هاتەلام بەترسەوە . لە ریوایەتەکەی ترا ئەڵێ : بەترسەوە لە خەو هەڵسا ئەفەرموێ : لا اله الا الله لە شەرێکە نزیك بوەوە ، ئیمرۆ لە سەددی یەئجووج و مەئجووج بە قەد ئەوەندەی لێ کراوەتەوە ، پەنجەی گەورەیی و شەهادەتی کرد بە حەلقە ، حەزرەتی زەینەبە ـ رضي الله تعالیٰ عنها ـ فەرمووی : وتم : (یا رسول الله) ئایا ئێمە هیلاك ئەبین ، وەحاڵ ئەوەندە ئینسانی صاڵحمان لەناوایە ؟ فەرمووی : بەڵێ کە پیسێتی زۆر ببێ . ح ـ ٦/٥٠ ، ح ـ ١٠/١٦٤/٢٠٦ وفيه : ويل للعرب من شر . م ـ ١٠/٣٤٥ ن ، جه .

١٠٣/٨٢٣ ـ خباب بن الارت [رضي الله تعالى عنه] قال : شكونا الى رسول الله ـ ﷺ ـ وهو متوسد بردة له في ظل الكعبة ؛ قلنا له : الا تستنصر لنا ألا تدعو الله لنا ؟ قال : كان الرجل فيمن قبلكم يحفر له في الارض فيجعل فيه ، فيجاء بالمنشار فيوضع على راسه فيشق باثنتين ، وما يصده ذلك عن دينه ! ويمشط بامشاط الحديد [جمع مُشْط] ما دون لحمه من عظم او عصب . وما يصده ذلك عن دينه ! والله لَيُتَمَّنَّ هذا الامر حتى يصير الراكب من صنعاء الى حضر موت لا يخاف الا الله او الذئب على غنمه . ولكنكم تستعجلون . ح ـ ٦/٥٨د ، ن ، ح ـ ١٠/٩٢ وفي باب مالقي النبي ـ ﷺ ـ من المشركين .

١٠٤/٨٢٤ ـ وعنه يقول : اتيت النبي ـ ﷺ ـ وهو متوسد بردة وهو في ظل الكعبة ، وقد لقينا من المشركين شدة فقلت : الاتدعو الله ؟ فقعد وهو محمرٌ وجهه ، فقال . . . والباقي مثله بتقديم المشط على الاشر ، ويصرفه بدل يصدُّه . ح ـ ٦/١٧٧ .

تەرجەمە :

خەببابى كورى ئەرەت ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووى : شكايەتى ذيللەتمان بردە خذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە سێبەرى كەعبەدا شانى دادابوە سەر بوردەيێ ، لە موشريكان زۆرمان ئەذييەت ديبو ، عەرزمان كرد : (يا رسول الله) بۆ طەڵەبى نەصرەتمان بۆ ناكەى ؟ بۆ دوعامان بۆ ناكەى ؟ تەشريفى هەڵساو دانيشت ، سوور بوويوەوە ، يەعنى ئەو تەكليفەى لە لا ناخۆش بوو . فەرمووى : پياو لە پياوانى پێش ئێوە ئەرزيان بۆ هەڵەكەنرا ، مشاريان بۆ ئەهێنرا ، ئەيان نايە سەر تەوقى سەريان ، ئەيانكردن بە دوو لەتەوە ، ئەوە لە دينى نەدەگێرايەوە ! شانەى ئاسنينيان بۆ ئەهێنا ، گۆشت و رەگيان بەو شانەيە لە ئێسقانيان دائەماڵى ، ئەوە لە دينى نەئەگێراوە ! وەڵڵاهى ! خوا ـ عز وجل ـ ئەم دينە ئيكماڵ ئەكا تا واى لێ بێ سوارێ لە صەنعاى يەمەنەوە تا حەضرەمەوت ئەچێ لە غەيرى خوا ناترسێ ، لە غەيرى گورگ ناترسێ لەبەر مەرەكانى . ئەمما ئێوە عەجەلە ئەكەن (صدق رسول الله ـ ﷺ ـ) صەبر كليلى فەرەجە .

١٠٥/٨٢٥ ـ اسود بن عامر ، حدثنا شعبة بن الحجاج عن ابي نضرة ، عن قتادة ، عن قيس بن عباد . اخرى . م ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قلت لعمار : ارأيتم صنيعكم [أرأيت قتالكم . م اخرى] هذا الذي صنعتم في امر علي ؟ ارأيا رايتموه [فان الراي يخطي ويصيب ، او عهدا . م اخرى] او شيئاً عهده اليكم رسول الله ـ ﷺ ـ ؟ فقال : ماعهد

الينا رسول الله ـ ﷺ ـ شيئا لم يعهده الى الناس . ولكن حذيفة [رضي الله تعالى عنه] اخبرني عن النبي ـ ﷺ ـ قال : [ان رسول الله . اخرى م] قال النبي ـ ﷺ ـ : [في امتي . م اخرى] في اصحابي اثنا عشر منافقا . فيهم ثمانية لا يدخلون الجنة [ولا يجدون ريحها . اخرى م] حتى يلج الجمل في سم الخياط ـ بحركات السين ـ ثمانية منهم تكفيكهم الدبيلة [سراج من النار يظهر في اكتافهم حتى ينجم من صدورهم م . اخرى [يظهر ويعلو] واربع لم احفظ ما قال شعبة فيهم م ـ ١٠/٢٥٥ .

تەرجەمە :

ئەسوەدی کوڕی عامیر ئەڵێ : شوعبەی کوڕی حەججاج لە قەتادەوە ، ئەویش لە ئەبو نەضرەوە ، ئەویش لە قەیسی کوڕی عوبادەوە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قسەی بۆ کردین کە : قەیس ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : عەرزی عەممارى کوڕی یاسیرم کرد ـ رضي الله تعالى عنه ـ : خەبەرم بدەرێ ئەو شەڕو شۆڕو موعامەلەیە کە کردتان بۆ ئیشی حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئایا بە رەئی خۆتان بوو ؟ ئەگەر بە رەئی بووبێ رەئی خەطایش ئەکاو ئیصابەتیش ئەکا ، یاخۆ شتێکە کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمری پێ کردوون کە بیکەن ؟ فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەهدی شتێکی لەگەڵ خوصووصی ئێمە نەکردوە کە لەگەڵ عموومی خەڵقا نەیکردبێ ، یەعنی چی بە خەڵق فەرمووبێ ئەوەیشی بە ئێمە فەرموە . ئەمما ئەوەندە هەیە حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ خەبەری داومێ لە پێغەمەرەوە ـ ﷺ ـ کە فەرموویەتی : لە ئەصحابی منا ؛ لە ئوممەتی منا دوانزە مونافیق هەن ، هەشتیان ناچنە بەهەشتەوەو بۆنی ناکەن تا وشتر ئەچێتە کونی دەرزی‌یەوە !

[دیارە وشتر بە کونی دەرزی‌یەوە ناچێ . یەعنی قەط ناچنە

بەهەشتەوە . (جَمَل) وشتر ، (جُمَّل) گوریسی زۆر ئەستوور ، هەر کامێکیان بێ تەعلیقە بە مەحاڵەوە . ئەگەر وەشترەکە یا گوریسەکە باریك بکرێتەوە وەك خەیاطە ئەو وەختە پێیان ناڵێن و شترو گوریس . کونی دەرزییەکە گەورە بکرێ تا وشتر ئەمدیو ئەودیوی پیا بکا ، یا گوریسی پێوە بچێ پێی ناڵێن دەرزی . یەعنی هەردوو لا لەسەر حاڵی خۆیان بمێنن تا وشتر یا تا گوریس بە کونی دەرزییەوە نەچن ـ کە بە عەقڵ مەحاڵە ـ ئەو هەشت کەسەیان ناچنە بەهەشتەوە]

هەشت لەوان گرێکی ئاگر لە دەفەی شانیانەوە[1] تا لە سنگیان بێتە دەرەوە ئەوانە لە ئێوە دەفع ئەکا . ئەسوەد ئەڵێ : حیفظی ئەوەم نەکردوە کە شوعبە دەرحەق چوارەکەی تر چی وت .

**١٠٦/ ٨٢٦ ـ ابو الطفيل قال : كان بين رجل من اهل العقبة :**

فەرمووی : لە بەینی پیاوێ لە ئەهلی عەقەبە [ی تەبووك و کە مونافیقان لەوێدا کۆبوونەوە کە غەدر لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ بکەن خوای تەعالا حیفظی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ لە شەری ئەو مونافیقانە] .

**وبين حذيفة بعض ما يكون بين الناس :**

لە بەینی حوذەیفەدا ـ رضي الله تعالى عنه ـ بەعزێ لەو دەمەقاڵێەی کە لە بەینی خەڵقا ئەبێ وقووعی بوو .

**فقال :**

ئەو پیاوە وتی :

**انشدك ـ كنصر ـ بالله !**

(١) وەرگێر ـ خ ـ مانای (يظهر)ی لەبیرچوە . کە ئەمەی بخرێتەوە سەر مانای حەدیثەکە وای لێ دێت : «گرێکی ئاگر لە دەفەی شانیانەوە پەیدا دەبێ . . .»

بە خوات سوێند ئەدەم ! کە :

**کم کان اصحاب العقبة ؟**

ئەصحابی عەقەبە کە تەمایان بوو غەدر کەن لە پێغەمـەر ـ ﷺ ـ
چەند کەس بوون ؟

**قال : فقال له القوم : اخبره اذ سألك :**

ئەبو طوفەیـل وتی : ئەو خـەڵقەی کـە لە لایـان بوون عـەرزی حوذەیفەیان کرد ـ رضي الله تعـالی عنه ـ : کـە چونکی لێی پـرسیوی خەبەری بدەرێ .

**قال : کنا نخبر انهم اربعة عشر ، فان کنتَ منهم فقد کان القوم خمسة عشر :**

حوذەیفە ـ رضي الله تعالی عنه ـ فـەرمووی : خـەبەرمـان دراوەتێ کە چواردە بوون ، ئەگەر تۆیش لەوان بووبی بوون بەپانزە .

**واشهد بالله ان اثني عشر منهم حرب لله ولرسوله في الحياة الدنيا ويوم يقوم الاشهاد[1] :**

خوا ئەکەم بە شاهید کە دوانزە لەوان ئیعلانی حەربیان کردوە لەگەڵ خوا ـ عز وجل ـ و لەگەڵ رەسوولی خوادا ـ ﷺ ـ لە حەیاتی دنیاداو لەو رۆژەدا کە شاهید رائەبووررێ لە حوضووری خوادا .

**وعذر ثلاثة ؛ قالوا : ما سمعنا منادي رسول الله ـ ﷺ ـ ولا علمنا بما اراد القوم :**

---

(١) لەم شوێنەدا پاش و پێشێـك هەبـوو بەم شێـوە لە «ان اثنی عشـر . . . تا الاشهـاد» دوای تـەرجـەمـەکـەی نـووسـرابـوو ئێمـە خستمـانـەوە پێش تەرجەمەکە . هەروەها ئەو بەشەی دوایی کە بـە «فمشی . . فقال . .» دەست پێدەکات .

سیانیش لەو قەومە پێغەمەر ـ ﷺ ـ عـوذری لێ قەبـووڵ کردن ، وتیان : گوێمان لە مونادیی پێغەمەر ـ ﷺ ـ نەبووە و خەبەریشمـان نی یە لەوەی کە ئەو مونافیقانە قەصدو ئیرادەیان کردوە ، کە ئیتیفاقیان کردوە لەسەر سووئی قەصد دەرحەق پێغەمەر ـ ﷺ ـ

**وقد كان في حرة :**

ئەو سەفەرەیش کە سەفەری تـەبووکـە لە گـەرمایـەکی زۆر بە شیددەتا بوو .

**فمشى فقال : ان الماء قليل فلا يسبقني اليه احد ، فوجد قوما قد سبقوه فلعنهم يومئذ . م ـ ١٠/١٥٧**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ حەرەکەتی فەرموو ، فەرمووی : ئاوی تەبـووك کەمە لـە پێش منا کـەس نەچێ و دەستی بـداتێ . پێغەمـەر ـ ﷺ ـ کە تەشریفی چوە سەر ئاوەکە بەعزێ کـەسی لێ پێشکەوتبـوو ، دەستیان لێدابوو . ئەو رۆژە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەو مونافیقانەی لەعن کرد .

بەدەم خەوەوە بووم بەعزێ لە تەرجەمەکەم لە مەتنی حەدیثەکە پێش خستوە .

**١٠٧/٨٢٧ ـ عروة قال : قالت لي عائشة [رضي الله تعالى عنهما] : يا ابن اختي اُمِروا ان يستغفروا لاصحاب رسول الله ـ ﷺ ـ فسبـوهم ! م ـ ١٠/٤٧٢**

**[قالت هذا عندما سمعت اهل مصر يقولون في عثمان ما قالوا ، واهل الشام في علي ما قالوا ، والحرورية في الجميع . نووى ـ رضي الله تعالى عنها ـ واخزى السابين في نار جهنم !]**

**تەرجەمە :**

عورروە فەرمووی : حەزرەتی عایشەی دایکمان ـ رضي الله تعالى

عنها ـ پێی فەرمووم : ئەی کوڕی خوشکم [ئەسما بینتی صەدیق ـ رضي الله تعالى عنهما] ئەمریان پێکراوە ئیستیغفار بکەن بۆ ئەصحابی پێغەمەر ـ ﷺ ، ورضي عنهم ـ کەچی جوێنیان پێ ئەدەن . ئەم قسەیـەی ئەو وەختە فەرمووکە بیستی میصریی جوێن بە ئیمامی عوثمان ئەدەن ـ رضي الله تعالى عنه ـ شامیش جوێن بە ئیمامی عەلی ئەدەن ـ رضي الله تعالى عنه ـ حەرەووریش لە سەر مەسئەلەی تەحکیم جوێن بە هەردوولاو بە سائیری ئەصحابە ئەدەن . (لعن الله اللاعنین !) .

**۸۲۸/۱۰۸ ـ حذيفة بن اسيد الغفاري [رضي الله تعالى عنه] قال : اطلع النبي ـ ﷺ ـ علينا ونحن نتذاكر . فقال : ما تذاكرون ؟ قالو : نذكر الساعة . قال : انها لن تقوم حتى ترون قبلها عشر آيات : فذكر ١ ـ الدخان . ٢ ـ والدجال . ٣ ـ والدابة . ٤ ـ وطلوع الشمس من مغربها . ٥ ـ ونزول عيسى بن مريم ـ عليهما الصلاة والسلام ـ . ٦ ـ ويأجوج ومأجوج . وثلاثة خسـوف . ٧ ـ خسف بالمشـرق . ٨ ـ وخسف بالمغرب . ٩ ـ وخسف بجزيرة العرب . ١٠ ـ وآخر ذلك نار تخرج من اليمن تطرد الناس الى محشرهم . وفي اخرى : وريح تلقي الناس في البحر . وفي اخرى : تنزل معهم اذا نزلوا ، وتقيل معهم حيث قالوا . م ـ ١٠/٣٦٣/٣٦٥ وفي اخرى : قال : كان النبي ـ ﷺ ـ في غرفة ونحن اسفل منه ، فاطلع . . . وفي آخره نار تخرج من قعرة عدن ترحل الناس .**

**تەرجەمە :**

حـوذەیفەی کـوڕی ئەسیـدی غیفاری ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ فەرمووی : تەشریفی پێغەمەر ـ ﷺ ـ لەسەرخـانێ بوو ئێمـە لە خـوار ئـەوەوە بووین . رۆژێ طـەلعەتی طـولووعی کـرد بەسـەرمانـا ، ئێمە

موذاکەرەمان ئەکرد . فەرمووی : موذاکەرەی چی ئەکەن ؟ عەرزمانکرد : قسە لە ساعەت ئەکەین کەی هەڵەستێ . فەرمووی : تا لە پێش ئەوەوە دە عەلامەت ظوهوور نەکاو نەیبینن قیامەت هەڵناستێ :
١ ـ دوخانو . ٢ ـ دەججالو . ٣ ـ دابةالارضو . ٤ ـ طولووعی رۆژ لە مەغریبەوەو . ٥ ـ نوزوولی عیسای کوڕی مەریەم ـ علیهما السلام ـ . ٦ ـ یەئجووجو مەئجووجو . سێ رۆچوونی ئەرزو . ٧ ـ رۆچوونێکی لە مەشریق . ٨ ـ رۆچوونێکی لە مەغریب . ٩ ـ رۆچوونێکی لە (جزیرة العرب) ذیکر فەرموو . ١٠ ـ فەرمووی : ئاخری ئەوانە ئاگرێکە لە یەمەن ظوهوور ئەکا ، کۆچ بە خەڵق ئەکا بۆ مەحشەر . لە ریوایەتێکا : بایێکیش کە خەڵق فڕێئەداتە ناو بەحر .

**١٠٩ / ٨٢٩ ـ عوف بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : اتيت النبي ـ ﷺ ـ في غزوة تبوك ، وهو في قبة من ادم . فقال : أعدد ستا بين يدي الساعة : موتى ، ثم فتح بيت المقدس [وقد وقعتا] ثم موتانٌ [طاعون] يأخذ فيكم كقعاص الغنم [داء يأخذ الدواب فيسيل من انوفها شئ فتموت فجأة] . ثم استفاضة المال ، حتى يعطى الرجل ماءة دينار فيظل ساخطا . ثم فتنة لا يبقى بيت من العرب الا دخلته . ثم هدنة [متاركة] تكون بينكم وبين بني الأصفر ، فيغدرون ، فيأتونكم تحت ثمانين غاية [راية] تحت كل غاية اثنا عشر الفا . ح ـ ٥/٢٣٢ .**

**تەرجەمە :**

عەوفی بنی مالیك ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : لە غەزای تەبووکا چوومە خدمەت پێغەمبەر ـ ﷺ ـ لە خێوەتێکی چەرما بوو .

فەرمووی : لە بەینی خۆت و قیامەت هەڵسانا شەش شت هەڵژمێرە :
١ ـ مردنی من .
٢ ـ فەتحی (بیت المقدس) لە دواییدا .
٣ ـ تاعوونێك : مردنێکی عموومی ئەتانگرێ ، وەك نەخۆشی یەك کە مەڕ ئەگرێ و لە لوتیەوە شتێك جاری ئەبێ و (فجأة) پێی ئەمرێ .
٤ ـ لە دواییدا ماڵ زۆر بوون بە دەرەجەیێك صەد دینار ئەدەی بە یەکێ و بە کەمی ئەزانێ و لێی ئەتۆرێ و رقی هەڵەسێ .
٥ ـ لە دواییدا فیتنەیێك هیچ خانوویێ[1] نامێنێتەوە کە تێی نەچێ .
٦ ـ لە دواییدا موتارەکەیێك لە بەینی ئێوەو بەنی ئەصفەرا . ئەوان غەدر ئەکەن ، موعاهەدەکە ئەشکێنن ، بە لەشکرێکی هەشتا بەیاخی یەوەو ، هەر بەیاخێ دوانزەهەزار کەسی لەژێرا بێ بێنە سەرتان .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ وەفاتی فەرمووە . قودس فەتح کراوە . گەلێ تاعوون و مەوتی عموومی بوە . فیتنەی بەینی عەرەبیش لە شەهادەتی حەزرەتی عوثمانەوە دەستی پێ بکە تا زەمانی پادشاهانی عەبباسی نەبڕایەوە . ئەوانی تریش دیارە کە ئەبن .

مەعنای وا نی یە کە ئەم شەشە بوون دەرحاڵ قیامەت هەڵەستێ . یەعنی تا ئەمانە نەبێ هەڵناسێ ، ئەمانە تەنها دەلیلی قیامەت هەڵسانە .

**١١٠ / ٨٣٠ ـ رهط منهم ابو الدَّهماء ، وابو قتادة ، قالوا : كنا نمر على هشام بن عامر ، نأتي عمران بن حصين ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فقال ذات يوم : انكم لتجاوزوني الى رجال ما كانوا باحضر لرسول الله ـ ﷺ ـ مني ، ولا اعلم بحديثه . سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : ما بين خلق**

(١) لە حەدیثەکەدا «هیچ خانوو بێ لە عەرەب»ە . دیارە وەرگێر لەبیری چوە .

آدم الى قيام الساعة خلق [امر . اخرى م] اكبر من الدجال .
ح ـ ١٠/٤١٠ .
تەرجەمە :

جەماعەتێ لە تابیعین وەك (ابو الدهما) و قەتادە فەرموویان : بەسەر هیشامی کوڕی عامیرا رائەبوردین ئەچووینە خدمەت عیمرانی کوڕی حوصەین ـ رضي الله تعالى عنهما ـ هیشام ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئێوە لە من تێپەڕ ئەبن بۆ لای بەعزێ پیاو کە لە من زیاتر حازر نەبوون لە خدمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ ، لە من زیاتر عالمتر نین بە حەدیثی ، لە پێغەمەرم بیست ـ ﷺ ـ ئەیفەرموو : لە بەینی خەلقی ئادەم ـ علیه الصلاة والسلام ـ تا قیامی ساعەت خەڵقێ هەن لە خوصووصی شەڕو زەرەر بۆ خەڵق لە دەججال گەورەترن .

[دەججال چی ئەکا ؟ موددەی چل رۆژی ئەو ـ کە ساڵێك و چەند مانگێ ئەگرێتەوە ـ خەڵق دەعوەت ئەکاتە سەر کوفر . ئەمە هەزارو چەند ساڵ زیاترە ئێمە لەو حاڵەداین . (حفظنا الله من ذلك الخلق) . ئەمە موعجیزەی پێغەمەرە ـ ﷺ ـ کە نەی فەرموە پیاوێ هەیە فەرموویەتی خەڵقێ هەیە]

٨٣١/١١١ ـ عن ابي هريرة [رضي الله تعالى عنه] : ان رسول الله ـ ﷺ ـ قال : بادروا بالاعمال ستا : ١ ـ طلوع الشمس من مغربها . ٢ ـ او الدخان . ٣ ـ او الدجال . ٤ ـ او الدابة . ٥ ـ او خاصة احدكم . [وفي اخرى : او خويصة احدكم اي الموت] ٦ ـ او امر العامة . [اي القيامة] [وفي اخرى (الواو) بدل (او) التي للتقسيم]
م ـ ١٠/٤١٠ .

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : لە شەش شت دەسپێشکەریی بکەن و ئیشی چاکە بکەن : ١ ـ لە پێش رۆژگەرانەوە لە مەغریبەوەو . ٢ ـ دوخانو . ٣ ـ دەجـجالو . ٤ ـ دابـة الارضو . ٥ ـ مردنو . ٦ ـ قیامەت هەڵسان .

**٨٣٢/١١٢ ـ معقل بن يسار ـ رضي الله تعالى عنه ـ ردّهُ [يعني رفعه] الى النبيّ ـ ﷺ ـ قال : العبادة في الهرج كهجرة اليّ . م ـ ٤١١/١٠**

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : عیبادەتکردن لە زەمانی فیتنەو فەسادا خێرو ثەوابی وەك خێرو ثەوابی هیجرەتکردن بۆ لای منە [چونکی لەو وەختەدا دڵی خەڵق مەشغوول ئەبێ بەو فیتنەوەو ناپەرژێتە سەر عیبادەت] .

**٨٣٣/١١٣ ـ عن سهل بن سعد [الساعدي ـ رضي الله تعالى عنه ـ] يقول : سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يشير باصبعه التي تلي الابهام والوسطى ـ وهو يقول ـ : بعثت انا والساعة هكذا م ـ ٤١٢/١٠ ، ح ـ ٢٧٨/٩ وعن انس ـ رضي الله تعالى عنه ـ بلفظ كهاتين . وعن قتادة : كفضل احداهما على الأخرى .**

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە پەنجەی شەهادەت و پەنجەی ناوەراستی ئیشارەتی ئەفەرموو . ئەیفەرموو : نێررانی من و هەڵسانی قیامەت وەك ئەم دوو پەنجەیە وایە . یەعنی موددەی خەڵقی ئادەم تا ئێستە ئەوەندەی

زیاترە لە موددەی ئێستەوە تا قیامەت بە قەد زیادی پەنجەی ناوەراست بەسەر پەنجەی شەهادەتا دەرحەق باقی موددەی دنیا کە کەی قیامەت هەڵەستێ .

و هەر حەدیثێ هەڵبەسترابێو ، هەر قسەیێ کرابێ هەمووی درۆیە . موددەی دنیا مەعلووم نی یە ، ئەوەندە لەم حەدیثە مەعلووم ئەبێ کە موددەی بەقای دنیا لە پاش پێغەمەر ـ ﷺ ـ کەمترە لەوەی کە رابوردوە . بە هەشت نۆ میثلی ئەوی رابوردوە . غەیری خوا کەس نایزانێ کەی قیامەت هەڵەستێ ، لە مەغیباتی خەمسەیە ، لە قورئانا لە چەند جێگەدا ئەفەرموێ : کە عیلمی ئەوە مەخصووصە بە خوا .

لەو حەدیثە کە لە ئیمانا رابورد پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە جوابی حەزرەتی جیبریل ـ علیه السلام ـ ا فەرمووی : من لە تۆ عالمتر نیم کە کەی قیامەت هەڵەستێ .

لە دوای ئایەتو حەدیث هەر قسەیێ بکرێ هەمووی درۆو دەلەسەیە هەڵبەستراوە .

في القسطلاني في تلك الصحيفة واللتان تليانها شفاء لما في الصدور . فراجعها .

١١٤/٨٣٤ ـ عن امنا عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت : كانت العرب [كان رجال من الاعراب جفاة . بخاري] اذا قدموا على رسول الله ـ ﷺ ـ سألوه عن الساعة : متى الساعة ؟ فنظر الى احدث انسان منهم ، فقال : ان يعش هذا لم يدركه الهرم قامت عليكم ساعتكم . وعن انس ـ رضي الله تعالى عنه ـ نحوه كثير في مسلم . ح ـ ٢٨٣/٩ وفيه قال هشام : يعني : موتهم م ـ ٤١٣/١٠

**تەرجەمە :**

حەزرەتی عائیشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : عەرەبی بەررانیی تەبیعەت وشك كە ئەهاتنە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ لێیان ئەپرسی : كەی قیامەت هەڵەستێ ؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەماشای كام ئینسان لەوێدا لە هەموویان بوچووكتر بووی كرد ، فەرمووی : ئەگەر ئەمە بژ ییێ ناگاتە پیربوون قیامەتی ئێوە هەڵەستێ . یەعنی ئەمرن .

تەماشای فەرموودەی پێغەمەر كە ـ ﷺ ـ چەندە حەكیم بوە ! عاریف بوە بە مەقامی خیطابو بەو موخاطەبانەی كە قسەیان لەگەڵ ئەكا . نەیفەرموو قیامەت هەڵەستێ ، فەرموویەتی : قیامەتی ئێوە هەڵەستێ . ئەگەر بیفەرمووایە : نازانم ئەو عەرەبانە ـ چونكی ئێشتا ئیسلامەتی تەواو لە دڵیانا نەچەسپی بوو ـ[1] بكەونە شوبهەوە یا ئیرتیداد بكەن . كەچی لە جوابی جوبریل ـ علیه السلام ـ ا فەرمووی : سائیل لە مەسئوول عالمتر نی یە[2] . چونكە ئەو وەختە ئەوانە كە لە خدمەتیا بوون ئیمانیان لە پیكی پۆڵا ساغتر بوو . ئەگەر لە جوابیانا بیفەرمووایە فلانە وەقت قیامەت هەڵەستێ موخالیفی : واقیعو ، ئایاتو ، ئەحادیثی خۆی ئەبوو . خوڵاصە مردنی كوللی كەسێ قیامەتی ئەو كەسەیە .

**١١٥/٨٣٥ ـ عن ابي هريرة [رضي الله تعالى عنه] : ان النبي ـ ﷺ ـ قال : سمعتم بمدينة جانب منها في البر وجانب منها في البحر ؟ قالوا : نعم يا رسول الله . قال : لا تقوم الساعة حتى يغزوها سبعون الفا من بني**

---

(١) لێرەدا ماناكەی باش ناڕوات دەبێ بگوترێ : «لەوانە بو بكەونە» یا «ئەكەوتنە»

(٢) ئەمەیش پێچەوانەیە ، دەبوو بیگوتایە : «مەسئوول لە سائیل عالمتر نی یە» .

اسحاق [الظاهر من اسماعيل ، كما نقله القـاضي عياض عن بعض ، والبلدة قسطنطين . من نووي] فاذا جاؤها نزلوا فلم يقاتلوا بسلاح ، ولم يرموا بسهم . قالوا : لا اله الا الله والله اكبر . فيسقط احد جانبيها قال ثوري : لا اعلم الا قال الذي في البحر . ثم يقولوا الثانية لا اله الا الله والله اكبر . فيسقط جانبها الآخر ، ثم يقولوا الثالثة لا اله الا الله والله اكبر . فتعرج لهم ، فيدخلوها فيغنموا ، فبينما هم يقتسمون المغانم اذ جاءهم الصريخ : ان الدجال قد خرج ! فيتركون كل شئ ويرجعون م- ١٠/ ٣٧٦ .

تەرجەمە :

پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : شارێکتان بیستوە کە طەرەفێکی لە بەرِرایەو ئەوی تری لە بەحرایە ؟ فەرموویان : بەڵێ (یا رسول الله) . فەرمووی : قیامەت هەڵناستێ تا حەفتا هەزار لە بەنی ئیسحـاق غەزای ئەکا ، کە چوونە ئەطـرافی ئەو شـارەوە لەوێ دائـەبەزن ، بـە سیلاح شەڕیان لەگەڵ ناکەن ، تیر ناهاوێن ، ئەڵێن : (لا اله الا الله والله اكبر) طەرەفێکی سوقووط ئەکا . ئەوریی راویی ئەڵێ : وا بزانم ئەو طەرەفە سوقووط ئەکا کە لە بەحرایە . لە دواییدا دووبارە ئەڵێن : (لا اله الا الله والله أكبر) طەرەفەکەی تریشی سوقووط ئەکا . لە دواییدا دەفعەی سێیەم ئەڵێن : (لا اله الا الله والله اكبر) بۆیان فەتح ئەبێ و ئەچنـە ژوورەوەو غەنیمەت ئەکەن . لەو بەینەدا کە لە بەینی خۆیانا تەقسیمی تالآن ئەکەن هاوارکەریان بۆ دێ : کە دەججال هەڵسا ! ئیتر هەموو شتێ تەرك ئەکەن و ئەگەڕێنەوە .

ئەم فەتحە غەیری فەتحی سولطان فاتیحە ؛ چونکی سولطان فاتیح بە سیلاح شەڕی کرد ، بە تۆپ گرتی ، ئەمما تیری هاویت یا نەیهاویت ؟

ئەوە مەعلووم نىيە . خەبەرى دەججاليان بۆ نەهاتو نەيشگەرايەوە . لەو وەختەوە تا ئێستە حوكوومەتى توركەو دەججاليش هەڵنەستاوە . يا ئەو شارە كە لە حەديثەكەدا هەيە (استانبول) نىيە يا (استامول) دەفعەيێكى تر لە طەرەف عەرەبەوە فەتح ئەكرێ .

(لتفتحن القسطنطينية راجع عزيزيه شرح جامع الاصغر) . ئەمما حەديثێكى ضەعيفە .

١١٦/٨٣٦ ـ عن انس [رضي الله تعالى عنه] قال : جاء رجل الى رسول الله ـ ﷺ ـ فقال : يا رسول الله متى الساعة ؟ قال : وما اعددت لها ؟ قال : حب الله ورسوله . قال : فانك مع من احببت . قال انس [رضي الله تعالى عنه] : فما فرحنا بعد الاسلام فرحا اشد من قول النبي ـ ﷺ ـ : فانك مع من احببت . [قال انس ـ رضي الله تعالى عنه ـ] : فانا احب الله ورسوله وابا بكر وعمر [رضي الله تعالى عنهم] فأرجو ان اكون معهم ، وان لم اعمل بأعمالهم . م ـ ١٠/ ٧٠ .

١١٧/٨٣٧ ـ انس بن مالك [رضي الله تعالى عنه] قال : بينما انا ورسول الله ـ ﷺ ـ خارجين من المسجد فلقينا رجلاً عند سدة المسجد [هي الظلال المسقفة عند باب المسجد] فقال : يا رسول الله متى الساعة ؟ قال رسول الله ـ ﷺ ـ : ما اعددت لها ؟ قال : فكأنَّ الرجل استكان . ثم قال : يا رسول الله ما اعددت لها كبير [من كثير . خ] صلاة ، ولا صيام [ولا صدقة . خ] . ولكني احب الله ورسوله . قال : فانت مع من احببت . م ـ ١٠/ ٧٢ ح ـ ٩/ ٩٨ . وليس فيه : كأنَّ الرجل استكان .

وفي القسطلاني : ان الرجل ذو الخويصرة اليماني الذي بال في المسجد . وليس هذا ذو الخويصرة التميمي ؛ فانه كان منافقا . وقال

للنبي ـ ﷺ ـ : اتق الله واعدِل . وسأل خالد وعمر قتله ـ رضي الله عنهما ـ

۸۳۸/۱۱۸ ـ عن ابي موسى [رضي الله تعالى عنه] قال : قيل للنبي ـ ﷺ ـ : الرجل يحب القوم ولما يلحق بهم . قال : المرء مع من احب .
ح ـ ۹۸/۹ ، م ـ ۷۲/۱۰ .

**تەرجەمە :**

ئەنەسی بنی مالیك ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : لە وەختێکا کە لە خزمەت پێغەمەرا بووین ـ ﷺ ـ لە مزگەوت ئەچووینە دەرێ گەیین بە پیاوێ لای ستارۆکەی مزگەوتەوە وتی : (یا رسول الله) کەی قیامەت هەڵەستێ ؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : چیت بۆ حازرکردوە ؟ ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئەو پیاوە (کأنه) تەریق بوەوە ، لە دوایی یا وتی : (یا رسول الله) شتێکی وا گەورەو زۆرم بۆ حازر نەکردوە لە نوێژو رۆژوو صەدەقە ، ئەمما خواو پێغەمەرم خۆشەوێ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : کە وابێ تۆ لەگەڵ ئەو کەسەی کە خۆشت دەوێ .

لە حەدیثەکەی پێشەوەدا ئەنەس فەرمووی : لە دوای ئیسلامەتی فەرەحی وامان نەبوو وەك ئەو فەرەحە کە بوومان بە فەرموودەی پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە فەرمووی : تۆ لەگەڵ ئەو کەسەی کە خۆشتدەوێ . ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : من [یەعنی منو مەلا حسەینیش ـ سلمه الله ـ وسلامه] خوام خۆشەوێ ، پێغەمەری خوام خۆشەوێ ـ علیه الصلاة والسلام ـ ئەبوبەکرو عومەریشم خۆشەوێ ـ رضي الله تعالى عنهما ـ . هەموو ئەهلی بەیتو ، ئەزواجی طاهیراتو ، هەموو ئەصحابی کیرامیشمان خۆشەوێ . اللهم احشرنا معهم ـ رضي الله تعالى عنهم ـ اجمعين .

ئەو پیاوە (ذو الخویصرە)ی یەمانی‌یە ، (ذو الخویصرە)ی تەمیمی نی‌یە ، کە بە پێغەمەری وت ـ ﷺ ـ : (اعدل) ؛ چونکی ئەو مونافیق بوو ، رەئسی خاریجی بوو . ئەمە حوببی خواو رەسوولی خوای هەیە .

بە دیققەت تەماشای جوابی پێغەمەر کە ـ ﷺ ـ کە بەحثی لە قیامی ساعەت تیا نی‌یە . (کأنە) فەرموویەتی : تۆ دەخڵت بەسەر وەقتی قیامەت‌هەڵسانا چیە ؟ هەر وەختێ هەڵستێ با هەڵسێ . تۆ لە دنیادا عەمەلی چاکەی بۆ حازر کە ! پیاوەکە لە خۆشییا سوئالەکەی خۆی لە بیر چۆتەوە .

١١٩/٨٣٩ ـ جابر بن عبدالله [رضي الله تعالى عنهما] يقول : سمعت النبي ـ ﷺ ـ يقول : ـ قبل ان يموت بشهر ـ تسألوني عن الساعة ، وانما علمها عند الله ، واقسم بالله ربي ! ما على الارض من نفس منفوسة تأتي عليها مائة سنة . وفي اخرى : وهي حية يومئذ م ـ ٩/ ٤٣٠

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ مانگێ لە پێش وەفاتیا ئەیفەرموو : ئێوە سوئالم لە قیامی ساعەت لێ ئەکەن ، عیلمی ئەوە (انما) هەر لای خوایە ، یەعنی کەسی تر نایزانێ ، سوێن بە خوای رەببی خۆم ئەخۆم ! کە : هیچ نەفسێکی رۆح لەبەر نی‌یە ئیمرۆ لەسەر ئەرز کە صەد ساڵی بەسەرا بێ‌و ئەو رۆژە زیندووبێ . یەعنی ئەوی ئێستە لەسەر ئەرزایە ناگاتە صەد ساڵ ئەمرێ . مەعنای وا نی‌یە کە تا صەد ساڵی تر هەموو دنیا ئەگاتە نیهایەت‌و قیامەتی عومومی هەڵەستێ .

١٢٠/ ٨٤٠ ـ عن ابي هريرة [رضي الله تعالى عنه] قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ مُنِعت العراق درهمها وقفيزها ، ومُنِعت الشام مُدْيها ودينارها ،

ومُنِعت مصر اردبها ودينارها . وعدتم من حيث بدأتم ، شهد على ذلك لحم ابي هريرة ودمه . م ـ ١٠/٣٥٨

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : عێراق مەنعی دیرهەمو قەفیزی لێ ئەکرێ ، شام مەنعی مودیو دیناری لێ ئەکرێ : میصر مەنعی ئەردەبو دیناری لێ ئەکرێ ، لە کوێوە هاتوون عەودەت ئەکەنەوە بۆ ئەوێ . یەعنی ئیسلام بە غەریبی ظوهووری کردو غەریب ئەبێتەوە .

ئەبو هورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لەسەر ئەمە کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ وای فەرموە گۆشتو خوێنی ئەبو هورەیرە شەهادەت ئەدا .

قەفیز : ظەرفێکە هەشت (مكوك) ئەگرێ . (مكوك) ربەو نیوێکە . ربە پێنج (کیلە)یە . عێراقی بەوە دانەوێڵە ئەپێون .

مودی : ئەهلی شام شتی پێ ئەپێون ، پانزە مەکووکە .

(اردب) : ئەهلی میصر شتی پێ ئەپێون . بیستو چوار ربەیە .

مەنع دوو مەعنای هەیە کە مەشهوورن :

١ ـ ئیسلام ئەبنو جیزیەیان لەسەر هەڵەگیرێ .

٢ ـ عەجەمو رۆم ئیستیلا ئەکەن بەسەر مەمالیکا لە ئاخری زەمانا ، مەنعی ئەکەن لە موسوڵمانان .

مەعنایێکی تریش هەیە : خەڵق لە ئاخری زەمانا مورتەد ئەبنو زەکات نادەن .

مەعنایێکی تریش هەیە : کوففار بە شەوکەت ئەبن ، جیزیەو خەرج نادەن . (كل ذلك من نووي)

ئەم حەدیثە موعجیزەیێکی گەورەی تیایە ؛ ئەو وەختە کە پێغەمەر

ـ ﷺ ـ کە ئەمەی فەرموو ، نە عێراق ، نە شام ، نە میصر هیچیان نە جیزیەیان ئەدا ، نە فەتح کرابوون . فەرموودەکەی ئیشارەتە بەوە کە جیزیە ئەدەن . . دایان ، فەتح ئەکرێن ، فەتح کران . لە دوایی مەنعی ئەوە ئەکەن لە ئیسلام کە ئەیاندانێ . ئێستە ئەو جێیانە با (ظاهراً) حوکومەتی ئیسلام بن ئێستە هەموو لە ژێر ئیدارەی ئینگلیلزو فەرەنگان (صدق رسول الله ـ ﷺ ـ)

٨٤١/١٢١ ـ عن الجريري عن ابي نضرة قال : كنا عند جابر بن عبد الله [رضي الله تعالى عنهما] فقال : يوشك اهل العراق ان لا يجيّ اليهم قفيز ولا درهم . قلنا : من اين ذاك ؟ قال : من قبل العجم يمنعون ذلك . ثم قال : يوشك اهل الشام ان لا يجيّ اليهم دينار ولا مديٌ . قلنا : من اين ذاك ؟ قال : من قبل الروم . ثم اسكت هنية . ثم قال [من هنا عن ابي سعيد الخدري ـ رضي الله تعالى عنه] قال رسول الله ـ ﷺ ـ : يكون في آخر أمتي خليفة يحثي المال حثيا ، ولا يعده عدا . قال : قلت لأبي النضرة وابي العلاء : اتريان انه عمر بن عبد العزيز [رضي الله تعالى عنه] ؟ فقالا : لا . م ـ ٣٧٢/١٠

تەرجەمە :

جەریری لە ئەبی نەضرەوە کە فەرمووی : لای جابیری کوڕی عەبدوڵلا بووین [رضي الله تعالى عنهما] فەرمووی : نزیکە کە ئەهلی عێراق نە قەفیزیان بۆ بێ نە دیرهەمیان بۆ بێ . وتمان : ئەوە لەبەر چی ؟ فەرمووی : لە طەرەف عەجەمەوە لێیان مەنع ئەکەن . لە دواییدا فەرمووی : نزیکە کە ئەهلی شام دینارو مودیان بۆ نەیێ . وتمان : ئەوە لەبەرچی ؟ فەرمووی : لە طەرەفی ڕۆمەوە . لە پاشا کەمێ بێدەنگ

بوو ، لە دوایی یا فەرمووی : لە ئاخری ئوممەتی منا خەلیفەییك ئەبێ بە مست پارە ئەبەخشێ ، نایژمێرێ . جەریری ئەفەرموێ : بە ئەبو نەضرەو ئەبولعەلامان وت : ئەو خەلیفەیە ئایا عومەری بنی عەبدولعەزیزە ؟ فەرموویان : نەء .

ظاهیر وایە لە زەمانی مەهدی یا بێ .

**٨٤٢/١٢٢ ـ عن ام سلمة [رضي الله تعالى عنها] قال : استيقظ النبي ـ ﷺ ـ ذات ليلة فقال : سبحان الله ماذا انزل الليلة من الفتن ! وماذا فتح من الخزائن ! ايقظوا ذوات الحجر ، فرب كاسية في الدنيا عارية في الآخرة ، ح ـ ١٠/١٦٨ ، ح ـ ١/٢٠٣**

**تەرجەمە :**

(ام سلمە)ی دایکمان ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : شەوێ پێغەمەر ـ ﷺ ـ خەبەری بوەوە ، فەرمووی : (سبحان الله) ئیمشەو چەندە فیتنە نازڵکرایە سەر خەڵق ! چەندە خەزێنە فەتح کرا . صاحێبی حوجرەکان ـ یەعنی ئەزواجی طاهیرات ، رضي الله تعالى عنهن ـ خەبەرکەنەوە بۆ نوێژ ، چەند کەس هەیە لە دنیادا پۆشتەیەو لە ئاخیرەتا رووتو قووتە .

یەعنی لە وەختی خۆفو فیتنەدا [التجا] بە نوێژ و دوٌعا ئومێدی لێ ئەکرێ کە ئینسان لە ترسو فیتنە موحافەظە بکا .

# مسيلمة الكذاب

١٢٣/٨٤٣ ـ عن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : قدم مسيلمة الكذاب على عهد رسول الله ـ ﷺ ـ [سنة ٩] فجعل يقول : ان جعل لي محمد [ﷺ] الأمر من بعده تَبِعتُه . وقدمها في بشر كثير من قومه . فاقبل اليه رسول الله ـ ﷺ ـ ومعه ثابت بن قيس بن شماس [رضي الله تعالى عنه] وفي يد رسول الله ـ ﷺ ـ قطعة جريد ، حتى وقف على مسيلمة في اصحابه ، فقال : لو سألتني هذه القطعة ما اعطيتكها ، ولن تعدو امر الله فيك ، ولئن ادبرت ليعقرنك الله ، واني لاراك الذي اريتُ فيك ما رأيت . فاخبرني ابو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ ان رسول الله ـ ﷺ ـ قال : بينما انا نائم رأيت في يديّ سوارين من ذهب ، فاهمني شأنهما ، فاوحي اليّ في المنام : ان انفخهما ، فنفختهما فطارا . فاولتهما لكذابين يخرجان بعدي . فكان احدهما [الاسود العنسي ، والآخر مسيلمة الكذاب صاحب اليمامة .] ح ـ ٦٣/٦ ، م ـ ١٣٢/٩ . ت ، ن ، مسند .

تەرجەمە :

ئيبن و عەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووى : موسەيلەمەى کەذذاب لە زەمانی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ [لە ساڵی نۆی هیجرەتا] هاتە مەدینە ئەیوت : ئەگەر محەمەد ـ ﷺ ـ لە دوای خۆی پێغەمەریّتی یا خەلافەتی بگێرێتە سەر من تابیعی ئەبم . لەگەڵ خەڵقێکی زۆرا هاتە مەدینە ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی چوە لای [بە ئومێدی ئەوە کە دڵیان بێنێتە جێ و ئیسلامیان بکا] لە خدمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ ثابیتی کوڕی قەیسی ،

کوڕی شەمماسی خەطیبی پێغەمەر ـ ﷺ ـ بو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ پارچە شووڵێکی بەدەستەوە بوو ، تا بەسەر موسەیلەمەو رەفیقەکانی یەوە وەستا ، فەرمووی : داوای ئەم پارچە شووڵەم لێ بکەی ناتدەمێ ! تۆ تەجاوز ناکەی لەو ئەمرەی کە خوا دەرحەق تۆی موقەددەر کردوە . ئەگەر لە ئیطاعەتی من رووەرگێری و پشتکەیتە من خوا هیلاکت ئەکا ، وات ئەبینم کە تۆ ئەوەی کە لە خەوما دەرحەق تۆ دیم و پێنیشانم درا .

ئیبن و عەباس ـ رضي الله تعالی عنهما ـ ئەفەرموێ : ئەبوهورەیرە خەبەری دامێ کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : لە وەختێکا کە نوستبووم لە خەوما دیم کە لە هەردوو دەستما دوو بازنی ئاڵتوونم دی [چونکی بازنی ئاڵتوون زینەتی ژنانە] ئەوە مەحزوونی کردم ، لە خەوەکەما وەحییم کرایێ کە فوویان لێ بکەم ، فووم لێ کردن ، هەردوکیان فرین [ئەوەندە سووك بوون] . ئەو بازنانەم بە دوو کەذذاب تەئویل کرد کە لە دوای من خورووج ئەکەن .

[یەعنی لە دوای ظوهووری نوبووەتی من لە بیلادا ؛ چونکی ئەسوەدی عەنەسیی لە زەمانی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ ظوهوری کردو ئیددیعای پێغەمەریّتی کردو شەوکەتی پەیداکرد ، لە زەمانی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ کوژرا . موسەیلیمەیش لە زەمانی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ ئیددیعای پێغەمەریی کرد ، ئەمما دوای پێغەمەر شەوکەتی پەیدا کرد ، لە خەلافەتی ئیمامی صەدیقا ـ رضي الله تعالی عنه ـ بە دەستی وەحشیی ـ قاتیلی حەزرەتی حەمزە ـ کوژرا] ئەو دوو کەذذابە یەکێکیان ئەسوەدی عەنەسیی بوو ، یەکێکیان موسەیلیمەی کەذذاب بوو کە رەئیسی یەمامەیە .

ئەهلی صەنعاو ئەهلی یەمامە لەوەپێش موسوڵمان بووبوون ، وەك

دوو دەستی ئیسلام وا بوون . ئەسوەد لە صەنعـادا ظوهـووری کرد ، موسەیلیمە لە یەمامە ظوهووری کرد ، خەڵقی زۆریان تەفرە دا ، بوون بـە بازن بـۆ دوو دەستی ئیسلام ، پێغـەمەر ـ ﷺ ـ فـووی لێ کـردن ، هەردووکی وەك پەڕ هەڵفڕان .

١٢٤/٨٤٤ ـ عبيد الله بن عتبة [بن مسعود ، احد الفقهـاء السبعة] قال : بلغنا ان مسيلمة الكذاب قدم المدينة فنزل في دار بنت الحرث وكان تحته بنت الحرث [كَيّسة] بن كريز ، وهي ام [اولاد] عبدالله بن عامر [بن كريز ، عبـدالرحمن ، عبـدالملك ، وعبدالله] فـاتاه رسـول الله ـ ﷺ ـ [استئلافا له ولتبليغ الوحي] ومعه ثابت ابن قيس بن شماس ، وهو الذي يقال له : خطيب رسول الله ـ ﷺ ـ وفي يد رسول الله ـ ﷺ ـ قضيب ، فـوقف عليه فكلمـه ، فقال لـه مسيلمة : ان شئت خليت بيننـا وبين الامـر ، ثم جعلتَه لنـا بعدكَ ! فقـال النبيِ ـ ﷺ ـ : لوِ سـألتني هـذا القضيب ما أعطيتكه ، واني لأراك الذي اريتُ فيه ما أُريتُ ، وهذا ثابت بن قيس وسيجيبك عني . فانصرف النبي ـ ﷺ ـ .

قال عبيد الله بن عبدالله : سألت عبدالله بن عباس [رضي الله تعالى عنهما] عن رؤيا رسول الله ـ ﷺ ـ الذي ذكره ، فقال ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] : ذكر لي [اي ذكره لي ابو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ كما في الحديث الاول] ان رسول الله ـ ﷺ ـ قال : بينا انا نائم رأيت انه وُضِـع في يدي سـواران من ذهب ، ففظعتهـا وكـرهتهـا ، فـاذن لي فنفختهما ، فطارا ، فاولتهما كذابين يخرجان . فقال عبيد الله : احدهما [الاسود] العنسي الذي قتله فيروز باليمن . والآخر مسيلمة الكذاب ح ـ ٤٢١/٦ مرسل .

**تەرجەمە :**

عوبەیدوڵڵا کە تابیعی یەو لە فوقەهای سەبعەیە ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : بە ئێمە گەیووە [یەعنی لە ئیبن و عەباسەوە ـ رضي الله تعالی عنهما ـ بە تەرکی ئیبن و عەباس حەدیثەکە بوە بە مورسەل] کە موسەیلیمەی کەذذاب هاتە مەدینە لە ماڵی کچی حەرثا دابەزی ، موسەیلیمە (کیسە)ی کچی حەرثی لە ژێر نیکاحا بوو ، (کیسە) دایکی عەبدورەحمان و ، عەبدولمەلیك و ، عەبدوڵڵای ئەولادی عەبدوڵڵای کوڕی عامیر بوو [لە پێشا ژنی موسەیلیمە بوو ، کە موسەیلیمە کوژرا عەبدوڵڵا مارەی کرد ئەو کورانەی لێ بوو]

[دارەقوطنی و ئیبن و ماکولا ئەڵێن : لەو وەختەدا کە موسەیلیمە چوو بۆ مەدینە (کیسە) لە مەدینە نەبوو لە یەمامە بوو لای موسەیلیمە ، ئەوی کە موسەیلیمە میوانی بوو (رملە)ی کچی حەدثە ـ رضي الله تعالی عنها ـ کە ژنی مەعازی کوڕی عەفرایە ـ رضي الله تعالی عنه ـ قاتیلی ئەبوجەهل . راوی حەدثی بە حەرث لێ تێکچوە . ماڵی رەمە موسافیرخانە بوو ، خۆی صەحابی یە بوو ، ژنی موسەیلیمەی کەو نەبوو . ئەمما لام وایە ریوایەکەی بوخاری لە ریوایەتی دارەقوطنی موعتەبەرترە ؛ چونکی حەرث غەلەط بێ کریز عەلەط بێ ؟ (ام عبدالله بن عامر) غەڵەطبێ ؟؟]

پێغەمەر ـ ﷺ ـ بۆ دەعوەت و تەبلیغی وەحی تەشریفی چوە لای موسەیلیمە ، ثابیتی کوڕی قەیسی ، کوڕی شەمماسی خەطیبی پێغەمەری لە خدمەتا بوو ـ ﷺ ، ورضي عنه ـ پێغەمەر ـ ﷺ ـ لقێ لە دارخورمای بە دەستەوە بوو ، بەسەر موسەیلیمەوە تەشریفی راوەستا ، قسەی لەگەڵ کرد ، موسەیلیمە عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ : وتی :

ئارەزووت هەیە واز لە دەعوای پێغەمەریێتی بێنم ، بۆتۆی تەرك ئەكەم ، بەو شەرتە لە دوای خۆت وەری گێریە سەر من !

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەگەر ئـەم شوولـەم داوا لێ بكەی ناددەمێ ، وات ئەبینم كە تۆ ئەوەی كە لە خەوما دەرحەق تۆ پێنیشانم درا ئەوی پێنیشانم درا . ئەمە ثابیتی بنی قەیس لە باتی من بە تەفصیلی جوابت دەداتەوە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی گەڕایەوە .

عوبەیدوڵڵای كوڕی عەبدوڵڵا فەرمووی : لە عەبدوڵڵای كوڕی عەباسم پرسی لەو خەوەی كە پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەرحەق موسـەیلیمەی كەذذاب فەرمووی . ئیبنو عەباس ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : بۆم ذیكركراوە [یەعنی ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعـالی عنه ـ خـەبەری داومێ] : كە پێغەمـەر ـ ﷺ ـ فەرمـووی : لە وەختێكـا كە نـوستبووم پێنیشـانم درا كە دوو بـازنی ئاڵتـوونم كرابـوە هەدوو دەستـەوە ، لێیان ترسام ؛ چونكی زینەتی ژنانەو پێم ناخۆش بوون ، ئیذندرام كە فوویان لێ‌كەم ، كە فووم لێ‌كردن هەردوكیان فرین . تەئویلم بەوە لێدایەوە كە دوو كەذذاب خورووج ئەكەن . عوبەیدوڵڵا فەرمووی : یەكێكیان ئەو عەنەسی یەیە كە فەیرۆز ـ رضي الله تعالی عنه ـ كوشتی لە یەمەن . ئەوی تریشیان موسەیلیمەی كەذذابە .

كەیفی یەتی كوشتنی موسەیلیمەی كەذذاب (انشاء الله) لە غەزەواتا بێ . كەیفی یەتی ئەسوەدی عەنەسیی وایە : كە لە صەنعا خورووجی كرد ئیددیعای پێغەمەرێتی كرد ، خەڵقێكی زۆری تابیع بوو ، غەڵەبەی بەسەر عامیلی پێغەمەرا كرد ـ ﷺ ـ كە موهاجیری كوڕی (ابو امیه) بوو ، یا (باذان) بوو ـ رضي الله تعالی عنها ـ ، صەنعای ضەبط كرد ، باذان ـ رضي الله تعالی عنه ـ وەفاتی كرد ، ئەسوەد مەرزەبانەی ژنی بازانی مارە

کرد . مەرزەبـان وەعدەی دا بـە فەیـرۆزو دارۆیە ، فـەرمووی : من شەرابی ئەدەمێ سەرخۆشی ئـەکەم شـەوێ ، ئێوەیش بـێن بیکوژن . هەزار کەس بە دەوری سەراکەیا ئێشکیان ئەگرت . شەوێ فەیرۆزو ، دارۆیەو ، رەفیقەکانیان دیواری سەراکەیان بریو ، کوشتیانو هەرچی مالی بەقیمەت بوو هەلیان‌گرتو ، مەزرەبانیان نەجات‌داو ، خەبەریان نارده خدمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ . فەقەط پێغەمەر ـ ﷺ ـ شەوو رۆژێ لە پێش وەفاتیا لەو دەقیقەدا کە ئەسوەد کوژرا مـوژدەی دا بە ئـەصحابی کیرامی ، لە پێش ئەمەدا کە خەبەری فەیرۆزی بگاتێ رحلەتی فەرموو بۆ خدمەت رەفیقی ئەعلا ، موژدەکە درا بە حەزرەتی صـەدیقی ئەکبـەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ .

ئەسوەد بە حیلەو تەفرەدانو قووەت ئیستیلای صەنعـای کرد ، ئەوە کە ئـەلێن : دوو شـەیطانی بـوو یەکێکیـان سوحـەیقی ناو بـوو ، یەکێکیان شوهەیقی ناو بوو ، کە بازان وەفـاتی فەرمـوو شەیـطانێکیان خەبەری دایە خۆیو قەومەکەی چوون ئیستیلای صەنعایان کردو ، ئەو دوو شەیطانە خەبەری حادیثاتیان ئەدایە . . بابەیەقیش بیلێ قەت پێی بروا مەکە درۆیە ؛ چونکی ئەوە خاریقی عادەتە (موددەعی نـوبووەت بەدرۆ) خاریقی عادەتی لەسەر دەست صادیر نابێ . گینا فەرقی لەگەل پێغەمەری راستا نامێنێ ، ئیش مـوشەوەش ئـەبێ . فەقـەط موددەعی ئولووهی‌یەت خاریقی لەسەر دەستا ظوهوور ئەکا ؛ چونکی بەدیهی‌یە کە ئیددیعاکەی درۆیە .

١٢٥/٨٤٥ ـ عن ابي سعيد [الخدري] ـ رضي الله تعالى عنه ـ ان النبي ـ ﷺ ـ قال : لَتَتَّبِعُنَّ سنن من قبلكم شبرا بشبر ، وذراعا بذراع ، حتى لـو سلكـوا جحـر ضب لسلكتمـوه ! قلنـا : يـا رسـول الله اليهـود

والنصارى ؟ قال : فمن ؟ ح ـ ٥/٤٢٣ ، ح ـ ١٠/٣١٥ ، وفيه : لو دخلوا جحر ضب تبعتموهم .م/١٠/١٠٩ .

٨٤٦/١٢٦ ـ عن ابي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن النبي ـ ﷺ ـ قال : لا تقوم الساعة حتى تأخذ أمتي بأخذ القرون قبلها شبرا بشبر وذراعا بذراع . فقيل : يا رسول الله كفارس والروم ؟ فقال : ومَنِ الناسُ الا اولائك ؟ ح ـ ١٠/٣١٥

تەرجەمە :

ئەبو سەعیدی خدریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ . . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : (البتة والبتة) ئێوە تابیعی رەوشتی ئەو میللەتانە ئەبن کە لە پێش ئێوەوە بوون بست بە بست ذیراع بەذیراع ، حەتتا ئەگەر بچنە کونی بزنمژەوە ئێوەیش ئەیچنێ ! عەرزمانکرد : ئەو میللەتانە گاورو جوون ؟ فەرمووی : ئەی کێن ؟

ئەبو هورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ . . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : قیامەت هەڵناستێ تا ئوممەتی من رەوشتی ئوممەتانی پێش خۆی ئەگرێ بست بە بست ذیراع بە ذیراع ، عەرزیکرا : (یا رسول الله) وەکوو فارس و رۆم ؟ فەرمووی : ئەی ئینسان غەیری ئەوانە کێن ؟ [چونکی لەو وەختەدا میللەتی بەشەوکەت و بە قووەت هەر ئەوان بوون . (صدق رسول الله) ـ ﷺ ـ بە چاوی خۆم دیم ، وام لە ناویانا ، ئەمما (بحمد الله) وەك ئەوان نیم .]

# ابن الصياد

٨٤٧/١٢٧ - عن عبدالله - رضي الله تعالى عنه - قال كنا مع رسول الله - ﷺ - فمررنا بصبيان فيهم ابن صياد [ويقال له : ابن صائد . واسمه صاف ، كما يأتي في الاحاديث بعد] ففر الصبيان ، وجلس ابن صياد ، فكأن رسول الله - ﷺ - كره ذلك . فقال له النبي - ﷺ - : تربت يداك ! اتشهد اني رسول الله ؟ فقال : لا ، بل تشهد اني رسول الله ؟ فقال عمر بن الخطاب [رضي الله تعالى عنه] : ذرني يا رسول الله حتى اقتله . فقال رسول الله - ﷺ - : ان يكن الذي ترى فلن تستطيع قتله . م - ١٠/٣٧٨

٨٤٨/١٢٨ - وعنه قال : كنا نمشي مع النبي - ﷺ - فمررنا بابن الصياد ، فقال له رسول الله - ﷺ - : قد خبأت لك خبأً ، فقال : دُخ . فقال رسول الله - ﷺ - : اخسأ ! فلن تعدو قدرك . فقال عمر : يا رسول الله دعني فاضرب عنقه . فقال رسول الله - ﷺ - : دعه ، فان يكن الذي تخاف لن تستطيع قتله . م - ١٠/٣٨٠

٨٤٩/١٢٩ - عن ابي سعيد [سعد بن مالك الخدري - رضي الله تعالى عنه -] قال : لقيه رسول الله - ﷺ - وابو بكر وعمر [رضي الله تعالى عنهما] فقال له رسول الله - ﷺ - : اتشهد اني رسول الله ؟ فقال هو : اتشهد اني رسول الله ؟ فقال رسول الله - ﷺ - : آمنت بالله وملائكته وكتبه ، ما ترى ؟ قال : ارى عرشا على الماء . فقال رسول الله - ﷺ - : ترى عرش ابليس على البحر . وما ترى ؟ قال : ارى صادقين وكاذبا ، او كاذبين وصادقا . فقال رسول الله - ﷺ - : لبس عليه ، دعوه . م - ١٠/٣٨١

**تەرجەمە :**

١ ـ عەبدوڵلای کوڕی ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالی عنهما ـ فەرمووی : لە خدمەت پێغەمەرا بووین ـ ﷺ ـ بە لای بەعزێ منالا رابوردین ، (ابن الصیاد) یان لە ناوا بوو ، منالەکان هەرایان‌کرد ، (ابن الصیاد) دانیشت ، (کأنه) پێغەمەر ـ ﷺ ـ دانیشتنی (ابن الصیاد)ی پێ خۆش نەبوو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بە هیلاك بچیت ! شەهادەت ئەدەی کە من رەسولوڵلام ؟ وتی : نەء ، ئەمما تۆ شەهادەت ئەدەی کە من رەسولوڵلام ؟ ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : (یا رسول الله) وازم لێ بێنە تا بیکوژم . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەگەر ئەوە بێ کە تۆ لێی ئەترسی ظەنی ئەبەیتێ بە دەججال ناتوانی بیکوژی .

٢ ـ لە حەدیثەکەی دوەما پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەفەرموێ : شتێکم بۆ گردوویتە دڵ چی یە ؟ وتی : (دخ) ! پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئیتر بە ذیللەت دانیشە ، لە قەدەری خۆت تەجاوز ناکەی . (ومعنی الباقی مرَّ) .

٣ ـ ئەبو سەعیدی خدریی ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ و ئەبوبەکرو عومەر ـ رضي الله تعالی عنهما ـ تووشی (ابن الصیاد) بوون ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێی فەرموو : شەهادەت ئەدەی بەوە کە من رەسولوڵلام ؟ ئەویش وتی : تۆ شەهادەت ئەدەی بەوە کە من رەسولوڵلام ؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئیمانم هەیە بە : خواو ، بە مەلائیکەی خواو ، بە کتێبی خوا کە [روسولیش داخلی کتێبەو ، لە ریوایەتەکەی تردا (ورسله) تیایە] .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : چی ئەبینی ؟ وتی : عەرشێ ئەبێنم لەسەر ئاو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەوە عەرشی شەیتانە لەسەر بەحر . چی تـر ئەبینی ؟ وتی : دوو راستو درۆیێ[1] ، یـا دوو درۆو راستێ . پێغـەمـەر ـ ﷺ ـ فـەرمـووی : وازی لێبێنن سـەری لێ شێوێنراوە .

١٣٠ / ٨٥٠ ـ وعنه قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ لابن الصياد : ما تربه الجنـة ؟ قـال : دَرْمكـة مسـك يـا ابـا القـاسم . قـال : صـدقت . م ـ ١٠ / ٣٨٣

١٣١ / ٨٥١ ـ وعنه : ان ابن صياد سأل النبي ـ ﷺ ـ عن تربة الجنة فقال : درمكة بيضاء ، مسك خالص . م ـ ١٠ / ٣٨٣ .

[قال القاضي : قال بعض اهل النظر : الرواية الثانية اظهر . نووي]

(درمكة) : ئاردگەندمی خالیصی بێژراوەیە .

تەرجەمە :

لە ئەبو سەعیدی خدریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ دوو ریـوایەت کراوە ، لە ریوایەتی ئەوەڵا ئەڵێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ لـە (ابن الصیاد)ی پـرسی : خاکی بـەهەشت چییـە ؟ (ابن الصیـاد) وتی : میسکێکی خالیصە وەك نانی گەندمی خالیص . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : راست ئەڵێی .

لە ریوایەتی دوەما ئەفەرموێ : (ابن الصیاد) لە پێغەمەری ـ ﷺ ـ پرسی : کە خـاکی بەهـەشت چییە ؟ پێغـەمەر ـ ﷺ ـ فـەرمووی :

(١) لە دەقی عەرەبییەکەدا : (اری صادقین وکاذبا ، او کاذبین وصادقا)ە ، بەم پێیەیش دەبێ لە وەرگێـرانەکـەیدا بـۆ کوردی بگـوترێ : (دوو راستگـۆو درۆزنێ ، یا دوو درۆزنو راستگۆیێ ئەبینم) .

ئاردێکی خالیصەو بێژ راوەی سپی ، میسکێکی خالیصە .

قاضیی ئەڵێ : ریوایەتی دوەم صەحیحە . (نووی) یەعنی راوی لێی ئیشتیباه بوە .

**٨٥٢/١٣٢ ـ محمد بن المنكدر قال : رأيت جابر بن عبدالله [رضي الله تعالى عنهما] يحلف بالله : ان ابن صائد الدجال . فقلت : اتحلف بالله ؟ قال : اني سمعت عمر [رضي الله تعالى عنه] يحلف عند النبي ـ ﷺ ـ فلم ينكره النبي ـ ﷺ ـ م ـ ١٠ / ٣٨٣**

**تەرجەمە :**

محەمەدی کوڕی (منكدر) ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : جا بیری کوڕی عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنهما ـ م دی سوێنی بە خوا ئەخوارد کە (ابن الصائد) دەججالە . وتم : بە خوا سوێن ئەخۆی ؟ فەرمووی : گوێم لە عومەر بوو ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە خدمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ سوێنی خوارد پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئینکاری نەکرد .

**٨٥٣/١٣٣ ـ سالم بن عبدالله ، ان عبدالله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] اخبره ان عمر بن الخطاب ـ رضي الله تعالى عنه ـ انطلق مع رسول الله ـ ﷺ ـ في رهط قبل ابن الصياد حتى وجده يلعب مع الصبيان عند أُطْمِ بني مغالة [من الانصار حصنهم] وقد قارب ابن الصياد يومئذ الحلم ، فلم يشعر حتى ضرب رسول الله ـ ﷺ ـ ظهره بيده ، ثم قال رسول الله ـ ﷺ ـ لابن الصياد : اتشهد اني رسول الله ؟ فنظر اليه ابن صياد ، فقال : اشهد انك رسول الأميين . فقال ابن صياد لرسول الله ـ ﷺ ـ : أتشهدُ اني رسول الله ؟ فرفضه [اى ترك سؤاله] .**

**وفي البخاري : فرضه [اى دفعه] رسول الله [النبي . خ] ـ ﷺ ـ فقال [ثم ، خ] : آمنت بالله وبرسله . ثم قال رسول الله ـ ﷺ ـ : ماذا**

ترى ؟ قال ابن صياد : يأتيني صادق وكاذب . فقال له رسول الله ـ ﷺ ـ : خلط عليك الامر . ثم قال له رسول الله ـ ﷺ ـ : اني قد خبأت لك خبيأ ، فقال ابن صياد : هو الدخ ، فقال له رسول الله ـ ﷺ ـ : اخسأ ! [كلمة يزجر بها الكلب ، اي : اسكت صاغرا] فلن تعدو قدرك . فقال عمر بن الخطاب : ذرني يا رسول الله اضرب عنقه . فقال له رسول الله ـ ﷺ ـ : ان يكنه ، [يكن هو ، خ] فلن تسلط عليه . وان لم يكنه [يكن هو ، خ] فلا خير لك في قتله .

وقال سالم بن عبد الله : سمعت عبدالله بن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ يقول : انطلق بعد ذلك رسول الله ـ ﷺ ـ وابي بن كعب الانصاري الى النخل التي فيها ابن صياد ، حتى اذا دخل رسول الله ـ ﷺ ـ النخل طفق يتقي بجذوع النخل ، وهو يختل [يستغفل] ان يسمع من ابن صياد شيئا قبل ان يراه ابن صياد ، فرآه رسول الله ـ ﷺ ـ وهو مضطجع على فراش في قطيفة له فيها زمزمة [وفي البخارى : فيها رمرمة او زمزمة] فرأت ام ابن صياد رسول الله ـ ﷺ ـ وهو يتقي بجذوع النخل ، فقالت لابن صياد : يا [اى ، خ] صاف ! ـ وهو اسم ابن صياد ـ هذا محمد ، فثار [فتناهى ، خ] ابن صياد ، فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : لو تركته بين .

قال سالم : قال عبدالله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] فقام رسول الله ـ ﷺ ـ في الناس ، فأثنى على الله بما هو اهله ، ثم ذكر الدجال فقال : اني لا نذركموه ما من نبي الا وقد انذره قومَه ؛ لقد انذره نوح [عليه السلام] قومَه ، ولكن اقول لكم فيه قولا لم يقله نبي لقومه [تعلمون خ] تعلموا انه اعور ، وان الله تبارك وتعالى ليس باعور م ـ ١٠/٣٨٣ الى ٣٨٥ . ح ـ ٩/٩٩ ـ ١٠٠ قال ابو عبدالله البخاري : خسأت الكلب

بعدته خاسئين مبعدين .

١٣٤/٨٥٤ ـ قال ابن شهاب : واخبر عمر بن ثابت الانصاري انه اخبره بعض اصحاب رسول الله ـ ﷺ ـ ان رسول الله ـ ﷺ ـ قال ـ يوم حذر الناس الدجال ـ : انه مكتوب بين عينيه : كافر يقرؤه من كره عمله ، او يقرؤه كل مؤمن . وقال : تعلموا انه لن يرى احد منكم ربه حتى يموت . م ـ ١٠/٣٨٥

تەرجەمە :

لە سالمی کوڕی عەبدوڵلاوە ڕیوایەتە کە عەبدوڵلای کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ خەبەری داوەتێ کە ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە خدمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە ناو جەماعەتێکا تەشریفیان چوو بۆ لای ، ئیبن وصەییادیان دۆزی‌یەوە لەگەڵ بەعزێ منالا . لای قەڵای بەنی مەغالەی ئەنصار یاریی ئەکرد ، ئەو وەختە نزیکی باڵغ بوونی بو ، (ابن الصياد) خەبەری لە خۆی نەبوو تا پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەستی موبارەکی ماڵی بە پشتیا ، لە دوایی یا پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە ئیبن وصەییادی فەرموو : شەهادەت ئەدەی کە من ڕەسوولوڵلام ؟ ئیبن و صەییاد تەماشای پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ وتی : شەهادەت ئەدەم کە تۆ پێغەمەری نەخوێندەوارەکانی ، وتی : تۆ شەهادەت ئەدەی کە من ڕەسوولوڵلام ؟ ! پێغەمەر ـ ﷺ ـ [کە لە موسوڵمان بوونی ئیبن و صەییاد مەئیووس بوو] وازی لە تەبلیغ کردنی هێنا بۆ ئیسلامەتی .

بە پێی لەفظی بوخاری : پاڵی نا بە سنگی یەوەو دەفعی کردو فەرمووی : ئیمانم بە خواو مەلائیکەی خواو پێغەمەرانی خوا هەیە . لە دوایی یا پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : چیت چاو پێ ئەکەوێ ؟ وتی : درۆیشم بۆ یێ و ڕاستیشم بۆ یێ ، یەعنی بەعزێ شت ئەبینم بە درۆ

دەرئەچێ ، بەعزێ شتم خەبەر ئەدەنێ بە راست دەرئەچێ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : سەرت لێشێوێنراوەو ئیشت لەسەر پەشێوێنراوە . لە پاشا پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : شتێکم بۆ لە دڵ گرتووی چی یە ؟ وتی : دوخ ! پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : سا ئیتر بێدەنگ‌و رسوا بە ! [یەعنی ئیدديعات نەمێنێ]

لەم نەوعە مەقامەدا کە موخاطەب مەغلووب بێ عەرەب ئـەڵێن (اخسأ) کەلیمەیێکە کە سەگی پێ دەرەکرێ ، ئەڵێن ، چغە ، وەك چۆن بە پشیلە ئەڵێن : ختە ، بە طەیر ئەڵێن : کشە ، بە مەڕو بزن ئەڵێن : ێخە . . . کورد لەم جێگایانەدا ئەڵێ : ئیتر بێدەنگ بە ، وسکوت بە ، رەحەت لێی دانیشە ، بەعزێ شتی تریش ئەڵێن .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئایەتی : ﴿فارتقب یوم تأتی السماء بدخان مبین﴾[1] لە دڵ گرتبوو . ئیبن‌و صەییاد لە طەرەف شەیطانەکەیەوە هەر بە لەفظی دوخی خەبەر پێدرابوو ، شەیطانەکەی ئەو دوو حەرفەی چۆن زانیبو کە خەبەر بدا بە ئیبنی صەییاد ؟ رەنگـە پێغەمـەر ـ ﷺ ـ لەو وەختـەدا بە سیرڕی تەلەفوظی بە ئایەتەکە کردبێ‌و شەیطانەکەی ئیبن‌و صەییاد ئەو دوو حەرفەی گوێ لێبووبێ واللە اعلم]

لە میقداری خۆت [کە کاهینی یە] بەرەوژووردتر ناچی . ئەو وەختە ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : (یا رسول الله) وازم لێبێنە با لە گەردنی بدەم ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەگەر ئەو بێ تۆ موسەللەط ناکرێیت بەسەریا [چونکی ئەوی دەججال ئەکوژێ حەزرەتی عیسایە ـ علیه الصلاة والسلام ـ] ئەگەر ئەو نەبێ لە کوشتنیا بۆ تۆ هیچ زەرەری نی یە .

(١) بڕوانە : سوورەتی دوخان ، ئایەتی : ١٠ .

[ئەی پێغەمەر ـ ﷺ ـ بەوە کە ئیبن وصەییاد ئیددیعای پێغەمەرێتی کرد لە بەرچی ئەمری بە کوشتنی نەکردو نەیهێشت کە ئیمامی عومەر بیکوژی ؟ چونکی ئیبن و صەییاد ئەو وەختە منال بو ، موکەللەف نەبوو ، هەم ئەو وەختە پێغەمەر ـ ﷺ ـ لەگەڵ جوولەکەی ئەطرافی مەدینە موتارەکەی کردبوو] .

سالمی کوڕی عەبدوڵلا ئەفەرموێ : لە عەبدوڵلای کوڕی ئیمامی عومەری باوکم بیست ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەیفەرموو : پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە دوای ئەو جارە دەفعەیێکی تریش خۆی و ئوبەیی کوڕی کەعبی ئەنصاریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفیان چوو بۆ طەرەفی ئەو دارخورمایانەی کە ئیبن و صەییادی لەناوا بوو ، تا پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی چوە ناو دارخورماکانەوە ، خۆی ئەدایە پەنا دارخورماکانەوە کە ئیبن و صەییاد غافڵ بکاو لە پێش ئەمەدا کە ئیبن وصەییاد بی بینێ شتێکی لێ ببیێ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئیبن وصەییادی دی لەسەر فەرشێ راکشابوو ، لە ناو قەدیفەیێکا بوو ، لە ناو قەدیفەکەوە دەنگە دەنگێك ئەهات . دایکی ئیبن وصەییاد پێغەمەری دی ـ ﷺ ـ بانگی ئیبن و صەییادی کرد : ئەی صاف ! ـ صاف ناوی ئیبن و صەییادە ـ ئەوە محەمەدە . ئیبن و صەییاد هەڵسایە سەرپێ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەگەر دایکی ئیبن وصەییاد وازی لە ئیبن وصەییاد بهێنایەو خەبەری نەدایێ ئیبن و صەییاد خۆی بە تەواویی مەعلووم ئەکرد .

ئیبن و عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی : لە دوای ئەوە پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی لەناو خەڵقا راوەستا ، بەوەی کە لایەق بێ بە خوا حەمدو ئەنای خوای کرد ، لە پاشا بەحثی لە دەججال کرد ، فەرمووی : من ئێوە لە دەججال ئەترسێنم ، هیچ پێغەمەرێ نیە کە

ئـوممەتی خـۆی لە دەججـال نەتـرسانبێ . نـووحيش قەومی خـۆی لە دەججال ترسانوە . ئەوەندەی هەیە من قسەیێ بە ئێوە ئەڵێم کـە هیچ پێغەمەرێ بە قەومی خۆی نەووتبێ . . بزانن ! کە دەججال چاوێکی کوێرە ، خوای تەعالا کوێر نی‌یە .

ئیبن‌وشـەهاب ئـەڵێ : عومـەری کوڕی ثـابیتی ئـەنصـاریی لـە ئەصحابی پێغەمەرەوە ـ ﷺ ـ خەبەری دوامێ کە پێغەمـەر ـ ﷺ ـ لەو ڕۆژەدا کە خەڵقی لە دەججال ئەترسان فەرمووی : دەججال لە مابەینی هەردو چاویا کەلیمەی کافری لێ نووسراوە ، هەرکەسێ کە کـردەوەی دەججالی پێ‌خۆش نەبێ ئەیخوێنێتەوە . یا فەرمووی : هەموو موسوڵمانێ ئەیخوێنێتەوە .

هەم پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بزانن ! کە هیچ کەسێ لە ئێوە خـوا نابینێ تـا نەمـرێ . [یەعنی ئیبن‌وصـەییاد بێ ، دەججـال بێ . . ئەبینرێن . ئەگەر بگەنە ئـەو زەمانـەی کە دەججـال خورووج ئـەکاو ئیددیعای خوایەتی ئەکا ، بزانن کە خوا نی‌یە ؛ چونکی خوا لـە دنیادا کەس نایبینێ) .

١٣٥/٨٥٥ ـ عن نافع قال : لقي ابن عمر [رضي الله تعالى عنهما] في بعض طرق المدينة فقال قولا اغضبه ، فانتفخ حتى ملأ السِّكة ، فدخل ابن عمر على حفصة [رضي الله تعالى عنهم] وقد بلغها ، فقالت له : رحمك الله ما اردت من ابن صياد ، اما علمت ان رسول الله ـ ﷺ ـ قال : انما يخرج من غضبة يغضبها ؟ م ـ ١٠/٣٨٦

تەرجەمە :

نافیع ئەڵێ : ئیبن‌و عومەر ـ رضي الله تعالى عنهـا ـ لە بـەعزێ ڕێگـەی مەدینـەدا گەیی بـە ئـین‌وصـەییـاد قسـەیێکی پێ‌وت ، ڕقی

ئیبن وصەییادی هەڵسان . ئیبن وصەییاد ئاوسا تـا ڕێگەکـەی پڕکـرد !
ئیبن وعومەر تەشریفی چوە خدمـەت حەفصـەی دایکمان ـ رضي الله
تعالی عنهم ـ ئەو موعامەلەیەی ئیبن و عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ کە
لەگەڵ ئیبن وصەییاد کردبووی بە حەزرەتی حەفصەی دایکمان ـ رضي
الله تعالى عنها ـ گەیی بو ، پێی فەرموو : تۆچیت دەوێ لە ئیبن وصەییاد
بۆ نازانی کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرموویەتی : ئەو شتەی کە ئەبێ بە سەبەبی
خورووجی دەججال هەر ڕقێکیەتی کە هەڵئەستێ ؟

١٣٦/٨٥٦ ـ نافع قال : قال ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ : لقيته مرتين ، قال فلقيته فقلت لبعضهم : هل تحدثـون انه هـو ؟ قال : لا والله ! قال : قلت كذبتني ، والله لقد اخبرني بعضكم انه لن يموت حتى يكون اكثركم مالا وولدا ، فكذلك هو ، زعموا اليوم . قال : فتحدثنا ثم فارقته . قال فلقيته لقية اخرى وقد نَفَرَت عينه . فقلت : متى فعلت عينـك ما ارى ؟ قـال : لا ادري . قـال : قلت : لا تـدري وهي في رأسك ؟ قال : ان شاء الله خلقها في عصاك هذه . قال : فنخر كأشدّ نخير حمارٍ سمعتُ . قال : فزعم بعض اصحابي اني ضربته بعصا كانت معي حتى تكسرت ، واما انا فوالله ما شعرت . قال : وجاء حتى دخل على ام المؤمنين ـ رضي الله تعالى عنها ـ فحدثها ، فقالت : ما تريد اليه ؟ الم تعلم انـه قد قـال : ان اول ما يبعثـه على النـاس غضب يغضبه ؟

م ـ ١٠/٣٨٧

تەرجەمە :

نـافیع ئـەفەرمـوێ : ئیبن و عـومـەر ـ رضي الله تعـالى عنهـما ـ فەرمووی : دوو دەفعە بە ئیبن وصەییاد گەییم . فەرمووی : دەفعەیێ

پێی گەییم بە بەعزێ لەوانەی کە لەگەڵما بوون وت : ئایا ئێوە قسەتان بۆ ئەکرێ کە ئیبن‌وصەییاد دەججالە ؟ وتیان : خەیر وەڵڵاهی ! فەرمووی : بەو کەسەم وت : درۆت لەگەڵ کردم ! وەڵڵاهی بەعزێ لە ئێوە خەبەری داومێ کە ئیبن‌وصەییاد نامرێ تا لە خوصووصی ماڵو مناڵەوە لە هەمووتان زیاتر نەبێ ، ئێستە ئەڵێن : ئیمرۆ ئەویش وایە ، ماڵو مناڵی لە هەمووتان زیاترە . [یەعنی عەلامەتی ئەمە کە ئیبن‌و صەییاد ئەو دەججالی مەعهوودەیە ئەمەیە کە ئیبن‌وصەییاد نامرێ تا ماڵو ئەولادی لە ئێوە زیاتر نەبێ ، ئێستە ئەو عەلامەتە لە ئیبن‌و صەییادا ظوهووری کردوە ، کە وابێ ئەبێ دەججال بێ]

ئیبن‌وعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی : لەگەڵ ئیبن‌وصەییادا قسەمان کردو لێی جوێ بوومەوە .

فەرمووی : دەفعەیێکی تریش مولاقاتم لەگەڵیا بوو چاوی ئاوسا بوو ، بەرز بوویوەوە ، پێم‌وت : کەی چاوت وای لێ هاتوە ؟ وتی : نازانم ، وتم : نازانی وا لە سەرتا ؟ وتی : ئەگەر خوا ئیرادە بکا ئەیخاتە ئەو عەصایەی تۆوە . لە دواییا زەڕەیەکی کرد وەکوو بەشیددەتو قایمترینی ئەو زەڕەی کەرانە بوو کە بیستبووم . فەرمووی : بەعزێ لە رەفیقەکانم پێیان‌وتم : گوایا بەو عەصایەی کە پێم بوو تا عەصاکەم تیا شکان لێم‌داوە ـ یەعنی بۆیە نەڕانی ـ ئەمما من وەڵڵاهی خەبەرم نی‌یە کە لیم‌دابێ .

نافیع ئەڵێ : ئیبن‌وعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ تەشریفی هات تا چوە خدمەت حەفصەی دایکمان ـ رضي الله تعالى عنها ـ قسەی ئەو حاڵەی خۆی‌و ئیبن‌وصەییادی بۆ کرد ، حەزرەتی حەفصەی دایکمان فەرمووی : تۆ چیتە لە ئیبن‌وصەییاد ؟ بۆ نازانی کە وتوویەتی : ئەووەڵ شتێ کە خورووجی پێ ئەکا غەضەبێکە کە ئەیگرێ ؟

[سياقى ئەم عيبارەتە وايە كە سەبەبى خورووجەكەى ئيبن و صەيياد وتبێتى لە حەديثەكەى پێشەوەدا ، ئەڵێ كە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرموويەتى : مومكينە كە ئەويش وتبێتى و ، مومكينيشە كە ئەمەيش هەر قسەى پێغەمەر بێ ـ ﷺ ـ با لە لەفظەكەيشا ناوى پێغەمەر ـ ﷺ ـ رانەبوردبێ .]

٨٥٧/١٣٧ ـ عن ابي سعيد الخدري [رضي الله تعالى عنه] قال : خرجنا حجاجا او عمارا ومعنا ابن صائد ، قال : فنزلنا منزلا فتفرق الناس ، وبقيت انا وهو ، فاستوحشت منه وحشة شديدة مما يقال عليه . قال : وجاء بمتاعه فوضعه مع متاعي . فقلت : ان الحرَّ شديد ، فلو وضعته تحت تلك الشجرة ! قال : ففعل . قال : فرفعت لنا غنم فانطلق ، فجاء بعُسٍّ [قدح كبير من اللبن] فقال : اشرب ابا سعيد ! فقلت : ان الحرَّ شديدٌ واللبن حارٌ ، ما بي الا اَنيِّ اكره ان اشربَ عن يده ، او قال : آخذ عن يده . فقال : ابا سعيد ! لقد هممت أن آخذ حبلا فاعلقه بشجرة ثم اختنق مما يقول لي الناس . يا ابا سعيد من خفي عليه حديث رسول الله ـ ﷺ ـ ما خفي عليكم معشر الانصار . ألست من اعلم الناس بحديث رسول الله ـ ﷺ ـ ؟ اليس قد قال رسول الله ـ ﷺ ـ : هو كافر وانا مسلم ؟ او ليس قد قال رسول الله ـ ﷺ ـ هو عقيم لا يولد له ، وقد تركت ولدي بالمدينة ؟ او ليس قد قال رسول الله ـ ﷺ ـ : لا يدخل المدينة ولا مكة وقد اقبلت من المدينة [وفي اخرى : وقد ولدت بالمدينة] م ـ ١٠ / ٣٨١ وانا اريد مكة ؟ قال ابو سعيد [رضي الله تعالى عنه] : حتى كدت ان اعذره ، ثم قال : أما والله اني لأعرفه وأعرف مولده واين هو الآن . قال : قلت : تبًّا لك سائر اليوم . م ـ ١٠/٣٨٢

١٣٨/٨٥٨ ـ عن ابي سعيد الخدري [رضي الله تعالى عنه] قال : قال لي ابن صائد ، وأخذتني منه ذَمامة [حياء واشفاق من الذم واللوم] هذا عذرت الناس ما لي ولكم يا اصحاب محمد [ﷺ -] ؟ الم يقل نبي الله - ﷺ - : انه يهودي وقد اسلمت ؟ قال : ولا يولد له وقد ولد لي ؟ وقال : ان الله قد حرم عليه مكة وقد حججت ؟ قال لي : فما زال حتى كاد ان يأخذ فيَّ قولُه . قال : فقال له : اما والله اني لأعلم الآن حيث هو واعرف اباه وامه . قال وقيل له : ايسرك انك ذلك الرجل ؟ قال : فقال : لو عرض عليّ ما كرهت . م ـ ١٠/٣٨١ وفي اخرى : قال : فلبسني [اى جعلني التبس في امره] .

تەرجەمە :

ئەبو سەعیدی خدري ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : بۆ حەج ، یا فەرمووی : بۆعومره [شك الراوي] لە مەدینە چووینە دەرێ ، ئیبن وصائیدمان لەگەڵ بوو ، لە مەنزڵێکا دابەزین ، خەڵق بڵاوبوونەوە ، من و ئەو ماینەوە ، وەحشەتێکی گرانم لێوە گرت ، یەعنی خۆفێکی زۆرم لەوەوە لێ نیشت ، لەبەر ئەو قسانەی کە دەرحەقی ئەکرێ ، کە ئەڵێن دەججالە ، فەرمووی : کەل وپەلەکەی هێنایە لای کەل و پەلەکەی من ، پێم وت : زۆر گەرمایە ، ئەگەر شت ومەکەکانت ببەیتە بن ئەو دارە چاتر ئەبێ . فەرمووی : بردی . فەرمووی : رانێ مەرمان بەدیی کرد . چوو کاسەیەکی گەورەی شیر هێنا ، وتی : بخۆرەوە (یا ابا سعید) . وتم : زۆر گەرمایە ، شیریش طەبیعەتی گەرمە ، هیچ بەهانەیێکم نەبوو ئەوە نەبێ کە حەزم نەدەکرد کە لە دەستی ئەو وەری بگرم . وتی : (یا ابا سعید) وام تەمایە پەتێ بێنم لە دارێ هەڵی بخەم و خۆم بخنکێنم ، لەبەر ئەوەی کە خەڵق پێم ئەڵێن ! ئەی

ئەبوسەعید هەرکەسێ حەدیثی پێغەمەری ـ ﷺ ـ لێ خەفی ئەبێ لەسەر ئێوە ، کە جەماعەتی ئەنصارن ، خەفی نابێ . ئایا تۆ لە هەموو کەس زیاتر عالمتر نیت بە حەدیثی پێغەمەر ـ ﷺ ـ ؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ نەیفەرموە کە دەججال کافرەو جوولەکەیە ؟ من موسولمانم . بۆ پێغەمەر ـ ﷺ ـ نەیفەرموە : کە نەزۆکەو ئەولادی نابێ ؟ من ئەولادم بوەو لە مەدینە بەجێم هێشتوون . بۆ نەیفەرموە کە ناچێتە مەککەو مەدینە ؟ وە من لە مەدینەدا بەوەلەد بووم و لەوێوە رووم کردۆتە مەککەو بۆ مەککە ئەچم ؟

ئەبوسەعید ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : [ئەوەندەی لەو نەوعە وت] تا نزیك بووم کە بە مەعذووری بزانم ، لە دواییا وتی : وەڵڵاهی من دەججال ئەناسم ، ئەزانم ئێستە لەکوێیە ، ئەزانم لە کوێ و کەی لەدایك بوە .

[لە ریوایەتەکەی ترا : لێیان پرسی : حەزەکەی کە تۆ ئەو پیاوە بی ؟ وتی : ئەگەر تەکلیفم لێ بکرێ لەبەرم گران نی یە]

ئەبوسەعید ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : لەو رۆژانەدا کە ماوە خوا بە هیلاکتا با ! [لە ریوایەتەکەی تریا ئەبوسەعید ئەفەرموێ : بەم قسەی ئاخری یەی خستمیەوە شوبهە لە ئیشی خۆیا . یەعنی هێنامیە سەر ئەوە کە بڵێم ئەو نی یە . بەم قسەی دوایی یەی لێی کەوتمەوە شوبهە .

لە حەق ئیبن وصەییادا ئیختیلاف لە بەینی سەلەفا ـ رضي الله تعالی عنهم ـ هەیە کە : دەججالی مەعهوودە یان نا ؟ ئەم حەدیثی فاطیمەی کچی قەیس ـ رضي الله تعالی عنها ـ دەرحەق (جساسە)و دەججال ئەنووسم لە دواییدا ـ إن شاء الله ـ قسەی نەوەویش کە فەرموویەتی ـ ئەوی لازم بێ ـ نەقڵی ئەکەم .

# جساسة

١٣٩/ ٨٥٩ عامر بن شراحيل الشَّعبي شَعْب هَمْدان : انه سأل فاطمة بنت قيس ، اخت الضحاك بن قيس [رضي الله تعالى عنهما] وكانت من المهاجرات الأُوَل ، فقال : حدثيني حديثا سمعتِهِ من رسول الله - ﷺ - لا تسنديه الى احد غيرِهِ ، فقالت : لئن شئت لأفعلن . فقال لها : اجل حدثيني . فقالت : نكحتُ ابن المغيرة وهو من خيار شباب قريش يومئذ ، فاصيب في اول الجهاد مع رسول الله - ﷺ - [اى جرح ولم يمت به ، وانما مات بعد ان طلق فاطمة - رضي الله تعالى عنها - حين كان مع علي - رضي الله تعالى عنه - باليمن - كما في رواية اخرى اخصر عنه] . قال : دخلنا على فاطمة بنت قيس [رضي الله تعالى عنها] فاتحفتنا برطب يقال له : رطب ابن طاب ، وأسْقتْنا سويق سلت [جوْ پيْغـه‌مه‌رانـه] فسألتها عن المطلقة ثلاثا : اين تعتد ؟ قالت : طلقني بعلي ثلاثا ، فاذن لي النبيُّ - ﷺ - ان اعتـد في اهلي ، قـالت فنـودي في النـاس . . . الـخ م - ١٠/ ٤٠٨]

فلما تأيمت [اي بالطلاق لا بالجراح] خطبني عبدالرحمن بن عوف في نفر من اصحاب محمد - ﷺ - وخطبني رسول الله - ﷺ - على مولاه اسامة بن زيد [رضي الله تعالى عنهما] ، وكنت قد حُدِّثْتُ ان رسول الله - ﷺ - قال : من احبني فليحبَّ اسامة ، فلما كلمني رسول الله - ﷺ - قلت : امري بيدك ، فأنْكحني من شئتَ ، فقال : انطلقي الى ام شريك ، وام شريك [رضي الله تعالى عنها] امرأة غنية من الانصار ، عظيمة النفقة في سبيل الله ، ينزل عليها الضيفان . فقلت : سأفعل . فقال : لا تفعلي ،

ان ام شريك امرأة كثيرة الضيفان ، فاني اكره ان يسقط عنك خمارك ، او ينكشف الثوب عن ساقيك فيرى القوم منك بعض ما تكرهين . ولكن انتقلي الى ابن عمك عبدالله بن عمرو ابن ام مكتوم ، وهو رجل من بني فهر قريش ، وهو من البطن الذي هي منه ، فانتقلت اليه . فلما انقضت عدَّتي سمعت نداء المنادي ، منادي رسول الله - ﷺ - ينادي : الصلاة جامعة . فخرجت الى المسجد ، فصليت مع رسول الله - ﷺ - فكنت في صف النساء الذي يلي ظهور القوم .

فلما قضي رسول الله - ﷺ - صلاته جلس على المنبر وهو يضحك ، فقال : ليلزم كل انسان مصلاه . ثم قال : اتدرون لم جمعتكم ؟ قالوا : الله ورسوله اعلم . قال : اني والله ما جمعتكم لرغبة ، ولا لرهبة ، ولكن جمعتكم لان تميما الداري كان رجلا نصرانيا ، فجاء فبايع واسلم ، وحدثني حديثا وافق الذي كنت احدثكم عن مسيح الدجال . حدثني انه ركب في سفينة بحرية مع ثلاثين رجلا من (لخم) و (جذام) فلعب بهم الموج شهرا في البحر ، ثم ارفؤا [التجأوا] الى جزيرة في البحر حتى مغرب الشمس ، فجلسوا في اقْرُبِ السفينة [قايەق] فدخلوا الجزيرة ، فلقيتهم دابة ، اهلب ، كثير الشعر [تفسير] لايدرون ما قبْلَهُ من دُبُره ، من كثرة الشعر ، فقالوا : ويلكِ ! ما انتِ ؟ فقالت : انا الجساسة [اي التجسس الاخبار للدجال . وعن عبدالله بن عمرو بن العاص - رضي الله تعالى عنهما - : انها الدابة المذكورة في القرآن] .

قالوا : وما الجساسة ؟ قالت : ايها القوم انطلقوا الى هذا الرجل في الدير ، فانه الى خبركم بالاشواق . قال : لما سمَّت لنا رجلا فرقنا منها ان تكون شيطانة . قال : فانطلقنا سراعا حتى دخلنا الدير ، فاذا فيه اعظم انسان رأيناه قط خلقا ، واشده وثاقا ، مجموعة يداه الى عنقه ، ما

بين ركبتيه الى كعبيه بالحديد ، قلنا : ويلكَ ! ما انتَ ؟ قال : قد قدرتم على خبري ، فاخبروني ما انتم ؟ قالوا : نحن اناس من العرب ، ركبنا في سفينة بحرية ، فصادفنا البحر حين اغتلم [اى هاج] فلعب بنا الموج ، ثم ارفأنا الى جزيرتك هذه ، فجلسنا في اقْرُبِها ، فدخلنا الجزيرة ، فلقيتنا دابة اهلب ، كثير الشعر ، لا ندري ما قبله من دبره من كثرة الشعر . فقلنا ويلكِ ! ما انتِ ؟ فقالت : انا الجساسة . قلنا : وما الجساسة ؟ قالت : اعمدوا الى هذا الرجل في الدير ، فانه الى خبركم بالاشواق ، فاقبلنا اليك سراعا ، وفَزعنا منها ، ولم نأمن ان تكون شيطانة .

فقالت : اخبروني عن نخل بيسان . قلنا : عن اي شأنها تستخبر ؟ قال : اسألكم عن نخلها هل يُثْمِرُ ؟ قلنا له : نعم . قال : اما انها يوشك ان لا تثمر . قال : اخبروني عن بحيرة طبرية ! قلنا : عن اي شأنها تستخبر ؟ قال : هل فيها ماء ؟ قالوا : هي كثيرة الماء . قال : اما ان ماءها يوشك أن يذهب . قال : اخبروني عن عين زغر [بلدة بالشام] قالوا : عن اي شأنها تستخبر ؟ قال : هل في العين ماء ؟ وهل يزرع اهلها بماء العين ؟ قلنا له : نعم ، هي كثيرة الماء ، واهلها يزرعون من مائها . قال : اخبروني عن نبي الأميين [ﷺ] ما فعل ؟ قالوا : قد خرج من مكة ونزل يثرب . قال : أقاتلَتْهُ العرب ؟ قلنا : نعم . قال : كيف صنع بهم ؟ فاخبرناه انه قد ظهر على من يليه من العرب واطاعوه . قال لهم : قد كان ذاك ؟ قلنا : نعم . قال : اما ان ذاك خير لهم ان يطيعوه ، واني مخبركم عني : اني انا المسيح الدجال ، واني اوشك ان يؤذن لي في الخروج فاخرج فأسير في الارض ، فلا ادع قرية الا هبطتها في اربعين ليلة غير مكة وطيبة ، فهما محرمتان عليّ كلتاهما ، كلما اردت ان ادخل

واحدة او واحدا منها استقبلني ملك بيده السيف صُلتا [مسلولا] يصدني عنها ، وان على كل نقب منها ملائكة يحرسها . قللت : قال رسول الله ـ ﷺ ـ وطعن . بمخصرته في المنبر : هذه طيبة ، هذه طيبة ، هذه طيبة . يعني المدينة . الا هل كنت حدثتكم ذلك ؟ فقال الناس : نعم . فانه اعجبني حديث تميم انه وافق الذي كنت احدثكم عنه ، وعن المدينة ومكة ، الا انه في بحر الشام ، او بحر اليمن ، لا بل من قبل المشرق ، ما هو [قال القاضي : لفظة (ما هو) زائدة صلة للكلام ، ليست بنافية . نووي] من قبل المشرق ، ما هو من قبل المشرق ، ما هو ـ واومأ بيده إلى المشرق . قالت : فحفظت هذا من رسول الله ـ ﷺ ـ م ـ ١٠/٤٠٤ ـ ٤٠٨ .

طوبى لتميم من منقبة اي منقبة ! حيث روى عنه الحديث رسولُ الله ـ ﷺ ـ وأيَّدَ بحديثه ما حدث به اصحابَهُ ـ عليه الصلاة والسلام ، وعليهم رضوانه ـ وكفى بذلك شرفا له .

تەرجەمە :

عامیری کوڕی شەراحیلی شەعبیی ـ شەعبی هەمەدان ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : سوئاڵم لە فاطیمەی کچی قەیسی خوشکی ضەحاکی کوڕی قەیس ـ رضي الله تعالى عنها ـ کە لەو ژنە موهاجیرانە بوو لە پێشەوە هیجرەتیان کردبوو ـ کرد ، پێم وت : حەدیثێکم بۆ ریوایەت بکە کە لە پێغەمەرت بیستبێ ـ ﷺ ـ ئیسنادی مەدەرە ئەلای غەیری ئەو . فەرمووی : ئەگەر ئەتەوێ وا ئەکەم . عامیر عەرزی کرد : بەڵێ وام بۆ ریوایەت بکە . فاطیمە ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : شووم کرد بە کوڕی موغیرە کە ئەو وەختە لە هەڵبژێرراوی جوانانی قورەیش بوو ، لە ئەووەڵ غەزایێ کە لە خدمەت پێغەمەرا کردی ـ ﷺ ـ بریندار بو [ئەمما

لەو برینە خەلەصت ، لە یەمەنا لە خدمەت حەزرەتی عەلیدا بوو ـ رضي الله تعالى عنها ـ لەویٰ طەلاقنامەی بۆ ناردم] کە بێوەژن بووم عەبدورەحمانی کوڕی عەوف و چەند کەسێ لە ئەصحابی پێغەمەر ـ ﷺ ـ خوازبێنییان کردم بۆ خۆیان . پێغەمەریش ـ ﷺ ـ خوازبێنی کردم بۆ ئوسامەی کوڕی زەیدی ئازادکراوی پێغەمەر ـ ﷺ ، ورضي عنهما ـ منیش قسەم بۆ کرابوو کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرموویەتی : هەرکەسێ منی خۆشەوێ ئوسامەی خۆش بوێ [منیش و مەلا حسەینیش خۆشمانەوێ] .

کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ لەو خوصووصەوە قسەی لەگەڵ فەرمووم عەرزم کرد : ئیشی من بە دەست تۆیە ، لە کێم نیکاح ئەفەرموی بیفەرموو . [ئەم خوازبێنی‌یە دوای عیددەچوونی بوو کە مێردەکەی طەلاقی داو خەبەری پێگەیی] پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمری پێفەرموو : بگوێزەرەوە لای (ام شريك) ام شریك ژنێکی دەوڵەمەند بوو لە ئەنصار ، لە ڕێی خوادا نەفەقەی زۆری ئەدا بە خەڵق ، زۆر میوانی ئەچوە ماڵ . عەرزم کرد : بەڵێ ئەیکەم . لە دواییدا فەرمووی : خەیر وا مەکە ؛ چونکی (ام شريك) ژنێکی میوان‌زۆرە ، حەز ناکەم کە سەرپۆشەکەت لێ بکەوێ ، یا جل لەسەر قاچ و قولت لابچێ خەڵق جێیەکت ببینن پێت ناخۆش بێ ، بچۆرە لای ئامۆزای خۆت کە عەبدوڵلای کوڕی باوکی عەمرەو ، کوڕی دایکی (ام مكتوم)ە . عەبدوڵلا پیاوێکە لە بەنی‌فەهر ، فەهری قورەیش ، لەو بەطنەیە کە فاطیمە لەوانە . فاطیمە فەرمووی : چوومە لای عەبدوڵلا ، کە عیددەم رابورد ، گوێم لێ‌بوو کە موناديی پێغەمەر ـ ﷺ ـ بانگی کرد : (الصلاة جامعةً) . چوومە دەرێ بۆ مزگەوت ، نوێژم لە خدمەت پێغەمەرا کرد

ـ ﷺ ـ لە صەفی ئەو ژنانەدا بووم کە لە پشت پیاوەکانەوە بوون .

کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ نوێژەکەی تەواوکرد تەشریفی لەسەر مینبەرەکەی دانیشت ، پێئەکەنی ، فەرمووی : هەرکەسێ لە جێ نوێژی خۆی دانیشێ . لە دواییدا فەرمووی : ئەزانن من ئێوەم بۆ چی کۆکردوەتەوە ؟ فەرموویان : خواو پێغەمەری خوا ئەزانێ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : وەڵلاهی ! من ئێوەم بۆیە کۆ نەکردۆتەوە نە لەبەر ترسێ کە بمبێ ، نە لەبەر مەنفەعەتێ کە بمەوێ . (لكن) بۆیەکم کۆکردنەوە چونکی تەمیمی داریی پیاوێکی نەصرانی بوو ، هاتو بەیعەتی پێکردمو موسوڵمان بوو ، قسەییکی بۆ کردم موافیقی ئەو قسەیە کە من بۆم ئەکردن لە مەسیحی دەججال .

تەمیم قسەی بۆ کردم کە خوێو سی پیاو لە لەخمو جەذام سواری سەفینەییکی بەحریی بوون ، تا مانگێ شەپۆلی بەحرەکە بەم لاو بەولایا ئەبردن . ئیلتیجایان کرد بە جەزیرەیەك لە ناو بەحرەکەدا تا رۆژ ئاوابوون چوونە ناو ئەو قایەقانەی کە لە گەمیکەدا بوون ، بەوە چوونە ناو جەزیرەکەوە حەیوانێکیان پێگەیێ ، ئەوەندە تیسکن بوو پێشی لە پاشی فەرق نەدەکرا لەبەر تیسك . پێیان‌وت : کۆست کەوێ ! تۆ چیت ؟ وتی : من جەساسەم . وتیان : ئەی جەساسە چیە ؟ وتی : ئەی قەوم بچنە لای ئەو پیاوە کە لە ناو دێرەکەدایە ؛ چونکی ئەو زۆر بەشەوقو ئارەزوە بۆ ئێوە .

تەمیم وتی : کە ناوی پیاوی بۆ ئێمە برد لێی ترساین کە شەیتانێ بێ . تەمیم وتی : بە عەجەلە چووین تا چووینە دەیرەکەوە ، کە چووین پیاوێکی زۆر زەلام لە هەموو ئینسانێ کە دیبوومان زەلامتری تیابوو ، بە بونیەو جوثە ، بە قووەت بەسترابوو دەستو ملی بەیەکەوە بەسرابوو ،

لە هەردوو ئەژنۆیەوە تا قولەپێی بە ئاسن مەحکەم بەسترابوو ، پێمان‌وت : خوا بتگرێ ! تۆ چیت ؟ وتی : ئێوە ظەفەرتان برد بە خەبەری من [یەعنی لە دواییدا تێئەگەن کە من چیم] ئێوە خەبەرم بدەنێ کە چین ؟ وتیان : ئێمە بەعزێ خەڵقین لەعەرەب [هەموویان بە تەفصیل بۆ حیکایەت کرد تا لای ئەو] ئەو پیاوە زنجیر کراوەکە وتی : خەبەرم بدەنێ لە دارخورمای بیسان . وتمان : لە چیی ئەپرسیت ؟ وتی : لەوەتان لێ ئەپرسم بەر ئەگرێ ؟ وتمان : ئا بەر ئەگرێ . وتی : نزیکە کە بەر نەگرێ . وتی : خەبەرم بدەنێ لە گۆلی طەبەرییە . وتمان : لە چە خوصووصێکی ئەپرسی ؟ وتی : ئاوی تیایە یان نا ؟ وتمان : ئاوی زۆرە ، وتی : نزیکە ئاوەکەی بروا . وتی : خەبەرم بدەنێ لە سەرچاوەی شاری زوغەر . وتمان : لە چە شتێکی ئەپرسی ؟ وتی : ئاوی هەیە یا نی‌یە ؟ خەڵقی ئەوێ بە ئاوەکەی زەراعەت ئەکەن یا نایکەن ؟ وتمان : ئاوی زۆرە ، خەڵق زەراعەتی پێ ئەکەن . وتی : خەبەرم بدەنێ لە (نبي أُمّيّين) چی کرد ؟ وتیان : وتمان : تەشریفی لە مەککە چوە دەرێ ، لە مەدینەدا جێ‌نشین بوو . وتی : عەرەب شەریان لەگەڵ کرد یا نەیان‌کرد ؟ وتمان : کردیان . وتی : چی لەگەڵ عەرەب کرد ؟ خەبەرمان دایێ کە غەڵەبەی کرد بەسەر ئەو عەرەبانە کە لە ئەطراف بوون . . هەموو ئیطاعەیان کرد . ئەو پیاوە بە قەومەکەی وت : موحەققەق ئەوە وقووعی بوو ؟ وتمان : ئا . وتی : ئەوە بۆ عەرەب خێرە ئەگەر ئیطاعەی بکەن .

منیش خەبەرتان ئەدەمێ لە خۆم . من مەسیحی دەججالم ، نزیکە کە ئیذن بدرێم کە خورووج بکەم [بە تەما بێ ! با هەر لە زنجیرا بێ تا چەند هەزار ساڵی تر ! ئەمما لەزنجیرامانی بۆی بە فایدەترە لە

خورووجی ؛ چونکی سـاڵێك و چـەند مـانگێ دەوام ئەکـاو حەزرەتی مەسیح عیسا ـ علیه الصـلاة والسلام ـ بـە جەهـەنەمی مـوشەڕڕەف ئەکا !] وتی : کە خورووجم کرد لە ئەرزا ئەڕۆم ، لە ظەرفی چل شەوا غەیری مەککەو مـەدینە هیـچ نامێنێ کـە نەیچمێ ، مـەککەو مـەدینە هەردوکیان لەسەر من حەرام کراون ، هەر وەختێ ئیرادە بکەم بچمە ناو یـەکێکیانـەوە مەلائیکـەیێکی دەست بەشیـری لـە کـالان دەرکێشـراو بەرەوپیرم بێ و مەنعم ئەکا لەوێ ، لەسەر کوللی کەلەبەرێکی مەککەو مەدینە مەلائیکە هەیەو پاسەوانی و موحافەظەی ئەکا .

فـاطیمە ـ رضي الله تعـالی عنها ـ فـەرمووی : پێغـەمەر ـ ﷺ ـ عەصاکەی بە مینبەرەکەدا کێشـاو فەرمـووی : ئەمـە طیبەیـە ، ئەمـە طیبەیە ، ئەمە طیبەیە . گوێتان لێ بێ : ئایا من لەمە خەبەرم داونێ یان نـا ؟ خەڵق فـەرموویـان : بەڵێ خـەبەرت داوینێ . پێغـەمـەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : عەجایەبم ما لە قسەی تەمیم کە موافیقی ئەوە بوو کە قسەم بۆ کردوون . خـەبەرتـان بێ کە لـە بەحـری شامـایە ، یـا لە بـەحری یەمەنایە . خەیر لە طەرەفی مەشریقەوەیە . لە طەرەفی مەشریقەوەیە ، لە طەرەفی مەشریقەوەیە ئەو هەر بە دەستی موبارەکی ئیشارەتی مەشریقی کـرد . فـاطیمـە ـ رضي الله تعـالی عنهـا ـ فـەرمـووی : ئـەمــەم لـە رەسوولوڵلاوە ـ ﷺ ـ حیفظ کردوە .

عولەما فەرموویانە : ظاهیری ئەحادیث وایە کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ وەحی بۆ نەهاتوە داثیر بەمە کە ئیبن وصەییاد دەججالە یا دەججال نی یە . تەنها صیفاتی دەججالی بە وەحی بۆ نازڵ بوە . لە ئیبن وصەییادا بەعزێ قەرینە مەجوود بوە کە ئینسان ئەخاتە تەرەدودو شوبهەوە ، بۆیە پێغەمەر ـ ﷺ ـ قەطعی نەناوە کە ئیبن وصەییاد دەججالە یا دەججال نی یە . بۆیە

پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە حەزرەتی عومەری فەرموو ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەگەر ئەو بێ تۆ موسەللەط ناکرێی بەسەریا . ئیستیدلالی ئیبن‌وصەییادیش کە کردوویەتی بۆ ئەبوسەعیدی خدریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ بەوە کە وتی : دەججال کافرەو ناچێتە مەککەو مەدینەو ، عەقیمە من موسوڵمانم‌و ئەولادم هەیەو لە مەدینەوە ئەچم بۆ مەککە . . دەلالەت ناکا لەسەر ئەمە کە ئەو نی‌یە ؛ چونکی پێغەمەر ـ ﷺ ـ خەبەری لە صیفاتی دەججال داوە کە لە زەمانی خورووج‌و ئیستیلایا وا ئەبێ کە وەقتی نوزوولی عیسایە ـ علیه الصلاة والسلام ـ .

ئەو سوئال‌و جوابانەی کە لە خدمەت پێغەمەرا وتوویەتی‌و لە خدمەت ئەبوسەعیدا وتوویەتی ، لەگەڵ ئیبن‌و عومەرا کە ئاوساوەو رێگەکەی پڕ کردوەو خەڵقی خستوەتە شوبهەوە کە دەججال بێ . . ئیظهاری موسوڵمانەتی‌و ، حەج‌و غەزاکردنی دەلالەت ناکا لەسەر ئەمە کە ئەو نی‌یە .

ریوایەتیش کراوە کە تەوبەی لەو کردەوەی پێشووی کردوە لە مەدینەدا مردوە ، لە وەختی نوێژی حەنازەیدا پێنیشانی خەڵق دراوە . ئەبوداوودیش ریوایەتێکی صەحیحی ریوایەت کردوە ، کە لە حەزرەتی جابیرەوە ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە رۆژی حەرەدا کە یەزید ئیستیباحەی عەرض‌و رۆح‌و ماڵی مەدینەیی کرد ئیبن‌و صەییاد ون‌بوو . کە وابێ لە مەدینە نەمردوە .

جابیرو ئیمامی عومەریش ـ رضي الله تعالى عنهما ـ سوێندیان خواردوە لەسەر ئەمە کە ئیبن‌و صەییاد دەججالە .

بەیهەقیش ئەفەرموێ : کە لە ئیبن‌وصەییادا ئیختیلافێکی زۆر هەیە ؛ ئەوی کە ئەڵێ دەججال نی‌یە ئیستیدلالی بە حەدیثی تەمیمی

داریی کردوە کە حەقیش وایە کە وابیّ ؛ چونکە ئیبن وصەییاد لەو وەختەدا کە پیّغەمەر ـ ﷺ ـ ئیمتیحانی کرد منالّیّکی (دون البلوغ) بو ، تەمیمی داریش ـ رضي الله تعالی عنه ـ لە سالّی نۆیەمی هیجرەتا هاتە خدمەت پیّغەمەرو موسولّمان بوو ، ئەو حەدیثی دەججالو جەساسەی عەرزی پیّغەمەر کرد ـ ﷺ ـ ئیبن و صائیدیش لە زەمانی ئیمتیحانیا تا زەمانیّ کە لە خدمەت ئەبوسەعیدا ـ رضي الله تعالی عنه ـ چوە بۆ حەج لە مەدینە جویّنەبۆتەوە . ئەبیّ کەی چووبیّ بۆ ئەو جزیرەیەو ؟ بووبیّ بە پیاوو لە کۆت درابیّ ؟؟ ئەمە بە قەطعی دەلالەت ئەکا لەسەر ئەمە کە ئیبن و صائید دەججال نی یە ، نیهایەت بەعزیّ لەو صیفەتانەی کە پیّغەمەر ـ ﷺ ـ دەرحەق دەججال فەرموویەتی لەوا مەوجوود بوە بەوە لازم نابیّ کە دەججال بیّ ، وەك چۆن پیّغەمەر ـ ﷺ ـ کە لە مەککەدا حەزرەتی عیسا ـ علیه السلام ـ و دەججالی لە خەوا پیّنیشان درا ، فەرمووی : دەججال لە هەموو کەس زیاتر بە (عبد العزّا)ی کوری (قطن) ئەشوبهیّ ، دیارە کە (ابن قَطَن) دەججال نی یە . ئەوەیش کە پیّغەمەر ـ ﷺ ـ لە دوای ئیمتیحانەکەیا پیّی فەرموو : تۆ لە قەدری خۆت تەجاوز ناکەی . . یەعنی لە کاهینی تەجاوز ناکەی ، دەلالەت ئەکا (ضمنا)کە دەججال نی یە ؛ چونکی دەرەجەی دەججالی لە دەرەجەی کاهینی گەلیّ بەرزترە . دەججال چەند خاریقی گەورە گەورە ئەکا ، بەیانی (ان شاء الله) لە حەدیثەکانی دواییدا دیّت . ئیبن و صائید غەیری (دوخ) چە خاریقیّکی هەیە ؟

قسەی جەساسەیش حەدیثیّکی صەحیحە پیّغەمەر ـ ﷺ ـ لە تەمیمی داریی ریوایەت کردوە ، تەمیمی داریش ـ با دەججالی لە زەمانی نەصرانی یەتا دیبیّ ئەمما لە دوای موسولّمان بوون بۆ پیّغەمەری ـ ﷺ ـ

گێراوتەوە ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەصدیقی کـردوە ، دیارە بـەقووەتتـرە لە ظەننی ئیمامی عومەرو جابیر ـ رضي الله تعالی عنهما ـ ، غەیببوونی لە وەختی حەرەدا هەر ئەوە ئەگەیێنێ کە لە مەدینەدا نەمـردبێ ، لێی لازم نایێ کە دەججال بێ ، جێگەو مەئوای دەججالزانیشی ناگەیێنێ کە خۆی دەججال بێ ، لە دوای موسوڵمانبوونی ئیرتیدادیشی هیچ کەس ریوایەتی نەکردوە . بە هەموو نەوعێ بەقای موسوڵمان لەسەر موسوڵمانەتی چاکترە لە ئیعتیقادی ئیرتیدادی بە شوبهە . بۆ ئێمە ئەوی لازم بێ باوەڕکردنە بەمە کە دەججال بێ ، حەزرەتی عیسا ـ علیه الصلاة والسلام ـ ئـەیکوژێ ؛ چونکی پێغەمەر ـ ﷺ ـ خەبەری لێداوە .

ئیتر بەسە با بچینە سەر بەحسی دەججال ـ علیه اللعنة ـ

# دجال وابن صياد

١٤٠/ ٨٦٠ عن المغيرة بن شعبة [رضي الله تعالى عنه] قال : ما سأل النبي - ﷺ - عن الدجال اكثر مما سألت . قال [لى : اي بني . اخرىم] وما يُنْصِبُكَ [اى : ما يتعبك] منه ؟ انه لا يضرك . قال : قلت : يا رسول الله انهم يقولون : ان معه الطعام والانهار [انهم يقولون : معه جبال من خبز ولحم ، ونَهَرِ ماء] قال : هو اهون على الله من ذلك . [قال القاضي : معناه : من ان يجعل الله ما خلقه على يديه مضلا للمؤمنين ومشككا لقلوبهم ، بل انما جعله له ليزداد الذين آمنوا إيماناً ، وتثبت الحجة على الكافرين والمنافقين . وليس معناه انه ليس معه شئ من ذلك . نووي] .

وفي القسطلانى : اهون على الله من ان يجعل شيئا من ذلك آية على صدقه ، لاسيما وقد جعل الله فيه آية ظاهرة في كذبه وكفره من عوره وقبح منظره وكتابة : (كافر) بين عينيه] م - ١٠/٤٠١ ، ح - ١٠/١٩٩ جه .

تەرجەمە :

موغیرەی کوڕی شوعبە - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : هیچ کەس زیاتر لە من سوئالی لە پێغەمەر - ﷺ - نەکردوە ئەوەندەی من کە لێم پرسیوە لە دەرحەق دەججال ، پێی فەرمووم : ئەی کوڕی خۆم چە شتێك لە دەججال تۆ ئەخاتە ناو زەحمەتەوە [ئەوەندەی لێ ئەپرسی] ؟ ئەو هیچ زەرەر بە تۆ ناگەیێنێ . شوعبە فەرمووی : وتم : چونکی ئەڵێن : طەعامو نەهری ئاوو بە قەدەری شاخ نانو گۆشتی لەگەڵە . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : [با ئەوانەیشی لەگەڵ بێ] لە لای خوا ئەو لەوە کەمترە [کە خوا ئەوانەی بۆ بکا بە عەلامەتی راستێتی ئەو ؛ چونکی عەلامەتی

درۆزنێتی ئەو دیارە بۆ هەموو موسوڵمانێ : چاوێکی کوێرە ، چاوەکەی تری وەك بۆڵەترێ دەرپەڕیوە ، لە بەینی هەردوو چاویا (كفر) نووسراوە] .

**٨٦١/١٤١ انس بن مالك [رضي الله تعالى عنه] قال : قال رسول الله - ﷺ - : ليس من بلد الا سيطؤه الدجالُ الامكة والمدينة ، وليس نقب من انقابها الا عليه الملائكة صافين تحرسها [م ـ ٤٠٩/١٠] يجئ الدجال حتى ينزل من ناحية المدينة [عند الطريق الاحمر عند منقطع السبخة . جه] [فينزل بالسبخة . م] فترجف المدينة ثلاث رجفات يخرج اليه منها كل كافر ومنافق . م ـ ٤٠٩/١٠ ، ح ـ ٢٠٠/١٠ جه ، فيأتي سبخة الجرف فيضرب رواقه ، فيخرج اليه كل منافق ومنافقة . اخرى . م .**

**تەرجەمە :**

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ . . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : غەیری مەککەو مەدینە هیچ شارێ نی‌یە کە دەججال نەیچێتێ ، ئەمما ناچێتە مەککەو مەدینە ، وە هیچ کەلەبەرێ نی‌یە لە کەلەبەرانی مەککەو مەدینە کە مەلائیکە صەفی تیا نەبەستبێ و موحافەظەی نەکا لە دەججال . دەججال یێ بۆ طەرەفی مەدینە ، لای سوورەرێ کە شۆرەکاتەکە ئەبڕێتەوە ، لەوێ باری لێ ئەخا ، مەدینە سێ دەفعە ئەلەرزێتەوە ، لە مەدینەدا هەرچی کافرو مونافیق ببێ هەمووی لە مەدینە ئەچێتە دەرەوە بۆ لای دەججال .

**٨٦٢/١٤٢ حذيفة [رضي الله تعالى عنه] قال : قال رسول الله - ﷺ - : الدجال اعور عين اليسرى ، جُفال الشعر [اى كثيره] معه جنة ونار ، فناره جنة وجنته نار م ـ ٣٩٠/١٠ ان معه ماء ونارا ، فناره معه بارد ، وماؤه نار . ح ـ ٢٠٢/١٠**

**تەرجەمە :**

حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ . . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : دەججال چاوی چەپی کوێرە ، مووی زۆرە ، باغو ئاگری ـ لە ریوایەتەکەی بوخاریدا ـ ئاوو ئاگری لەگەڵە ، باغو ئاوەکەی ئاگرە ، ئاگرەکەی باغو ئاوێکی ساردە .

**١٤٣/٨٦٣ وعنه ایضا قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : لأنا اعلم بما مع الدجال منه . معه نهران یجریان : احدهما رأي العین ، ماء ابیض ، والآخر رأي العین نار تأجج . فاما أدركنَّ احد فلیأت النهر الذي یراه نارا ، ولیغمض ثم لیطأطئ رأسه فیشرب منه ؛ فانه ماء بارد ، وان الدجال ممسوح العین ، علیها ظَفَرة غلیظة [تانه] مكتوب بین عینیه : (كافر) یقرؤه كل مؤمن كاتب وغیر كاتب . م ـ ١٠/٣٩٠ ، ح ـ ٥/٤٢١ بمعناه ، وفیه ابن مسعود .**

**تەرجەمە :**

حوذیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ . . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : من لە دەججال چاکتر ئەزانم کە چی لەگەڵایە ، دوو نەهری جاریی لەگەڵە ؛ یەکێکیان لەبەرچاو ئاوێکی سپی یە . ئەوی تریان لە پێش چاو ئاگرێکە گڕی لێ ئەبێتەوە . ئەگەر یەکێ لە ئێوە گەیی بە دەججال بچێتە ناو ئەوەی کە بە چاو بە ئاگری ئەبینێ ، چاوی لێك نێ ، لە دواییا سەری دانەوێنێو لێی بخواتەوە ئەوە ئاوێکی ساردە . دەججال چاوێکی مەمسووحە ، یەعنی تەختەپەردەیێکی ئەستووری بەسەرا کێشراوە ، لە بەینی هەردوو چاویدا کەلیمەی کافری لێ نووسراوە ، کاتبو غەیری کاتب ئەیخوێنێتەوە .

١٤٤/٨٦٤ عن ابي بَكـرَة [رضي الله تعالى عنـه] عن النبي ـ ﷺ ـ قال : لا يدخل المدينة رعب الدجال ، ولها يومئذ سبعة ابواب ، على كل باب ملكان [يذبان عنه رعب المسيح . حاكم] ح ـ ١٠/ ٢٠٠

تەرجەمە :

ئەبوبەكەرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ . . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ترسی دەججال ناچێتە ناو مەدینەوە ، ئەو رۆژە مەدینە حەوت دەرگای هەیە ، كوللی دەرگایەكی دوو مەلائیكەی لەسەرە موحافەظەی ئەكەن لە ترسی دەججال .

١٤٥/٨٦٥ عن ابي هريرة [رضي الله تعالى عنه] قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : الا اخبركم عن الدجال حديثا ما حدثه نبيٌّ قَوْمَهُ ؟ : انه اعور ، وانه يجيئ معه مثل الجنة والنار ؛ فالتي يقول انها الجنة هي النار . واني انذرتكم به كما انذر به نوح قومه . م ـ ١٠/ ٣٩١

تەرجەمە :

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ . . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : خەبەرتان بدەمێ لە دەججال بە خەبەرێ كە هیچ پێغەمەرێ نەیدابێ بە قەومی خۆی ؟ : دەججال چاوێكی كوێرە ، شتێكی وەك باغچەو وەك ئاگری لەگەڵە ، ئەوەی كە ئەو ئەڵێ باغە ئاگرە . من ئێوەی لێ ئەترسێنم وەك چۆن نووح ـ علیه السلام ـ قەومی خۆیی لێ ترسانوە .

١٤٦/٨٦٦ عن انس ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال النبي ـ ﷺ ـ : ما بعث نبي الا انذر أمته الاعورَ الكذابَ ، الا انه اعور وان ربكم ليس باعور ، وان بين عينيه مكتوب كافر . [ك ، ف ، ر . م] ح ـ ١٠/ ٢٠٣ [فيه ابو هريرة وابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهم ـ] م ـ ١٠/ ٣٨٩ .

٨٦٧/١٤٧ وعنه قال رسول الله ـ ﷺ ـ : الدجال ممسوح العين ، مكتوب بين عينيه كافر . ثم يتهجاها (ك ف ر) يقرؤه كل مسلم م ـ ١٠/ ٣٨٩ .

٨٦٨/١٤٨ وعن نافع عن ابن عمر اراه عن النبي ـ ﷺ ـ قال : [ان الدجال اعور العين اليمنى كانها عنبة طافية . ح ـ ١٠/ ٢٠٠

تەرجەمە :

لەم حەدیثەدا دەججال چاوی راستی ئەعوەرە . لە حەدیثی حوذەیفەدا ـ رضي الله تعالى عنه ـ چاوی چەپی ئەعوەرە . تەوفیقی قەسطەلانی ١٠ ـ ٢٠١ .

لە صیفەتی دەججالا ئەم میقدارە کافی یە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ مەقصوودی لە ترساننی موسوڵمانان لە دەججال و بەیانی صیفەتی ئەمەیە کە خوا ـ عز وجل ـ لە ئاخری زەمانا خەڵق موبتەلا ئەکا بە فیتنەی دەججال . دەججالیش ئیددیعای خوایی ئەکا . خوا بۆ ئیمتیحانی خەڵق بەعزێ خاریقی عادەتی لەسەر دەستا خەلق ئەکا . ئەوی کە خوا مووەففەقی بکا بروای پێ ناکا .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ بۆ ئیرشادی موسوڵمانان ئەفەرموێ : دەجوله ، حادیثە ، جیسمە ، عەیب و نەقصی زۆری هەیە . خوا ـ عز وجل ـ ئەزەلی یە ، مونەززەهە لە صیفاتی حودووث ، لەعەیب و نەقص بەری یە . . . کە وابێ ئەگەر یەکێ لە ئێوە بگاتە زەمانی ئەوو بی بینێ ـ ـ بەعزێ خاریقی عادەتیشی لەسەر دەستا ظوهوور بکا ـ بەوە نابێ بە خوا ، بەو نەقص و عەیبانە بزانێ کە درۆزن و کەذذابە . پێغەمەریش ـ ﷺ ـ خەبەری لێ داوەو بەیانی عەلامەت و خاریقی عادەتی فەرموە ، سەری لێ تێك نەچێ و شوێنی نەکەوێ . خوا سەرمان لێ تێك نەداو ڕیمان

بێ ون نەکا لەگەڵ هەموو برادەرو ئەحباب و خزم و موسوڵمانانا (آمین) .

۸٦۹/۱٤۹ عن انس بن مالك [رضي الله تعالى عنه] ان رسول الله - ﷺ - قال : يتبع الدجال من يهود اصبهان سبعون الفا عليهم الطيالسة . م ـ ۱۰/ ٤۱۰

تەرجەمە :

پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : لە جوولەکەی ئەصفەهان حەفتاهەزار شوێن دەججال ئەکەوێ ، هەموو طەیلەسانیان لەسەرایە .

طەیلەسان لەسەرکردن چاك نی یە ، لیباس و سەرپۆشی جوولەکەی تەبەعەی دەججالە .

۸۷۰/۱۵۰ ام شريك [رضي الله تعالى عنها] سمعت النبي - ﷺ - يقول : ليفرّنَّ الناس من الدجال في الجبال ! قالت ام شريك : يا رسول الله فاين العرب يومئذ ؟ قال : هم قليل . م ـ ۱۰/ ٤۱۰

تەرجەمە :

پێغەمەر - ﷺ - ئەیفەرموو : خەڵق بە پەتەوە لە دەججال هەرا ئەکەن ! (ام شريك) - رضي الله تعالى عنها - عەرزی کرد : (یا رسول الله) ئەو رۆژە عەرەب لە کوێن ؟ فەرمووی : عەرەب کەمن .

۸۷۱/۱۵۱ ابو هريرة [رضي الله تعالى عنه] ان رسول الله - ﷺ - قال : لا تقوم الساعة حتى ينزل الروم بالأعماق ، او بدابق الاعماق [موضعان بقرب حلب] فيخرج اليهم جيش من المدينة من خيار اهل

الارض يومئذ ؛ فاذا تصافوا قالت الروم : خلُّوا بيننا وبين الذين سَبَوا منا نقاتلهم ؛ فيقول المسلمون : لا والله ! لا نخلّي بينكم وبين اخواننا ، فيقاتلونهم فينهزم ثلث لا يتوب الله عليهم ابدا . ويقتـل ثلثهم افضل الشهـداء عنـد الله ، ويفتتـح الثلث لا يفتنـون ابـدا . فيفتتحـون قسطنطينية ، فبينما هم يقتسمون الغنائم قد علقوا سيوفهم بالزيتون اذ صاح فيهم الشيطان : ان المسيح قد خلفكم في اهليكم ، فيخـرجون وذلك باطل ، فاذا جاؤا الشام خرج . فبينما هم يعدون للقتال يسوّون الصفوف [للقتال] اذ اقيمت الصلاة ، فينزل عيسى ابن مريم [عليهما الصلاة والسلام] فَأَمَّهم ، فاذا رآه عدو الله ذاب كما يذوب الملح في الماء ، فلو تركه لانـذاب حتى يهلك ، ولكن يقتله الله بيده ، فيـريهم دمه في حربته . م ـ ١٠/ ٣٥٨

تەرجەمە :

ئـەبو هـورەيـرە ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ . . پێغـەمـەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : تا رۆم نازڵ نەبێتە (اعماق) یا فەرمووی (دابق الاعماق) [کە دوو جێن لە نزیکی حەڵەب] قیامەت هەڵناستێ ، کە هـاتنە ئـەوێ لە مەدینەوە لەشکرێکیان لە چاکترینی ئەهلی ئەرزی ئەو وەختە بۆ ئەچێتە دەرێ ، کە بەرابەر یەك صەفیان بەست بۆ شەڕ رۆم بەو موسوڵمـانانـە ئەڵێن : ڕێمان بۆ چۆڵ بکەن لە بەینی ئێمەو ئەوانەی کە ئەسیریـان لێ گرتووین شەڕیان لەگەڵ بکەین [ئەسیـرەکانمـان نەجـات بدەین] ئـەو موسوڵمانانە بە ڕۆمەکان ئەڵێن : وەڵڵاهی لە بەینی ئێوەو برادەری دینیمان ڕێ چـۆڵ ناکـەین ، شەڕیـان لەگـەڵا ئەکـەن ، سێیەکی لـەشکـری موسوڵمانەکان ئەشکێن قەت خوا تەوبەیان لێ قەبووڵ ناکا ، سێیەکیشیان لێ شەهید ئەبێ کە چاکترینی شوهەدان لای خوا ـ عز وجل ـ سێیەکیشیان

فەتح ئەکەن ، کە بە هیچ فیتنەیێ لە رێ ناچنەدەرێ ، فەتحی قوسطەنطین ئەکەن .

لەو وەختە خەریکی تەقسیمی تالاّن ئەبن و شیرەکانیان بە داری زەیتوونا هەلّئاوەسیبوو ، شەیتان صەیحەیێ ئەکا : کە دەججال واجێنشینی ئێوە بوە بە سەر مالّ و منالّەکانتەوە[1] لە قوسطەنطین ، ئەچنە دەرەوە ، ئەو قسەو بانگی شەیتانە باطیل بوو [چونکی ئێشتا دەججال خورووجی نەکردوە] کە ئەو لەشکرە هاتنەوە شام دەججال خورووج ئەکا ، تەداروکی شەڕ ئەکەن و بۆ شەڕ تەسوی یەی صوفووف ئەکەن ، قامەت بۆ نوێژ ئەکرێ ، لەو وەختەدا حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەم ـ علیهما الصلاة والسلام ـ نوزوول ئەفەرموێ ، نوێژ یان پێ ئەکاو ئەبێ بە ئیمامیان [ظاهیر وایە ئەم ئیمامەتی یە دوای ئەو دەفعەیە بێ کە محەمەدی مەهدیی ئیمامەتیان بۆ ئەکا . حەزرەتی عیسا ـ علیه الصلاة والسلام ـ ئیقتیدای پێ ئەکا] کە دەججال چاوی بە حەزرەتی عیسا ـ علیه السلام ـ ئەکەوێ خوێ لە ناو ئاوا چۆن ئەتوێتەوە ئەویش وا ئەتوێتەوە ، ئەگەر حەزرەتی عیسا دەخلێ نەکردایە تا بە هیلاکا ئەچێ ئەتوایەوە ، ئەمما خوا بە دەستی حەزرەتی عیسا ـ علیه السلام ـ ئەیکوژێ ، حەزرەتی عیسا ـ علیه السلام ـ خوێنەکەیان پێ نیشان ئەدا کە بە سەری نێزەکەیەوە بوو .

---

(١) دەبوو بیگوتایە : منالّەکانتانەوە .

١٥٢/٨٧٢ عن يسير بن جابر [ رضي الله تعالى عنه ] ، [ وفي رواية شيبان بن فروخ عن اسير ] قال : كنت في بيت عبدالله بن مسعود [ رضي الله تعالى عنه ] والبيت ملآن ، قال : فهاجت . اخرىم . قال : هاجت ريح حمراء [ اى شديدة ] بالكوفة ، فجاء رجل ليس له هجّيرىٰ [ اي شأن ودأب ] الايا عبدالله بن مسعود جاءت الساعة ! قال : فقعد وكان متكئا ، فقال : ان الساعة لاتقوم حتى لايقسم ميراث ، ولا يفرح بغنيمة . ثم قال بيده هكذا ، ونحاها نحو الشام ، فقال : عدو يجمعون لأهل الاسلام ويجمع لهم اهل الاسلام . [ قال يسير ] : قلت : الرومَ تعني ؟ قال : نعم ، وتكون عند ذاكم القتال ردة شديدة ، فيشترط المسلمون شُرْطة [ طائفة من الجيش تقدم للقتال ] للموت لاترجع الا غالبة ، فيقتتلون حتى يحجر بينهم الليل ، فيفيَ [ يرجع ] هؤلاء وهؤلاء كل غير غالب ، وتفنى الشرطة ، ثم يشترط المسلمون شرطة للموت لاترجع الا غالبة ، فيقتتلون حتى يُحجر بينهم الليل ، فيفيُ هؤلاء وهؤلاء كل غير غالب ، وتفنى الشُرْطة ، ثم يشترط المسلمون شرطة للموت لاترجع الا غالبة ، فيقتتلون حتى يمسوا ، فيفيُ هؤلاء وهؤلاء كل غير غالب وتفنى الشرطة ، فاذا كان اليوم الرابع نَهد اليهم بقية اهل الاسلام ، فيجعل الله الدبرة [ اي الهزيمة ] فيقتتلون مقتلة . اما قال : لايرى مثلها . واما قال : لم يُرَ مثلها ، حتى ان الطائر ليمر بجنباتهم [ نواحيهم ] فما يُخَلِّفُهمْ [ اي يجاوزهم ] حتى يخرّ ميتا . فيتعاد بنو الأب كانوا مائة فلا يجدون بقي منهم الا الرجل الواحد ، فبأي غنيمة يفرح ؟ او اي ميراث يقاسم ؟

فبيناهم كذلك اذ سمعوا ببأس هو اكبر من ذلك ، فجاءهم الصريخ : ان الدجال قد خلفهم في ذراريهم ، فيرفضون ما في ايديهم ،

ويُقْبِلون ، فيبعثـون عشرة فـوارس ، قـال رسـول الله : اني لأعـرف اسماءهم واسماء آبائهم ، والوان خيولهم ، هم خير فوارس على ظهـر الارض يومئذ ، او من خير فوارس على ظهر الارض يومئذ . قال ابن ابي شيبة في روايته عن اسير بن جابر . م ـ ١٠ / ٣٦١
**تەرجەمە :**

يوسەيری کوڕی جابیر ـ رضی الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : بایێکی بە شیددەت هات لە کووفە ، پیاوێ هات هیچ ئادابێك و عادەتێکی نەبوو ئەوە نەبێ کە وتی : یا عەبدولـلای کوڕی مـەسعوود قیـامەت هـات ! عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنـه ـ پاڵی دابـوەوە ، هەڵسـاو دانیشت ، قیامەت[1] هەڵناستێ تا وای لێ بێ کە : میرات بەش ناکرێ ، کەس بە تالآن دڵخۆش نابێ لە پاشا دەستی وا لێ کرد ، درێژی کـرد بۆ طـەرەفی شام ، فەرمووی : دوشمنێ لەشکر کۆئەکاتەوە بۆ شەڕ لەگەڵ ئیسلام ، ئیسلامیش لەشکر کۆئـەکەنـەوە بۆ شـەڕلەگـەڵ کردنیـان . وتم : ئەو دوشمنـە رۆمە ؟ فـەرمووی : بـەڵێ . لەو وەختـەدا پیاهـەڵپـژانێکی بەشیددەت ئەبێ ، ئیسلام بەعزێ لە خەڵق هەڵەبژێرن کە لەسەر مردن شەڕ بکەن بە غالبی نەبێ نەگـەڕێنەوە ، شـەڕ ئەکـەن تا شـەو لێکیان جوێ ئەکاتەوە ، هیچ لایێکیان غەڵەبە ناکەن ئەو فیرقەیە مەحو ئەبنەوە . رۆژی دوەمیش و رۆژی سێیەمیش بەو نەوعە . رۆژی چوارەم ئەو (بقیه السیوف) ەی کە لە ئیسلام ماونەوە لەگەڵیان ئەکەونە شەڕکردن ، خوا کـافرەکـان ئەشکێنێ ، شـەڕێکی وا ئەکـەن کە میثلی نابیسـرێ . یـا

(١) وەرگێڕ ـ خ ـ مانای (فقال) ی بیرچوە ، واتە : فەرمووی : قیامەت . . . .

فـەرمووی : میثـلی نەبیستـراوە . طەیـر بە لایـانا رائـەبووریٚ نـاگاتـە ئەوپەریـانەوە تـا ئەکـوژریٚو بەلادا ئیٚ . عـەشیرەتیٚ ئـەولادی باوکیٚ هەلّەژمیٚررێن لە صەد یەکیٚکیان ئەمجا مابیٚ ! کە وابیٚ بە چە غەنیمەتیٚ دلّ خۆشە بیٚ ؟ یا چە میراتیٚ تەقسیم ئەکری ؟

کە لەو حـالّەدا ئـەبن خەبـەری موصیبـەتیٚکی گەورە ئـەبینٚ ، هاوارکەریان بۆ بیٚ

کە : دەججال لە دوای ئەوان لە ناو مالّو منالّیانا جیٚنشین بوە ، هەرچیٚیکان لە دەستایە هەمووی بەجیٚ بیٚلّنو ئەگەریٚنەوە . دە سوار لە پیٚشەوە ئەنیٚرن . پیٚغەمەر ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ـ فەرمووی : ناوی خۆیان ، ناوی باوکیان ، رەنگی ئەسپەکانیان ئەزانم . ئەو دە سوارە لەو رۆژەدا چاکترینی ـ یا فەرمووی لە چاکترینی ـ سواری سەر ئەرزن .

ئەم حەدیثە لە ئەوەلّەکەی وا دەرەکەویٚ کە مەوقووف بیٚ ، لەوە کە ئەفەرمویٚ : پیٚغەمەر ـ صلی الله تعالی علیـە وسلم ـ فەرمـووی . . دەرەکەویٚ کە مەرفووعە .

۱۵۳/۸۷۳ عن جابر ـ صحابي ابن الصحابي ـ بن سَمُرة عن نافع بن عتبة [ رضي الله تعالى عنهم ] قال : كنا مَع رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ في غزوة ، قال : فاتى النبي ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قومٌ من قبل المغرب فوافقوه عند اكمة ، فانهم لقيام ورسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قاعد ، قال : فقالت لي نفسي : ائتهم فقم بينهم وبينه لايغتالونه ، قال : ثم قلت : لعله نجي معهم . فاتيتهم فقمت بينهم وبينه . قال فحفظت منه اربع كلمات اَعُدهنَّ في يدي ، قال : تغزون جزيرة العرب فيفتحها الله ، ثم فارس فيفتحها الله ، ثم تغزون الروم فيفتحها الله ، ثم تغزون الدجال فيفتحها الله . قال [ عبدالملك الراوي

عن جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ] : فقال نافع [ رضي الله تعالى عنه ] : يا جابر لانرى الدجال يخرج حتى تفتح الروم . م ـ ١٠/٣٦٢

**تەرجەمە :**

نافیعی کوڕی عوتەیبە ـ رضي الله تعالى عنـه ـ فەرمـووی : لە غەزاییکا بووین لە خزمەت پێغـەمەرا ـ صـلى الله تعالى عليـه وسلم ـ قەومێ لە طەرەف مەغریبەوە هاتنە خزمەت پێغەمەر ـ صـلى الله تعالى عليه وسلم ـ لای تەپۆڵکەیێ بە خزمەتی گەیین ، ئەوان بەپێوە بوون ، پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ تەشریفی دانیشتبوو ، نەفسم پێی وتم : بچۆ لە بەینی ئەوان و پێغـەمەرا ـ صـلى الله تعالى عليـه وسلم ـ راوەستە مەبـادا فرصـەت ببینن و بیکوژن ، لـە دوایی یا وتم : بـەڵکو پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ قسەی سیرڕی یان لەگەڵ ئەکا . چوومە لایان ، لە بەینی ئەوان و پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ وەستام ، چوار کەلیمەم لە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ حیفظ کرد لە دەستما ئەیژمێرم ، فەرمووی : غەزای (جزيرة العرب) ئەکەن و ، خوا ـ عز وجل ـ بۆتان فەتح ئەکا ، لە دوایی دا غەزای فارس ئەکەن و ، خوا بۆتان فەتح ئەکا . لە دوایی دا غەزای رۆم ئەکەن و خوا بۆتان فەتح ئەکا . لە دوایی دا غەزای دەججال ئەکەن و خوا بۆتان فـەتح ئـەکا . عەبدولمەلیکی راویی ئەڵێ : نافیع ـ رضي الله تعالى عنه ـ بە جابیـری فەرموو ـ رضي الله تعالى عنه ـ : ئەی جابـیر وا ئەبینـین تا رۆم فـەتح نەکرێ دەججال نایێ .

لەسەر ئەو تەرتیبەی کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليـه وسلم ـ فەرمووی (جزيرة العرب) و ، فارس و ، رۆم فـەتح کـران . ماوەتـەوە دەججال ، ئەویش کە وەختی خۆی هات بە تـەحقیق عەرەب فـەتحی

ئەكا . ئیحتیمالی ئەوەیشی هەیە کە خیطابەکە عام بێ بۆ هەموو موسوڵمانان . سێ موعجیزەی گەورەی تیایەو تەحەققوقی کردوە . موعجیزەی چوارەمیش ئەبێ تەحەققوق بکا . آمنت به وبما جاء به ـ علیه الصلاة والسلام ـ

# دەججالو یەئجووجو مەئجووج

١٥٤ / ٨٧٤ عن النواس بن سمعان قال : ذكر رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ الدجال ذات غداة ، فخفَّض فيه ورفَّع [ اى حقَّر شأنه ببيان عيوبه ، وفخم شأنه بما يفعله الله من الخوارق على يده . او خفَّض صوته عند التعب ، ورفع صوته بعدما استراح ليبلغ صوته كل احد . من نووي ] حتى ظنناه في طائفة النخل ، فلما رحنا اليه عرف ذلك فينا . فقال : ماشأنكم ؟ قلنا : يارسول الله ذكرت الدجال غداة ، فخفَّضت فيه ورفَّعت حتى ظنناه في طائفة النخل ، فقال : غير الدجال اخوفني عليكم [ اى اخوف مخوفاتي عليكم ] إن يخرج وانا فيكم فانا حجيجه دونكم ، وان يخرج ولست فيكم فامرؤ حجيج نفسه ، والله خليفتي على كل مسلم ، انه شابٌّ قَطَط ، عينه عنبة طافئة كأني اشبهه بعبد العزى بن قطن [ رجل من خزاعة مات بالجاهلية ] فمن ادركه منكم فليقرأ عليه فواتح سورة الكهف انه خارج خَلَّةً [ اى ما ] بين الشام والعراق فعاث [ ففسد وأفسد ] يمينا ، وعاث شمالا . ياعباد الله فاثبتوا . قلنا : يا رسول الله ومالبثه في الارض ؟ قال : اربعون يوما : يوم كسنة ، ويوم كشهر ، ويوم كجمعة . وسائر ايامه كأيامكم [ سنة واربع وسبعون يوما ، ولاشك ان ضرره اقل من الرؤساء الظالمين الضالِّين المضِلِّين ، كما قاله عليه الصلاة والسلام . اللهم احفظنا من شرورهم ]

قلنا : يارسول الله فذلك اليوم الذي كسنة [ اى وكشهر وجمعة ] اتكفينا فيه صلاة يوم ؟ قال : لا . إقدِروا له قدره [ بابه نصر وضرب ]

قلنا : يا رسول الله وما اسراعه في الارض ؟ قال : كالغيث استدبرته الريح ، فيأتي على القوم ، فيدعوهم فيؤمنون به ويستجيبون له ، فيأمر السماء فتمطر ، والارض فتنبت ، فتروح عليهم سارحتهم اطول ماكانت ذرى واسبغه ضروعا وامده خواصر ، ثم يأتي القوم فيدعوهم ، فيردون عليه قوله . فينصرف عنهم ، فيصبحون ممحلين ليس بايديهم شيً من اموالهم ، ويمر بالخربة [ بفتحتين جمع خرب ، وبفتح فكسر صفة ] فيقول لها : أخرجي كنوزك فتتبعه كنوزها كيعاسيب النحل [ ذكورها ، او جماعتها ] ثم يدعو رجلا شبابا مُمتلئا فيضربه بالسيف فيقطعه جزلتين [ قطعتين ] رمية الغَرَض [ اى بينهما مقدار رميتها ] ثم يدعوه فيُقْبِل ويتهلّل وجهه ويضحك ، فبينما هو كذلك اذ بعث الله المسيح بن مريم ـ عليهما الصلاة والسلام ـ فينزل عند المنارة البيضاء [ وهي موجودة اليوم ] شرقيَّ دِمَشْقَ بين مهرودتين [ بالدال والذال : لابس ثوبين مصبوغين بالورس والزعفران ] واضعاكفيه على اجنحة ملكين ، اذا طأطأ رأسه قطر ، واذا رفعه تحدد منه جمال اللؤلؤ ، فلا يحل لكافر يجد ريح نَفَسه الامات ، ونَفَسه ينتهي حيث ينتهى طرفه ، فيطلبه حتى يدركه بباب بلدة (لُدّ) فيقتله .

ثم يأتي عيسى ابن مريم [ عليهما الصلاة والسلام ] الى قوم قد عصمهم الله منه ، فيمسح عن وجوههم ، ويحدثهم بدرجاتهم في الجنة . فبينما هو كذلك اذ اوحى الله الى عيسى ـ عليه السلام ـ : اني قد أخرجتُ عبادا لي لايدان لاحد بقتالهم فحرِّز [ اى ضم ] عبادي الى الطور [واجعله حرزالهم ] .

ويبعث الله يأجوج ومأجوج وهم من كل حدب ينسلون ، فيمر اوائلهم على بحيرة طبرية فيشربون ما فيها ، ويمر آخرهم فيقولون : لقد

كان بهذه مرَّةً ماءً ! ويحصر نبي الله عيسى ـ عليه السلام ـ واصحابه حتى يكون رأس الثور لأحدهم خيرا من مائة دينار لاحدكم اليوم ، فيرغب نبي الله عيسى واصحابه ، فيرسل الله تعالى عليهم النغف في رقابهم [ دودة تكون في انوف الابل والغنم ] فيصبحون فَرْسىٰ [ مقتولين ] كموت نفس واحدة . ثم يهبط نبي الله عيسى ـ عليه السلام ـ واصحابه الى الارض ، فلا يجدون في الارض موضع شبر الا ملأه زهَمَهم [ دسمهم ] ونتنهم ، فيرغب نبي الله عيسى ـ عليه السلام ـ واصحابه الى الله تعالى فيرسل الله طيرا كاعناق البخت فتحملهم فَتطرحهم حيث شاء الله ، ثم يرسل الله مطرا لايكن منه بيت [ لا يستتر ] مدرٍ ولا وبر [ خانووى گڵ و خێوەتو دەوار ] فيغسل الله الارض حتى يتركها كالزلقةً [ وروى : كالزَلَفة كالمرآة ، او كالمصانع للماء ، او كالاِجّانة للخضراء ، او كالروضة . . . معانٍ ] ثم يقال للارض : انبتي ثمرتك ، وردي بركتك ، فيومئذ تأكل العصابة من الرمانة ، ويستظلون بِقحْفها ، ويبارك في الرِسل [ اللبن ] حتى ان اللِّقْحَةَ [ تازەزاو ] من الابل لتكفي الفئام من الناس [ الجماعة الكثيرة ] واللقحة من البقر لتكفي القبيلة من الناس ، واللقحة من الغنم لتكفي الفخذ من الناس . فبينماهم كذلك اذ بعث الله ريحا طيبة فتأخذهم تحت آباطهم ، فتقبض روح كل مؤمن وكل مسلم ، ويبقى شرار الناس يتهارجون فيها تهارج الحمر [ يجامع الذكران النساء علنا فيمابينهم ] فعليهم تقوم الساعة م ـ ١٠ / ٣٩١

وفي اخرى بعد قوله : (لقد كان بهذه مرةً ماءً) ثم يسيرون حتى ينتهوا الى جبل الخمر وهو جبل بيت المقدس ، فيقولون : لقد قتلنا من في الارض ، هلم فلنقتل من في السماء ! فيرمون بنشابهم الى السماء فيرد الله عليهم نشابهم مخضوبة دما . م ـ ١٠ / ٣٩٨

**تەرجەمە :**

نەواسی کوڕی سەمعان ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بەیانی یەك بەحثی لە دەججال فەرموو ، زۆری نزم کردەوەو تەحقیری کرد ، زۆری بەرزکردەوەو ، کردەوەیی و (خارق العادە) ی بەیان فەرموو : حەتا وامان ظەن برد کە لە ناو بەعزێ باخی خورماکانایە ، کە چووین بۆ لای خورماکانەوە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرقي پێ کردین کە ظەنمان بۆ کوێ چوە . فەرمووی : ئیشتان چی یە ئەچنە ناو دارخورماکانەوە ؟ عەرزمان کرد : (یارسول الله) تۆ بەیانی بەحثت لە دەججال فەرموو ، زۆرت نزم کردەوەو زۆریشت بەرزکردەوە ، حەتتا وا تێ گەیین کە لە ناو بەعزێ لەو دارخورمایانەدایە . فەرمووی : [ دەججال هیچ نی یە ] ئەوی کە زۆر خۆف و ترسم لێی هەیە بۆئێوە دەججال نی یە ، غەیری دەججالە . ئەگەر دەججال خورووج بکات و من لەناوتانا بم من موعارەضەو مودافەعەی ئەکەم لە باتی ئێوە . ئەگەر خورووج بکاو من لەناوتانا نەبم هەرکەس لە ئێوە مودافەعەی نەفسی خۆی بکا ، خوا ـ عزوجل ـ وەکیلی من بێ لەسەر ئێوە . دەججال جەهێڵیکی موو گرژو لوولە ، چاوی وەك بۆڵە ترێ بەرز بۆتەوە ، ئەوی کە من پێی بشوبهێنم عەبدولعوزای کوڕی قەطەنە . هەرکەسێ لە ئێوە بگاتە زەمانی ئەوو تووشی بێ ئەووەڵی سوورەتی (الكهف) بخوێنێ . [ لە ریوایەتێکی ترا ئاخری سوورەتی (الكهف) بخوێنێ ] . دەججال لە مابەینی شام و عێراقا خورووج ئەکا . ئەی (عباد الله) ثابت بن ، لەسەر ئیمان بمێنن . یەعنی تەبەعەی مەکەن . عەرزمان کرد : (یا رسول الله) چەندە لەسەر ئەرز ئەوەستێ ؟ فەرمووی : چل رۆژ ؛ رۆژێکی بە قەد ساڵێکە ، رۆژێکی بەقەد

مانگێکە ، ڕۆژێکی بەقەد هەفتەیێکە . باقی ڕۆژەکانی وەك ڕۆژی ئێستەی ئێوە وایە . یەعنی ساڵێك و هەفتاو چوار ڕۆژ ئەمێنێتەوە .

عەرزمان کرد : (یا رسول الله) ئەو ڕۆژەی کە بە قەد ساڵێکە ـ یەعنی ئەوانەیش کە بە قەد مانگێك و هەفتەییێکە ـ نوێژی ڕۆژێ بۆ ئێمە کافی یە ؟ فەرمووی : خەیر بە قەد ڕۆژەکانی تر تەقدیری بکەن . یەعنی هەر کە خورووجی کرد لە هەر بیست و چوار سەعاتا پێنج نوێژ بکەن .

عەرزمان کرد : (یا رسول الله) سیرعەتی و خێرایی لە ئەرزا چوونە ؟ فەرمووی : وەك بارانێکە کە بای لە پشتەوە بێ ، بەسەر قەومێکا ڕائەبووری دەعوەتیان ئەکا ، ئیمانی پێ ئەهێنن ، ئیجابەتی ئەمری ئەکەن ، ئەمر بە ئاسمان ئەکا باران ئەبارێنێ ، ئەمر بە ئەرز ئەکا گیاو زەراعەت ئەڕوێنێ ، حەیواناتیان ئێوارێ ئەگەڕێنەوە بۆ ماڵێ بەرز ، گوان پڕ ، کەلەکە هەڵاوساو . لە دوای ئەوە بەسەر قەومێکی ترا ئەڕوا دەعوەتیان ئەکا ، ئەمری ڕەدئەکەنەوە ، لێیان ئەگەڕێتەوە ، هەموو فەقیر ئەبن ، لە ماڵ و موڵکی خۆیان هیچیان بە دەستەوە نامێنێ . بە لای کەلاوەدا ڕائەبووری بە کەلاوەکە ئەڵێ : چە غەزنەت تیایە بیخەرە دەرێ ! غەزنەکەی وەك پوورەی هەنگ شوێنی ئەکەوێ ! لە دواییا پیاوێکی زۆر جوان و جەهێڵ بانگ ئەکا بە شیر لێی ئەدا ، ئەیکا بە دوو پارچەوە ، بەینی پارچەکانی بەقەد ئەوەندەی تیر بگرنە نیشان لێك دوورن ، لە دواییا بانگی ئەکا بە پێکەنین و ڕووخۆشی یێتەوە لای .

لەو وەختەدا کە ئەو لەسەر ئەو حاڵەیە [ سەلطەنەت و قودرەت و شەوکەتەکەی لێ ئەبێ بە زەهری مار ] خوا ـ عز وجل ـ حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەم ئەنێرێ ـ علیه الصلاة والسلام ـ تەشریفی لای منارەی سپی ـ کە ئێمڕۆیش مەوجوودە ـ لە طەرەفی شەرقی دیمەشقەوەیە نوزوول ئەکا .

لە ناو دوو لیباسایە ، یەکێکیان بە زەعفەران ، یەکێکیان بە وەرس ـ کە گیایێکی بۆن‌خۆش و زەردەر ڕەنگ‌کراوە ، دەستی موبارەکی ناوەتە سەر باڵی دوو مەلائیکە کە سەری دانەوێنێ قەترەی ئاوی لێ یێتە خوارێ ، کە سەر بەرز بکاتەوە وەك دانە مرواریی لێ یێتە خوارێ . هیچ کافرێ بۆی حەلاڵ نی‌یە کە بۆنی نەفەسی بکاو نەمرێ . بۆنی نەفەسی بە مەددی نەظەری خۆی ئەڕوا . حەزرەتی عیسا ـ علیه الصلاة والسلام ـ شوێن دەججال ئەکەوێ تا بەردەرگای شاری (لـودد) ، کە شارێکە نزیکی قودوس ، ئەیگاتێ و بە جەهەننەمی موشەررەف ئەکا .

لە دواییا حەزرەتی عیسا ـ علیه الصلاة والسلام ـ تەشریفی یێتە لای قەومێ کە خوا حیفظی کردوون لە شەری فیتنەی دەججال . دەستی موبارەکی بەسەرو چاویانا ئەهێنێ ، خەبەریان ئەداتێ بە دەرەجەیان لە بەهەشتا ، لەو وەختەدا خوا وەحی نازڵ ئەکاتە سەر حەزرەتی عیسا ـ علیه الصلاة والسلام ـ ئەفەرموێ : بەعزێ لە عیبادی خۆم خورووجم پێ کردوون ، هیچ کەس توانای نی‌یە کە حەربیان لەگەڵ بکا ، عیبادی من ببە بۆ کێوی طوور ، لەوێ موحافەظەیان بکە .

خوا یەئجووج و مەئجووج ئەنێرێ ، لە هەموو سەربەرەوژێرەیێ گلۆر ئەبنەوە ، ئەوەڵیان بە لای گۆلی طەبەری‌یەدا رائەبوورن ، چە ئاوێکی تیابێ هەمووی ئەخۆنەوە ئاخری‌یەکەیان بە لایا رائەبوورن ئەڵێن : دەفعەیێ ئێرە ئاوی تیا بوو ! یەئجووج و مەئجووج موحاصەرەی حەزرەتی عیسا ـ علیه السلام ـ و ئەصحابی ئەدا ، وای لێ ئێ کە سەری گایێکیان لە لا لە صەد دینار چاتر ئەبێ[1] . حەزرەتی عیسا ـ علیه

(١) دەبوو بینو وسیایە : لە صەد دینار بۆ یەکێکی ئیمڕۆی ئێوە . . .

السلام ـ و ئەصحابی لە خوا ئەپارێنەوە ، خوا کرمێکیان لە ناو ملیانا بۆ ئەنێرێ ، بە یەك دەفعە وەك نەفسێکی واحیدە ئەمرن ، لە دواییدا حەزرەتی عیسا ـ علیه السلام ـ و ئەصحابی لە کێوی طوور ئێنە خوارەوە سەر ئەرز ، یەعنی بۆ دەشت جێ بستێ لە ئەرزا نی یە کە لە لاشەو بۆنی پیسیان پر نەبووبێ . حەزرەتی عیسا ـ علیه السلام ـ و ئەصحابی لە خوا ئەپارێنەوە . خوا ـ عز وجل ـ طەیرێك ئەنیرێ وەك ملی وشتر گەورە ، ئەو لاشانە هەڵەگرن فرێیان ئەدەنە ئەو جێیەی کە خوا ـ عز وجل ـ ئەمرو ئیرادەی کردوە لە دواییدا خوابارانێك ئەنێرێ ، هێچ خانوویێك و هیچ خێوەتێ نابێ بە مانیعی ، خوا ـ عز وجل ـ ، بەو بارانە ئەرز ئەشواتەوە وەك مینای لێ ئەکا ، لە دوایی دا خوا ـ عز شأنه ـ ئەمر بە ئەرز ئەکا : درەختی میوە دارت بروێنە ، بەرەکەتەکەت بێنەرەوە . عەشیرەتێکی گەورە لە هەنارێك ئەخۆن ، لەبەر سێبەری تێکوڵەکەیا دائەنیشن ! بەرەکەت ئەکەوێتە شیرەوە بەو نەوعە وشترێکی تازەزاو بەشی عەشیرەتێ ئەکا . مانگایێکی تازەزاو بەشی فیرقەیێ لەو عەشیرەتە ئەکا . مەرێکی تازەزاو بەشی خێڵێ ئەکا . . . لەسەر ئەم حاڵەدا ئەبن ، خوا بایێکی بۆن خۆش ئەنێرێ . لە بن باخەڵیان ئەداو هەرچی موسوڵمان بێ ئەمرێ ، خەڵقی خراپ و فاسق و فاجیر ئەمێننەوە ، وەك کەرگەل بە ئاشکارا لای یەکتری سواری ژن ئەبن ! لەسەر ئەوانە قیامەت هەڵەستێ .

لە ریوایەتێکا ئەفەرموێ : ئەرۆن تا شاخی خەمر کە شاخی قودوسە . ئەڵێن : خەڵقی سەرئەرزمان کوشت ، بێن خەڵقی ئاسمانیش بکوژین ! تیر ئەگرنە ئاسمان ، خوا بە خوێنەوە تیرەکەیان بۆ ئەگێرێتەوە .

٨٧٥/١٥٥ عن ابي سعيد الخدري [ رضي الله تعالى عنه ] قال : حدثنا رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ يوما حديثا طويلا عن الدجال ، فكان فيما يحدثنا به انه قال : يأتي الدجال ، وهو محرم عليه ان يدخل نِقابَ المدينة [ طريق بين الجبلين ، او بقعة بعينها ] فينزل بعض السباغ [ ارض لاتنبت لملوحتها ] التي تلي المدينة [ من قبل الشام ] ، فيخرج اليه يومئذ رجل هو خير الناس او من خير الناس [ شك من الراوي ] فيقول : اشهد انك الدجال الذي حدثنا رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ حديثه . فيقول الدجال [ لاوليائه ] : أرأيتم ان قتلت هذا ثم احييته هل تشكون في الامر ؟ فيقولون : لا . فيقتله ثم يحييه . فيقول : والله ماكنت فيك اشدَّ بصيرة مني اليومَ . فيريد الدجال ان يقتله فلا يسلط عليه .

[ وفي رواية الآتي عن ابي الوداك : فيأخذه الدجال ليذبحه ، فيجعل ما بين رقبته وترقوته نحاساً فلا يستطيع اليه سبيلا . قسطلاني ] ح ـ ٣٢٦/٣ ح ـ ٢٠٣/١٠ ن . م ـ ٣٩٩/١٠ وفيه : قال ابو اسحاق : يقال : ان هذا الرجل هو الخضر [ ابو اسحاق هذا هو ابراهيم بن سفيان راوي الكتاب عن مسلم . نووي ] فيكون مسلم روى هذه القطعة عن ابي اسحاق . ثم روى ابو اسحاق تمام الكتاب عن مسلم .

تەرجەمە :

ئەبو سەعيدى خدريى ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووى : پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ رۆژێ بەحەتێكى دوورو درێژ ى لە دەججال بۆ فەرمووين . لەو فەرموودەى پێغەمەرا ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ ئەوەى تيا بوو كە دەججال بێت ، لە سەرى حەرامە كە بچێتە ناو دەربەندى مەدينەوە لە بەعزێ جێى شۆرەكاتى خوار مەدينەوە بارى لێ

ئەخا ، پیاوێ لە مەدینە - کە چاکترینی ، یا فەرمووی : لە چاکترینی ئینسانانە لەو ڕۆژەدا - ئەچێ بۆلای دەججال ، بە دەججال ئەفەرموێ : شەهادەت ئەدەم کە تۆ ئەو دەججالەی کە پێغەمەر - صلی الله تعالی علیه وسلم - خەبەری لێ داویت بە ئێمە . دەججال بەو خەڵقەی کە لە لایەتی ئەڵێ : پێم بڵێن ئەگەر ئەمە بکوژم و زیندووی بکەمەوە . . ئایا هیچ شکتان ئەمێنێ لەوەدا کە من خوای ئێوەم ؟ ئەڵێن : خەیر . ئەو پیاوە ئەکوژێ و زیندووی ئەکاتەوە . ئەو پیاوە بە دەججال ئەڵێ : وەڵڵاهی هیچ ڕۆژێ لەمەوپێش یەقینم لەم ڕۆژیاتر نەبوە لەوەدا کە تۆ دەججالی . دەججال تەمای ئەبێ بیکوژێ ، ناتوانێ .

لە ریوایەتی ئەبولوەداکا ئەفەرموێ : دەججال ئەیگرێ پاڵی ئەخا کە سەری بڕێ بە ئەمری خوا - عز وجل - مابەینی قورقوڕاگەیی و چۆڵەمەی ملی ئەکا بە تەختەیێکی مس . ڕێی نامێنێ کە سەری ببڕێ . ئەبوئیسحاق ئەفەرموێ : ئەڵێن : ئەو پیاوە حەزرەتی خضرە .

١٥٦/ ٨٧٦ وعنه - رضي الله تعالى عنه - قال : قال رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - : يخرج الدجال فيتوجه قِبَلَه رجلٌ من المؤمنين ، فتلقاه المسالح [ قوم معهم السلاح يرتبون في المراكز ] مسالح الدجال فيقولون له : اين تعمد ؟ فيقول : اعمد الى هذا الذي خرج . قال : فيقولون له : اوما تؤمن بربنا ؟ فيقول : ما بربنا خفاء . فيقولون : اقتلوه . فيقول بعضهم لبعض : اليس قد نهاكم ربكم ان تقتلوا احدا دونه ؟ قال : فينطلقون به الى الدجال ، فاذا رآه المؤمن قال : يا ايها الناس هذا الدجال الذي ذكر رسول الله - صلى الله تعالى عليه وسلم - . قال : فيأمر الدجال به فيشجُّ [ من شجَّ ، بجيم مشددة ، اى يجرح راسه

ووجهه . او من شبح بشين وباء وحاء . اى يمدُّ ] فيقول : خذوه وشجوه ، فيوسع ظهره وبطنه ضربا . قال : فيقول : اما تؤمن بي ؟ قال : فيقول : انت المسيح الكذاب . قال : فيؤمر به فيؤشر بالمنشار من مفرقه حتى يفرق بين رجليه . قال : ثم يمشي الدجال بين القطعتين . ثم يقول له : قم . فيستوي قائما . قال : ثم يقول له : اتؤمن بي ؟ فيقول : ما ازددت فيك الا بصيرة . قال : ثم يقول : يا ايها الناس انه لايفعل بعدي باحد من الناس . قال : فيأخذه الدجال ليذبحه ، فيجعل مابين رقبته الى ترقوته نحاسا ، فلا يستطيع اليه سبيلا . قال : فيأخذ بيديه ورجليه فيقذف به ، فيحسب الناس انما قذفه الى النار ، وانما القي في الجنة . فقال رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ : هذا اعظم الناس شهادة عند رب العالمين . م ـ ١٠/ ٤٠٠

تەرجەمە :

ئەبو سەعیدی خدریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ . . پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : دەججال خورووج ئەکا ، پیاوێکی موسوڵمان ئەچێ بۆ لای ، لە رێ موحافیظی سەلاحشووری دەججالی پێئەگەن ، لێی ئەپرسن بۆکوێ ئەچی ؟ ئەفەرموێ : بۆلای ئەو پیاوەی کە خورووجی کردوە . پێی ئەڵێن : بۆ بڕوا ناکەی بە رەببی ئێمە ؟ ئەفەرموێ : رەببی ئێمە دیارە پەنهان نی یە . ئەڵێن : بیکوژن . بەعزێکیان بە بەعزێکیان ئەڵێن : بۆ دەججال نەهی لێ نەکردوون کە هیچ کەس بە بێ ئەو مەکوژن ؟

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : ئەیبەن بۆ لای دەججال ، کە موسوڵمانەکە چاوی بە دەججال کەوت ئەفەرموێ : ئەی خەڵقینە ئەمە ئەو دەججالەیە کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرموویەتی .

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : دەججال ئەمر ئەکا ئەڵێ : بیگرن رایکێشن . کە رایان کێشا تێرتێر لە پشتو زگی ئەو پیاوە موسوڵمانە ئەدرێ . فەرمووی : دەججال پێی ئەڵێ : ئیتر ئیمانم پێ نایێنی ؟ ئەفەرموێ : تۆ مەسیحی کەززابی . فەرمووی : ئەمری پێ ئەکرێ بە مشار داینرێ ، لە تەپڵی سەریەوە تا ناولنگی لێك جوێ ئەکرێتەوە ! فەرمووی : دەججال بە مابەینی هەردوو لەتەکەیا ئەڕوا ، لە دواییا دەججال پێی ئەڵێ : هەڵسە . هەڵەستێتە سەر پێ . فەرمووی : لە دواییا پێی ئەڵێ : وام لێ کردیو ئیتر ئیمانم پێ ناهێنی ؟ ئەفەرموێ : بەوەی کە کردت غەیری یەقین بەوە کە تۆ دەججالی هیچ شتێکی ترم زیادی نەکردوە . [ چونکی پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ خەبەری داوینێ کە عەلامەتی دەججال ئەوەیە کە پیاو ئەکوژێو زیندووی ئەکاتەوە . ئەو عەلامەتە لە تۆدا مەوجوودە ، کە وابێ بەمە کە کردت یەقینم پێی زیاد بوو] .

لە دواییا ئەفەرموێ : ئەی خەڵقینە لە دوای ئەوە کە لەگەڵ منی کرد ئیتر ناتوانێ هیچ بکا بە خەڵقی تر . فەرمووی : دەججال ئەیگرێ تا سەری برێ ، بەینی ژێرچەنەیی و چالاّیی ملی ئەکرێ بە مس رێی نامێنێ کە سەری ببرێ . فەرمووی : دەججال هەردوو دەستیو هەردوو پێی ئەگرێو فڕێی ئەدا . خەڵق وا تێ ئەگەن کە فڕێی داوەتە ناو ئاگرەوە . ئەمما فڕێی داوەتە ناو بەهەشتەوە . [یەعنی ناو ئەو ئاگرەی لە پێش چاوی خەڵق ئاگرە ، ئەمما لە حەقیقەتا باغو ئاوو گوڵزارە] .

پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : ئەو پیاوە لە خوصووصی شەهادەتەوە لە حوضووری (رب العالمين) ا لە هەموو کەسێ گەورەترە ؛ [چونکی لەسەر ئەو هەمو ئازارو جەفایەدا لە قسەی حەق لای نەدا] .

٨٧٧/١٥٧ عبدالله بن عمرو [ بن العاص ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ] وجاءه رجل فقال : ما هذا الحديث الذي تحدث به ؟ تقول : ان الساعة تقوم الى كذا وكذا ؟ فقال : سبحان الله ، او لا اله الا الله ، او كلمة نحوهما . لقد هممت ان لا احدث احدا شيئا ابدا . انما قلت : انكم سترون بعد قليل امرا عظيما ؛ يحرّق البيت ، ويكون ، ويكون . ثم قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ تعالى عليه وسلم ـ : يخرج الدجال في أمتي ، فيمكث اربعين لا ادري اربعين يوما ، او اربعين شهرا ، او اربعين عاما . فيبعث الله عيسى بن مريم [ عليهما الصلاة والسلام ] كأنه عروة بن مسعود . فيطلبه فيُهلكه . ثم يمكث الناس سبع سنين ، ليس بين اثنين عداوة . ثم يرسل الله ريحا باردة من قبل الشام . فلا يبقى على وجه الأرض احد في قلبه مثقال ذرة من خير او ايمان الا قبضته . حتى لو أنَّ احدكم دخل في كبد جبل لدخلته عليه حتى تَقْبِضَهُ . قال : سمعتها من رسول الله ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ .

قال : فيبقى شرار الناس في خفة الطير واحلام السباع ، لا يعرفون معروفا ولا ينكرون منكرا . فيتمثل لهم الشيطان ، فيقول : الا تستجيبون ؟ فيقولون : فما تأمرنا ؟ فيأمرهم بعبادة الاوثان وهم في ذلك دارّ رزقهم ، حسن عيشهم . ثم ينفخ في الصور ، فلا يسمعه احد الا اصغى لِيتا ورفع لِيتا [اماِل صفحة من العنق ، ورفع صفحته الاخرى ] واول من يسمعه رجل يلوط حوض أبله ، فيصعق ويصعق الناس ، ثم يرسل الله ، او قال : ينزل الله مطرا كأنه الطلّ او الظلّ [ قال العلماء : الاصح الطَلّ بالمهملة ، وهو الموافق للحديث الآخر انه كمني الرجال . نووي ] نعمان الشاك . فتنبت منه اجساد الناس . ثم ينفخ فيه اخرى فاذا هم قيام ينظرون . ثم يقال : يا ايها الناس هلموا الى ربكم ؛

**وقفوهم انهم مسؤلون . قال : ثم يقال : اخرجوا بعث النار فيقال : من كم ؟ فيقال : من كل الف تسعمائة وتسعة وتسعين . قال : فذلك يوم يجعل الولدان شيبا . وذلك يوم يكشف عن ساق . م ـ ١٠/٢/٤٠٢**

**تەرجەمە :**

پیاوێ هاتە لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ـ رضي الله تعالى عنهما ـ وتی : چیە ئەم حەدیثەی کە تۆ ئەیڵێی کە قیامەت تـا فـلانەو فـلانە وەقت هـەڵەستێ ؟ عـەبدوڵـڵا ـ رضي الله تعالى عنـه ـ فەرمووی : (سبحان الله) یا فەرمووی : (لا اله الا الله) یا کەلیمەیێکی وای فەرموو . نێتم وایە کە لەمەولا بۆ هیچ کەسێ هیچ حەدیثێ ریوایەت نەکەم . من هەر ئەمەم وتوە کە ئەوەندەی پێ ناچێ ئەمرێکی گـەورە ئـەبینن : بەیتـوڵڵا ئـەسووتێ [ حـەججاج سـووتانی ] ، ئـەوەو ئـەوە ئەبێ . . . لە دواییا فەرمووی : کە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ فەرمووی : لە ناو ئوممەتی منا دەججال هەڵەستێ . چل ئەوەستێ ، نازانم چل رۆژ یا چل مانگ ، یا چل ساڵ . لە دواییا خوا ـ عز وجل ـ حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەم ـ عليه الصلاة والسلام ـ ئەنێرێ ، شوێنی ئەکەوێ ئەیکوژێ . لە دواییا حەوت ساڵ خەڵق ئەمێننەوە ، لە بەینی هیچ دوو کەسێکا دوشمنایەتی نابێ ، لە دواییا خوا بایێکی فێنك ئەنێرێ . لەسەر رووی ئەرزا هیچ کەسێ نایێڵێتەوە لەوانەی کە ذەرەیێ ئیمانی یا خێری لە دڵا بێ ، قەبضی رۆحی هەموویان ئەکا ، حەتتا ئەگەر یەکێ لە ئێوە بچێتە ناو جەرگەی شاخێکەوە ئەو بایە ئەچێتە ناو شاخەکە سەر ئەو کەسە تا قەبضی رۆحی ئەکا .

عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئەوەم لە پێغەمەر ـ صلى الله تعالى عليه وسلم ـ بیست فەرمووی : هەر خـەڵقی خراپ

ئەمێننەوە بۆ خراپەکردن . وەك مەل وانە ، ئەوەندە سووك هەڵـەستنە سەر خراپەکردن ، لە عەقڵی درندەدان ، نە چاك ئـەزانن کە بیکـەنو ئەمری پێ کەن ، نە خراپ ئەزانن کـە لێی لادەنو یەکێکی تـر کردی مەنعی بکەن . شەیتان بۆ ئەو کەسانە ئەچێتە شکڵی ئینسانەوە پێیان ئەڵێ : ئێوە بە گوێم ناکەن ؟ ئەڵێ : بە چی ئەمرمان پێ ئەکەی ؟ ئەمریان پێ ئەکا بە بتپەرستن . ئەو خەڵقە لە بتپەرستنا رزقیان زۆر ئەبێ ، عەیشیان خۆش ئەبێ .

لە دواییا نەفخ ئەکرێ بە صوورا ، هیچ کەس نی یـە کە بیبیێو لایێکی ملی لار نەکاتەوەو لایێکی بەرزنەکـاتەوە [ و بـەلادا نەبێ ] . فەرمووی : ئەوەڵ کەسێ کە ئەی بیێ ئەو پیاوە حەوزی وشترەکانی سواغ ئەدا ، کە لێی ئاو بدا . بە هیلاکا ئەچێو هەموو خەڵقیش بە هیـلاکا ئەچن . لە دواییا خوا بارانێ ئەبارێنێ وەك پرووشەو شەونم ، یـا وەك سێبەر . نوعمان کەوتۆتە شکەوە کە عەبدوللا چۆنی فەرموە . [ عولەما ئەڵێن : پرووشەو شەونم صەحیحترەو موافیقە لەگەڵ ئەو حەدیثەدا کە ئەفەرموێ : وەك مەنی ی پیـاوانە ] بـەو بارانـە جەسـەدی ئینسانی پێ ئەروێ ، لە دواییدا دەفعەیێکی تر نەفخ بە صـوورا ئەکـرێ ، ئیسنان هەموو راست ئەبنەوەو تەماشا ئەکەن . لە پاشا ئەمر ئـەکرێ : ئـەی ئینسانان بێن بۆ حوضووری خوای خۆتان . ئەمر ئەکرێ رایان بگرن . سوئالیان لێ ئەکرێ ، لە دواییا ئەمر ئەکرێ ئەوی ئەچێتە ئاگرەوە جوێیان بکەنەوە . [ئەوی کە ئەمری پێ ئەکرێ حەزرەتی ئادەمە ـ علیە الصلاة والسلام ـ] ئەفەرموێ : لە چەند چەند ؟ ئەمری پێ ئەکرێ لە هـەـ هەزارێ نۆصەدو نەوەدو نۆ . فەرمووی : ئەوە ئەو رۆژەیە کە مناڵ پیر ئەکا . ئەوە ئەو رۆژەیە کە بۆ حیساب قـولی لێ هەڵـەکرێو شیـدەت

دەست پێ ئەکا .

اللهم حاسبنا وحسينا حسابايسيرا . تم ولله الحمد . جمعه ٢٠/٩ـ ٩٤٠ .

# نامەیەك بۆ مامۆستا مەلا حسەین

ئەی حسەینم ! ئەم وەرەقانەم لە بیستی مانگا تەواو کردبوو کە بە کاغەذەکەت موشەرەف بووم . فەرمووبووت : کەم کەمەیە غەڵەطی تیایە . راست ئەفەرمووی ؛ چونکی لە ئاخری پیریما خوا خستی یە دڵەوە کە بوخاری و موسلیم جەمع بکەمەوە . مردن لێم نزیك بۆتەوە پەلەپەلە[1] لە پێش مردنا (انشاء الله) تەواوی بکەم . لەبەر ئەوە هەر نووسیومە تەماشام نەکردۆتەوە . لەسەر ئەمری خێری جەنابت ئەم صەحیفانەم تەماشا کردەوە ، ئەوی فەرقم پێکرد لە غەڵەطی کیتابەتیدا بە قەدطاقەت ئیصلاحم کرد ئیمرۆ و ئێستە (الحمد لله) تەواو بوو . جومعە ساعەت پێنجی (الافەرەنگە الاعشرین دقائق ٢٧/٩/٩٤٠)

ذیهنم کول بوە ، دەستم زۆر ئەلەرزێ ، مەرەکەب هەمووی

---

(١) لە پێشەکیی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا وتم : «وەکو خوا درێژەی داپێ بە تەمەنی بۆ تەواوکردنی ئەم کتێبە وایە . . » وە ئەو کاتەیش ئەم بەشەی ئێرەی کتێبەکەم لە بەردەستدا نەبوو .
ئێستە کە ئەمە دەخوێنینەوە دێینە سەر ئەوە کە بڵێین : وەك دەڵێن « دڵی خەبەری داوە » کە مردن کەلەبەری پێ گرتووە ، تا زوو بکات درەنگە بۆیە لێرەدا وا بە (پەلەپەل) دەنووسێ و « یەك جار کتێبەکە دەنووسێتەوە . وە وەك خۆیشی دەفەرموێ : کەمکەم هەڵەی نووسینی ـ وەك لەم لاپەرەی سەرەوەدا دیارە ـ هەیە . منیش ئەوەی کە هەڵەی زۆر زەق و ئاشکراو بچووك بێ وەك دەبینی لە سەرەوە لە باتی (٩٤٠) . (٣٤٠) نووسراوە ، یان نوختەی (غلط) نەکراوە . . ئەوانەم چاك کردوەو کەمتر لە پەراوێزەوە باسم کردوە . مەبەستیشم ئەوەیە کە کتێبەکە بەم پەراوێزانە زۆر نەکەم و ، ئەگەر هەڵێکم چنگ بکەوێ بۆ لەچاپدانی کتێبەکە تا بتوانم زیاتری لێ بەچاپ بگەیێنم و لە دەست لەناوچوونی رزگار بکەم .

بۆیایه دایئەداته ئەو دیوەوه ، قەڵەمی خۆمان نی یە ، کاغەذی چاك نی یە ، هەر ئەوەندە ئەتوانم . ئەگەر عەڵەطیشم بیّ لە مەعنادا ـ دیارە کە هەیە ـ ئومیّدم وایە بە هیممەتی جەنابت و ئەحبابان کـە ئیصلاحی بکـەن ، با مەعنای حەدیثە موبارەکەکان بە غەڵەطی نەمیّنیّتەوە .

لە دوای ئەم بابە (انشاء الله) دەست بە فەضائیلی ئەصحابی کیرام ئەکەم کە فەضائیلی ئەوانیش هەر لە تەعلیم و تەربی یەی پیّغەمەرە ـ صلی الله تعالی علیه وسلم ، وعلیهم الرضوان ـ ئـەویش لە فـەضائیـلی ئەو مەعدوودەو ، بەرەکەت و موعجیزەی ئەوە . (متعني الله وایاك بلقائهم تحت لوائه ـ علیه الصلاة والسلام ـ آمین) رشید بابان ٢٧/٩/١٣٤٠ .

ئەمەیشت عەرزبکەم ئەم وەرەقانە کە ئەینیّرم بە خدمەتی بگەی (تأمل ؛ لانها احادیث) هەم تەبییضە هەم موسوەددەیە لە خدمەت هیچی تریانا نیم ، کە بزانم موکەرەری تیایە یاتیا نی یە . رەنگە زۆری تیا بیّ ، شایەد فەرقیان نەبیّ مەینووسن . (والسلام علیکم والسلام)

فضـائل اصحـاب النبي ـ عليه الصـلاة والسلام ، وعليهم رضوان الملك العلام . ٢٨/٩/٩٤٠

## فضائلهم في الجملة

بسم الله الرحمن الرحيم

(الحمد لله رب العالمين ، صلوات الله وسلامه على سيد المرسلين . وعلى آله ، واصحابه ، وازواجه ، وذرياته الطيبين الطاهرين . رضوان الله تعالى عليهم أجمعين) .

ئەوی صوحبەتی پێغەمەری ـ ﷺ ـ كردبێ ، با سەعاتێكیش بێ ، یا پێغەمەری ـ ﷺ ـ دیبێ بە موسوڵمانی ، نێر بێ یا مێ ، گەورە بێ یا منالْ . . ئەو كەسە صەحابی یە . ح/٦/٧٦

[ مم ] الفضيلة الآية[1]

﴿يا ايها الناس انا خلقناكم من ذكر وانثى ، وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا ، ان اكرمكم عند الله اتقاكم ان الله عليم خبير[2]﴾ حجرات ح ـ ٦/٢

عن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ : الشعوب : القبايل العظام . والقبائل : البطون . ح ـ ٦/٣ .

﴿يا ايها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة ، وخلق منها زوجها ، وبث منهما رجالا كثيرا ونساء ] واتقوا الله الذي تساءلون به والارحام ، ان الله كان عليكم رقيبا[3]﴾ . ح ـ ٦/٢ اول آية سورة النساء .

---

(١) ئەم ناونیشانەم باش بۆ نەخوێنرایەوە

(٢) سوورەتی حجرات ، ئایەتی (١٣)

(٣) سوورەتی نیساء ، ئایەتی (١)

خوا ـ عز وجل ـ بەم دوو ئایەتە کەریمە بەیانی ئەوە ئەکا کە فەضل و شەرەفی ئینسان بە : حەسەب و ، نەسەب و ، دەوڵەمەندی و عەشیرەت زۆری و ، شەوکەت و ، قوەتی دنیایی . . . نی یە ، چونکی دنیا بۆ هیچ کەس بەقای نەبوەو نابێ . لە موددەیێکی کەما ئەبرێتەوە ، صەد هەزار ساڵ لە دنیادا بژی کە برایەوە وەکوو هیچ نەبووبێ وایە . نە لەذەتی نە ذیللەتی نامێنێ .

ئیمرۆ حەفتاو دوو ساڵم عومرە ، بە حیسابی شەمسیی ، هەر ئەم ئانەیە کە ئەمە ئەنووسم ، ئەویش وا رابورد . عیززەت و شەرەف بە ئیطاعەتی ئەمرو نەهی خوایە ، ئیطاعەتی پێغەمەرانیش ـ علیهم الصلاة والسلام ـ هەر ئیطاعەتی خوایە . دوای مردن فەقیرو پادشاه هیچ فەرقیان نامێنێ ، (ظاهرا) ئەبن بە جەماد ، با پادشاهەکەیش گومەزی ئاڵتوونی لەسەر بکرێ ، بە ئەطرافیا گوڵ و گوڵزار بکرێ ، لە قەبرەکەیا مەشغوولی عەمەلی خۆیەتی . زۆرترینیان ئاوات بە گەلێ فەقیر ئەخوازێ کە لە برسانا مردبێ . سەڵطەنەتەکەی لێ ئەبێ بە زەهری هەلاهی . (کوردیی ئەنووسم ! ) .

لە ئایەتی ئەوەلا ئەفەرموێ : ئەی ئینسانان ! بە تەحقیق من ئێوەم ، فەقیرتان و دەوڵەمەندتان ، پادشاو رەعییەتتانم ، لە نێرێك و لە مێیێکم خەلق کردوون کە ئادەم و حەووایە ـ علیهما السلام ـ یا کوللی یەکێکم لە ئێوە ، نێربێ یا مێ بێ ، حەسەب و نەسەبی ببێ یا نەیبێ . . لە باوکێك و لە دایکێ خەلق کردوە هەموو لەوەدا شەریکن ؛ وەکوو یەك وانە ، هیچ فەرقتان نی یە ، خالیقتان و ئەصلتان یەکێکە ، یەکێ روانوونی ، هەموو لقی دارێکن ، ئیتر چە مەعنای هەیە فەخربەسەر یەکتریدا ئەکەن ؟ لەو خوصووصەوە کەستان لە کەستان زیاتر نی یە .

ئێوەم كردوە بە شوعبەو قەبیلە بۆ خاتری ئەمە كە یەكتری بناسن ، وەك بڵێی فلان كەس لە فلان عەشیرەتە ، لە فلان قەبیلەیەتی ، لەو قەبیلەیش لە فلان خێڵە ، كوری یا كچی فلانە ، فلان كەس لە فلان شارە ، لە فلان محلەیە ، لە فلان شەقام و جادەیە ، لە فلان كۆڵانە ، لە خانەی فلان نومرۆیە كە پێی ئەڵێن ناونیشان ، ئادرەس . بەوە یەكتری ئەناسن ، یەكتری ئەدۆزنەوە ، لە یەكتری ون نابن . فایدەی شوعبەو قەبیلە هەر ئەوەندەیە . بۆیێكم نەكردوون بە عەشیرەت و قەبیلە كە فەخر بەسەر یەكتریدا بكەن ؛ چونكی عەشیرەت و قەبیلە نابن بە سەبەبی ئیفتیخارو گەورەیی و شەرەف ، گەورەو شەریف ئەوەیە كە لای خوا گەورەو شەریف بێ . گەورەبوون و شەریفبوون لە لای خوا بەوە ئەبێ كە ئینسان تەقواو عیبادەتی خواو ئیطاعەتی خوای زۆر بێ . كە وابێ ئەكرەمترین و مەقبولترینی ئێوە لە حوزووری خوادا ئەوانەتانن كە تەقوای زیاتر بێ . بە تەحقیق خوا عیلمی هەیە بە ئێوەو خەبەری هەیە بەسەر ظاهیرو باطینتانا ، بەسەر هەموو عەمەلی چاكەو خراپەتانا . ئەزانێ كێتان تەقوای هەیەو كێتان نی‌یەتی . هی كامتان زۆرە ، هی كامتان كەمە .

[ ئیبن و عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ رۆژی فەتحی مەككە لەسەر ئوشترەكەیەوە خوطبەی خوێن ، بەوەی لایەق بە خوا بێ حەمدو ثەنای خوای كرد ، لە دوایی‌یا فەرمووی : ئەی ئینسانینە خوای تەعالا لە ئێوە تەعظیمی ئینسانی بە واسیطەی باوك و باپیرەوە ، كە عادەتی جاهیلی‌یەت بوو ، قەطع كردوە . ئینسان دوو پیاوە ، یەعنی دوو نەوع ئینسانە : پیاوێكی صاحیب تەقوایە لای خوا كەریمە . یەعنی حەسەب و نەسەبی دنیایی ببێ یا نەبێ . پیاوێكیان فاسق و شەقی‌یە ، سووكە لە لای خوا بێ‌قەدرو قیمەتە ، پادشا

بێ یـا گەدا بێ ، ئـەو ئایـەتەیشی خـوێنـەوە : ﴿ یـا ایهـا النـاس انـا خلقناکم﴾[1] . . . الآیة . رواه ابن ابي حاتم . قسطلاني .

[بوخاریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : شەعب نەسەبی بەعیدە . قەبائیل لە خوار ئەوەوەیە .

ئیبن وعەباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئـەفەرمـوێ : شوعـووب قەبائیلی گەورە گەورەیە . قەبیلە بەطنە .

بەیضاوی و قەسطەلانی ئەفەرموون : (شعبە) جەمعێکی گەورەیە کە مەنسووب بێتە ئەلای باوکی . (شعبـە) جامیعی گـەلێ قەبیلەیـە . قەبیلە جامیعی گەلێ (عمارە) یـە ، (عمارە) جـامیعی بەطنـە . بەطن جامیعی گەلێ فـەخذە . فـەخذ جـامیعی گەلێ فـەصیلەیە . (خـزیمە) شەعبە . (کنانە) قەبیلەیە . قـورەیش عیمارەیـە . قوصـەی بەطنـە . هاشم فەخذە . عەباس فەصیلەیە .

بەعزێك ئەڵێن : شەعب بەطنی عەجەمە ، قەبیلە بەطنی عەرەبە]

**مەعنای ئایەتەکەی (نساء) :**

ئـەی ئینسانـان ! تەقـوای خوای خـۆتـان بکـەن ، خـۆتـان لـە موخالەفەی ئەمرو نەهی ئەو بپارێزن . رەببێکی واتانە ئێوەی لە تەنها یەك نەفس خەلق کردوە بە طەریقی تەوالود ، ئەو نەفسە کە حەزرەتی ئادەمە ـ علیه الصلاة والسلام ـ ئەگەر بڵێی : لە دوو نەفسی خەلق کردوە کە ئادەم و حەوایە ـ علیهما السـلام ـ . . زەوجیشی کە حـەزرەتی حەوایـە ـ علیها السلام ـ هەر لەو نەفسە خەلق کردوە ، لە تەنها پەراسووییێکی چەپی ئەوی خەلق کردوە ، لەو دوانەیش چەندە پیاوی زۆرو ژنی زۆری

(١) سوورەتی : حجرات ، ئایەتی : (١٣) .

خەڵق و نەشرو بڵاو کردۆتەوە بەسەر ئەرزا .

خواییکی ئەوەندە قادر بێ لە هیچ ئەرز خەلق بکـاو ، لە ئـەرز نەفسێك و ، لەو نەفسە ژنێك و ، لەو ژن و پیاوە ئەم هەموو ئینسانانەو ئەم هەموو پیاوو ژنە ئیجاد بکا . . بۆ قودرەتی نی یە بەسەریانا کە موخالەفەی بکەن عەذابیان بدا ؟ لەگەڵ ئەم قودرەتە قاهیرەیەو ئەو نیعمەتە باهیرەی ئیجـادو ئینعـام و ئیعــطای رزق و . . . صیفـاتی ســائیـرەو تــەدریجا پەروەردەکردنیان بۆ لایەق نابێ بەمە ئیطاعەتی بکرێ و لە مـوخالـەفەی (توقی) بکرێ ؟

هەم خۆتان بپارێزن لە موخالەفەی ئەو خوایەی کە بە ناوی ئەوەوە داوای شت لە یەکتری ئەکەن ، ئەڵێن : تو خوا ئەوە وا بکەو ، ئەوە وا بکە . یەعنی ئیدراکی ئەوە ئەکەن کە خوایەو گەورەیەو (لازم الاطاعة)یە بۆیە بە ناوی ئەوەوە رجا لە یەکتری ئەکەن . وەك چۆن لەبەر عەظەمەتی ئەو ناوی ئەکەن بە شەفیع لای یەکتری لەبەر ئەو عەظەمەتەیش لازمە لە موخالەفەی خۆ بپارێزن .

هـەم خۆیشتـان لە قـەطعی صیلەی رەحم بپارێـزن ؛ چـونکی قەطعی ئەو مووجیبی ئەوەیە کە خوا ـ عز وجل ـ ئەوەی کە قەطعی ئەکا لە رەحمەتی خۆیی قەطع بکا . (انشـاء الله) بەحثی صیلەی رەحم لـە (رقاقا) بێت . بـۆیە لازمـە لەسـەرتان کـە خۆتـان لە خـواو لە رەحم بپارێزن ؛ چونکی بە تەحقیق خوا ـ عز وجل ـ حافیظی ئێوەیەو (مطلع)ە بەسەر ئەحواڵتانا ، چاوی لە هەموو کردەوەی چاکەو خراپەتانە ، هیچی لێ ون نابێ ، بە پێی ئەوە موعامەلەتان لەگەڵ ئەکا .

ئەم ئایەتەیش ئـەگەیێنێ کـە شەرەفـو گـەورەیی بە شـەرەفـو حەسەب و نەسەبی دنیەوی نی یە ؛ چونکی هەموو کەس ئەولادی دایك و

باوكێكن ، كەستان لە كەستان گەورەو شەریفتر نین . نەسەبی هەمووتان یەكێكە . حەسەبی دنیەویش (ظل)ێكی زائیلە . حەسەبی (اخروی)یش . ئەمجا لە ئاخیرەتا مەعلووم ئەبێ ، حەتتا ئەگەر ئینسان بە عیلمی دینیو عیبادەتو تەقوای ئیفتیخار بكا ئەبێ بە عوجبو خودپەسەندیی ، هەموو عەمەلی بە فەسادا ئەبا ، كە وابێ لە دنیادا مووجیبی ئیفتیخار هیچ شتێك مەوجوود نییە . كە بە (منقّح)ی ئینسان چوە حوضووری خوا ئەو وەختە ئیستیفادە لە ئەعمالی صالیحەی ئەكا . وفقنا الله وحسينا على هذا وجعلنا من المتقين .

١/٨٧٨ عن ابي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن رسول الله ـ ﷺ ـ قال : تجدون الناس معادن ؛ خيارهم في الجاهلية خيارهم في الاسلام اذا فَقُهوا [ومن باب علم المضموم لازم ، والمسكور متعدٍّ] ، وتجدون خير الناس في هذا الشأن اشدهم له كراهية . وتجدون شر الناس [من شرار الناس . م] ذا الوجهين : الذي يأتي هؤلاء بوجه ويأتي هؤلاء بوجه . ح ـ ٤/٦ ، م ـ ٤٢٠/٩

وفي مسلم: تجدون من خير الناس في هذا الامر اكرههم له قبل ان يقع فيه . م ـ ٤٢١/٩.

تەرجەمە :

ئەبو هورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه . . پێغەمەر ـ ﷺ ـ . . . فەرمووی : [لە خێرو شەڕا] نەوعی ئینسانتان وەك مەعدەن بۆ دەرەكەوێ . یەعنی چۆن مەعدەن چاكی هەیەو خراپی هەیە ؛ مەعدەنی زیوو ، ئاڵتوونو ، ئەڵماسو ، ئاسنو ، خەڵووزو . . سائیرەی هەیە . . ئینسانیش بەو نەوعە چاكو خراپو ، مەقبووڵو بەقیمەتو

بێقیمەتی هەیە . ئەو ئینسانانەی کە لە زەمانی جاهیلیەتا لە ناو خەڵقا ئیعتیبارو قیمەتی بوە لە دوای ئیسلامبوونیشیان بەو نەوعە بە نیسبەت غەیری خۆیانەوە بەو نەوعە ئیعتیبارو قیمەتیان موحافەظە ئەکەن ، بەو شەرتە کە عیلمو فەضیلەتی دینییان ببێ ، ئەو وەختە فەضیلەتی زەمانی جاهیلیەتیشیان موحافەظە ئەکەن [یەعنی فەضیلەتی حەسەبیو نەجابەتی نەسەبیشیان بۆ ئەبێ ، هەردوو شەرەفەکەیان ئەبێ ، هەم شەرەفی مەورووثیان ئەبێ ، هەم شەرەفی موکتەسەبیان ئەبێ .

١ ـ ئەگەر ئەو کەسەی کە لە زەمانی جاهیلییەتا شەریف بووبێ ـ وەك قورەیش (مثلا) ـ دوای ظوهووری ئیسلامییەت ئیسلامەتی قەبووڵ نەکا ـ با کوری پێغەمەریکیش بووبێ ـ شەرەفی جاهیلییەتی هیچ قیمەتی نامێنێ .

٢ ـ ئەگەر ئیسلامەتی قەبووڵ بکا جامیعی دوو شەرەف ئەبێ ، ئەو وەختە ئەگەر لەگەڵ ئەو دوو شەرەفەدا شەرەفی عیلمی دینیو ، زوهدو تەقوایشی ببێ ئەو وەختە لە ئەعلای دەرەجەی شەرەفا ئەبێ . ئەبێ بە تاجی مورەصصەعی هەموو موسوڵمانان ؛ وەك خولەفای راشیدینو ئەهلی بەیتو ذورریاتی طاهیرین . ئەگەر لە جاهیلییەتا شەرەفی نەبووبێ ـ وەك جوولەکەیێ موسوڵمان ببێ ـ فەقەط ئیسلامەتیەکەی بە عیلمو تەقوا ئارایش نەکا ئەو کەسە لە ئەدنای دەرەجەی شەرەفا ئەبێ . . لە ژوور ئەمەوە ئەو شەریفی جاهیلییەتەیە کە ئیسلام بێو ئیسلامەتیەکەی بە عیلمو تەقوا موزەییەن نەکا . لە ژوور ئەمەوە غەیرە شەریفی فەقیهو موتەقی ؛ پیاوێکی دۆم کەسبی عیلمو فەضلو تەقوا بکا ئەفضەلترە لە سەییدێکی غەیرەموتەقیو جاهیل .

خوڵاصه : مەئالی ئایەتەکانو ، مەئالی ئەم حەدیثە یەك ئەگرنەوە ، کە صیرف شەرەفی نەسەبی‌ی هیچ قیمەتی نی‌یە لە لای خوا ـ عز وجل ـ حەقیقەتی شەرەف هەر هی زوهدو تەقوایە ، ئەگەر شەرەفی نەسەبیشی لەگەڵا بێ ئەبێ بە (نور علی نور) ، وەك ئەڵماسێکی لێ بێ کە لە ناو گڵ و قورا بێ و پاکی بکەیتەوە] .

هەم لە ئیشی ئیمامەتی و خەلافەتا بۆتان مەعلووم ئەبێ کە کێ لە هەموو کەس زیاتر خەلافەت و ئەمارەت ئەکەرهێنێ [تا ئە کەوێتە ناوی (أخری یأتي انشاء الله تعالی) یەعنی کە کەوتە ناوی پێی خۆش ئەبێ] لێتان مەعلووم ئەبێ کە خراپترینی هەموو کەس ئەوەیە کە دووڕوە : بە روویەکی ئەچێتە لای ئەوانو بە روویێکی ئێتە لای ئەمان .

**٨٧٩/٢ عن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ [انه سئل عن قوله تعالى . خ اخرى] : ﴿الا المودّة في القربى﴾[1] فقال سعيد بن جبير [رحمه الله] : قربى محمد ـ ﷺ ـ [حمل الآية على امر المخاطبين بان يوادوا اقاربه ـ ﷺ ـ وهو عام لجميع المكلفين] فقال [ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لسعيد] : ان النبي ـ ﷺ ـ لم يكن بطن من قريش الا وله فيه قرابة . فنزلت عليه [هذه الآية التي تفسيره] الا ان تصلوا قرابة بيني وبينكم . ح ـ ٤/٦ ، ح ـ ٣١٦/٧ ، وفيه : فقال ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما ـ لسعيد] : عجلت .**

**تەرجەمە :**

ئیبن‌وعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ سوئالی تەفسیری ئەم ئایەتەی لێکرا کە لە (حم عسق)ایە کە تەفسیری وایە : ئەی محەمەد بە قورەیش بڵێ : کە من لەسەر ئەمە کە ئەحکامی خواتان تەبلیغ ئەکەم

(١) سوورەتی (شوری) ئایەتی : (٤٢)

هیچ ئەجرتان لیٚ طەلەب ناکەم ، هەر ئەمەتان لیٚ طەلەب ئەکەم کـە مەحەببەتی منتان بیٚ لەبەر ئەوە کە خزمایەتیمان لە بەینایە . هەر کەسیٚ کەسبی حەسەنەییٚ بکـا ، وە کوو مـەحەببـەتی پیٚغەمـەر ـ ﷺ ـ ئیٚمە حەسەناتی زیاد ئەکەین ، بە تەحقیق خوا غەفوورو رەحیمە . . سەعیدی بنی جوبەیر ـ رحمه الله ـ کە لە خدمەتیا بوو فەرمووی : موراد لە (قربی) ئالی محەمەدە ـ عليه الصلاة والسلام ـ یەعنی موخـاطەبـەکان ، یـەعنی هەموو ئینسان ئەمریان پیٚ کراوە کە ئالی پیٚغەمەریان خوٚش بویٚ ـ ﷺ ، ورضي عنهم ـ .

ئیبن و عەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی : موخاطەبەکان هەموو ئینسان نین ، توٚ عەجەلەت کرد لە تەفسیرەکەیا ، موخاطەبەکان تەنها قورەیشن . پیٚغەمەر ـ ﷺ ـ هیچ قەومیٚ لە قورەیش نىیە کە لەو قەومەدا زیاد لە قورەیشیٚتی خزمایەتىیەکیان نەبیٚ لەگەڵ پیٚغەمەرا ـ ﷺ ـ یەعنی مەعنای ئایەتەکە وا نىیە کە ئەی موسوڵمانینە ئیٚوە ئالی پیٚغەمەرتان ـ ﷺ ـ خوٚش بویٚ . مەعنای وایـە : ئەی قـورەیش پیٚغەمـەر ـ ﷺ ـ خزمی هەمووتانە ، هیچ نەبیٚ صیلەی خزمایەتىیەکەی بەجیٚ بیٚنن ، هەر لەبەر خزمایەتىیەکەی ئەوتان خوٚش بویٚ .

لەفظی (في) بوٚ تەعلیلە .

**٣/ ٨٨٠ عن جبير بن مطعم بن نوفل [رضي الله تعالى عنه] قـال : مشيت انا وعثمان [منبع الحياء والعـرفان ـ رضي الله تعـالى عنه ـ] الى رســول الله ـ ﷺ ـ [فيــا قسـم من الخمس بـين بني هــاشـم وبني المطلب ، د ، ن] [قال جبير : ولم يقسم النبي ـ ﷺ ـ لبني عبد شمس ، ولا لبني نوفل ح ـ ٥/ ٢١٢ اخرى] فقلنا : يـا رسول الله اعـطيت بني**

المطلب ، وتركتنا ونحن وهم منك بمنزلة واحدة ؟ فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : انما بنو المطلب وبنو هاشم شيئ واحد . [سيّ واحد . ذر] ح ـ ٥/٢١١ ، ح ـ ٦/٧

**تەرجەمە :**

جوبەيرى بنى موطعەم ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووى : لەگەڵ عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ دا چووينە خدمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ خومسێكى تەقسيم ئەكرد لە بەينى بەنى هاشم و (بني المطلب) بەشى (بني عبد الشمس)و بەنى نەوفەلى لێ نەدا عەرزمان كرد : (يا رسول الله) لە خومس بەشى (بني المطلب)ت داو بەشى ئێمەت نەدا . ئێمەت تەرك كرد ، حاڵ وايە كە ئێمەو ئەوان لەگەڵ تۆدا بە نيسبەت (عبدالمناف)ەوە دەرەجەيێكمان هەيە ؟ [ئەوان ئەولادى موطەليبن ، ئەويش كوڕى (عبدالمناف)ە عوثمان ئەولادى (عبدالشمس)ە (عبدالشمس) كوڕى (عبدالمناف)ە ، موطعەم كوڕى نەوفەلە ، نەوفەليش كوڕى عەبدولمەنافە ، تۆيش كوڕى هاشمى ، هاشم كوڕى (عبدالمناف)ە . . بۆچ بە هاشمى و موطەليبى ى ئەدەى ، بەشى نەوفەلى و عەبدوشەمسى نادەى ، باپيرى هەموومان يەكێكە ؟] پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووى : (بنو المطلب)و بەنوهاشم يەك شتن [چونكى هاشم باپيرمانە ، موطەليب ـ با وەك باپيرى ئێوە ماميشم بێ ـ ئەمما ئەو (عبدالمطلبى) باپيرمى پەروەردە كردوە ، مامەكانى ترى دەخڵيان نەكردوە خۆيان تێنەگەيانوە]

٤ / ٨٨١ عن ابي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال رسول الله ـ ﷺ ـ : قريش [بنو النضر ، او فهر بن مالك بن النضر] والانصار ، وجهينة ، ومزينة ، واسلم ، واشجع ، وغفار موالي ليس لهم مولى دون الله ورسوله . ح ـ ٦/٧ م ـ ٤١٧/٩

وعن ابي ايوب - رضي الله تعالى عنه - بتقديم بعض على بعض ، وليس فيه قريش ، وفيه : ومن كان من بني عبدالله مواليَّ دون الناس ، والله ورسوله مولاهم . م في تلك الصحيفة .

٨٨٢/٥ عن ابي ذر [رضي الله تعالى عنه] قال : قال لي رسول الله - ﷺ - : ائت قومك فقل : ان رسول الله - ﷺ - قال : اسلم سالمها الله ، وغفار غفر الله لها [دعاء ، او خبر] م - ٤١٦/٩

٨٨٣/٦ عن ابي هريرة [رضي الله تعالى عنه] ان رسول الله - ﷺ - قال : اسلم سالمها الله ، وغفار غفر الله لها . اما اني لم اقلها . ولكن قالها الله - عز وجل - م - ٤١٦/٩

والاحاديث في حق اسلم وغفار وردت عن ابي ذر ، وابي ايوب ، وابي هريرة ، وجابر ، وخفاف بن ايماء ، وابن عمر - رضي الله تعالى عنهم -

٨٨٤/٧ ابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - اخبر ان رسول الله - ﷺ - قال على المنبر : غفار غفر الله لها ، واسلم سالمها الله ، وعصية عصت الله ورسوله . ح - ١١/٦ ، م - ٤١٦/٩

تەرجەمە :

١ - ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - . . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : قورەیش و ، ئەنصارو ، جوهەینەو ، موزەینەو ، ئەسلەم و ، ئەشجەع و ، غیفار مەولاو یاریەدەری منن ، ئەوان غەیری خواو رەسوولی خوا یاریەدەریان نی یە .

٢ - ئەبوئەییوب - رضي الله تعالى عنه - . . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : ئەنصارو ، موزەینەو ، جوهەینەو ، غیفارو ، ئەشجەع و ، ئەوانەی لە ئەولادی عەبدولّلا - ناوی جاهیلییەی

(عبدالعزى)یه پێغەمەر ـ ﷺ ـ ناوی گۆڕین بۆیـه عەرەب پێیـان ئەڵێن : (بني محولة) له غەطەفانن ـ بن مـەولای منن ، غەیـری ئەوان مەولام نین ، خواو رەسوولی خوایش مەولای ئەوانه .

٣ ـ عن ابي ذر ـ رضي الله تعالى عنه ـ پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێی فەرمووم : بچـۆره ناو قـەومەکـەت پێیان بـڵێ : کـه رەسـوولـوڵـلا ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەسلەم خوا موسالەمەی لەگەڵ کردوون ، یەعنی که سەلامەتیان ئەکا له عەذاب . غیفار خوا لێیان خۆش بوه .

٤ ـ ئەبوهورەیره ـ رضي الله تعالى عنه ـ پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەسلەم خوا سەلامەتیـان بکا ، غیفـار خوا لێیـان خۆش بـوه . خەبەرتان پێ ! ئەمە من نەمـوتوه خـوا فەرمـوویەتی [هـەرکەس ئیطاعەی ئەمری خوا ـ عز وجل ـ و رەسوولی خوا ـ علیه الصلاة والسلام ـ بکا وایه . ]

٥ ـ ئیبن و عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ خەبەری داوه که پێغەمەر ـ ﷺ ـ لەسەر مینبـەر فەرمـووی : غیفار خـوا لێی خۆش بـوه ، ئەسلەم خوا موسالەمەی لەگەڵ کردوەو ، (عصية) عیصیـانی له خواو پێغەمەری خوا کردوه ـ ﷺ ـ

٨٨٥/٨ عن عدي بن حاتم ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : اتيت عمر بن الخطاب [رضي الله تعالى عنه] فقال لي : إن اول صدقة بيّضت [اى سرتهم وأفرحتهم . نووي] وجه رسـول الله ـ ﷺ ـ ووجوه اصحـابه صدقة طيٍّ جئت بها الى رسول الله ـ ﷺ ـ م ـ ٩/ ٤٢٠

تەرجەمە :

عودەیی کوڕی حاتەمی طائی ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : هاتمە خلمەت عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ پێی فەرمووم : ئەوەڵ صەدەقەیێ کە رووی پێغەمەرو ئەصحابی پێغەمەری ـ ﷺ ـ ، ورضي عنهم ـ سپی کردبێ ، یەعنی فەرەحناکی کردبن صەدەقەی طەی بوە کە هێنات ئەلای پێغەمەر ـ ﷺ ـ .

٨٨٦/٩ وعنه [رضي الله تعالى عنه] قال : اتينا عمر [رضي الله تعالى عنه] في وفد ، فجعل يدعو رجلا رجلا ويسميهم . فقلت : اما تعرفني يا امير المؤمنين ؟ قال : بلى أسلمتَ اذ كفروا ، وأقبلتَ اذ ادبروا ، واوْفيتَ اذ غدروا ، وعرفتَ اذ أنكروا . فقال عدي : فلا أبالي اذا . ح ـ ٤٢٩/٦ .

ذكر ابن اسحاق : ان خيل النبي ـ ﷺ ـ اصابت اخت عديّ ، وان النبيّ ـ ﷺ ـ منَّ عليها ، فأطلقها بعد أن استعطفها ، فقالت له : هلك الوالد ، وغاب الوافد ، فامنن عليَّ منَّ الله عليكَ . قال : ومَنْ وافِدُكِ ؟ قالت : عديُّ بن حاتم . قال : الفارُّ من الله ورسوله ؟ قال : فلما قَدِمتْ على عديّ اشارت عليه بالقدوم على رسول الله ـ ﷺ ـ فقدم واسلم .

وفي الترمذي : انه لما قدم قالوا : هذا عديُّ بن حاتم . وكان النبيّ ـ ﷺ ـ قال قبل ذلك : اني لأرجو الله ان يجعل يَدهُ في يدِهِ . قسطلاني .

تەرجەمە :

عەدیی کوڕی حاتەمی طائی ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : هاتینە خلمەت عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لەگەڵ جەماعەتێ عومەر

ـ رضي الله تعالى عنه ـ یەکە یەکە بانگی ئەکردن و ناوی ئەبردن . عەرزم کرد : (یا امیر المؤمنین) نام ناسی ؟ فەرمووی : بەڵێ ئەتناسم : لە وەختێکا ئەوان کافر بوون تۆ موسوڵمان بووی ، وەختێ ئەوان پشتیان تێکردین تۆ رووت تێکردین ، وەختێ ئەوان نەقضی عەهدیان کرد تۆ وەفات بە عەهد کرد ، وەختێ ئەوان ئێمەیان ئینکار کردو نەیان‌سین تۆ ئێمەت ناسی . عەدیی فەرمووی : [کە بەم نەوعە میقداری منت زانی ئیتر باکم نی‌یە [لەوە کە لە لێپرسینا ئەوانت لێ پێش‌خستم] .

ئیبن و ئیسحاق ئەفەرموێ : سەبەبی ئیسلامی عەدیی ئەوەیە کە : سواری لەشکری پێغەمەر ـ ﷺ ـ کچێکی حاتەمی طائی‌یان بە ئەسیر گرت . پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەلطیف و ئیکرامی گرت ، منەتی نا بەسەریاو ئازادی کرد . عەزری پێغەمەری ـ ﷺ ـ کرد : باوك بەهیلاك چوو ، هاتوچۆکەرمان غائیب بوو ، منەتم بەسەرا نێ ، خوا ئینعامت بەسەرا کا . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : هاتوچۆکەری تۆ کێیە ؟ وتی : عەدیی کوری حاتەمە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەوەی کە لە خواو رەسوولی فیراری کردوە ؟ ئیبن و ئیسحاق ئەڵێ : کە کچەکەی حاتەم عەوْدەتی کردەوەو ، چوە لای عەدیی ئیشارەتی کرد کە بچێتە خدمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ . ئەویش چوە خدمەتی و موسوڵمان بوو .

ترمذی ئەڵێ : کە عەدیی هاتە حوضووری پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزیان‌کرد : ئەوە عەدی‌یە . لەوەپێشیش پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەیفەرموو : ئومێدم وایە بە خوا ـ عز وجل ـ کە دەستی عەدیی بنێتە ناو دەستمەوە .

عەدیی نەصرانی بوو ، بە بەرەکەتی رجای پێغەمەر ـ ﷺ ـ خوا کردی بەو صەحابە گەورە کە عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بەو نەوعە تەعریفی کرد .

١٠/ ٨٨٧ قال ابو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ : لا أزال أحبُّ بني تميم من ثلاث سمعتهن من رسول الله ـ ﷺ ـ : سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : هم أشدُّ أمتي على الدجال . قال : وجاءت صدقاتُهم فقال النبي ـ ﷺ ـ : هذه صدقات قومنا . قال : وكانت سبية منهم عند عائشة [رضي الله تعالى عنها] فقال النبي [رسول الله] ـ ﷺ ـ : اعتقيها فانها من ولد اسماعيل [عليه السلام] . ح ـ ٤/٣٠٧ م ـ ٩/ ٤٢٠ ، ح ـ ٦/٤١٥ .

وفي اخرى من مسلم مثله . وفيه : هم اشدُّ الناس قتالا في الملاحم . ولم يذكر الدجال . م ـ ٩/ ٤٢٠

تەرجەمە :

ئەبو هورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرموویەتی : لە حوببی بەنیتەمیم قەط لانادەم لە بەر سێ شت کە لە پێغەمەرم ـ ﷺ ـ بیستوە : لێم بیست ئەیفەرموو : بەشیددەتترینی ئوممەتی منن لەسەر دەججال . لە ریوایەتەکەی ترا : بە شیددەتترینی خەلْقن لە حەربا . صەدەقەی بەنیتەمیم هات فەرمووی : ئەمە صەدەقەی قەومی خۆمانە . کچێکی ئەسیر لەوان لە خدمەت حەزرەتی عائیشەدا بوو ، فەرمووی : ئازادی بکە ؛ چونکە لە ئەولادی ئیسماعیلە ـ علیه السلام ـ .

١١/ ٨٨٨ عن الاعرج وعن طاوس ، كلاهما عن ابي هريرة [رضي الله تعالى عنه] قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : نساء قريش خير نساء ركبن الابل . قال احدهما : صالح نساء قريش . وقال الآخر : نساء قريش احناه على يتيم [طفل . اخرى م] في صغره . وارعاه على زوج في ذات يده . م ـ ٩/ ٤٢٢

وفي اخرى مثله . وفي آخره يقول ابو هريرة على اثر ذلك : ولم تركب مريم بنت عمران بعيرا قط . م ـ ٤٢٢/٩

تەرجەمە :

ئەعرەج و طاوس لە ئەبوهورەیرەوە ریوایەت ئەکەن کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ژنانی قورەیش چاکترینی ئەو ژنانەن کە سواری وشتر بوون . یەکێکیان ئەڵێ : ژنی صالیحەی قورەیشە . ئەوی تریان ئەڵێ : ژنی قورەیشە شەفەقەتی لەگەڵ یەتیما ، لە ریوایەتەکەی ترا بەسەر منالا لە وەختی منالی یا زۆرترە ، چاکیان پەروەردە ئەکەن ، کە هەتیو بن بەسەریانەوە رائەوەستن شووناکەنەوە ، ریعایەتی حەقی مێردی خۆیان ئەکەن لە هەموو خوصووصێکیانا : لە (عرض)ا ، لە مالا ، لە نەفەقەدا (مثلا) .

لە ریوایەتەکەی ترا ئەبوهورەیرە ئەڵێ : مەریەمەی کچی عیمران ـ رضي الله تعالى عنها ـ قەط سواری وشتر نەبوە . یەعنی لازم نایێ لەو چاکتر بن .

١٢ / ٨٨٩ عن ابي هريرة [رضي الله تعالى عنه] ان النبي ـ ﷺ ـ خطب ام هانئ بنت أبي طالب [رضي الله تعالى عنها] فقالت : يا رسول الله اني قد كبُرتُ ، ولي عيال . فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : خير نساء . ثم ذكر بمثل حديث يونس [راوى الحديث الاول عن إبن شهاب] غير انه قال : احناه على ولد في صغره . م ـ ٤٢٢/٩

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ خوازبێنی ئوموهانیئ کچی ئەبو طالیبی کرد [رضي الله تعالى عنها] عەرزی کرد : (يا رسول الله) من پیر بووم ، ماڵو

منالّم هه‌یه . [یه‌عنی ئه‌ترسم که له خدمه‌تتا قوصوور بکه‌م] ئه‌و وه‌خته پێغه‌مه‌ر - ﷺ - فه‌رمووی : ژنه قوره‌یشی چاکترینی ئه‌و ژنانه‌ن که سواری وشتر بوون ، به شه‌فه‌قه‌تترینی ژنانن به‌سه‌ر منالّیانا له وه‌ختی منالّی‌یاو ، به ریعایه‌تترینی ژنانن له خوصووصی حوقووقی مێردیانا .

سه‌عیدی بنی موسه‌ییه‌ب ئه‌فه‌رموێ : ئه‌بو هوره‌یره دوایی ئه‌یفه‌رموو : مه‌ریه‌می کچی عیمران - رضي الله تعالى عنها - قه‌ط سواری وشتر نه‌بوه . مه‌قصوودی پێغه‌مه‌ر - ﷺ - وایه که ژنه قوره‌یشی له هه‌موو ژنه عه‌ره‌ب چاکترن . عه‌ره‌بیش له خه‌لّقی تر چاکترن (في الجمله) بۆیه ئه‌بوهوره‌یره - رضي الله تعالى عنه - ئه‌فه‌رموێ : مه‌ریه‌م - رضي الله تعالى عنها - سواری وشتر نه‌بوه . . له‌وه لازم نایێ که ژنه قوره‌یشی له‌و چاکتر بن .

١٣ / ٨٩٠ سلمة [بن الاكوع - رضي الله تعالى عنه -] قال : خرج رسول الله - ﷺ - على قوم من اسلم [بن اقصى[1] من اليمن] يتناضلون بالسوق ، فقال : ارموا بني اسماعيل ، فان اباكم كان راميا ، وانا مع بني فلان . [اى بنى الادرع] لاحد الفريقين فامسكوا [اي الفريق الآخر] بأيديهم ، فقال : ما لهم ؟ قالوا : وكيف نرمي وانت مع بني فلان ؟ فقال : ارموا وانا معكم كلكم . ح - ٥ / ٩٠ / ٣٥٨ ، ح - ٦ / ٩

[وعند ابن اسحاق : بينا محجن بن الادرع يناضل رجلا من اسلم يقال له : نضلة الخير . وفيه : فقال نضلة - والقى قوسه من يده - : والله لا أرمي معه وانت معه !]

**تەرجەمە :**

(سلمة بن الاكوع ـ رضي الله تعالى عنه ـ) ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی بەسەر قەومێکا لە ئەسلەم چوو ، لە بازارا تیریان ئەگرتە نیشانە ، فەرمووی : ئەی بەنی ئیسماعیل بهاون ، باوکی ئێوە ـ کە ئیسماعیلە ـ تیرانداز بوە . من لەگەڵ بەنی فلانم ، دەرحەق یەکێ لەو دوو فیرقەیەی فەرموو کە بەنی [ادرع]ن .

ئیبن و حیبان : ناوی ئەدروع (محجن)ە . [طبرانی]

فیرقەکەی تر لە ئەسلەم کە (نضرة الخیر)ە کەوانەکەی لە دەستی فڕێدا ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بۆچی نەضلە کەوانەکەی فڕێدا ؟ نەضلە وتی : چۆن ئێمە تیر ئەهاوین کە تۆ لەگەڵ بەنی ئەدروعا بی ؟ ! [نضلة الخیر حەیا گرتی کە سەعی بکا تا غالب بێ بەسەر فیرقەیێکا کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ یەکێ بێ لەو فیرقەیە] پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : تیر بهاون من لەگەڵ هەردوو لاتانم .

٨٩١/١٤ عن ابي بكرة [رضي الله تعالى عنه] : ان الاقرع بن حابس [التميمي ، وكان من مؤلفة الفتح] قال للنبي ـ ﷺ ـ : انما تابعك سُرّاق الحجيج من اسلم ، وغفار ، ومزينة . واحسبه : وجهينة [قال شعبة بن الحجاج محمد] بن يعقوب [الراوي هو الذي شك] . قال النبي ـ ﷺ ـ : ارأيت ان كان اسلم ، وغفار ، ومزينة ، واحسبه وجهينة خيرا من بني تميم ، ومن بني عامر واسد ، وغطفان ! خابوا وخسروا ؟ قال : نعم . قال : والذي نفسي بيده ! انهم لخير منهم . ح ـ ١٢/٦

٨٩٢/١٥ وعنه قال : قال النبي ـ ﷺ ـ : ارأيتم ان كان جهينة ، ومزينة ، واسلم ، وغفار خيرا من بني تميم ، وبني اسد ، ومن بني

عبدالله بن غطفـان ، ومن بني عامـر بن صعصعة ؟ فقـال رجل [هـو الاقرع] : خابوا وخسروا ! فقال [ﷺ] : هم خير من بني تميم ومن بني اسـد ، ومن بني عبدالله بن غـطفـان ، ومن بني عـامـر بن صعصعـة ح ـ ١٢/٦ ، م ـ ٤١٨/٩ ت ، وليس في هذا الشك .

**تەرجەمە :**

ئەبوبەکەرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ . . ئەقرەعی کوڕی حابیسی تەمیمی عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ : تۆ هەر ئەوانەی کە دزیی لە حەججاج ئەکەن لە قەومی ئەسلەم‌و ، غیفارو ، موزەینەو . (محەمەدی کوڕی ئەبویەعقووب ئەڵێ : ظەنئم وایە کە وتیشی لە جـوهەینـە) . . شوێنت کەوتوون[1] ! پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : خەبەرم بدەرێ ئەگەر ئەسلەم‌و ، غیفارو ، موزەینە ، وابزانم فەرموویشی جوهەینە ، چاکتر بن لە بەنی تەمیم‌و ، بەنی عامیرو ، ئەسەدو ، غەطەفـان ئایـا ئەمـانە مەحرووم‌و خەسارەتمەند ئەبن ؟ ئەقرەع وتی : بەڵێ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : قەسەم بەوەی کە نەفسی من لە دەستی قودرەتیایە ! ئەوان چاکترن لەمان .

لە ریوایەتی دوەما کە عەبدوڵەلیکی کوڕی عومەیر لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکرەی ریوایەت ئەکا لە جوهەینەدا شك نی‌یە . یەعنی بەوە کە بەعزێ لە بـەعزێ چـاکتر بێ لازم نـایێ کە بـەعزە (مفضـول)ەکە مەحرووم‌و خەسارەتمەند بین ؛ چونکی شك نی‌یە لەوەدا کە بەعزێ لە ئەهلی ئیمان لە بەعزێ چاکترن . حەتتا بەعزێ لە ئەنبیا تەفضیل دراون بەسەر بەعزێکا .

(١) وەرگێڕ ـ خ ـ مانای (تابعك)ی بیرچووبوو ، منیش بە (شوێنت کەوتوون) نووسیم .

١٦ / ٨٩٣ عن ابي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ : قال : قال [النبي] ـ ﷺ ـ : اسلم ، وغفار ، وشيٌ من مزينة ، وجهينة ، او قال شيٌ من جهينة ، او مزينة ، خير عند الله او قال يوم القيامة [الشك من احد الرواة] من اسد وتميم وهوازن وغَطَفان [ذكر هوازن بدل بني عامر ، وبنو عامر منهم ؛ فذكر هوازن اشمل] ح ـ ٦/١٣ ، م ـ ٩/٤١٨ بتقديم بعض على بعض .

تەرجەمە :

ئەبو هورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ . . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەسلەمو ، غیفارو ، بەعزێ لە موزەینەو ، جوهەینە . یا فەرمووی : بەعزێ لە جوهەینە یا موزەینە چاکترن لای خوا . یا فەرمووی : لە رۆژی قیامەتا لە ئەسەدو تەمیمو هەوازینو غەطەفان [لە باتی بەنی عامیر هەوازینی ذیکر فەرموە کە بەنی عامیر قەبیلەیێکە لە هەوازین] .

١٧ / ٨٩٤ عن عروة بن الزبير قال : كان عبدالله بن الزبير [رضي الله تعالى عنهما] احب البشر الى عائشة [رضي الله تعالى عنها] وكانت لا تمسك شيئا مما جاءها من رزق الله تصدقت [أو مجهولا] ، فقال ابن الزبير : ينبغي ان يؤخذ على يديها . فقالت : ايؤخذ على يديّ ؟ عليَّ نذرٌ إنْ كلمتُهُ ، فاستشفع اليها برجال من قريش وبأخوال رسول الله ـ ﷺ ـ [الزهريين] خاصة فامتنعتْ . فقال له الزهريون اخوال النبي ـ ﷺ ـ منهم عبدالرحمن بن الاسود بن عبد يغوث ، والمسور بن مَخْرمة : اذا استأذنّا فاقْتَحِم الحجاب ، ففعلَ ، فارسل اليها بعشر رقاب ، فاعتقتْهُمْ . ثم لم تزل تعتِقُهم حتى بلغت اربعينَ . وقالت : وددت أني جعلت حين حلفت عملا اعمله فافرغ منه . ح ـ ٦/٧

**تەرجەمە :**

عورووەی کوڕی زوبەیر ئەفەرموێ : عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر - رضي الله تعالى عنهما - خۆشەویسترینی هەموو کەس بوو لە خزمەت حەزرەتی عایشەدا - رضي الله تعالى عنها - حەزرەتی عائیشە - رضي الله تعالى عنها - لە رزقی خوا هەرچییێکی بۆ بهاتایە لای خۆی بەندی نەدەکرد ، ئەیبەخشی . ئیبن‌وزوبەیر - رضي الله تعالى عنهما - فەرمووی : لازمە دەستی حەزرەتی عایشە بگیررێ ، حیجری بنرێتە سەر . حەزرەتی عائیشە - رضي الله تعالى عنها - فەرمووی : حیجرم ئەنێتە سەرو دەستم ئەگیررێ لە عەطا ؟ نەذرێکم لەسەر بێ ئەگەر قسەی لەگەڵ بکەم . عەبدوڵلا - رضي الله تعالى عنه - کە ئەم خەبەرەی گەیی‌ێ لە خۆی ترسا ، شەفاعەتی بە واسیطەی گەلێ لە پیاوانی قورەیش بردە لا ، بە خوصووصی خالانی پێغەمەری - ﷺ - لە بەنی زوهرە بردە لا ، ئاشت‌نەبۆوە لەگەڵی . خالانی زوهریی پێغەمەر - ﷺ - کە یەکێ لەوان عەبدورەحمانی بنی ئەسوەدی بنی عەبدی یەغووثی [بنی وەهەبی بنی عەبدی مەناف‌و] میسوەری کوڕی مەخرەمەی [کوڕی ئوهەیبی ، کوڕی عەبدی مەناف بو] بە عەبدوڵلایان فەرموو : ئێمە ئەچین ئیستیذانی لێ ئەکەین ، کە ئیذن دراین بچینە خزمەتی تۆ بچۆرە ئەودیو پەردەکەوە . عەبدوڵلا وای کرد بەو نەوعە شەفاعەتیان قەبووڵ کرا . عەبدوڵلا دە عەبدی ناردە خزمەت ، هەمووی ئازادکردن ، بەم نەوعە تا چل عەبدی ئازاد کردو فەرمووی : کاشکی شتێکم بکردایە کە سوێنم خوارد بیکەم‌و لێی بمەوە . یەعنی نەذرەکەم وا بکردایە : ئەگەر قسەی لەگەڵ بکەم عەبدێ ئازاد بکەم ، یا مانگێ بەرۆژوو بم . بە موطلەقی نەموتایە نەذرم لەسەر بێ .

ئیمامی شافیعی - رضي الله تعالی عنه - ئەفەرموێ : کەسێ وا بە موطڵەقی نەذر بکا نەذرەکەی (منعقد) ئەبێو دروستە ، موخەییەرە لە بەینی ئیشی خێرا ، تەعیینی موحەووەلە بەو . ئەگەر ئیشێکی خێری نەکرد کەفارەتی سوێنی لەسەرە . (بویطی) ئەفەرموێ : نەذرەکەی دروست نی‌یەو هیچی لەسەر نی‌یە .

۱۸/ ۸۹٥ عن ابن عباس - رضي الله تعالى عنهما - قال : اذا سرّك ان تعلم جهل العرب فاقرأ ما فوق الثلاثين ومائة في سورة الانعام : ﴿قد خسر الذين قتلوا اولادهم سفها بغير علم . .﴾ الى قوله : ﴿قد ضلوا وما كانوا مهتدين . .﴾ ح - ٦/ ١٧

تەرجەمە :

ئیبن وعەباس - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : ئەگەر حەزەکەی جەهلی عەرەبتان لێ مەعلووم بێ لە سوورەی ئەنعام لە ژوور ئایەتی صەدو سی‌یەوە بخوێنەرەوە کە ئەفەرموێ : بە تەحقیق ئەوانە کە ئەولادی خۆیان ئەکوژن بە سەفاهەت و بێ ئەمە کە عیلمیان ببێ بزانن کە شتێکی خراپ ئەکەن . . ئەوانە خەسارەتمەندن : . . تا ئەو ئایەتەی کە ئەفەرموێ : بە تەحقیق ئەوانە رێی حەقیان ونکردوەو ظەفەریان پێ نەبردوە .

۱۹/ ۸۹٦ قال ابو هريرة : قال النبي - ﷺ - : رأيت عمرو بن عامر بن لحى الخزاعي يجر قصبه في النار ، وكان اول من سيب السوائب ح - ٦/ ١٧

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : چاوم بە عەمری کوری عامیری کوری لەحیای خەزاعی کەوت ریخۆڵەی بە ناو ئاگرا رائەکێشا ؛ چونکی ئەوەڵ کەسێکە سائیبەی ئیجاد کردوە .

سائیبە : ئەو وشترەیە کە ئەیبەنە لای خەدەمەی بەیت ، لای ئەوان بەرەڵای ئەکەن بە خێری بتەکانیان . ئیتر نە سواری ئەبن نە باری لێ ئەنێن .

**٨٩٧/٢٠ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت : استأذن حسان النبيَّ ـ ﷺ ـ في هجاء المشركين . قال : كيف بنسبي ؟ فقال حسان : لأسلنَّك منهم كما تسل الشعرة من العجين . خ ـ ٦/١٩**

**٨٩٨/٢١ وعن هشام عن ابيه [عروة] قال ذهبت : اسب حسانا عند عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ فقالت : لا تسبه ، فانه كان ينافح عن رسول الله ـ ﷺ ـ . قال ابو الهيثم : نفحت الدابة اذا رمحت بحوافرها . ونفحه بالسيف : اذا تناوله من بعيد . ح ـ ٦/١٩ ، م ـ ٩/٣٩٥ وفيه : يا رسول الله إئذن لي في ابي سفيان . قال : كيف بقرابتي منه . . ؟ الخ .**

**تەرجەمە :**

عايشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : حەسانی بنی ثابت ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئیذني لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ خواست کە هەجوی موشریکین بکا [کە هەجوی ئەبوسوفیان بکا . م] پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەی نەسەبی من چی لێ ئەکەی ؟ [یەعنی هەجوی قورەیش بکەی ؛ چونکی منیش لەو نەسەبەم ، ئەو وەختە هەجوی نەسەبی منیش ئەکەی] حەسان فەرمووی : وەك چۆن موو لە هەویر ییێنرێتە دەرێ بەو

نەوعە تۆیش لەو قورەیشە ، کە هەجوی ئەکەم ، پێنمە دەرێ ، لەو هەجوە هیچ بە تۆوە نانووسێ .

عوروە ئەڵێ : حەسان لە مەسئەلەی (افك)ا دەرحەق عائیشە زۆر بێمەعنایی کردبوو . لەبەر ئەوە لە لای عائیشە جوێنم پێ ئەدا . فەرمووی : جوێنی پێ مەدە ، چونکی مودافەعەی پێغەمەری ئەکرد . - ﷺ -

٨٩٩/٢٢ عن مسروق قال : دخلت على عائشة [رضي الله تعالى عنها] وعندها حسان بن ثابت ينشدها شعرا يشبب بابيات له . وقال : حصان [عفيفة] رزان [صاحبة وقار] ما تُزَنُّ [تُتَّهمُ] بريبة ، وتصبح غرثى [جائعة] من لحوم الغوافل . فقالت له عائشة [رضي الله تعالى عنها] : لكنك لستَ كذلك . قال مسروق : فقلتُ لها : لم تأذني له أن يدخل عليك وقد قال الله تعالى : ﴿والذي تولى كبره منهم له عذاب عظيم﴾[1] ؟فقالت : وأي عذاب اشد من العمى : قالت له : انه كان ينافح ، او يهاجي عن رسول الله ـ ﷺ ـ . ح ـ ٦/٣٣٢

تەرجەمە :

مەسرووق ئەفەرموێ : لە خدمەت حەزرەتی عائیشەدا ـ رضي الله تعالى عنها ـ دانیشتبووم ، حەسانی کوڕی ثابیتی لە خدمەتا بوو ، شیعری بۆ ئەخوێندەوە دەرحەق وەصفی ژنان ، مەعنای شیعرێکی وایە : ئەو ژنانە عەفیفە بوون ، صاحێب ویقارو بە (حیثیت) بوون ، بە هیچ نەوعێ توهمەتی خراپەیان پێ نەدەبررا ، برسی ئەبوون لە گۆشتی ئەو ژنانەی کە غافڵ و بێخەبەرن . [یەعنی ئەو ژنانە غەیبەتی ژنی تریان

(١) سوورەتی نوور . ئایەتی (١١)

نەدەكرد ، چون خۆیان لە توهمەت بەریی بوون ، لەوەیش بەریی بوون كە ئیفتیرا بە ژنی تر بكەن‌و بە گۆشتی ئەوان خۆیان تێر بكەن] .

حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ بە حەسانی فەرموو : ئەمما تۆ وا نەبووی [من كە غافڵ بووم خەبەرم لە هیچ نەبـوو تۆ ئیفتیـرات پێكردم ، لە گۆشتی من خۆت تێركرد] .

مەسرووق ئەفەرموێ : عەرزی حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ م كرد : تۆ بۆچی پێلی‌و ئیذن ئەدەی كە حەسان بێتە خذمەتت ، وەلحاڵ خوا لە قورئانا لە ئایەتی تەبـری‌یەی ذیمـەتی تۆ لـەو ئیفتیرایـە ئـەفەرمـوێ : ئەو كـەسـەی كـە ئـەو ئیفتیـرایـەی زۆر گـەورە كـردو رازانیەوەو ، بە ناو خەڵقا بڵاوی كردەوە عەذابێكی زۆر گەورەی هەیە كە پێی مـوعەذەب ئـەبێ ؟ [یەعنی حـەسان وەكـوو ئیبن‌و ئـوبـەی ئـەو ئیفتیرایەی بە ناو خەڵقا رازانەوە شایعـەی پێ بەست ، ئیـتر بۆچ رێ ئەدەی ئەو موفتەری‌یە گەورەیە بێتە خدمەتت ؟] حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : چە عەذابێك لە كوێرییێتی بەشیددەتترە ؟ وا خوا لە دنیادا كوێری كرد . [چونكی ئەوی نەیدیبێ وەك بە چاو دیبێتی قسەی لێ‌كردو خوایش جەزای دایەوە .]

لە دواییا حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنهـا ـ فەرمـووی : حەسان مودافەعەی پێغەمەر ـ ﷺ ـ یا فەرمووی : موقابەلەی كـوففار ئەكا بە هەجوكردنیان لە باتی پێغەمەر ـ ﷺ ـ [موقابیلی ئەو خراپەیەی ئەم چاكەیەی هەیە . (ان الحسنات یذهبن السیئات) حەسەنە خراپە مەحو ئەكاتەوە گوناهی نایێلێ] .

٩٠٠/٢٣ عمران بن حصين ـ رضي الله تعالى عنهما ـ يقول : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : خير امتي قرني [زماني الذي كنت فيه] ثم الذين يلونهم ، ثم الذي يلونهم . قال عمران [رضي الله تعالى عنه] : فلا ادري اَذَكَر بعد قرنه قرنين او ثلاثا ؟ ثم ان بعدكم قوما يشهدون ولا يستشهدون ، ويخونون ولا يؤتمنون ، وينذرون ولا يفون ، ويظهر فيهم السِّمَن . ح ـ ٧٧/٦ ، م ـ ٤٢٧/٩

وعن ابن مسعود ـ رضي الله تعالى عنه ـ ايضا ، وفيه : ثم يجيُ قوم تسبق شهادة احدهم يمينه ويمينه شهادته . قال ابراهيم النخعي : وكانوا يضربونا على الشهادة والعهد ونحن صغار . ح ـ ٧٨/٦ ، م ـ ٤٢٦/٩ بدون الضرب .

وعن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها : قالت : سأل رجل النبيَّ ـ ﷺ ـ : اى الناس خير ؟ قال : القرن الذي انا فيه . ثم الثاني ، ثم الثالث . بدون شك م ـ ٤٢٩/٩

تەرجەمە :

عیمرانی کوڕی حصەین ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەیفەرموو : کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : چاکترینی ئوممەتی من ئەوانەن لە زەمانی حەیاتی منان ، لە پاش ئەوان ئەوانەن کە لە دوای ئەوان ێن ، لە دوای ئەوان ئەوانەی لە دوای ئەوانن . عیمران ئەفەرموێ : نازانم کە لە دوای قەرنی خۆی دوو قەرنی فەرمووە یا سیان ؟ [لە حەدیثی عائیشەدا ـ رضي الله تعالى عنها ـ و ئیبن و مەسعوود ـ رضي الله تعالى عنهما ـ هیچ شکی تیا نی‌یە دوو قەرنی فەرمووە] . لە دوای ئەو قەرنانە قەومێك ێن بێ ئەمە بیانکەن بە شاهید لە خۆیانەوە ئەبن بە شاهید ، بێ ئەمە طەڵەبی شەهادەتیان لێ بکەن لە خۆیانەوە ئەچن شەهادەت ئەدەن .

[له حەدیثەکەی ئیبن و مەسعوودا ئەفەرموێ : شەهـادەتیان لـە سوێنیان پێش ئەکەوێ ، سوێنیان لە شەهادەتیان پێش ئەکەوێ ، یەعنی حەریصن لەسەر سوێندو شەهادەت ، لە خۆیانەوە شەهادەت ئەدەن لە دواییا سوێندیشی لەسەر ئەخۆن ، بەعزێ وەقتیش لە پێشـەوە سوێنـد ئەخۆن لە دواییشا شەهادەت ئەدەن . ئیبراهیمی نەخەعي کە لە ریوایەتی ئیبن و مەسعوودایە ئەفەرموێ : ئێمە منالْ بووین ، لەسەر عەهدکردن و شەهادەتدانا لێیان ئەداین] خیانەت ئەکەن ئەمنی یەتیان پێ ناکرێ ، نەذر ئـەکەن بـەجێی نایێنن ، هـەر لـەگـەلْ ئـەوە خـەریکن کـە خـۆیـان قەڵەویکەن ، قەڵەوییان پێوەدیارە .

ئێستە لە لاکۆلانا قینطار دانراوە خەڵق ئەچن خۆیان ئەکێشن بزانن چەند کیلۆن ، ئەگەر دەفعەی پاشوو لە دەفعەی پێشوو کـەمتر بێ وەك باوك و برای مردبێ ئەوەندەی پێ ناخۆش ئەبێ . ئیفتیخار بە قـەڵەویی ئەکەن کەچی لای خوا ـ عز وجل ـ لە باڵە مێشوولە سووکترن !

# مناقب المهاجرين وفضلهم

منهم ابو بكر بن ابي قحافة التميمي [واسمه عثمان ، وامه ام الخير سلمه - رضي الله تعالى عنهم -]

قال الله - تعالى - : ﴿للفقراء المهاجرين الذين اخرجوا من ديارهم واموالهم يبتغون فضلا من الله ورضوانا ، وينصرون الله ورسوله اولئك هم الصادقون﴾[1] حشر ص : ٥٤٤

وقال : ﴿الا تنصروه فقد نصره الله ، اذ اخرجه الذين كفروا ، ثاني اثنين اذ هما في الغار ، اذ يقول لصاحبه : لا تحزن ، ان الله معنا﴾[2] توبة . ص : ١٩٢ . ح - ٦/٧٨/٩

تەرجەمە :

صەدەقەو ، ئیحسانو ، فەیئ - ئەوەی بە بێ حەرب دەستی ئیسلام بکەوێ لە کوففارەوە - بۆ موهاجیری فەقیرن کە بە ناحەق لە دیاریانو لە ماڵیان کراونەدەرێ ، طەلەبی فەضلو رەحمەتو ، ریضوان لە خوا ئەکەن موعاوەنەتی دینی خواو رەسوولی خوا ئەدەن ، ئەو موهاجیرە فەقیرانە هەر لەسەر صیدقو وەفان لە راستی لەگەڵ خواو پێغەمەرا لا نادەن .

---

(١) سوورەتی حەشر . ئایەتی : ٨

(٢) سوورەتی تەوبە . ئایەتی : ٥

خوا ـ عز وجل ـ له سووره‌تی به‌رائه‌تا ئه‌فه‌رموێ : ئه‌گه‌ر ئێوه موعاوه‌نه‌تی پێغه‌مه‌ر نه‌كه‌ن خوا موعاوه‌نه‌تی ئه‌كا ، وه‌ك چۆن كه كافران له مه‌ككه‌یان كرده‌ده‌رێ دوه‌مینی دوو كه‌س بوو كه له غاره‌كه‌دا بوون ، به صاحیبه‌كه‌ی ـ كه حه‌زره‌تی ئه‌بوبه‌كره ـ رضي الله تعالى عنه ـ فه‌رموو : مه‌حزوون مه‌به خوا له‌گه‌ڵ ئێمه‌یه چۆن ئه‌و وه‌خته كه دوو كه‌س بوون خوا موعاوه‌نه‌تی كردو له شه‌ڕی موشریكینی حیفظ كرد . . ئێسته‌یش كه له غاره‌كه هاتۆته‌ده‌رێ خوا موعاوه‌نه‌تی ئه‌كاو ضایعی ناكا .

قالت عائشة [ذكره في الهجرة] وابو سعيد [وصله ابن حبان في صحيحه] وابن عباس [أخرجه أحمد والحاكم ـ رضي الله تعالى عنهم ـ] : وكان ابو بكر مع النبيّ ـ ﷺ ـ [ورضي عنه] في الغار ح ـ ٦/٧٩ . معلق .

ته‌رجه‌مه :

عائیشه ، ئه‌بوسه‌عیدی خدریی ، ئیبن و عه‌باس [رضي الله تعالى عنهم] . . فه‌رموویانه : كه پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ هیجره‌تی فه‌رموو و ته‌شریفی له غاره‌كه‌دا ئیختیفای كرد . . حه‌زره‌تی ئه‌بوبه‌كری له خدمه‌تا بوو له ناو غاره‌كه‌دا . (رضي الله تعالى عنه من صديق)

٩٠١/٢٤ عن ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : كنا نخير بين الناس في زمن النبيّ ـ ﷺ ـ فنخير ابا بكر ، ثم عمر بن الخطاب ، ثم عثمان بن عفان ـ رضي الله تعالى عنه ـ . ح ـ ٦/٨٢

ته‌رجه‌مه :

له ئیبن و عومه‌ر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ وه ریوایه‌ته كه فه‌رمووی : له زه‌مانی پێغه‌مه‌را ـ ﷺ ـ له به‌ینی خۆمانا به‌یانی ئه‌وه‌مان

ئەكرد كە لە بەینی ئەصحابا لە هەموویان چاكتر كێیە ؟ لە پێشا ئیمامی ئەبوبەكر ، دوای ئەو ئیمامی عومەر ، دوای ئەو ئیمامی عـوثمانی بنی عەفانمان تەرجیح ئەدا بەسەر باقیەكانا .

**٩٠٢/٢٥ عن ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : كنـا في زمن النبي ـ ﷺ ـ لا نعدل بابي بكر احدا ، ثم عمر ، ثم عثمان ثم نتـرك اصحاب النبيّ ـ ﷺ ـ لا نفاضل بينهم . ح ـ ٦/١٠٥**

**تەرجەمە :**

ئبین و عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئـەفەرمـوێ : لە زەمـانی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ كەسمان ئاوتای ئەبوبـەكر نـەدەگرت ، لـە دوای ئەو عومەر ، لە دوای ئەو عوثمان ، لە دوای ئەوە ئەصحابی پێغەمەرمان وەها ئەهێشتەوە ، تەرجیحمان نەدەدان بەسەر یەكتریدا .

**٩٠٣/٢٦ عبدالله بن ابي مليكة ، قال : كتب اهل الكـوفة الى ابن الزبير في الجد . فقال : اما الذي قال رسول الله ـ ﷺ ـ : لو كنت متخذا من هذه الامة خليلا لاتخذته انزله ابا ، يعني ابا بكر . ح ـ ٦/٨٣**

**تەرجەمە :**

عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو مولەیكە ئەفەرموێ : كووفەیی نووسی یان بۆ خدمەت عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ دەرحەق جەد كە : لە ئیرثا چی وەرەگرێ ؟ فەرمووی : ئەمما ئەو كەسـەی كە پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەرحەقی فەرموویەتی : ئەگەر لەم ئوممەتە خـەلیلێكم بگرتایە ئەوم ئەگرت بە خەلیل .

فـەرموویـەتی : باپیـری باوكیی وەك بـاوك وایە . ئـەو كـەسـە

ئەبوبەکرە . چە روتبەیێ هەیە لە روتبەی خەلیلییّتی گەورەتر بێ ؟

٩٠٤/٢٧ عن جبير بن مطعم ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : أتت امرأة النبيَّ ـ ﷺ ـ [فكلمته في شيْ . اخرى] فأمرها أن ترجع اليه . قالت : أرأيت ان جئت ولم أجدك ؟ كأنها تقول الموت . قال ـ ﷺ ـ : ان لم تجديني فأتي ابا بكر . ح ـ ٨٤/٦ ، م ـ ٢٧٤/٩ ، ح ـ ٢٦١/١٠ [وباسناد ضعيف عن الطبراني : قلنا : يا رسول الله الى من ندفع صدقات اموالنا بعدك ؟ قال : الى ابي بكر الصديق . قسطلاني]

تەرجەمە :

جوبەیری بنی موطعیم ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : ژنێ هاتە خدمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ بۆ شتێك قسەی لە خدمەتیا کرد ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمری پێ فەرموو : کە لە دواییدا دووبارە بچێتەوە خدمەتی . ژنەکە فەرمووی : ئەگەر هاتمەوەو تۆم دەست نەکەوتی . (کانە) ئەڵێ : تۆ وەفاتت کردبو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەگەر منت دەست نەکەوت وەرەوە لای ئەبوبەکر .

لە حەدیثەکەی قەسطەلانی ئەفەرموێ : وتمان : (یا رسول الله) لە دوای تۆ صەدەقەی ماڵمان بدەین بە کێ ؟ فەرمووی : بیدەن بە ئەبوبەکری صەدیق .

ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ خەلیفەی ئەووەڵە .

٩٠٥/٢٨ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت : قال لي رسول الله ـ ﷺ ـ : ادعي لي ابا بكر اباك ، واخاك حتى اكتب كتابا ، فاني اخاف ان

يتمنى متمنٍ ويقول قائل انا اولى ، ويأبى الله والمؤمنون الا أبا بكر .
م - ٩/ ٢٧٤

تەرجەمە :

عائیشە - رضي الله تعالى عنها - فەرمووی : پێغەمەر - ﷺ - ئەمری پێ فەرمووم : ئەبوبەکری باوکتو ، براکەتم بۆ بانگ بکە تا شتێك بنووسم ؛ چونکی ئەترسم کە بەعزێ (متمني) تەمەننای ئەوە بکاتو بەعزێ کەس بڵێن : من ئەحەققم - یەعنی بە خەلافەت - ئەمما خواو موئمینان لە غەیری ئەبوبەکر ئیبا لە خەڵقی تر ئەکەن .

ئەم حەدیثە نەصە بەسەر خەلافەتی ئەبوبەکرا - رضي الله تعالى عنه - ئەگەر هەموو دنیا لەسەر غەیری ئەو ئیتیفاقی بکردایە هەر ئەوەبوو ؛ چونکی خوا ئیبای لە غەیری ئەو کردوە .

**٢٩/ ٩٠٦ عن ابي سعيد - رضي الله تعالى عنه - قال : كان بين خالد بن الوليد وبين عبدالرحمن بن عوف [رضي الله تعالى عنهما] شيٌ ، فسبَّه خالد ، فقال رسول الله - ﷺ - : لا تسبُّوا احدا من اصحابي [فو الذي نفسي بيده . م اخرى عن ابي هريرة] فان احدكم لو انفق مثل احد ذهبا ما ادرك مُدَّ احدِهم ولا نصيفه . م - ٩/ ٤٣٢ .**

**وعن ابي هريرة - رضي الله تعالى عنه - بدون التصريح بسبب النهي عن السبِّ . ح - ٦/ ٩٠ . د ، ت ، ن ، جه .**

تەرجەمە :

ئەبوسەعیدی خدریی - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : لە بەینی خالیدی بنی وەلیدو عەبدورەحمانی بنی عەوفا - رضي الله تعالى عنهما - دەمەقاڵێی پێ بوو ، حەزرەتی خالید جوێنی بە عەبدورەحمان دا - رضي الله

تعـالى عنهما - پێغـەمەر - ﷺ - فـەرمووى : جـوێن بە ئـەصحـابى من مەدەن . قەسەم بەو ذاتەى كە نەفسى من لە دەستى قودرەتيايە ! ئەگەر يەكێ لە ئێوە بە قەد شاخى ئوحود ئاڵتوون لە رێى خوادا صەرف بكا ناگا تا موددێكى ئەوانو ، ناگاتە نيوە موددێكيشيان .

(فيه سؤال وجواب ! واستخراجهما الى عبدالسلام - سلمه الله ، واقرّ به عين أخي حفظه الله) .

**٩٠٧/٣٠ عن ابي بردة عن ابيه [ابي موسى الاشعري - رضي الله تعالى عنه -] قال : صلينا المغرب مع رسول الله - ﷺ - ثم قلنا : لو جلسنا حتى نصلي معه العشاء ! قال : فجلسنا فخرج علينا ، فقال : ما زلتم ههنا ؟ قلنا : يا رسول الله صلينا معك المغرب ، ثم قلنا نجلس حتى نصلي معك العشاء قال : احسنتم ، او اصبتم . قال : فرفع راسه الى السماء ، وكان كثيرا ما يرفع رأسه إلى السماء ، فقال : النجومُ أَمَنة للسماء ؛ فاذا ذهبت النجوم اتى السماء ما توعدون . وانا أَمَنة لأصحابي فاذا ذهبت اتى اصحابي ما يوعدون [من الفتن] واصحابي اَمَنة لأمتي ، فاذا ذهب اصحابي اتى أمتي ما يوعدون [من ظهور البدع والحوادث في الدين وسائر اشراط الساعة] م - ٩/٤٢٤**

**تەرجەمە :**

ئەبو مـوساى ئـەشعەرى - رضي الله تعـالى عنه - فـەرمووى : نوێژى شێوانمان لە خزمەت پێغەمەرا كرد - ﷺ - لـە دواييدا وتمـان : دابنيشتينايە تا نوێژى خەوتنانمان لە خزمەتا ئەكرد ! دانيشتين ، پێغەمەر - ﷺ - تەشريفى هاتەدەرێ بۆ نوێژى خەوتنان ، فەرمووى : ئەوە هەر لێرەن ؟ عەرزمان كرد : نوێژى شێوانمان كردو وتمان با بمێنينەوە تا نوێژى

خەوتنانیشی لە خزمەتا ئەکەین . فەرمووی : چاکتان کرد ، یا ئیصابەتتان کرد . فەرمووی : سەری هەڵبری بۆ ئاسمان ، زۆر جار سەری بەرزەکردەوە بۆ ئاسمان [یەعنی بۆ ظوهووری بەرەکەت] لە پاشا فەرمووی : ئەستێرە ئەمینی یە بۆ ئاسمان ؛ کە ئەستێرەی ئاسمان نەما ئەو وەختە ئەو موصیبەتانەی کە وەعدەتان پێدراوە ، کە لە ئاسمانەوە بێ ، ئاسمان ئەیان هێنێ . من ئەمینیم بۆ ئە صحاب کە من رۆییم ئەو فیتنانەی کە وەعدەیان پێدرابێ بۆیان بێ . ئەصحاب ئەمینین بۆ ئوممەتی من کە ئەوان نەمان ئەوی وەعدەیان پێدرابێ بۆیان بێ . (صدق رسول الله - ﷺ -)

٩٠٨/٣١ عن عمار [بن ياسر ـ رضي الله تعالى عنه ـ] يقول : رأيت رسول الله ـ ﷺ ـ وما معه الا خمسة اعبد : [بلال ، زيد بن حارثة ، عامر بن فهيرة ، وابو فكيهة ـ مولى صفوان بن أمية بن خلف ـ وعبيد بن زيد الحبشي . وذكر بعضهم عمار بن ياسر بدل ابي فكيهة] وامرأتان : [خديجة ـ ام المؤمنين ـ وام ايمن ، او سمية] وابو بكر الصديق ـ رضي الله تعالى عنهم ـ ح ـ ٦/٨٤

تەرجەمە :

عەمماری بنی یاسیر ئەفەرموێ : پێغەمەرم دی ـ ﷺ ـ غەیری پێنج عەبدو دوو ژنو ئەبوبەکری صەدیقی لە خدمەتا نەبوو ، کە ناویان نووسراوە .

٩٠٩/٣٢ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت : كان لابي بكر [رضي الله تعالى عنه] غلام يخرج له الخراج ، وكان ابو بكر يأكل من

خراجه ، فجاء يوما بشئ ، فأكل منه ابو بكر - رضي الله تعالى عنه - فقال له الغلام : تدري ما هذا ؟ فقال ابو بكر - رضي الله تعالى عنه - : وما هو ؟ قال : كنت تكهنت لانسان في الجاهلية وما أُحْسِنُ الكِهانةَ الا اني خدعته ، فلقيني فأعطاني بذلك ، فهذا الذي اكلتَ منه . فادخل ابو بكر يده فقاء كل شيء في بطنه ! ح - ١٧٢/٦

تەرجەمە :

عائیشە - رضي الله تعالى عنها - ئەفەرموێ : ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - غولامێکی بوو لەو میقدارەی کە کەسبی ئەکرد میقدارێکی لەسەر مەعلووم کرابوو کە بیدا بە حەزرەتی ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - . حەزرەتی صەدیق - رضي الله تعالى عنه - لەو خەرجەی ئەخوارد . ڕۆژێ غولامەکەی شتێ لەو کەسبەی هێنایە خدمەتی لێی خوارد ، غولامەکە عەرزیکرد : ئەزانی ئەوی بۆم هێنای چی بوو ؟ فەرمووی : چی بوو ؟ عەرزی کرد : لە زەمانی جاهیلییەتا کاهینیم بۆ پیاوێ کرد ، کوڵێ نانێتیشم نەئەزانی ، ئەمما خەڵەتانم ، تووشم بوو ، موقابیل بەو کوڵەنانێتییە ئەوەی دامێ ، ئەوەیە کە تۆ لێت خوارد . حەزرەتی ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - دەستی کرد بە گەروویا ، هەرچی لە زگیا بوو بە ئیستیفراق هێنایەوە !

پێغەمەر - ﷺ - نەهی کردوە لە (حلوانی)[1] کوڵەنانی ، بە تەفرەدانیش بوە ، دوو نەوع حەرامی تیا بوە .

---

(١) ئەم وشەم بە باشی بۆ نەخوێنرایەوە ، وەك خۆی روونووسم کرد .

٩١٠/٣٣ عن ابي الدرداء [عويمر بن زيد بن قيس الانصاري] ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : كنت جالسا عند النبي ـ ﷺ ـ اذ أقبل ابو بكر آخذا بطرف ثوبه حتى ابدى من ركبته . فقال النبي ـ ﷺ ـ : اما صاحبكم فقد غاص [اى خاصم] . فسلم وقال : يا رسول الله انه كان بيني وبين ابن الخطاب شيئٌ فاسرعت اليه ثم ندِمتُ ، فسألتُه ان يغفر لي ، فابى عليَّ ؛ فاقبلتُ اليك . فقال : يغفر الله لك يا ابا بكر (ثلاثا) .

ثم ان عمر ندِم فاتى منزل ابي بكر [رضي الله تعالى عنهما] فسأل : أَثمَّ ابو بكر ؟ فقالوا : لا . فأتى الى النبيِّ ـ ﷺ ـ فسلم عليه ، فجعل وجه النبي ـ ﷺ ـ يتمعّرُ [تذهب نَضارته من الغضب] حتى اشفق ابو بكر [رضي الله تعالى عنه] فجثا على ركبتيه ، فقال : يا رسول الله والله انا كنت اظلم (مرتين) فقال النبي ـ ﷺ ـ : ان الله بعثني اليكم فقلتم : كذبتَ ، وقال ابو بكر : صدق ؛ وواساني بنفسه وماله . فهل انتم تاركو لى صاحبي ؟ (مرتين) فما اوذي بعدها . ح ـ ٦/ ٨٤

تەرجەمە :

ئەبودەرداء ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : لە خدمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ دانیشتبووم ، لەو وەختەدا حەزرەتی ئەبوبەكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ هات داوێنی لیباسەكەی گرتبوو تا ئەژنۆی دەركەوتبوو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەمما رەفیقەكەتان لەگەڵ یەكێكا دەمەقاڵێ بوە . تەشریفی هاتو سەلامی كرد . فەرمووی : (یا رسول الله) لە بەینی منو (ابن الخطاب) شتێك بوو ، من عەجەلەم كرد ، [یەعنی قسەیێكی ناخۆشم پێ وت] لە دواییدا پەشیمان بوومەوە ، طەڵەبی لێخۆشبوونیم لێكرد لێم خۆش نەبوو . وا هاتوومە خدمەت تۆ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : یا ئەبوبەكر خوا لێت خۆش بێ . (سێ جار وای فەرموو) .

له دواییا عومەر - رضي الله تعالى عنه - پەشیمان بۆوه ، تەشریفی چوه ماڵی ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - ، پرسیی : ئەبوبەکر لەوێیه ؟ وتیان : خەیر . ئەویش تەشریفی چوه خدمەت پێغەمەر - ﷺ - سەلامی لێ کرد . پێغەمەر - ﷺ - له غەضەبا رەنگی گۆڕراو تێکچوو . حەزرەتی ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - ترسا که پێغەمەر - ﷺ - شتێکی خراپ به ئیمامی عومەر بڵێ ، دوعایێکی خراپی لێ بکا . . حەزرەتی صەدیق - رضي الله تعالى عنه - بەچۆکاهات ، فەرمووی : (یا رسول الله) وەڵلاهی من لەو زاڵمتر بووم [یەعنی من له پێشا قسەم پێ وت ، به ناحەق ئازاری دڵم دا] (دووجار وای فەرموو) . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : خوا - عز وجل - منی به پێغەمەرییێتی بۆ ناردن ، ئێوه وتتان : درۆ ئەکەی ، ئەبوبەکر وتی : راست ئەکا . به ماڵی و به نەفسی خۆی چاکەی لەگەڵ کردووم . (دوو جار فەرمووی) ئێتر واز له برادەرەکەم یێنن ؟ له دوای ئەم واقیعەیه ئیتر دڵی حەزرەتی ئەبوبەکر له طەرەف هیچ کەسێکەوه نەیێشێنرا .

ئیعتیرافی قوصوور ، شەفاعەت لای گەوره ، عەفوی قوصووری غەیر . . . له مەکاریمی ئەخلاقه .

ئەمر به موراعاتی حەقی ئەهلی حەق و ، ئەمر به ئیحتیرامی ئەهلی فەضل و بەیانی فەضلی . سوننەته .

٩١١/٣٤ عن ابي بكر - رضي الله تعالى عنه - قال : كنت مع النبي - ﷺ - في الغار ، فرفعت رأسي ، فاذا انا بأقدام القوم ، فقلت : يا نبي الله لو ان بعضهم طأطأ بصره رآنا ! قال : اسكت يا ابا بكر ، اثنان الله ثالثهما . [ما ظنك يا ابا بكر باثنين ؟ اخرى . . م ، وخ] .

م - ٢٦٨/٩ ، ح - ٨٠/٢١٩/٦

تەرجەمە :

ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : لە غارا لە خدمەت پێغەمەرا بووم - ﷺ - سەرم هەڵبڕی ، چاوم کەوت بە پێی موشریکەکان کە هاتبوون بە شوێنمانا ، عەرزم کرد : (یا رسول الله) ئەگەر بەعزێ لەمانە چاویان دانەوێنن تەماشای بەرپێی خۆیان بکەن ئەمان بینن . فەرمووی : وز بە (یا ابو بکر) ئەڵێی چی ؟ گومانەت چۆنە بە دووکەس سێیەمینی ئەوان خوا بێ ؟ [ئایا هیچ زەرەریان پێتە پێش ؟]

ئەم حەدیثە موعجیزەیەکی گەورەی تیایە کە چاوی موشریکەکانی لێ کوێر بوە .

فەضلێکی چەندە گەورەیە بۆ ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - کە لە حوضووری خواو رەسوولیا بوە . بەیانی شەجاعەت و ئیعتیمادی پێغەمەری تیایە بە خوا - عز وجل ، و - ﷺ - .

**٩١٢/٣٥ عن ابن ابي مليكة : سمعت عائشة [رضي الله تعالى عنها] وسئلت : من كان رسول الله - ﷺ - مستخلفا لواستخلفه ؟ قالت : ابو بكر . فقيل لها : ثم مَنْ بعد ابي بكر ؟ قالت : عمر . ثم قيل لها : مَنْ بعد عمر ؟ قالت : ابو عبيدة بن الجراح . ثم انتهت الى هذا .**

**م - ٢٧٣/٩**

**تەرجەمە :**

لە حەزرەتی عائیشە - رضي الله تعالى عنها - پرسرا : پێغەمەر - ﷺ - ئەگەر لە پاش خۆی یەکێکی بکردایە بە خەلیفە کێی ئەکرد ؟ فەرمووی : ئەبوبەکری ئەکرد . عەرزیان کرد : دوای ئەو کێی ئەکرد ؟

فەرمووی : عومەری ئەکرد . لە دوای ئەو[1] کێی ئەکرد ؟ فەرمووی : ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاحی ئەکرد . حەزرەتی عایشە تا ئێرە هات و لێرە راوەستا . ـ رضي الله تعالى عنهم كلهم ـ .

**٩١٣/٣٦ عمرو بن العاص ـ رضي الله تعالى عنه ـ ان النبي ـ ﷺ ـ بعثه على جيش ذات السلاسل [ماء لبني جذام بناحية الشام في جمادي الأخرى سنة ثمان نووي [سبع . قسطلاني] ولمّا امّره ـ عليه الصلاة والسلام ـ على الجيش ـ وفيهم ابو بكر وعمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ظن انه مقدَّمٌ منزلة على من في الجيش ، قال قسط][2] فاتيته فقلت : اى الناس احبُّ اليك ؟ قال : عائشة . فقلت : مِنَ الرجال ؟ فقال : ابوها . فقلت : ثم من ؟ قال : ثم عمر بن الخطاب . فعد رجالا فسكتت مخافة ان يجعلني في آخرهم .**

**ح ـ ٤١١/٨٥/٦ ، م ـ ٢٧٢/٩**

**ح ـ ٤١١/٦ ت ، ن .**

**تەرجەمە :**

عەمری بنی عاص ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ کردمی بە ئەمیری لەشکری (ذات السلاسل) کە جێیەکە[3] لە طەرەفی شامەوە . لە (جمادی الاخری)ی ساڵی حەوتەم یا هەشتەما ، لەو

(١) لێرەدا وەرگێڕـ خ ـ ماناى (ثم قيل لها : من بعد عمر) ی نەنووسیوە ، رەنگە هەر بە ئارەزوو بەو شێوەی سەرەوە کورتی کردبێتەوە .

(٢) وشەی (قال) پێش (قسط ـ قسطلاني) نووسرابوو ، بە گوێرەی قەسطەلانی چاکم کرد .

(٣) دەبوو بیگوتایە : «ئاوی بەنی جوذامە لە . . .» وەك لە حەدیثەکەدایە .

لەشکرەدا حەزرەتی ئەبوبەکرو عومەر مەوجوود بوون ، بە دڵما هات کە مەرتەبەی من لەوان گەورەترە ، چوومە خدمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ لێم پرسی : (یا رسول الله) کێت لە هەموو کەس زیاتر خۆشەوێ ؟ فەرمووی : عایشە . عەرزم کرد : لە پیاوان ؟ فەرمووی : باوکی عایشە . عەرزم کرد : دوای ئەو ؟ فەرمووی : عومەری کوڕی خەطاب . چەند پیاوێکی ژمارد . عەمر ئەفەرموێ : ئیتر بێدەنگ بووم مەبادا بمخاتە دوای هەموویانەوە .

٩١٤/٣٧ ابو هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : بينما راع في غنمه عدا عليه الذئب ، فأخذ منها شاة ، فطلبه الراعي [حتى كأنه استنقذها منه ، فقال له الذئب : هذا ! استنقذتها مني خ ـ ٤٣٢/٥] فالتفت اليه الذئب ، فقال : مَنْ لها يوم السبُع ؛ يوم ليس لها راعٍ غيري ؟ [فقال الناس : سبحان الله . فقال النبي ـ ﷺ ـ : فاني اومن به ، وابو بكر وعمر . وما ثمَّ ابو بكر وعمر . ح ـ ١٠٠/٦ ، م ـ ٢٧٦/٩ بتقديم البقرة على الذئب . وفي كليهما : فقال الناس : سبحان الله . وقول النبي ـ ﷺ ـ فاني اومن . وفي حديث الذئب ، فطلبه الراعي حتى استنقذها منه] .

وبينا رجل يسوق بقرة قد حمل عليها اذ ركبها فضربها . فالتفتت اليه فكلمته ، فقالت : اني لم اخلق لهذا ، ولكن خلقت للحرث . قال الناس : سبحان الله ! بقرة تتكلم ! فقال النبي ـ ﷺ ـ : فاني اومن بذلك ، وابو بكر ، وعمر ابن الخطاب ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ح ـ ٨٦/٦

تەرجەمە :

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە پێغەمەرم

ـ ﷺ ـ بیست ئـەیفەرمـوو : وەختێ شوانێ مـەڕی ئەلـەوەڕان گورگێ مەڕێکی فڕان ، شوانەکە شوێنی کـەوت‌و لێی سەنـدەوە . گورگـەکە رووی تێکرد وتی : رۆژی درندە کـە مەڕ غـەیری من شـوانی نابێ کێ موحافەظەی ئەکا لـە من ؟ خەڵقـەکە وتیـان : (سبحان الله) [یـەعنی تەعەجوبیان لەوە کرد کە گورگ قسە بکا] پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : من باوەڕی پێ ئەکەم ، ئەبوبەکرو عومەریش باوەڕی پێ ئەکەن . پیاوێ لە وەختێکا گاجووتێکی لێ ئەخوڕی ، باری لێ نابوو ، سواری بوو لێی دا ! گاجووتەکە رووی تێکرد ، وتی : من بۆ ئەمە خەلق نەکراوم . بۆیە خـەلق کراوم کـە جووتم پێ بکـرێ . خەڵق وتیـان : (سبحـان الله) گاجووت‌و قسـە بکا ! ؟ پێغـەمەر ـ ﷺ ـ فـەرمووی : من بـڕوای پێ ئەکەم ، ئەبوبەکرو عومەریش بڕوای پێ‌ئەکەن . نە ئەبوبـەکر لـەوێ بوو ، نە عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ .

٩١٥/٣٨ عبدالله بن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : من جر ثوبه خيلاء لم ينظر الله اليه يوم القيامة . فقال ابو بكر : ان احد شقي ثوبي يسترخي الا ان اتعاهد ذلك منه . فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : انك لست تصنع ذلك خيلاء . قال موسى [بن عقبة] فقلت لسالم : اَذَكَرَ عبدالله (مَنْ جَرَّ ازاره) ؟ قال : لم اسمعه ذكر الا (ثوبه) .

ح ـ ٨٧/٦

**تەرجەمە :**

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی : کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : هەرکەسێ بە کیبرو ئیفتیخار جلی خۆی بە

ئەرزا راكێشێ رۆژی قیامەت خوای تەعالا بە نەظەری مەرحەمەت تەماشای ئەو کەسە ناکا . حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : (یا رسول الله) من طەرەفێکی لیباسەکەم شۆڕەبێتەوە ، مەگەر ظەریف دیققەتی لێ بکەم و لێی غافڵ نەبم . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : تۆ ئەوە بە کیبرەوە ناکەی . مووسای کوری عەقەبە ئەڵێ : بە سالم وت : کە لە عەبدوڵلای باوکت بیست کە بڵێ : (ازار) لە باتی (ثوب) ؟ فەرمووی : هەر (ثوب)م لێ بیست . یەعنی لەفظەکەی عامە لە هەموو نەوعە لیباسێ . خاص نی‌یە بە ئیزارەوە .

**٩١٦/٣٩ عن محمد بن الحنفية قال : قلت لأبي : ايّ الناس خير بعد رسول الله ـ ﷺ ـ ؟ قال : ابو بكر . قلت : ثم من ؟ قال : ثم عمر . وخشيت ان يقول عثمان . قلت : ثم انت ؟ قال : ما انا الا رجل من المسلمين . ح ـ ٨٩/٦**

**تەرجەمە :**

حەمە حەنیفەی کوری ئیمامی عەلی ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی : عەرزی باوکم کرد : چاکترینی خەڵق لە دوای پێغەمەر ـ ﷺ ـ کێیە ؟ فەرمووی : ئەبوبەکرە . عەرزم کرد : دوای ئەو کێیە ؟ فەرمووی : عومەر . ترسام لێی پرسم دوای ئەو کێیە ، مەبادا بڵێ عوثمانە [چونکی لام وابوو باوکم لە عوثمان گەورەترە] عەرزم کرد : لە دوای ئەو تۆ چاکتری ؟ فەرمووی : من هەر پیاوێکم لە موسوڵمانان .

ئەصحابی کیرام ـ علیهم الرضوان ـ هەموو دوڕو ئەڵماسن ؛ کامی لە کامیان بەقیمەت‌ترە ؟ هەر گەوهەرفرۆش ئەیناسێ . ئێمە لە موورووێشس نازانین . وا چاکە لەوە زیاتر کە ئەئیمەی دین فەرموویانە ئێمە هەر لێی بێدەنگ بین .

٩١٧/٤٠ عن ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : اني لواقف في قوم ؛ فدعوا الله لعمر بن الخطاب ـ رضي الله تعالى عنه ـ وقد وضع على سريره ، اذا رجل من خلفي قد وضع مرفقه على منكبي يقول : رحمك الله ، ان كنت لأرجو ان سيجعلك الله مع صاحبيك ؛ لأني كثيرا مما كنت اسمع رسول الله ـ ﷺ ـ يقول : كنت وابو بكر وعمر ، وفعلت وابو بكر وعمر ، وانطلقت وابو بكر وعمر ؛ فان كنت [واني كنت . نسخة الفرع] لأرجو ان يجعلك الله معهما ، فالتفتت فاذا هو علي بن ابي طالب [رضي الله تعالى عنه] ح ـ ٩٤/٦ . م ـ ٢٧٨/٩

تەرجەمە :

ئيبن و عەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووى : [كە ئيمامى عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ وەفاتى فەرموو] لە ناو قەومێكا بووم دوّعايان بۆ ئيمامى عومەر كرد [رضي الله تعالى عنه] ئەويش لەسەر تەختى سەعادەتى دانرابوو ، پياوێ لە پشتمەوە ئانيشكى لەسەر شانم دانابوو ، ئەيفەرموو : خوا رەحمت پێ بكا ، بە تەحقيق من رجام وابوو كە خوا ـ عز وجل ـ لەگەڵ دوو رەفيقەكەتا بتهێڵێ ؛ چونكى زۆر جار لە پێغەمەر ـ ﷺ ـم ئەبيست ئەيفەرموو : من و ئەبوبەكر و عومەر بووين ، من و ئەبوبەكر و عومەر كردمان ، من و ئەبوبەكر و عومەر رۆيين . من و ئەبوبەكر و عومەر داخڵى فلان جێ بووين . ئيتر ئومێدم بوو كە خوا [لە قيامەتيشا] بتكا بە رەفيقى رەفيقەكانت . كە ئاورم دايەوە ئەو پياوە حەزرەتى عەلى كوڕى ئەبو طاليب بوو ـ رضي الله تعالى عنه ، وخفف عن ابيه ـ .

٩١٨/٤١ عن عروة بن الزبير قال : سألت عبدالله بن عمرو بن

العـاص [رضي الله تعـالى عن الاولـين] قلت : اخبـرني [بـأشـدّ شئ صنعه . خ اخرى . ] عن اشدّ ما صنـع المشركـون [بالنبي . اخـرى] برسول الله ـ ﷺ ـ قال : رأيت عقبة بن ابي معيط [لعنه الله ، زوج ام عثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ] جاء الى النبي ـ ﷺ ـ وهو يصلي [في حجر الكعبة . اخرى . خ] فـوضع رداءه [اى رداء النبي ـ ﷺ ـ] في عنقـه فخنقه به خِنْقا شديدا ، فجاء ابو بكر [رضي الله تعالى عنه] حتى [أخذ بمنكبه . اخرى خ] دفعه عنه ـ ﷺ ـ [وهو يبكي . ابن اسحاق] فقال : اتقتلون رجـلا ان يقـول ربي الله وقـد جـاءكم بـالبينـات من ربكم ؟ ح ـ ٦/ ٩٤ ، ح ـ ٦/ ١٧٩ . في بـاب ما لقي النبي ـ ﷺ ـ من الاذى ببعض فرق تراه .

تەرجەمە :

عوروە ئەفەرموێ : لەعەبدوڵلای کوڕی عەمری عاصم پرسی لە بەشیددەتتـرینی ئەو مـوعامـەلەی کـە موشـریکان لـە مەکـەدا لەگـەڵ پێغەمەریان کردوە ـ ﷺ ـ فەرمووی : عەقەبەی کوڕی ئەبوموعەیـطی مەلعوونم دی [کە مەسخەرەی قورەیش بوو ـ لعنه الله ـ] پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە لە حیجرا نوێژی ئەکرد عەقەبەی [مـەلعوونی بـاوەپیارەی ئیمـامی عوثمان ـ رضي الله تعـالى عنه ـ ی زاوای پێغـەمەر ـ ﷺ ـ] چـوو ئەو بەرماڵەی کە بـەسەرشـانی موبـارەکی پێغەمـەرەوە بوو ـ ﷺ ـ لـە ملی پێغەمەری ئالاّن و بەوە پێغەمەری ـ ﷺ ـ ئەخنکان . حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی چوو لە دەستی ئەو مەلعوونە نەجاتی داو ، فـەرمووی : بـۆ تەمـاتـانـە پیـاوێ بکـوژن کـە ئـەفـەرمـوێ : پەروەردگاری من خوایەو ، لە طەرەف پەروەردگاری خۆتانـەوە ئایـاتی واضیحەو ظاهیرەی بۆ هێناون ؟ [کە دەلالەت ئەکا لەسەر ئەوەی کـە

پێغەمەری بەحەقەو لە طەرەف خواوە رەوانەکراوە . ئەو بۆ نەجاتی ئێوە لە ئاگر نێرراوە کەچی ئێوە ئەیکوژن !

حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ گەلێ لە موئمینی ئالی فیرعەون چاکترە کە بە زمان موجادەلەی لەگەڵ فیرعەون و فیرعەونیـدا کرد ، مودافەعەی حەزرەتی مووسای کرد ـ علیه الصلاة والسـلام ـ ؛ چونکی حەزرەتی صـەدیقی ئەکبـەر بە قـەول و بە فیعـل مودافـەعەی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ ، ورضي عنه ـ لە فیرعەونی ئەم ئومەتـە ـ لعنه الله ـ] .

# باب الهجرة ، وفيه فضل الصديق
## - رضي الله تعالى عنه -

٩١٩/٤٢ براء بن عازب [رضي الله تعالى عنهما] يقول : جاء ابو بكر - رضي الله تعالى عنه - الى ابي في منزله ، فاشترى منه رَحلا ، فقال لعازب : ابعث ابنك يحمله معي . قال : فحملته معه ، وخرج ابي ينتقد ثمنه ، فقال له ابي : يا ابا بكر ! حدثني كيف صنعتما حين سريت مع رسول الله - ﷺ - ؟ قال : نعم . قال : اسرينا ليلتنا ومن الغد حتى قام قائم الظهيرة ، وخلا الطريق ؛ لا يمر فيه احد ، فرُفِعَتْ [ظهرت] لنا صخرة طويلة ، لها ظل ، لم تأت عليه الشمس ، فنزلنا عنده ، وسويت للنبي - ﷺ - مكانا بيدي ينام عليه ، وبسطت فيه فروة [كانت معي . ابن اسحاق] وقلت : نم يا رسول الله وانا انفض لك ما حولك [من الغبار واحرسك] فنام ، وخرجت انفض ما حوله ، [من الغبار واحرسه] فاذا انا براعٍ مقبل بغنمه الى الصخرة ، يريد منها مثل الذي اردنا ، فقلت : لمن انتَ يا غلام ؟ فقال : لرجل من اهل المدينة [مسلم جزما] او مكة [مدينة هنا صفة لا علمٌ ، بمعنى البلد والمراد مكة] قلت : أَفي عنزك لبن ؟ قال : نعم . قلت : افتحلب ؟ قال : نعم . فأخذ شاة ، فقلت : انفض الضرع من التراب والشعر والقذى .

قال [ابو اسحاق] : فرأيت البراء يضرب احدى يديه على الأخرى ينفض . فحلب في قعب [كأس] كثبة [قليلا] من لبن ومعي إداوةً [مطارة] حملتها للنبي - ﷺ - يرتوي منها ، يشرب ويتوضأ ، فأتيت النبي

ـ ﷺ ـ فكرهت ان اوقظه ، فوافقته حين استيقظ ، فصببت من الماء على اللبن حتى برد اسفله ، فقلت : اشرب يا رسول الله . قال : فشرب حتى رضيتُ . ثم قال : اَلَمْ يأن للرحيل ؟ قلت : بلى . قال : فارتحلنا بعدما مالت الشمس . واتبعَنا سراقة بن مالك فقلت : أُتينا يا رسول الله . فقال : لا تحزن ان الله معنا . فدعا عليه النبي ـ ﷺ ـ فارتطمت [غاصت قوائمه] به فرسه الى بطنها ارى في جَلَد [صلب] من الارض (شك زهير) . فقال : اني أراكما قد دعوتما عليَّ ، فادعوا لي . فالله لكما ان اردَّ عنكما الطلب . فدعا له النبي ـ ﷺ ـ فنجا ، فجعل [رضي الله تعالى عنه] لا يلقي احدا الا قال : كفيتكم ما هنا . فلا يلقي احدا الا رده ، قال : ووفى لنا [ثم اسلم ـ رضي الله تعالى عنه ـ] . خ ـ ٦/٦٠ ، م ـ ١٠/٤٦١

تەرجەمە :

بەرائی کوڕی عازیب ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی هاتە لای باوکم لەماڵەوە ، کۆپانێکی وشتری لێ کری ، فەرمووی بە باوکم : کوڕەکەتم لەگەڵ بنێرە لەگەڵم هەڵبگرێ . بەراء فەرمووی : لە خزمەتیا هەڵمگرت ، باوکیشم لە خزمەتیا هات کە پارەکەی وەربگرێ ، باوکم عەرزی کرد : یا ئەبوبەکر قسەی ئەوەم بۆ بکە کە شەو لە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفتان ڕۆیی چۆنتان کرد ؟ فەرمووی : بەڵێ قسەت بۆ ئەکەم . فەرمووی : شەو ڕۆیین ، ڕۆژی دواییش ڕۆیین تا وەختی نیوەڕۆ ، ڕێگە چۆڵ بوو ، کەسی پیا نەدەڕۆیی ، بەردێکی درێژی سێبەردارمان بۆ دەرکەوت ، ئێشتا هەتاوی نەهاتبوویێ ، لای ئەو بەردە دابەزین ، بە دەست ئەرزەکەم بۆ پێغەمەر ـ ﷺ ـ ڕێك خست کە لێی

بنوێ ، کەوڵێکم پێ بوو بۆم ڕاخست ، عەرزم کرد : (یا رسول الله) بنوو من دەورو پشتت ئەماڵم تۆزت بۆ نەیێ ، تەماشای ئەطراف ئەکەم کە کەسمان بە شوێنا هاتوە یان نا ؟

پێغەمەر ـ ﷺ ـ نوست ، منیش چووم ئەطراف تەماشا بکەم کەس دیارە دیار نی‌یە ؟ تێفکریم شوانێکی مەڕ مەڕەکەی ئەهێنایە بن بەردەکە ، بۆ بەر سێبەری بەردەکە . لێم‌پرسی : غولامی کێی ؟ وتی : هی فلانی مەککەییم . وتم : لە مەڕەکەتا شیر هەیە ؟ وتی : بەڵێ . وتم : ئیذن‌دراوە کە شیری لێ بدۆشرێ بۆ ڕێبوار ؟ وتی : بەڵێ . شوانەکە مەڕێکی گرت . پێم‌وت : ظەریف گوانی مەڕەکە لە تۆزو موو و پیسایی پاکەرەوە .

ئەبوئیسحاقی راویی ئەڵێ : بەرائم دی دەستێکی بە دەستێکیا ئەدا ، تەصویری حیکایەتی ئەمەی ئەکرد کە شوانەکەی چۆن گوانی مەڕەکەی پاك ئەکردەوە لە تۆز ـ دیارە ئەویش چاوی لە حەزرەتی صەدیق بوە کە تەصویری ئیشی شوانەکەی کردوە ـ حەزرەتی صەدیق ـ رضي الله تعالی عنە ـ ئەفەرموێ : شوانەکە کەمێ شیری بۆ دۆشین ، منیش مەطارەیێکم پێ بوو ئاوی خواردنەوەو دەزنوێژی پێغەمەری ـ ﷺ ـ تیا بوو ، بە شیرو مەطارەکەوە هاتمە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ حەزم نەکرد کە خەبەری کەمەوە ، کە چووم چوونەکەم تەصادوفی وەختی خەبەربوونەوەی ئەوی کرد . لە ئاوی مەطارەکە کردم بەسەر شیرەکەدا تا لای خوارووی سارد بوەوە . عەرزم‌کرد : (یا رسول الله) فەرموو : بخۆرەوە ، خواردی‌یەوە تا بە مەرامی من تێر بوو ، لە پاشا فەرمووی : وەختی ڕۆیین نەهاتوە ؟ وتم : بەڵێ هاتوە . سواربووین لە دوای ئەوە کە ڕۆژ میلی بە لای مەغریبا کردبوو ، گەرمی کەم بووبوو .

سوراقەی کوری مالیکی جوعشومان شوێن کەوتبوو کە بمانکوژێ . عەرزی پێغەمەرم کرد - ﷺ - : (یا رسول الله) وا پێمانگەیین . فەرمووی : مەحزوون مەبە ئێمە خوامان لەگەڵە ! پێغەمەر - ﷺ - دۆعای لێکرد ، ئەسپەکەی تا زگی بە ئەرزا چوە خوارێ .

زوهەیر کە یەکێکە لە روایەکان ئەڵێ : وام ظەن هەیە کە فەرمووی : بە ئەرزێکی رەقا رۆچوو . سوراقە - رضي الله تعالى عنه - عەرزی پێغەمەری کرد - ﷺ - : وا بزانم دۆعاتان لێ کردم . دۆعام بۆ بکەن نەجاتم بێت ، خوا حافیظتان بێ . بۆیێکم دۆعا بۆ بکەن ئەوانەتان لێ بگێرمەوە کە تەعقیبتان ئەکەن . پێغەمەر - ﷺ - دۆعای بۆکرد نەجاتی بوو . سوراقەیش - رضي الله تعالى عنه - تووشی هەرکەسێ لەو طەرەفەوە ببوایە پێی ئەوت : پێی ناوێ لەم طەرەفەوە تەعقیبی بکەن ، ئەم طەرەفەم گرتۆتە سەر خۆم ، زەحمەتی ئەم دەورو پشتەم لە کۆڵ خستوون . حەزرەتی صەدیق - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : سوراقە وەفای بە وەعدەکەی خۆی کرد . - رضي الله تعالى عنه - .

٤٣ / ٩٢٠ عائشة - رضي الله تعالى عنها - قالت : لم أعقِل ابوي قط الا وهما يدينان الدين ، ولم يمرًّ علينا يوم الا يأتينا فيه رسول الله - ﷺ - طرفي النهار : بكرة ، وعشية . فلما ابتلي المسلمون خرج ابو بكر - رضي الله تعالى عنه - مهاجرا نحو ارض الحبشة حتى بلغَ بِرْكَ الغِماد ، [موضع على خمس ليال من مكة الى جهة اليمن] لقيه ابن الدَّغِنَة [وهو اسم امه ، واسمه الحرث بن زيد] وهو سيد القارة [قبيلة] ، فقال : اين تريد يا ابا بكر ؟ فقال ابو بكر [رضي الله تعالى عنه] : اخرجني قومي ، فاريد أن

أسيح في الأرض ، واعبد ربي . فقال ابن الدغنة : فان مثلك يا ابا بكر لا يَخْـرُجُ ولا يُخْرَجُ ؛ انـك تكسب المعدوم [اي تعـطي النـاس مـا لا يجدونه] ، وتصل الرحم ، وتحمل الكلَّ [الثقل ، او الذي لا يستقـل بامره] وتَقْري الضيف ، وتعين عـلى نوائب الحق . [اي : حـوادثه . فوصفه بمثل ما وصفت خديجة ـ رضي الله تعـالى عنها ـ بـه رسـول الله ـ ﷺ ـ ] فانا لك جار ، ارجع واعبد ربك ببلدك , فرجع وارتحل معه ابن الدُّغُنَة فطاف ابن الدُّغْنة [فيه لغات اشرت اليها] عشية في اشراف قريش ، فقال لهم : ان ابا بكر لا يَخْرج مثله ولا يُخْرج . أتُخْرِجون رجلا يكسب المعدوم ، ويصل الرحم ، ويحمل الكـل ، ويقري الضيف ، ويعين على نوائب الحق ؟ فلم تكذِّب قريش بجوار ابن الدغنة [اى لم تَردّه] .

وقالوا لابن الدغنة : مر ابا بكـر فليعبد ربـه في داره . فليصل فيها ، وليقرأ ما شاء . ولا يوذينا بذلك ، ولا يستعلن به ؛ فانا نخشى ان يفتن نساءنا وابناءنا ، فقال ذلك ابن الدغنة لابي بكر [رضي الله تعالى عنه] فلبث ابو بكر [رضي الله تعالى عنه] بذلك يعبد ربه في داره ، ولا يستعلن بصلاته ، ولا يقرأ في غير داره .

ثم بدا لابي بكر [رضي الله تعالى عنه ] فابتنى مسجدا بفناء داره [امامها] وكان يصلي فيه ، ويقرأ القرآن ، فينقذف عليه نساء المشركين وابناؤهم [اي يجتمعون عليه] وهم يعجبون منه ، وينظرون اليه . وكان ابو بكر [رضي الله تعالى عنه] رجلا بكّاء ، لا يملك عينيه اذا قرأ القرآنَ . فافزعَ ذلك أشرافَ قريش من المشركين . فأرسلوا الى ابن الـدغنة ، فقدم عليهم ، فقالوا : انا كنا اجرنـا ابا بكـر ـ رضي الله تعالى عنـه ـ

بجوارك على ان يعبد ربه في داره . فقد جاوز ذلك فابتنى مسجدا بفِناء داره ، فاعلن بالصلاة والقراءة فيـه ، وانا قـد خشينا ان يفتن نسـاءنا وابناءنا ، فانهه ، فان احب ان يقتصر على ان يعبد ربه في داره فعل ، وان ابى الا ان يعلن فسله ان يردَّ اليك جِوارك ؛ فانا قد كرِهنا ان نُخْفِرَك [اى ننقض عهدك] ولسنا مقرين لأبي بكر الاستعلان .

قالت عائشة [رضي الله تعالى عنها] : فأتى ابن الدغنة الى ابي بكر [رضي الله تعالى عنه] فقال : قد علمت الذي عاقدت لك عليه ؛ فاما ان تقتصر على ذلك واما ان ترجع اليّ ذمّتي ، فإني لا احب ان تسمع العرب اني اخفرت في رجل عقدت له . فقال ابو بكر [رضى الله تعالى عنه] : فإني اردُّ اليك جوارك وارضى بجوار الله ـ عز وجل ـ ! والنبيُّ ـ ﷺ ـ يومئذ بمكة .

فقال النبي ـ ﷺ ـ : للمسلمين : اني أُريت دار هجرتكم ذات نخل بين لابتين ، وهما الحرتان [حجارة سود] . فهاجر من هاجر قِبَل المدينة ، ورجع عامة من كان بارض الحبشة الى المدينة . وتجهز ابو بكر [رضي الله تعالى عنه] قبل المدينة . فقال لـه رسول الله ـ ﷺ ـ : عـلى رسلك [اصبر . ابن حبان] فاني ارجو ان يؤذن لي . فقال ابو بكر [رضي الله تعالى عنه] وهل ترجو ذلك بأبي انت [وامي كش] ؟ قال : نعم . فحبس ابـو بكر [رضي الله تعـالى عنه] نفسـه على رسـول الله ـ ﷺ ـ ليصحبه ، وعلف راحلتين كانتا عنده ورق السَّمُرِ وهو الخَبْط [ما يُخبط بالعصا فيسقط] اربعة اشهر .

قال ابن شهاب : قال عروة : قالت عائشة [رضي الله تعالى عنها] : فبينما نحن يوما جلوس في بيت ابي بكر [رضي الله تعالى عنه] في نحر الظهيرة قال قائل [اسماء ، او عامر بن فهيرة ـ رضي الله تعالى عنهما ـ] لابي بكر : هذا رسول الله ـ ﷺ ـ متقنعا في ساعة لم يكن يأتينا فيها ، فقال ابو بكر [رضي الله تعالى عنه] : فداء له ابي وامي ، والله ما جاء به في هذه الساعة الا امر ! قالت : فجاء رسول الله ـ ﷺ ـ فاستأذن ، فأذن له ، فدخل ، فقال النبي ـ ﷺ ـ لابي بكر [رضي الله تعالى عنه] : اَخرِج مَنْ عندك . فقال ابو بكر [رضي الله تعالى عنه] : انما هم اهلك وامها ، بابي انت يا رسول الله . قال : فإني قد اذن لي في الخروج . فقال ابو بكر [رضي الله تعالى عنه] : الصحابةَ بابي انت يا رسول الله . قال رسول الله ـ ﷺ ـ : نعم . قال ابو بكر [رضي الله تعالى عنه] : فخذ بابي انت يا رسول الله احدى راحلتي هاتين . قال رسول الله ـ ﷺ ـ : بالثمن [ثمانمائة والراحلة القصواء ، او الجدعاء] .

قالت عائشة [رضي الله تعالى عنها] : فجهزناهما [احب كش] احث الجهاز [اسرعه] وصنعنا لهما سُفْرة [زادا] في جراب ، فقطعت اسماء بنت ابي بكر [رضي الله تعالى عنهما] قطعة من نطاقها فربطت به على فم الجراب ؛ فبذلك سميت ذات النطاق .

قالت : ثم لحق رسول الله ـ ﷺ ـ وابو بكر [رضي الله تعالى عنه] بغار في جبل ثور [يوم الخميس] فكمنا [بفتح فكسر ، او فسكون او محركة . حاذق] فيه ثلاث ليال [وخرجا يوم الاثنين] يبيت عندهما عبدالله بن ابي بكر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ وهو غلام شاب ثَقِف ، لَقِن [فهيم] فيُدْلِجُ [من الاِفعال او التفعيل] من عندهما بسحر ، فيصبح مع قريش بمكة كبائت ، فلا يسمع امرا يُكتادان به الا وعاه حتى يأتيهما بخبر ذلك

حين يختلط الظلام ، ويرعى عليهما عامر بن فهيرة مولى ابي بكر [رضي الله تعالى عنهما] مِنحة [شاة تحلب] من غنم [للصديق - رضي الله تعالى عنه -] فيريحها عليهما حين تذهب ساعة من العشاء ، فيبيتان في رِسل ، وهو لبن منحتهما ورضيفهما [الموضوع فيه الحجارة المحماة ، لتذهب وخامته وثقله] حتى ينعق بها [يزجرها] عامر بن فهيرة بغلس [ظلمة آخر الليل] يفعل ذلك كل ليلة من تلك الليالي الثلاث .

واستأجر رسول الله - ﷺ - وابو بكر [رضي الله تعالى عنه] رجلا من بني الديل ، وهو من بني عبد ، بن عدي هاديا خِرِّيتا . والخِرِّيت : الماهر بالهداية . قد غمس حِلْفا في آل العاص بن وائل السهمي ، [اذا تحالفوا غمسوا ايديهم في دم ، او في شيٍّ له لون ، تاكيدا للحلف] - وهو على دين كفار قريش - فأمِناه ، فدفعا اليه راحلتيهما ، وواعداه غار ثور بعد ثلاث ليال . فأتاهما براحلتيهما صبح ثلاث . وانطلق معهما عامر بن فهيرة ، والدليل [عبدالله بن أُرَيقِط] فاخذ بهم طريق السواحل .

قال ابن شهاب : واخبرني عبدالرحمن بن مالك المُدْلِجيّ ، وهو ابن اخي سراقة بن مالك بن جُعْشُم [رضي الله تعالى عنه] ان اباه مالكا اخبره انه سمع سراقة بن جعشم [نسبة لجده] يقول : جاءنا رسول كفار قريش يجعلون في رسول الله - ﷺ - وابي بكر [رضي الله تعالى عنه] دية كل واحد منهما من قتله او اسره . فبينما أنا جالس في مجلس من مجالس قومي - بني مُدْلج - اقبل رجل منهم حتى قام علينا ونحن جلوس . فقال : يا سُراقة اني قد رأيت آنفا أسودة بالساحل أُراها محمدا [ﷺ] واصحابه . قال سراقة : فعرفت انهم هم ، فقلت له : انهم ليسوا بهم ، ولكنك رأيت فلانا وفلانا انطلقوا باعيننا ، ثم لبثت في المجلس ساعة ثم قمت فدخلت ، فامرت جاريتي ان تخرج بفرسي [وزاد موسى

بن عقبة : ثم اخذت قِداحى [اى الازلام] فاستَقْسَمتُ بها ، فخرج الذي اكره : لا تضره ، وكنت ارجو ان ارده وآخذ المائة ناقة] وهي من وراء اكمة فتحبسها عليّ ، واخذت رمحي ، فخرجت به من ظهر البيت فحططت [معجما ومهملا] بِزَجِّه الارض وخفضت عاليه حتى اتيت فرسي فركبتها فرفعتها [فَعَل او فَعَّل] تُقَرِّبُ بي [التقريب : ان ترفع يديها معا وتضعها معا] حتى دنوت منهم ، فعثرت بي فرسي ، فخَرَرت عنها ، فقمتَ فاهويت يدي الى كنانتي ، فاستخرجت منه الازلام ، فاستقسمت بها : اضرهم ام لا ؟ فخرج الذي اكره [لا تضرهم] فركبت فرسي ، وعصيت الازلام تقرِّب بي حتى اذا سمعت قراءة رسول الله ـ ﷺ ـ وهو لا يلتفت ، وابو بكر [رضي الله تعالى عنه] يكثر الالتفات . . . ساخت يدا فرسي في الأرض حتى بلغتا الركبتين ، فَخَررت عنها ثم زجرتها ، فنهضت ، فلم تكد تخرج يديها ، فلما استوت قائمة اذاً لأثر يديها عُثان [دخان] ساطع في السماء مثل الدخان فاستقسمت بالازلام ، فخرج الذي اكره ، فناديتهم بالامان [وعند ابن اسحاق : فناديت القوم : انا سراقة بن مالك بن جعشم ، انظروني اكلمكم ، فوالله لا يأتيكم مني شيٌ تكرهونه] . فوقفوا فركبت فرسي حتى جئتهم ، ووقع في نفسي حين لقيت ما لقيت من الحبس عنهم : ان سيظهر امر رسول الله ـ ﷺ ـ فقلت له : ان قومك قد جعلوا فيك الدية ، واخبرتهم أخبار ما يريد الناس بهم ، وعرضت عليهم الزاد والمتاع ، فلم يَرْزَآني ولم يسألاني [شيئا مما معي] الا ان قال : اَخفي عنا . فسألته ان يكتب لي كتاب اَمن ، فاَمر عامر بن فهيرة ، فكتب في رقعة من اديم [وزاد ابن اسحاق : فاَخذته فجعلته في كنانتي ، ثم رجعت] ثم مضى رسول الله ـ ﷺ ـ .

قال ابن شهاب : فأخبرني عروة بن الزبير [رضي الله تعالى عنه ، ولم يولد عروة اذ ذاك] ان رسول الله ـ ﷺ ـ لقي الزبير [رضي الله تعالى عنه] في ركب من المسلمين كانوا تجاراً قافلين من الشام ، فكسا الزبير [رضي الله تعالى عنه] رسول الله ـ ﷺ ـ وابا بكر [رضي الله تعالى عنه] ثياب بياض . [وفي رواية الدمياطي : ان الذي كساهما طلحة ـ رضي الله تعالى عنه ـ والكل صحيح] .

وسمع المسلمون بالمدينة فخرج رسول الله ـ ﷺ ـ من مكة ، فكانوا يغدون كل غداة الى الحرة فينتظرونه حتى يردُّهم حرُّ الظهيرة ، فانقلبوا يوما بعد ما اطالوا انتظارهم ، فلما اَووا الى بيوتهم اَوْفى [اى طلع] رجل من يهودَ على اُطُم من اَطامهم لأمر ينظر اليه ؛ فبصر برسول الله ـ ﷺ ـ واصحابه مبيضّين [بيض الثياب ، او من فارس بائض متعجل] يزول بهم السراب ، فلم يملك اليهودي ان قال باعلى صوته : يا معاشر العرب هذا جدّكم ، [حظكم وصاحب دولتكم] الذي تنتظرون . فثار المسلمون الى السلاح ، فتلقوا رسول الله ـ ﷺ ـ بظهر الحرة ، فعدل بهم ذات اليمين حتى نزل بهم في بني عمرو بن عوف [بقباء] وذلك يوم الاثنين من شهر ربيع الاول ، فقام ابو بكر للناس ، وجلس رسول الله ـ ﷺ ـ [ورضي عنه] صامتا ، فطفق من جاء من الانصار ـ ممن لم يرَ رسول الله ـ ﷺ ـ يحيى ابا بكر [رضي الله تعالى عنه] حتى اصابت الشمسُ رسول الله ـ ﷺ ـ فاقبل ابو بكر [رضي الله تعالى عنه] حتى ظلّل عليه بردائه ، فعرف الناس رسول الله ـ ﷺ ـ عند ذلك .

فلبث رسول الله ـ ﷺ ـ في بني عمرو بن عوف بضع عشرة ليلة ، واسس المسجد الذي اسس على التقوى [مسجد قباء] وصلى فيه رسول الله ـ ﷺ ـ ثم ركب راحلته [يوم الجمعة] فسار يمشي معه الناس ، حتى

بركت عند مسجد الرسول ـ ﷺ ـ بالمدينة وهو يصلي فيه يومئذ رجال من المسلمين . وكان مِرْبدا للتمر لسُهيل وسَهْل [ابني رافع بن عمرو] غلامين يتمين في حجر اسعد بن زرارة [رضي الله تعالى عنه] فقال رسول الله ـ ﷺ ـ ، حين بركت به راحلته : هذا ـ ان شاء الله ـ المنزل ، ثم دعا رسول الله ـ ﷺ ـ الغلامين ، فساومهما بالمِرْبَد ليتخذه مسجدا ، فقالا : بل نهبه لك يا رسول الله . فابى رسول الله ـ ﷺ ـ ان يقبله منهما هبة حتى ابتاعه منهما ، ثم بناه مسجدا ، وطفق رسول الله ـ ﷺ ـ ينقل معهم اللَّبِن في بنيانه ويقول :

هذا الحِمال لا حِمال خيبر
هذا أبَرّ ربنا واظهر

ويقول :

اللهم ان الاجر أَجر الآخرة
فارحم الانصار والمهاجرة

فتمثل بشعر رجل من المسلمين لم يسمَّ لي [عبدالله بن رواحة ـ رضي الله تعالى عنه ـ] .

قال ابن شهاب : ولم يبلغنا في الاحاديث ان رسول الله ـ ﷺ ـ تمثل ببيت شعر تام غير هذا البيت خ ـ ٦/٢٠٧ ـ ٢١٣

تەرجەمە :

عايشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : لەو رۆژەوە كە من دايكو باوكی خۆمم ناسیوه هەر لەسەر ئەم دینە بوون ، هیچ رۆژێكمان بەسەرا رانەبوردوە كە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئێوارێو سبەینێ نەهاتبێتە ماڵی ئێمە . كە موسوڵمانان لە طەرەفی موشریكەوە موبتەلا بوون بە ئەذاو جەفا ئەبوبەكر ـ رضي الله تعالى عنە ـ بە موهاجیریی بۆ ئەرزی حەبەش لە

مەککە تەشریفی چوە دەرێ ، تا گەیی یە (برك الغماد) کە مەسافەی پێنج ڕۆژە لە مەککەوە بۆ طەرەفی یەمەن . لەوێ (ابن الدغنە)ی پێگەیی . (ابن الدغنە) گەورەی قەبیلەی قارەیە کە شوعبەیێکە لە موضەر . . عەرزی ئەبوبەکری کرد ـ رضي الله تعالى عنه ـ : یا ئەبوبەکر بۆ کوێ ؟ فەرمووی : قەومەکەم دەریان کردووم ، تەمامە لە ئەرزا سەیاحەت بکەم و عیبادەتی ڕەببی خۆم بکەم . (ابن الدُغنە) وتی : پیاوی وەکوو تۆ نە خۆی ئەڕوا نە دەریش ئەکرێ ؛ چونکی تۆشت ئەبەخشی بەوانەی کە هیچیان نی یە ، صیلەی ڕەحم بەجێ یێنی ، ئیشی قورس و گرانی پیاوی بێ دەستەڵات ئەگری یە سەر خۆت ، میهمان نەوازیی ئەکەی ، موعاوەنەتی ئینسانی لێقەوماو ئەکەی ، من پەنات لای خۆم ئەدەم کە موشریکان ئەذیەتت نەدەن ، بگەڕێرەوە لە شاری خۆتا عیبادەتی خوای خۆت بکە .

ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی گەڕایەوە (ابن الدغنە) لە خدمەتیا سوار بوو بۆ مەککە . ئێوارێیەك بە گەورەو ئەشرافی قورەیشەوە گەڕا ، پێی وتن : پیاوی وەك ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە وەتەنی خۆی ناچێتە دەرەوەو دەریش ناکرێ ، بۆ ئێوە تەماتان وایە پیاوێ لە وەتەنی خۆی بکەنە دەرێ کە شت ئەبەخشێ بە ئینسانی نەبوە ، صیلەی ڕەحم ئەکا ، ئیشی ئینسانی بێ دەستەڵات ئەگرێتە سەرخۆی ، میوانداریی خەڵق ئەکا ، موعاوەنەتی لێقەوماوان ئەکا . . قورەیش پەنادانی (ابن الدغنە) یان ڕەد نەکردەوە . پێیان وت : ئەمر بکە بە ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە ماڵی خۆیا عیبادەتی خوای خۆی بکا ، لە ماڵی خۆیا بە هەوەسی خۆی نوێژ بکاو بخوێنێ ، بەوە ئەذیەتی ئێمە نەداو ئاشکارای نەکا لە ناو ئێمەدا ؛ ئەترسین منالەکانمان و ژنەکانمان بە

ئاشكاراكردنى نويْژ و خوێنی لە ڕێ بكاتە دەرێ .

(ابن الدغنه) ئەو قسەی قورەیشەی عەرزی ئەبوبەكر كرد - رضي الله تعالى عنه - ئەبوبەكر - رضي الله تعالى عنه - لەسەر ئەو شەرتە مایەوە ؛ لە مالْی خوّیا عیبادەتی خوای ئەكردو ، لە غەیری مالْی خوّیانا هیچی نەدەكرد تا موددەیێ . دوای ئەو موددەیە ئەبوبەكر - رضي الله تعالى عنه - غەیری ئەو حالْەی بە چاك بوّ دەركەوت ؛ لە بەردەمی مالْەكەیانا مزگەوتێكی دروستكرد ، لەوێدا نوێژی ئەكردو قورئانی ئەخوێن . ژن و منالْی قورەیشی لێ كوّئەبوونەوە ، تەماشایان ئەكردو تەعەججوبیان لێ ئەما ، ئەبوبەكریش - رضي الله تعالى عنه - پیاوێكی (رقیق القلب) بوو زوّر ئەگریا ، كە قورئانی ئەخوێن فرمێسكی چاوی پێ ڕانەدەگیرا .

ئەو موعامەلەی ئەبوبەكر - رضي الله تعالى عنه - كەتە كەتەی قورەیشی ترسان لەوە كە ژنەكانیان و كورەكانیان موسولْمان ببن ، ناردیان بە شوێن (ابن الدغنة)دا هات پێیان وت : كە ئێمە بە واسیطەی توّوە پەنای ئەبوبەكرمان دا كە نەڕوا بەو شەرتە كە لە مالْی خوّیا عیبادەت بكا ئێستە ئەو لەو شەرتەی تێپەڕ كرد ؛ ئیعلانی هەموو شتێكی كرد ، ئەترسین مالْ و منالْمان تووشی فیتنە بكا . پێی بلێ نەیكا . ئەگەر ئارەزووی هەیە كە لە مالْی خوّیا عیبادەت بكا بیكا ، ئەگەر هەر نەیكردو ئیعلانی عیبادەتی كرد لە ناو خەلْقا پێی بلێ ضامنێتییەكەت ڕەد بكاتەوە ، ئێمە حەز ناكەین ضامنێتی توّ بشكێنین ، ئەبوبەكریش لەسەر ئەو حالْە نایێلْینەوە كە بە ئاشكارا عیبادەت كاو بخوێنێ .

عایشە - رضي الله تعالى عنها - فەرمووی : (ابن الدغنه) هاتە خدمەت ئەبوبەكر - رضي الله تعالى عنه - عەرزی كرد : ئەزانی كە چوّنم

عـەهد لـەگەڵ کـردووی . یا لـەسەر ئـەوە بمێنە یـا ضـامنێتی یـەکـەم بدەرەدواوە ، حەز ناکەم کەعەرەب ببێی کە من ضامنێتیم شکێنراوە بۆ پیاوێ کە عەهدم لەگەڵ کردووە . ئەبوبەکـر - رضي الله تعالى عنـە - فەرمووی : ئەو پەنایەی کە تۆ داوتە بە من وا بۆم رەدکردیەوە ، بە پەنای خواو ئامانی ئەو رازیی ئەبم !

پێغـەمەر - ﷺ - تـەشریفی لـەو وەختەدا لـە مەککـە بـوو بـەو موسوڵمانانەی کە لە خدمەتیا بوون فەرمووی : ئەو جێگەیەی کە هیجرەتی بۆ ئەکەن پێنیشانم دراوە ؛ دارخورمای زۆری هەیە ، لە بەینی دوو شاخی بەردەلانی رەشایە . ئەوی هیجرەتی بۆ مەدینە کرد - کردی ، ئەوانەی کە لەوەپێش هیجرەتیان کردبوو بۆ ئەرزی حەبەش گەرانەوە بۆ مـەدینە . حـەزرەتی ئەبـوبەکـریش - رضي الله تعالى عنـە - تەدارەکی کـرد کـە هیجرەت بکا بۆ مەدینە . پێغەمەر - ﷺ - ئەمری پێ فەرموو : جارێ صەبر کە ، ئومێدم وایە کە ئیذن بدرێم کە هیجرەت بکەم . ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : دایكو باوکم بە قوربانت بێ ! بۆچ ئومێدت هەیە کە ئیذن بدرێی ؟ فەرمووی : بەڵێ . ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - خۆی لەسەر پێغەمەر - ﷺ - بەندکرد کە لە هیجرەتا بێ بە رەفیقی رەسوولی ئەکرەم - ﷺ - .

دوو وشتری بە قووەتی خۆشرەوتی - کە لە خدمەتا بوو - بە گەلای داری مۆرد بەخەم کرد ، تا چوار مانگ .

حەزرەتی عائیشە - رضي الله تعالى عنها - فەرمووی : رۆژێ لە مـاڵی حەزرەتی ئـەبوبـەکرا - رضي الله تعـالى عنە - دانیشتبـووین ، لە

گەرمای نیوەڕۆدا ، یەکێ [یا عامیری کوڕی فوهەیرە ، یا ئەسما - رضي الله تعالى عنها -] عەزری ئەبوبەکری کرد - رضي الله تعالى عنه - : ئەوە رەسولوڵلایە - ﷺ - لەچەکی کردوە ، لە سەعاتێکا بوو کە قەط لەو سەعاتەدا تەشریفی نەهاتبوە لامان . ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : باوكو دایکم فیدای بێ ، وەڵڵاهی لەم سەعاتەدا ئەبێ ئیشێك ئەوی هێنابێ .

عایشە - رضي الله تعالى عنها - فەرمووی : پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی هات ئیستیذانی کرد ، ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - ئیذنی دا ، تەشریفی هاتەژووری ، بە ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - ی فەرموو : ئەوانەی لە لاتن بیانکەرە دەرێ ، ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : باوکم بە قوربانت بێ ! غەیری ئەهل و عەیالی خۆت کێی لێیە (یا رسول الله) ! پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : ئیذن درام کە بچم بۆ مەدینە . ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : باوکمت بە قوربان بێ لە خدمەتتا بم (یا رسول الله) ؟ پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : بەڵێ . ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : باوکمت بە قوربان بێ ! کە وابێ (یا رسول الله) یەکێك لەم دوو وشترە بۆ تۆ بێ . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : سا بە پارەی بەهای خۆی .

عائیشە - رضي الله تعالى عنها - فەرمووی : توێشوویێکی باشی بە عەجەلەمان بۆ کرد ، خواردنێکمان بۆ دروست کرد ، خستمانە ناو توێشەبەرەیێکەوە [واقیدی ئەڵێ : ئەوی لە توێشەبەرەکەدا بوو مەڕێکی کوڵاو بوو] . [ئەسما - رضي الله تعالى عنها - . . . کە پێغەمەر - ﷺ - و باوکم ئیرادەیان کرد کە هیجرەت بکەن بۆ مەدینە توێشوویێکمان بۆ کردن . بە باوکم وت : هیچ نی یە غەیری پشتێنەکەم کە دەرکی

تویشەبەرەکەی پێ ببەستم ، فەرمووی : بیکە بە دوو لەتەوە ، کردم بە دوولەتەوە . ح ـ ٦/٢١٣ . ] ئەسماء ـ رضي الله تعالى عنها ـ پشتێنەکەی خۆی کرد بە دوو لەتەوە ، بە لەتێکی دەمی توێشەبەرەکەی پێ بەست ، لەبەر ئەوە ناونرا بە (ذات النطاقین) [یەعنی صاحیبی دوو پشتێن] .

حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ و ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفیان چوو بۆ غارێ کە لە شاخی (ثەور)ا بوو ، سێ شەو خۆیان لەوێدا شاردەوە ، شەو عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لە لایان لە غارەکەدا شەوی بەسەر ئەبرد . عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالى عنه ـ کوڕێکی جەهێڵی زیرەك و عاقڵ و تێگەییو بوو ، لە ئاخری شەوا لە غارەکە ئەهاتە دەرێ بۆ مەککە ، سبەینێ لە مەککە لەگەڵ قورەیشا لێ ئەبۆوە . (کأنە) شەوی لە مەککەدا بەسەر بردوە . قورەیش حیلەو تەدبیرێکیان بکردایە دەرحەق پێغەمەر ـ ﷺ ـ و حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنە ـ حیفظی ئەکرد ، تا لە وەختی تاریکی شەوا ئەو خەبەرانەی بۆ ئەبردنەوە .

عامیری کوڕی فوهەیرەی ئازادکراوی حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ یش لە مەڕانی حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ مەڕێکی شیرداری بۆ موحافەظە ئەکردن ، کوللی شەوێ لەو شەوانە کە تەشریفیان لە غارەکەدا مابوەوە کە ساعەتێ لە شەو ئەڕۆیی مەڕەکەی بۆ ئەبردن ئەیاندۆشی و شیرەکەیان نۆشی گیان ئەکرد . پێغەمەر ـ ﷺ ـ و ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە روفاهی یەت و رەحەتی یا شەویان رائەبوارد بە شیری تازەو بەردی گەرم تێنراوی ئیصلاح کراو ، تا وەختی ئاخری شەو عامیر ـ رضي الله تعالى عنە ـ دەنگی لە مەڕەکە ئەکردو ئەیبردنە لەوەڕ . ئەو سێ شەوە ئیشی عامیر ئەوە بوو بە رۆژ لەگەڵ شوانی

ترا ئەبوو ، وەك شەو لە لایان بووبێ نەئەزانرا کە چی کردوە .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ و ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ پیاوێکیان لە (بني الـديل) کـە لە بـەنی عەبـدی کوڕی عـەدی دیلی بـوو بە دەلیـلی بەکرێ گرت کە رێیان پێ نیشان بدا ، پیاوێ بە مەهارەت لە رێ ناسینا . ئەو پیاوە بۆ تەئکیدی سوێن دەستی کردبوو بە خوێنا یا بە شتێکا کە دەست رەنگ بکا بە عادەتی عەرەب کە سوێن بخۆن لەسەر (اتحاد)یان ، ئەو دەلیلەیش لە ناو طائیفەی عاصی بەنی وائیلی سەهمی یا بەو نەوعە بووبوو بە سوێن خواریان ، هەم لەسەر دینی کافـری قورەیش بـوو ، پیاوێکی راست بوو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ و حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەمنی یەتیان پێکرد ، وشترەکانیان تەسلیم کرد ، وەعدەیان دایێ کە لە دوای سێ شەو لە غاری ئەورا صبحەینێی سێیەم «وشترەکانیان» بۆ بەرێ کە لە وەعدەکەدا وشترەکەی بۆبردن . عامیری بنی فوهەیرەو دەلیلەکە لە خدمەتیا رۆیین . دەلیلەکە بە خواری عەسفانا رێی سەواحیلی پێ گرتن . [خوایان لەگەڵ بێ] .

ئیبن وشـەهاب ئـەفەرمـوێ : عـەبـدورەحمـانی کـوڕی مـالیکی مودلەجی کە برازای سوراقەی کوڕی مالیکی بنی جوعشومە خەبـەری داومێ لـە باوکیـەوە کە لـە سوراقـەی کوڕی جـوعشومی بیستـوە کـە ئەیفەرموو : فروستادەی کافرانی قورەیشمان بۆ هات کە : هەرکەسێ رەسولوڵلا ـ ﷺ ـ و ئەبوبەکـر ـ رضي الله تعالى عنـە ـ ئەسیر بکا یـا بیانکوژێ بە موقابیلی هەر یەکێکیان خوێنی پیـاوێکی ئەدەینێ کـە صەد وشترە . لە وەختێکا کە دانیشتبووم لە مەجلیسێکی قەومەکەما ، کە بەنی مودلەجە ، پیاوێکی بەنی مودلەج هات وتی : سەوادی چەند کەسێکم دی کە بە ساحیلا ئەڕۆیین ، وا بزانم محەمەدو رەفیقەکانیە ـ علیه الصلاة

والسلام ـ . سوراقه ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : زانيم كە ئەوانن ئەمما بۆ شوێنەونی پێم‌وت : ئەوانەی كە بەچاوت كردن ئەوان نين ، ئەبێ فلاّن‌و فلاّن بوون كە لەبەرچاوی ئێمە رۆيين كە وشتريان ون‌بووبوو چوون بۆی بگەڕێن .

لە دوای ئەوە لە مەجليسەكەدا سەعاتێ دانيشتم ، لە پاشا چوومە ماڵەوە بە كارەكەرەكەمانم وت : بچۆ ئەسپەكەم بۆ ببەرە دەرێ ، ئەسپەكەم لە پشت تەپۆڵكەيێكی بەرزەوە بوو لەوێ بۆم راگرێ ، رمەكەم هەڵگرت ، لە پشت خانوەكەمانەوە چوومە دەرێ ، بنی رمەكەم لە ئەرز ئەخشان‌و سەرەكەيشم دانەوان كە كەس نەيبينێ ، تا چوومە لای ئەسپەكەم‌و سواری بووم‌و پێم‌پێوە ناو بە تاو رۆييم تا لێيان نزيك بوومەوە . ئەسپەكەم سەرسمێكی پێدام لە سەری كەوتمە خوارێ ، هەڵسامەوە دەستم برد بۆ تيركەشەكەم ئەزلامەكانم دەرهێنا قورعەم پێ كێشا كە : ئەتوانم زەرەريان پێ‌بگەيێنم يا ناتوانم ؟ ئەوەم بۆ هات كە حەزی لێ‌نەكەم . يەعنی زەرەريان پێ‌ناگەيێنی . سواری ئەسپەكەم بووم عيصيانی ئەزلامەكەم كرد .

[ئەزلام : چەند تيرێكە كە لەسەر بەعزێكيان (ئا) لەسەر بەعزێكيان (نا) نووسراوە ، بەعزێكيان هيچی لێ نەنووسراوە . كە تەمای ئيشێكيان بێ بەو ئەزلامە فاڵی خێروشەڕ ئەگرنەوە ؛ ئەگەر ئەوەيان بۆ بێ كە (ئا)ی لێ نووسراوە ئەچن بۆ ئەو ئيشە ئەيكەن ، ئەگەر (نا) يان بۆ هاتە دەرێ وازی لێ بێنن . ئەگەر بۆشيان بۆ هاتەدەرێ هەڵی ئەخەنەوە تا يەكێ لە (ئا) يا (نا) يان بۆ بێتە دەرێ]

ئەسپەکەم نزیکی ئـەخستمەوە تـا ئەو وەختـە گوێم لـە دەنگی پێغـەمەر بـوو ـ ﷺ ـ کە قـورئانی ئـەخوێن . پێغـەمەر ـ ﷺ ـ ئـاوڕی نەدەدایەوە . ابو بکر ـ رضي الله تعـالی عنە ـ زۆری ئـاوڕ ئەدایـەوە . هەردوو دەستی ئەسپەکەم داچوو تا هەردوو ئەژنۆی ، لەسەری کەوتمە خوارێ ، تێمەوەژەن ، هەڵسا ئەمما نزیك بوو کە دەستی نەتوانێ بیهێنێتە دەرێ ، کـە راستەوە بـوو جێی دەستی شتێکی لێ ئەهـاتـەدەرێ وەك دووکەڵ بە ئاسمانا هەڵچوو .

بە ئەزلامەکە قیسمەتی خەیرو شەڕی خۆمم تاقی کردەوە ئەوەم بۆ هاتەوە کە پێم ناخـۆش بوو . بـانگم کردنێ کـە ئەمـانم بدەن [وتم : سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جوعشومم ، لەسەرم بوەستن قسەتان بۆ ئەکەم ؛ وەڵـلاهی لە منـەوە شتێکیان بـۆ نایێ کـە پێتان نـاخۆش بێ] راوەستان تا چوومە لایان ، لەو وەختەدا کە ئەسپەکـەم دەستی داچوو لێیان پاشەکەوتم کە نەیانگەمێ ، بە دڵا هات کە ئیشی پێغەمەر ـ ﷺ ـ سەرەگرێ . عەرزم کرد : کە قەومەکەت بۆ تۆ بـە کەسێ بتکـوژێ یا ئەسیرت بکا صەدِ وشتریان بەڵێن داوە . ئەو موعامەلەی کە قـورەیش تەمایان بوو لەگەڵیانا بکەم ، هەمووم خەبەردانێ ، نانو شتو مەکم . عەرزکردن کە بیاندەمێ هیچیان لێ کەم نەکردمەوەو داوبای هیچیـان لێنەکردم ئەوە نەبێ پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمری پێ فەرمووم کە جێو شوێنیان لە خەڵق ون بکەم ، طەڵەبم لێکرد کە کاغەذی ئەمانم بۆ بنـووسێ ، ئەمری کرد بە عامیری کوڕی فوهەیرە ـ رضي الله تعالی عنە ـ لە پارچەیێ پێستی دەبـاغ کـراو بـۆی نـووسیمو [وەرم گـرتو خستمـە نـاو تیرکەشەکەمەوەو گەڕامەوە] لە پاشا پێغەمەر ـ ﷺ ـ لەگەڵ رەفیقەکانی لێیانداو تەشریفیان ڕۆیی .

ئیبن و شه‌هاب ئه‌فه‌رموێ : عورووه‌ی کوڕی زوبه‌یر - رضي الله تعالی عنه - [عورووه نه خوێ نه‌کاکی که عه‌بدوڵلاّیه - رضي الله تعالی عنه - ئاگایان له دنیا نه‌بوه] خه‌به‌ری داومێ که پێغه‌مه‌ر - ﷺ - له رێ به زوبه‌یر گه‌یی له‌گه‌ڵ چه‌ند سوارێکا له موسوڵمانان بۆ تیجاره‌ت چووبوونه شام و گه‌ڕابوونه‌وه . زوبه‌یر - رضي الله تعالی عنه - به پێغه‌مه‌ر - ﷺ - و حه‌زره‌تی ئه‌بوبه‌کر - رضي الله تعالی عنه - لیباسی سپیی دانێ پۆشییان .

[دومیاطي ئه‌ڵێ : ئه‌وی لیباسی ته‌قدیم کردن طه‌لحه بوو - رضي الله تعالی عنه - هیچ مانیع نی‌یه که له‌و رێیه هه‌ردووکیان به‌یه‌که‌وه ، یا یه‌ك له دوای یه‌ك به خزمه‌تی پێغه‌مه‌ر - ﷺ - گه‌یی بن . هه‌ردوو ریوایه‌ته‌که صه‌حیحه] .

موسوڵمانی مه‌دینه خه‌به‌ری ئه‌وه‌یان بیست که پێغه‌مه‌ر - ﷺ - له مه‌ککه‌وه ته‌شریفی ده‌رچوه . . کوللی رۆژێ به‌یانیان تا (حرّه) ئه‌چوون ئینتیظاری‌یان ئه‌کێشا تا گه‌رمای نیوه‌ڕۆ ئه‌یگێڕانه‌وه . رۆژێ له دوای ئه‌مه زۆریان چاوه‌ڕوانی کێشا گه‌ڕانه‌وه . که چوونه ماڵه‌وه جووله‌که‌یێك بۆ ته‌ماشاکردنی شتێك سه‌رکه‌وته سه‌ر قه‌لاّیێ له قه‌لاّکانی خۆیان ، چاوی که‌وت به پێغه‌مه‌ر - ﷺ - و به ئه‌صحابی له دووره‌وه سپی ئه‌چوونه‌وه ، به سیرعه‌ت ئه‌ڕۆیین ، ته‌نگی‌یان به سه‌راب هه‌ڵچنی بوو طه‌یی‌یان ئه‌کرد . به بێ ئیختیار جووله‌که‌که خۆی پێ نه‌گیررا ، به ده‌نگێکی به‌رز بانگی کرد : ئه‌ی جه‌ماعه‌تی عه‌ره‌ب موژده ! ئه‌وه مه‌طلووبه‌که‌تان و ره‌ئیسه‌که‌تان که ئینتیظاریتان بۆ ئه‌کێشا وا هات . یه‌عنی خۆشیی له خۆتان . موسوڵمانان هه‌موو به جارێ په‌لاماری سیلاحیان داو چوون به‌ره‌وپیری پێغه‌مه‌ر - ﷺ - له سه‌ر شانی حه‌ڕڕه‌وه پێغه‌مه‌ر - ﷺ - گێڕانیه‌وه به لای راستا تا دایه‌زانن له ناو به‌نی عه‌مری

بەنی عەوفا . رۆژی دووشەمەی (ربیع الاول) [یەکەمی ؟ دوەمی ؟ دوانزەهەمی ؟ سێنزەهەمی . . . اقوال] .

ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - تەشریفی راوەستا بوو خەڵق لەگەڵیانا مولاقاتی ئەکرد . پێغەمەریش - ﷺ - تەشریفی بێدەنگ دانیشتبوو ، بەعزێ لە ئەنصار - لەوانەی کە پێغەمەر - ﷺ - ەیان نەدیبو - ئەبوبەکریان بە پێغەمەر ئەزانی و تەعظیمیان ئەکردو سەلامیان لەوەکرد ، تا رۆژ هاتەسەر پێغەمەر - ﷺ - ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - تەشریفی چوو بۆ حوضووری پێغەمەر - ﷺ - ەو بە بەرماڵەکەی کۆڵی سێبەری کرد بۆ پێغەمەر - ﷺ - ئیتر خەڵق پێغەمەریان ناسی - ﷺ - .

پێغەمەر - ﷺ - دە شەوو ئەوەندە تەشریفی لە ناو بەنی عەمری بەنی عەوفا بەند بوو ئەو مزگەوتەی لە سوورەتی بەرائەتا ئەفەرموێ کە لەسەر تەقوا بیناکراوە کە مەسجیدی قوبایە . . ئەساسەکەی دامەزران و نوێژی تیا کرد . لە دواییا رۆژی جومعە تەشریفی سواربوو . وەختێ جومعەی لە بەنی سالمی بەنی عەوفا بەسەراهات تەشریفی ئەرۆیی و خەڵقیش لە خزمەتیا ئەرۆیین تا وشترەکەی لە لای ئەو جێگەیەی کە ئێستە لە مەدینەدا [لە جێی مینبەرەکەیا] مەسجیدی پێغەمەرە - ﷺ - چۆکی دادا ، ئەو رۆژانە لەوێدا خەڵقی موسوڵمان نوێژیان ئەکرد ، جێ موشتاخی خورمای سەهل و سوهەیل بو [کە کوڕی رافیعی کوڕی عەمر بوون] دوو غولامی هەتیو بوون لە ژێر حیمایەی ئەسعەدی کوڕی زەرارەدا بوون - رضي الله تعالى عنهم - پێغەمەر - ﷺ - لەو وەختەدا کە وشترەکەی چۆکی دادا فەرمووی : ئێرە (ان شاء الله) مەنزڵە . لە پاشا پێغەمەر - ﷺ - ئەو دوو کوڕەی بانگ کرد ، سەودای جێ موشتاخەکەی

لیّکـردن کە بیکـا بە مـزگەوت . عـەرزیانکـرد : هـەر بـە خـۆڕایی ئەددەینیّ ، پیّغەمەر ـ ﷺ ـ بە بیّ پارە لیّی قەبووڵ نەکردن تا لیّی کڕین و کردی بە مزگەوت .

پیّغەمەر ـ ﷺ ـ لە بیناکردنی مەسجیـدەکەدا لـەگەڵ ئـەصحابـا خشتی ئەگوازتەوەو ئەم شیعرانەی ئەخویّندەوە کە مەعنای وایە :

ئەم خشتهەڵگرتنەیە بە بار حسیّب بیّ نەك باری خورماو میّوژو مەحصوولاتی خەیبەر . ئەم خشتگوازتنەوە خیرو مەنفەعـەتی زیاتـرو بەدەوامترە ، (عند الله) تەمیزترە لە واریداتی هەمووخەیبەر .

هەم ئەیفەرموو :

خوایا ! ئەجر هـەر ئەجـری ئاخیـرەتە ڕەحم بکـە بە ئـەنصارو موهاجیرە .

پیّغەمەر ـ ﷺ ـ بەم شیعرانە [کە لە بەحـری (رجز)ن] شیعـری پیاویّکی موسولّمانی تەمثیل فەرموو . [ڕاوییەکە ظـاهیر وایـە کە ئیبن و شـەهاب بیّ] ئـەفەرمـویّ : کە نـاوی ئەو پیـاوەم بۆ نـەبراوە کـە کیّیە [قەسطەلانی ئەڵیّ : عەبدوڵلای بنی ڕەواحەیە ـ رضي الله تعالى عنه ـ] .

ئیبن و شەهاب ئـەڵیّ : بە ئیّمـە نەگـەییوە کـە پیّغەمـەر ـ ﷺ ـ بەیتیّکی بە تەواوی لە شیعر خویّندبیّتەوە غەیری ئەم بەیتە .

[ئەمیش بیّ وەزنە فەقەط ئەگەر بلّیی : (لا هُمَّ) لە باتی (اللهم) ، (فَارْحَم) بلّیی لە باتی (فَارْحم) وەزنی ئەبیّ .

قەسطەلانی ئـەفەرمـویّ : بوخـاریی ـ رحمه الله ـ ئـەم حەدیثی هیجرەتەی بە پارچە پارچە لەگەلّ جیّدا ذیکـر فەرمـوە ، بە تـەواوەتی

لێرەیدا ، یەعنی لە بەحثی فەضائیلا ، ذیکر فەرموە .

پێغـەمەر - ﷺ - لـەسەری حـەرام نـەبـوە کـە شیعـری خـەڵق بخوێنێتەوە ، شیعروتنی لەسەر حەرام بوە .

٩٢١/٤٤ انس بن مالك [رضي الله تعالى عنه] قـال : اقبل نبيُّ الله - ﷺ - الى المدينة وهو مردف أبا بكر - رضي الله تعالى عنه - وابو بكر - رضي الله تعالى عنه - شيخ يعرف [لتـردده اليهم للتجارة] ونبي الله - ﷺ - شاب لايعرف [لعدم تردده إليهم] قال : فيلقي الرجل ابا بكر ، فيقول : يا أبا بكر من هذا الرجل الذي بين يديك ؟ فيقول : هذا الرجل يهديني السبيل ؛ فيحسب الحاسب انه انما يعني الطريق ، وانما يعني سبيل الخير . فالتفت ابو بكر [رضي الله تعالى عنه] فاذا هو بفارس قد لحقهم ، فقال : يا رسول الله هذا فارس قد لحق بنـا ، فالتفت نبي الله - ﷺ - فقال : اللهم اصرعه ! فصرعه [فرسه ، ذر] ثم قامت تُحَمْحِمُ [تصوت] فقال : يا نبي الله مرني بم شئتَ ، فقال : فقف مكانك لاتتركنَّ احدا يلحق بنا . قال : فكان سراقة اول النهار جاهدا على نبي الله ، وكان آخر النهار مَسْلَحَة له [مدافعا له بالسلاح] . [الى هنا مرسل الصحابى] .

فنـزل رسول الله - ﷺ - جـانب الحرة [فـأقام بقبـاء ، وبني بها المسجـد] ثم بعث الى الانصار ، فجـاؤا الى نبي الله - ﷺ - وابي بكـر - رضي الله تعالى عنه - فسلموا عليهما ، وقالوا : اركبا آمِنَيْنِ مطاعَيْنِ ، فركب نبي الله - ﷺ - وابو بكر وحفّوا دونهما بالسلاح ، فقيل في المدينةَ : جاء نبي الله - ﷺ - فاشرفوا ينظرون ويقولون : جاء نبي الله [ﷺ] فاقبل يسير حتى نزل جانب دار ابي ايوب ، فانه ليحدث اهله اذ سمع به عبدالله بن سلام [الاسرائيلي من حلفاء بني عوف] وهو في نخل لاهله يخترف

[يجني ثمرها] فيها ، فعجل ان يضع الذي يخترف فيها ، فجاء وهي [الثمرة التي جناها] معه ، فسمع من نبي الله ـ ﷺ ـ [ان قال : ايها الناس افشوا السلام ، واطعموا الطعام ، وصلوا الارحام ، وصلُّوا بالليل والناس نيام .. تدخلوا الجنة بسلام]

ثم رجع الى اهله ، فقال نبي الله ـ ﷺ ـ : ايُّ بيوت اهلنا اقرب ؟ فقال ابو ايوب : انا يا نبي الله ، هذه داري ، وهذا بابي ، قال : فانطلق فهيِّ لنا مقيلا ، قال : قوما على بركة الله تعالى . فلما جاء نبي الله ـ ﷺ ـ [الى منزل ابي ايوب ـ رضي الله تعالى عنه ـ] جاء عبدالله بن سلام اليه ـ ﷺ ـ فقال [بعد ما سأله عن مسائل ، وسمع جوابه ـ عليه الصلاة والسلام ـ] : اشهد انك رسول الله ، وانك جِئْتَ بحقٍّ ، وقد عَلِمَتْ يهودُ اني سيدهم وابن سيدهم ، واعلمهم وابن اعلمهم ، فادْعُهُمْ ، فاسألهم عني قبل ان يعلموا اني قد اسلمت ، فانهم ان يعلموا اني قد اسلمت قالوا فيَّ ما ليس فيَّ .

فارسل نبي الله ـ ﷺ ـ فاقبلوا فدخلوا عليه ، فقال لهم رسول الله ـ ﷺ ـ : يا معشر اليهود ! ويلكم ! اتقوا الله ! فو الذي لا اله الا هو ! انكم لتعلمون اني رسول الله حقا ، واني جئتكم بحق ، فاسلموا . قالوا : ما نعلمه . قالوا للنبيّ ـ ﷺ ـ قالها ثلاث مرار . قال : فأيُّ رجل فيكم عبدالله بن سلام ؟ قالوا : ذاك سيدنا وابن سيدنا ، واعلمنا وابن اعلمنا ، قال : أفرأيتم ان اسلم ؟ قالوا : حاشالله ماكان ليسلم ! قال : أفرأيتم ان اسلم ؟ قالوا : حاشالله ما كان ليسلم ! قال : افرايتم ان اسلم قالوا : حاشالله ماكان ليسلم ! قال : يا ابن سلام اخرج عليهم ! فخرج ، فقال : يا معشر اليهود اتقوا الله ، فو الذي لا اله الا هو ! انكم لتعلمون انه رسول الله ، وانه جاء بحق ، فقالوا له : كذبت ! فاخرجهم رسول الله ـ ﷺ ـ . ح ـ ٦/ ٢١٤

**تەرجەمە :**

ئەنەسی بني ماليك ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە مەککەوە تەشریفی رووی‌کردە مەدینە [بۆ ئەوێ هیجرەتی فەرموو] ئەبوبەکریش لە خزمەتیا لە دوای ئەوەوە سواری راحیلەی خۆی بووبوو تەشریفی ئەرۆیی . ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ پیریی پێوە دیاریی دابو [بۆ تیجارەت هاتوچۆی مەدینەی کردبوو لە مەدینەدا] ئەناسرا . پێغەمەر ـ ﷺ ـ جوان بوو [پیر نەبووبوو ، سەرو ریشی مویارەکی مووی سپی تێنەکەوتبوو ، لەویش بە سێ ساڵ بە عومرتر بوو ، لەبەر ئەوە هاتوچۆی مەدینەی نەفەرموو بوو لە مەدینەدا] نەناسرابوو ، پیاو لە رێدا لەگەڵ ئەبوبەکرا ـ رضي الله تعالى عنه ـ مولاقاتی ئەکرد لێی ئەپرسی : ئەو پیاوە کە لە بەردەوەمتەیە کێیە ؟ ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەیفەرموو : ئەم پیاوە رێگەم پێ نیشان ئەدا . ظەن بەر وای ظەن ئەبرد کە رێ‌وبانی پێ نیشان ئەدا ، [بۆرۆیین] ئەویش قەصدی وا بوو کە رێی خێری پێ نیشان ئەدا . حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئاوری دایەوە کە تێفکری سوارێ [کە سوراقە بوو ، ئەعقیبی ئەکردن] پێیان گەیی ، فەرمووی : (یا رسول الله) ئەوە سوارێکە وا پێمان گەیی .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئاوری دایەوە فەرمووی : (یا اللّهم) بیخەرە خوارێ ، ئەسپەکە خستی‌یە خوارێ . [یەعنی ئەسپەکەی کەوت و ئەوی لەسەر کەوتە خوارێ] لە دواییا ئەسپەکەی هەڵسایەوەو دەنگی لێوە ئەهات . [لە دوای حەپسەو پەپسەی کە لە حەدیثەکانی پێشەوایە] وتی : (یا نبي الله) بەچی ئەمرم پێ ئەکەی بیکەم ؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : لە جێی خۆت راوەستەو مەهێڵە خەڵقمان بگاتە سەر .

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : سوراقە ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە ئەووەڵی رۆژا بە دوشمنایەتی بۆ کوشتنی یا بۆ ئەسیرکردنی پێغەمەر ـ ﷺ ـ هەوڵی ئەدا ، لە ئاخری رۆژا بوو بە سیلاحی پێغەمەر ـ ﷺ ـ و دەفعی دوشمنی لێ ئەکرد .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی لە لای حەررەدا دابەزی لە دوای ئەو [موددەیە کە لە قوبادا تەشریفی بەندبوو بینای مەسجیدی تیا کرد] ناردی بە شوێن ئەنصارا . [ئەم حەدیثە تا ئێرە مورسەلی صەحابی‌یە ؛ چونکی ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ (بالذات) ئاگای لەمانە نەبوە] ئەنصار ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفیان هاتە خدمەت پێغەمەرو ئەبوبەکر ـ ﷺ ـ سەلامیان لێ‌کردن‌و عەزریان کردن : بفەرموون بە ئەمینی‌و بە ئیطاعەکراوی سوار بن . پێغەمەر وئەبوبەکر ـ ﷺ ، ورضي عنه ـ تەشریفیان سوار بوو ، ئەنصاریش بە سیلاحەوە دەورەی پێغەمەرو ئەبوبەکر ـ ﷺ ، ورضي عنه ـ یان گرت . لە مەدینەدا خەڵق ئەیان‌وت : (نبي الله) هات ، (نبي الله) هات ـ ﷺ ـ لێی نزیك بوونەوەو تەماشایان ئەکرد . ئەیانفەرموو : (نبي الله) هات . پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی موتەوەجیهی مەدینە بوو تا لە تەنیشتماڵی ئەبوئەییووبی ئەنصاریدا ـ رضي الله تعالى عنه ـ دابەزی .

لەو وەختەدا کە قسەی لەگەڵ خزمانی خۆی ئەفەرموو عەبدوڵلای بنی سەلام خەبەری تەشریف‌هاتنی پێغەمەری بیست ـ ﷺ ـ ئەو وەختە عەبدوڵلا لە ناو باغی خورمایانا بوو ، هێشوەکانی ئەبری ، نەپەرژایە سەر ئەوە کە ئەو خورمایە بە دەستی‌یەوەیە داینێ‌و بیخاتە سەر خورماکانی تر . خورماکەی هەروا لە دەستا بوو هاتەخزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ قسەی موبارەکی پێغەمەری ـ ﷺ ـ بیست .

[ترمزی . . ئەووەڵ کەلامێ کە لێی بیست ئەوەیە کە فەرمووی : ئەی خەڵقینە سەلام بە ناو خۆتانا بڵاوکەنەوە ، ئیطعامی طەعام بکەن ، صیلەی رەحم بکەن ، بە شەو کە خەڵق لە خەوا بن ئێوە نوێژ بکەن . . تا بە سەلامەتی داخڵی بەهەشت ببن] لە دواییا عەبدوڵڵا گەڕایەوە بۆ لای ماڵ و منداڵی خۆی .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : کام خانووی خزمەکانم نزیکترە ؟ [خاڵوانی عەبدولموطەلیب کەس و کاری سەلمای دایکی کە کچی عەمرە لە بەنی نەججار] ئەبوئەییووبی ئەنصاری ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : (یا نبي الله) من لە هەموویان نزیکترم ، ئەوە خانووەکەمە ، ئەوەیش دەرگاکەمە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی . دەسا بچۆ جێیەکمان بۆ حازر کە کە ئیستراحەتی تیا بکەین . فەرمووی : (على بركة الله) تەشریفتان هەڵسێ .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە تەشریفی چوە ماڵی ئەبوئەییووب ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەبدوڵڵای بنی سەلام [دووبارە] تەشریفی هاتەخزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ [لە دوای ئەو سوئال و جوابەی لە بەینا جاریی بوو ، کە لە بەحثی موسوڵمانبوونی عەبدوڵڵادا (ان شاء الله) ذیکر ئەکرێ] فەرمووی : شەهادەت ئەدەم کە تۆ پێغەمەری خوای بە حەق هاتووی . جوولەکە ئەزانن کە من گەورەی ئەوانم ، کوڕی گەورەیانم ، عالمتری هەموویانم ، کوڕی عالمترینی ئەوانم . لە پێش ئەمەدا کە بزانن موسڵمان بووم لێیان بپرسە : کە لەناویانا چۆنم ؛ چونکی ئەگەر بزانن من موسوڵمان بووم ، دەرحەق من ئەوە ئەڵێن کە تیاما مەوجوود نەبێ ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ ناردی بە شوێنیانا ، هاتنەخزمەتی ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێی فەرموون : ئەی جەماعەتی یەهوود لە خوا بترسن ! سوێن ئەخۆم بەو

ذاتەی کە غەیری ئەو مەعبوودی بە حەق نی یە ! ئێوە ئەزانن کە من (رسول الله)م بە حەق بۆ ئێوە هاتووم موسوڵمان بىن . . وتیان : خەیر ئەوە نازانین . پێغەمەر ـ ﷺ ـ سێ دەفعە وای پێ فەرموون ، هەر سێ جارەکە وایان جوابی پێغەمەر دایەوە کە نازانین تۆ پێغەمەری خوایی و بە حەق هاتووی .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : عەبدوڵلای بنی سەلامتان لە ناوا چۆن پیاوێکە ؟ وتیان : گەورەمانەو کوری گەورەمانە ، عالمترینی ئێمەیەو کوری عالمترینمانە ـ علیه الصلاة والسلام ـ فەرمووی : ئەڵێن چی ئەگەر موسوڵمان بووبێ ؟ وتیان : (حاشا لله) قەد نابێ موسوڵمان ببێ . فەرمووی : ئەڵێن چی ئەگەر موسوڵمان بووبێ ؟ وتیان : (حاشا لله) قەد نابێ موسوڵمان ببێ . فەرمووی : ئەڵێن چی ئەگەر موسوڵمان بووبێ ؟ وتیان : (حاشالله) نابێ کە قەد موسوڵمان ببێ [سێ جار] .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەی ئیبن و سەلام وەرە دەرێ بۆیان ! عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی هاتەدەرێ ! فەرمووی : ئەی گەلەجوو ! تەقوا لە خوا بکەن ، قەسەم بەو خوایەی کە غەیری ئەو مەعبوودی بە حەق نی یە ! ئێوە ئەزانن کە ئەو رەسوولوڵلایەو بە حەق هاتوە . . وتیان : درۆ ئەکەی .. پێغەمەر ـ ﷺ ـ کردنی یە دەرێ .

بە موناسەبەی هیجرەتەوە ئەم قسەی قەسطەلانی یە ئەنووسم کە ئەساسی هیجرەتە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ هەموو مەوسیمێ خۆی لە لای قەبائیلی عەرەبا رائەنوان کە موعاوەنەتی بکەن . لە لای (عقبە) مولاقاتی لەگەڵ شەش کەسا لە خەزرەج کرد . ئەمە عەقەبەی ئوولای پێ ئەڵێن . ئەو شەش کەسە :

١ ـ ئەبوئەمامە ، ئەسعەدی کوڕی زەرارە .
٢ ـ عەوفی کوڕی حەرثی کوڕی رەفاعە کە مەشهوورە بە (ابن عفرا)ء .
٣ ـ رافیعی بنی مالیکی عەجلانی .
٤ ـ قەطبەی کوڕی عامیری ، کوڕی حەدیدة .
٥ ـ عەقەبەی کوڕی عامیری ، کوڕی نابی .
٦ ـ جابیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی رەباب .

بەعزێ لە ئەهلی عیلم لە باتی جابیر عوبادەی کوڕی صامیتیان داخڵی ئەم عەقەبەیە کردوە .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمانەی دەعوەتکردە سەر ئیسلامەتی ، ئیمانیان هێنا ، عەرزی پێغەمەریان کرد ـ ﷺ ـ : کە قەومەکەمان وا بەجێهێشت لە بەینیانا حەرب بوو ، ئەگەڕێینەوە دەعوەتیان ئەکەینە سەر ئەوە کە ئێمەت دەعوەت کردۆتە سەر ، بەڵکو خوا بە واسیطەی تۆوە کۆیان بکاتەوە . ئەگەر قسەیان یەکدیگیر بێ و تابیعی تۆ ببن هیچ کەس لە تۆ بە عیززەتتر نابێ . ئەو شەش کەسە گەڕانەوە بۆ مەدینە قەومەکەیان دەعوەتکردە سەر ئیسلامەتی ، تا ئیسلامەتی لە مەدینە بلاوبۆوە . هیچ ماڵێ لە ماڵی ئەنصارا نەما کە ناوی پێغەمەری تیا نەبێ ـ ﷺ ـ .

ساڵی دوایی لە ئەنصار دوانزە پیاو هاتنە مەککە ، پێنجیان لە شەشەکەی پێشوو بوو :

١ ـ ئەبو ئەمامە .
٢ ـ عەوفی بنی عەفراء .
٣ ـ رافیعی بنی مالیك .
٤ ـ قەطبە .
٥ ـ عەقەبە .

حەوتەکەی تر :

١ ـ مەعازی کوڕی حەرثی ، کوڕی رەفاعە . برای عەوف .

٢ ـ ذەکوانی بنی عەبدی قەیس .

٣ ـ عوبادەی بنی صامیت .

٤ ـ ئەبوعەبدوڕحمانی یەزیدی کوڕی ثەعلەبە .

٥ ـ عەباسی بنی عوبادەی بنی نەضلە . ئەمانە هەموو لە خەزرەجن .

دوانیش لە (ئەوس) :

١ ـ ئەبولهەیثەم کوڕی تیهان ، لە بەنی (عبدالاشهل) .

٢ ـ عوەیمی کوڕی ساعیدە ، لە بەنی عەمری کوڕی عەوف .

ئەم دوانزە کەسانە بەیعەتیان لە خدمەتا کرد . لە سەر بەیعـەتی ژنەکانیشیـان کە مـوسوڵمـان ببن پێغەمـەر ـ ﷺ ـ عەبـدوڵڵای کـوڕی ئومی مەکتووم و ، موصعەبی کوڕی عومەیری لەگەڵ ناردن ، تا قورئان فێری ئەوانە بکەن کە موسوڵمان بوون ، ئەوانەیشیان کە ئێشتا موسوڵمان نەبوون دەعوەتیان بکەنە سەر موسوڵمانەتی . لەسـەر دەستی موصعـەبا خەڵقێکی زۆر موسوڵمان بوو . لە بەنی (عبدالاشهل)ا ، لە پیاوو ژن ، هیچ کەس نەما کە موسوڵمان نەبێ تەنها (ئەصرەم) کـە عەمـری کوڕی ثابیتی کوڕی وەقشە . . مایەوە موسوڵمان نەبوو تا رۆژی ئوحود ، رۆژی ئوحود هاتەخدمەت پێغەمەر ، موسوڵمان بوو ، هەر ئەو رۆژە بێ ئـەمە سوجدەیێ بۆ خوا ببا شەهید کرا . ـ رضي الله عنهم ـ پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە خەبەری درایە فەرمووی : لە ئەهلی بەهەشتە !

لە دوای ئەو عەقەبەیە ساڵی دوایی لەوانەی کە موسوڵمان بوون لە ئەنصار جەماعەتێکی زۆر ئارەزووی لیقای پێغەمەریان کـرد ، لەگـەڵ کوففاری خۆیان چوونە مەککە ! وەعدەیان دا بـە پێغەمـەر ـ ـ کە لـە

ناوەڕاستی ئەییامی تەشریقا لە عەقەبە بچنە خدمەتی . لەویدا موبایەعەیان لەگەڵ کرد لەسەر ئەمە کە موحافەظەی بکەن لەوانەی کە خۆیان و ماڵ و مناڵی خۆیانی لێ موحافەظە ئەکەن . هەم خۆی و ئەصحابی ئەشریفیان بچێ بۆ مەدینە . حەزرەتی عەباس لەو وەختەدا کە ئێشتا لەسەر دینی قورەیش بوو حازری موعاهەدەیێ بوو کە لەسەر ئەهلی مەدینە تەوثیق کرابوو . ئەو شەوە بەرائی بنی مەعروور لە عەهدو پەیمانا جێگەیەکی زۆر گەورەی گرت . ئەو شەوە ئەوانەی کە موبایەعەیان لە خدمەتا کرد حەفتا پیاوو دوو ژن بوون . قسط ٦/ ٢٠٠

٤٥/ ٩٢٢ جابر بن عبدالله ـ رضي الله تعالى عنهما ـ يقول : شهد بي خالاي العقبة [الثالثة] . قال ابو عبدالله : قال ابن عيينة : احدهما البراء بن معرور [من اقارب امه ، ليس بخاله حقيقة . وخالاه الحقيقيان ثعلبة وعمرو . وشهدا العقبة الثالثة] قال جابر : انا وابي وخالي من اصحاب العقبة الثالثة . ح ـ ٦/ ٢٠١

تەرجەمە :

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : خاڵەکانم بردمیان بۆ عەقەبەی سێیەم . هەم ئەفەرموێ : من و باوکم و لە ئەصحابی عەقەبەی سێیەمین .

٤٦/ ٩٢٣ براء بن عازب ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : اول من قدم علينا مُصْعَب بن عمير ، وابن ام مكتوم . وكانا يقرئان الناس . فقدم بلال وسعد [بن ابي وقاص] وعمار بن ياسر . ثم قدم عمر بن الخطاب في

ـرين من اصحاب النبي ـ ﷺ ـ ثم قدم النبي ـ ﷺ ـ [وابو بكـر ، وعامر بن فهيرة ـ رضي الله تعالى عنهم اجمعين] فما رأيت أهل المدينة فرحوا بشئ فرحهم برسول الله ـ ﷺ ـ حتى جعل الاماء يقلن : قدم رسول الله ـ ﷺ ـ .

• [وعند الحاكم عن انس ـ رضي الله تعالى عنه ـ فخرجت جوارٍ من بني النجار يضربن بالدف وهن يقلن :

نحن جوار من بني النجار  يا حبذا محمد من جار !]

فما قدم حتى قـرأت (سبح اسم ربـك الاعلى) في سـور من المفصل .
ح ـ ٦/ ٢٢٠

تەرجەمە :

بەرای کوڕی عازیب ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ئەووەڵ کەسێ کە هاتەلامان موصعەبی کوڕی عومەیـرو ئیبنو ئومی مەکتووم بوون . قورئانیان فێری خەڵق ئەکرد ، لە دواییا بیلالو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصو عەمماری کوڕی یاسیر هاتن . لە دواییا عومەری کـوڕی خەطاب لە ناو بیست کەسا تەشریفی هات . لە دوا پێغـەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی هات [لە رەفاقەتیا صەدیقی ئەکبەرو عـامیری بنی فـوهەیـرە بوون] نەمدیبوو کە لەوەپێش ئەهلی مەدینە فەرەحناك بووبن بە شتێـك ئەوەندە کە بەپێغـەمەر ـ ﷺ ـ فـەرەحیان پێگـەیی . حەتـا جاریـەی مەدینەیی ئەیانوت : رەسوولی خوا ـ ﷺ ـ تەشریفی هات .

[حاکم لە ئەنەسەوە ریوایەت ئەکا کە کچە مەدینەیی بە دەفەوە ئەیانوت : ئێمە لە کچانی (بني النجارين) پێغەمەر ـ ﷺ ـ چە پەنایێکی گەورەو ظەریفە بۆ ئێمە !] پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی نەهات تا سوورەی

(سبح اسم ربك الأعلى) و چەند سوورەتێ لە (مفصل) م خوێن [كە لە سوورەی (حجرات) ەوەیە] .

**٤٧/ ٩٢٤ عن ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ يوم الفتح : فتح مكة : لاهجرة ولكن جهاد ونية ، واذا استنفرتم فانفروا . م ـ ٦/ ٥٦**

**وعن عائشة [رضي الله تعالى عنها] وفي اوله قالت : سئل رسول الله ـ ﷺ ـ عن الهجرة فقال . .**

**تەرجەمە :**

ئیبن و عەباس و عائیشە [رضي الله تعالى عنهم] . . . پێغەمەر ـ ﷺ ـ [سوئالی دەرحەق هیجرەت لێ کرا . عایشە] [رۆژی فەتحی مەککە . ئیبن و عەباس] فەرمووی : دوای فەتح هیجرەت نی یە ، ئەمما جیهاد هەیە ، نییەتی ئەعمالی خەیری یە بۆ ئینسان هەیە . ئەگەر حوکوومەت تەکلیفی لێ کردن لە جێی خۆتان بچنە دەرێ بۆ حەرب لەگەڵ کوففارا . . دەرچن .

[هیجرەتکردن لە مەککە لە پێش فەتحی مەککەدا بۆیە بوە کە ئەصحابی کیرام بە دەست موشریکینەوە لە ئەذاو جەفادا بوون ، کە فەتحی مەککە کرا ئەو سەبەبە نەما ، فەقەط ئەصلی هیجرەت بۆ موحافەظەی دینی خۆی لە جێیکا لەسەر دینداری ئەذیەت بدرێ . . ئەوە تا رۆژی قیامەت باقی یە . ئێستە (الحمدلله) لە هەموو بیلادی کوففارا بە ئاشکارا بە بێ ترس لە خەڵق ئیجرای موسوڵمانەتی ئەکرێ ، بۆ ئەوە فەرقی داری ئیسلام و فەرقی داری کوفر نەماوە . هیچ بیلادی کوففار نی یە کە بێ حیساب مەساجیدی تیا بینا نەکرابێ . (فلله الحمد) .

**٩٢٥/٤٨ عن جابر [رضي الله تعالى عنه] قال : جاء عبد ، فبايع النبي ـ ﷺ ـ على الهجرة ولم يَشْعُرْ انه عبد ؛ فجاء سيده يريده ؛ فقال النبي ـ ﷺ ـ : بعنيه ، فاشتراه بعبدين اسودين ، ثم لم يبايع احدا بعد حتى يسأله : أعبدٌ هو ؟ م ـ ٤٠/٧**

**تەرجەمە :**

عەبدێ هاتە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ لەسەر هیجرەت موبایەعەی لە خدمەتا کرد . پێغەمەر ـ ﷺ ـ نەیزانی کە عەبدە ، لە پاشا صاحیبەکەی هاتە خزمەت پێغەمەر داوای عەبدەکەی لێ کرد . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : پێم بفرۆشە . لێی کری بە دوو عەبدی ڕەش . لە دوای ئەوە موبایەعەی لەگەڵ کەس نەدەکرد تا لێی نەپرسیایە : کە عەبدە یان نا ؟

ظاهیر وایە ئەو عەبدەی کە موبایەعەی لە خزمەتا کردوە موسوڵمان بوە ، صاحیبەکەی کافر بوە ، ئەو عەبدانەیش کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ کردوویەتی بە ئەمەنی عەبدە موسوڵمانەکە کافر بووبن .

بەیعی عەبد بە عەبد دروست بێ بەیعی حەیوان بە حەیوان (بە طەریقی ئەولا) دروست ئەبێ .

**٩٢٦/٤٩ عطاء بن ابي رباح قال : زرت عائشة [رضي الله تعالى عنها] مع عبيد بن عمير الليثى ، فسألناها عن الهجرة ، فقالت : لا هجرة اليوم ، كان المؤمنون يفر احدهم بدينه الى الله والى رسوله ـ ﷺ ـ مخافة ان يفتن عليه . فاما اليوم فقد اظهر الله الاسلام ، واليوم يعبد ربه حيث شاء ، ولكن جهاد ونية . ح ـ ٢٠٥/٦ ح/٦/٣٨٦**

تەرجەمە :

ئەبو رەباح لەگەڵ عوبەیدی کوڕی عومەیرا ئەچنە خزمەت حەزرەتی عایشە - رضي الله تعالى عنها - لێی ئەپرسن لە هیجرەت ، فەرمووی : ئیمڕۆ هیجرەت نی یە ، موسوڵمانان لەوەپێش لەبەر دینیان فیراریان ئەکردە لای خواو رەسوولی - ﷺ - لە ترسی ئەوە لەسەر دین تووشی فیتنەیێ ببن . ئەمما ئێستە خوا ظوهووری بە ئیسلام کردوە . ئەمڕۆ ئیسلام لە هەر جێیێ ئارەزووی بێنێ عیبادەتی خوای خۆی ئەکا ، لاکین جیهاد هەیە . نییەتی ئەعمالی صالیحە هەیە موقابیلی هیجرەت .

٩٢٧/٥٠ عن ام خالد بنت خالد [بن سعيد بن العاص] قالت : قدمت من ارض الحبشة وانا جويرية ، فكساني رسول الله - ﷺ - خميصة لها اعلام ، فجعل رسول الله - ﷺ - يمسح الاعلام بيده ، ويقول : سناه ، سناه . قال الحميدي : يعني حسن ، حسن . ح - ١٩١/٦

تەرجەمە :

(ام خالد) ی کچی خالید - رضي الله تعالى عنها - فەرمووی : کچێکی مناڵ بووم لە ئەرزی حەبەشەوە هاتمەوە بۆ مەدینە ، پێغەمەر - ﷺ - لیباسێکی گوڵداری پێ پۆشیم . پێغەمەر - ﷺ - دەستی موبارەکی ئەهێنا بەسەر گوڵەکانیا ئەیفەرموو : (سنه ، سنه) یەعنی تەتەیە .

جلی گوڵدار لەبەرکردن دروستە .

٩٢٨/٥١ عن عايشة [رضي الله تعالى عنها] ان ابا بكر - رضي الله تعالى عنه - تزوج امرأة من كلب يقال لها : ام بكر . فلما هاجر ابو بكر

طلقها ؛ فتزوجها ابن عمها [ابو بكر شداد بن الاسود] هذا الشاعر الذي قال هذه القصيدة ، رثى (منكرا للبعث) كفار قريش [الذين قتلوا الى جهنم يوم البدر] :

وماذا بالقليب قليب بدر
من الشيزى [شجر تعمل منه القصاع والجفان] تزين بالسنام ؟
وماذا بالقليب قليب بدر
من القَيْنات والشَّرْب الكرام [جمع شارب النديم]
تحيي بالسلامة ام بكر
وهل لى بعد قومي [لعنهم الله] بالسلام ؟
يحدثنا الرسول [ﷺ] بان سَنُحْيا وكيف حياة اصداء وهام ؟

خ - ٢١٨/٦

**تەرجەمە :**

[عەرەبی جاهیلییەت لایان وابوە کە ئینسان مرد طەیرێ کە بە شەو ئەخوێنێ کە پێی ئەڵێن (صەدا) لە کاسەی سەری ئێتەدەرێ و ئەفرێ . یا پیاو کوژراو خوێنی نەستێنرا رۆحەکەی ئەبێ بەو طەیرەی لە کاسە سەریەوە ییتە دەرێ ، قونەقونە ئەکا بەدەوری قەبرەکەیا ، ئەڵێ : تینوومە خوێنی قاتیلەکەم بدەنێ بیخۆمەوە . کە خوێنی ستێنرا هەڵەفرێ . (من قسطلاني)]

حەزرەتی عایشە - رضي الله تعالى عنها - ئەفەرموێ : کە ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - ژنێکی لە عەشیرەتی کەلب مارەکرد ناوی (ام بکر) بوو کە هیجرەتی کرد تەڵاقی دا ، ئامۆزای ژنەکە مارەی کرد ، کە ناوی ئەبوبەکرە ، شەدادی کوری ئەسوەدە . ئەو شاعیرە کە لە (مرثیە) ی ئەو موشریکانەدا کە رۆژی بەدر رەوانەی جەهەننەم کران ئەم قەصیدەی وتوە :

ئەوە چی یە لە ناو بیری بەدرایە ؟ ئەو پیاوە گەورانە کێن کە وەك ئەو سوفرەو خوانەو کاسەو تەبەقـە زلانەن کـە بە گـۆشتی سەرپشتی وشـتر ئەرازێنرێنەوە ؟ یەعنی صاحیبی سوفرەو خوان بوون و ئێستە چاڵی بەدرە .

ئەوە چی یە کە لە بیری بەدرایە کە صاحیبی ئەو ژنە گۆرانی بێژانەو ئەو ساقییانەن کە لە مەجلیسیانا شەرابیان ئەگێراو عوودو کەمانیان بۆ لێ ئەدان ؟ ئەوانە دۆعای سەلامەتی بۆ (ام بکر) ئەکەن ، یا خۆیان چوونە جەهەننەمەوەو سەلام لە (ام بکر) ئەکەن . ئایا لە دوای قەومەکەم ئیتر من هیچ سەلام و سەلامەتیم بۆ هەیە ؟

رەسوولوڵلا ـ ﷺ ـ قسەی ئەوەمان بـۆ ئەکـا کە ئێمـە لەمـەولا زینـدوئەبینـەوە : زیندوبـوونەوەی ئـەو رۆحانـەی بوون بـە (صەدا)و (بایەقوش) و «کوننەبەبوو» چۆن مومکین ئەبێ ؟

[ئێستە لە جەهەننەما ئەم قەصیدەیان بۆ بخوێنێتەوە !]

٩٢٩/٥٢ عن سهل بن سعد [رضي الله تعالى عنه] قال : ما عدّوا التأريخ من مبعث النبيِّ ـ ﷺ ـ [لأن وقته كان مختلفا فيه بحسب دعوته للحق ، ودخول الرؤيا الصالحة فيه ، فلا يخلو من نزاع في تعيين سنته] ولا من وفاته [لما يقع في تذكره من الاسف ، والتألم على فراقه] ما عدّوا الا من مقدمه المدينة . ح ـ ٦/ ٢٢٤ .

[وانما جعلوه من اول المحرم ؛ لأن ابتداء العزم على الهجرة كان في اول المحرم ، اذ البيعة وقعت في اثناء ذي الحجة ، وهي مقدمة الهجرة ، فكان المحرم اول هلال استهل بعد العزم على الهجرة ، وكان ذلك ؛ خلافة عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ سنة سبع عشرة . واشار اليه عمر

وعثمان ، وعلي ، ـ رضي الله تعالى عنهم ـ واخذوه من قوله تعالى : ﴿لمسجد اسس على التقوى من اول يوم﴾[1] وهو اول الزمن الذي عزَّ الله فيه الاسلام ، وعبَدَ فيه النبيُّ ـ ﷺ ـ ربه آمنا . وقال عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ : الهجرة فرقت بين الحق والباطل . . . فارخوا بها وبالمحرم ؛ لانه منصرف الناس من الحج ، فاتفقوا عليه . من قسطلاني . ٢٢٥ .

تەرجەمە ؛

سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : مەبدەئی تەئریخیان لە مەبعەثی پێغەمەرەوە ـ ﷺ ـ حیساب نەکرد [چونکی خیلافی تیایە کە ئەووەڵی مەبعەث ئەو وەختەیە کە روئیای صالیحەی تیا بینیوە ، یا ئەو وەختەیە خەڵقی دەعوەت کردوە بۆ ڕێی حەق] لە وەفتی وەفاتیەوەیش حیسابیان نەکردوە ؛ [چونکە ئەیهێنێتەوە فکری ئینسانو حوزنی بۆ پێیێو تازەی ئەکاتەوە] ئەوەیان کردوە بە مەبدەئی تەئریخ کە تەشریفی گەییوەتە مەدینە [لە زەمانی ئیمامی عومەرا ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە ساڵی حەڤدەی هیجرەتا بە ئیشارەتی ئەوو عوثمانو عەلی ئەصحابی کیرام ـ رضي الله تعالى عنهم ـ کۆبوونەوە بەعزێکیان مەبعەثیان بە موناسب زانی . بەعزێکیان هیجرەتیان بە موناسب زانی . . ئیمامی فارووق ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : هیجرەت تەفریقی حەقی لە باطیل کردوە . ئەویان کرد بە مەبدەء .

لە موحەرەمەوە حسێبیان کرد ؛ چونکی حاجییان لەو وەختەدا گەڕانەوە لە حەجو ئیتتیفاقیان لەسەر کردوە . هەم چونکی بەیعەتی

(١) بڕوانە : سوورەتی بەرائەت ، ئایەتی : ١٠٨

عەقەبەی دوایی لە ناوەڕاستی (ذی الحجة)دا بوو . ئەووەڵ هیلالی دوای ئەو مانگی موحەڕەمە . هەم بینای مەسجیدی قوباء کە لەسەر تەقوا بینا کراوە لە ئەووەڵ ڕۆژێکا بوە خوا ئیسلامی تیا عەزیزو بەقووەت کردوە . ئەو ڕۆژەیە کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ گەییوەتە قوبا . لەو ئایەتەیان (استنباط) کردوە کە ئەفەرموێ لە سوورەی بەرائەتا . ﴿لمسجد اسس على التقوى من اول يوم﴾ ئەووەڵ ڕۆژ ڕۆژی مواصەلەتە بە مەدینە کە لە (ربیع الاول)ا بوە . فەقەط (مقدمه)ی ئەو ڕۆژە ئاخری عەقەبەیە کە لە (ذی الحجة)دا بوە ناوەڕاستی مانگ نابێ بە تەئریخ . ئەووەڵی مانگی دوایی یان کردوە بە مەبدەئی تەئریخ .

# مناقب عمر
## - رضي الله تعالى عنه -

٥٣/ ٩٣٠ عن جابر بن عبدالله - رضي الله تعالى عنهما - قال : قال النبيُّ - ﷺ - رأيتني دخلت الجنة ، فاذا انا بالرُّمَيْصاء [سهلة بنت ملحان] امرأة ابي طلحة [رضي الله تعالى عنهما] وسمعتُ خَشْفَة ، فقلت : من هذا ؟ فقال : هذا بلال . ورأيت قصرا بفنائه جارية ، فقلتُ : لمن هذا ؟ فقال : لعمر . فاردتُ ان ادخله فَأَنظُرَ اليه فذكرتُ غَيْرَتك ! فقال عمرُ [رضي الله تعالى عنه] : بابي وامي يا رسول الله اعليك اغارُ ؟ !
ح - ٦/٩٥ م - ٩/٤٨٤ ن بدون رميصاء ، وبلال .

٥٤/ ٩٣١ وعن ابي هريرة - رضي الله تعالى عنه - نحوه ، قال : بينا نحن عند رسول الله - ﷺ - اذ قال : بينا انا نائم رأيتني في الجنة فإذا امرأة تتوضأ الى جانب قصر ، فقلت : لمن هذا القصر ؟ فقالوا : لعمر . فذكرتُ غَيْرته ، فوليت مدبرا ! فبكى عمر ، وقال : اعليك اغار يا رسول الله ؟ ! ح - ٦/٩٥ ، م - ٩/٢٨٥

تەرجەمە :

جابيرى كوڕى عەبدوڵلا - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - فەرمووى : لە خەوما خۆم وا چاو پێكەوت كە چوومە بەهەشتەوە . تێفكريم (رميصا)ى ژنى (ابو طلحە)م دى ، دايكى ئەنەسى بنى ماليك ، خشپەخشپێكم بيست ، پرسيم : ئەمە كێيە ؟ فەرمووى : ئەوە بيلالە . قەصرێكم دى ، لە لاى ئەو قەصرەوە

جاریەییکی لێ بوو ، وتم : ئەم قەصرە قەصری کێیە ؟ ئەو مەلائیکەی لێم پرسی فەرمووی : قەصری عومەرە . تەمام بوو بچمە ناوی تەماشای بکەم ، غیرەتی تۆم فکرکەوتەوە رووم وەرگێراو رۆییم ! ئیمامی عومەر - رضي الله تعالى عنه - گریا فەرمووی : (یا رسول الله) باوكو دایکم بە فیدات بێ ! بۆ تۆ غیرەتم ببزوێتەوە ؟ ! لە حەدیثەکەی ترا ئەفەرموێ : ئەو جاریەیە دەزنوێژی ئەشت .

لەم حەدیثەدا فەضلی (ام سليم)و بیلالیشی تیایە - رضي الله تعالى عنهما - .

**٩٣٢/٥٥ عن سعد بن ابي وقاص [رضي الله تعالى عنه] قال : استأذن عمر بن الخطاب [رضي الله تعالى عنه] على رسول الله - ﷺ - وعنده نسوة من قريش يكلمنه ويستكثرنه ، عالية اصواتهن على صوته [قبل النهي عن رفع الصوت] ، فلما استأذن عمر بن الخطاب [رضي الله تعالى عنه] قمن فبادرن الحجاب . فأذن له رسول الله - ﷺ - فدخل عمر [رضي الله تعالى عنه] ورسول الله - ﷺ - يضحك . فقال عمر : أضحك الله سنك يا رسول الله ! فقال النبيُّ - ﷺ - عجبت من هؤلاء اللاتي كُنَّ عندي ، فلما سمعن صوتك إبتدرن الحجاب ! فقال عمر : فانت احق ان يهبن يا رسول الله . ثم قال عمر : يا عدوات انفسهنَّ اتهبنني ولا تهبن رسول الله - ﷺ - ؟ ! فقلن : نعم انت افظ واغلظ من رسول الله - ﷺ - . فقال له - ﷺ - إيهاً يا ابن الخطاب والذي نفسي بيده ! ما لقيك الشيطان سالكا فجاً قطُ الا سلك فجاً غير فجّك . ح - ٩٧/٦ ، م - ٢٨٥/٩**

**تەرجەمە :**

سەعدی بنی ئەبی وەقاص - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : عومەری بنی خەطاب - رضي الله تعالى عنه - ئیذنی خواست بۆ

حوضووری پێغەمەر ـ ﷺ ـ چەند ژنە قورەیشییێکی لە خدمەتا بوو لە ئەزواجی طاهیرات ، لە خوصووصی نەفەقەوە کە بۆیان زیاد بکا ، بەدەنگی بەرزتر بەسەر دەنگی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ لە خدمەتیا قسەیان ئەکرد ، کە ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئیستیذانی کرد لە ترسانا هەموو رایان کردە پشت پەردەکەوە ! پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئیذنی دا ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی چوە ژوورێو پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێئەکەنی .

ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : (یا رسول الله) خودا هەر ددانت بێنێتە پێکەنین [یەعنی هەر مەسروورت بکا ، بە چی پێئەکەنی ؟] فەرمووی : عەجائیبم لەم ژنانە ما کە لە لام بوونو بە دەنگی بەرز قسەیان ئەکرد ، کە دەنگی تۆیان بیست هەرایان کردە پشت پەردەکەوە [لە هەیبەتی تۆ] . ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : (یا رسول الله) تۆ لە من موستەحەقتری کە هەیبەتت لێ بکەن . لە دواییا عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئەی ئەوانەی کە دوشمنی خۆیانن ! ئێوە لە من ئەترسنو لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ناترسن ؟ ! جوابیان دایەوە فەرموویان : تۆ لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ توندترو بەشیددەتتری [یەعنی ئەو حیلمی هەیەو بە شیددەتو حیددەت موقابەلە ناکا ، تۆ وا نیت] پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەی (ابن الخطاب) قەسەم بەوەی کە نەفسی من لە دەستی قودرەتیایە ! هیچ وەقتێ نییە کە لە رێگەیێکا شەیطانت تووش ببێ کە تۆی پیا ئەڕۆی شەیطان لە ترسی تۆ لەو رێگەیە لائەداتو بە رێییێکی ترا ئەڕوا !

لەم حەدیثەدا صەراحەت هەیە لەسەر عیصمەتی کاملەی حەزرەتی فاروق ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە موخالەفەی ئەمری خوا لەو

رۆژەی کە خوا ـ عز وجل ـ هیدایەتی داوە تا رۆژی شەهادەتی بە قەد ذەڕڕەیێ ئیشێکی لێ صادیر نەبوە کە دڵی شەیطانی پێ خۆش بێ . هەرچی ئەو بە رەئی و ئیجتیهاد کردبێتی حوکمی خوایەو (واجب الاتباع)ە ، وەك ئەوامیرو نەواهي (سنیە)ی حەزرەتی ریسالەتپەناهی ـ علیه الصلاة والسلام ، ورضي عنه ـ .

**٥٦/٩٣٣ قال عبدالله بن مسعود ـ رضي الله تعالى عنه ـ : ما زلنا اعزّةً منذ اسلم عمر [رضي الله تعالى عنه ـ بعد حمزة ـ رضي الله تعالى عنه ـ بثلاثة ايام] . ح ـ ٩٨/٦**

**تەرجەمە :**

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لەو رۆژەوە کە ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ موسوڵمان بوە هەر عەزیزو غالیب بووین [یەعنی هیچ ذیللەتمان بەسەرا نەهاتوە ، سێ رۆژ لە دوای ئیمامی حەمزە ـ رضي الله تعالى عنه ـ موسوڵمان بوە] .

[ترمزیی لە ئیبنو عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ بە ئیسنادێکی صەحیح رایوایەت ئەکا کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ دوعای فەرموو : «اللهم اعز الاسلام باحب الرجلين اليك بابي جهل ، اوبعمر . قال فكان احبُّهما اليه عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ»

خوایا ئیسلام عەزیز بکەی بە خۆشەویسترینی ئەو دوو پیاوە لە خلمەتی تۆدا ، کە یا بە ئەبوجەهل و یا بە عومەر . ئیبنو عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : خۆشەویستریان حەزرەتی عومەر بوو ـ رضي الله تعالى عنه ـ .

ئیبنوشەیبە لە حەدیثی ئیبنو مەسعودەوە ریوایەت ئەکا کە فەرموویەتی : ئیسلامی عومەر عیززەت بوە بۆ ئیسلامەتی ، هیجرەتی

نەصرەت بو بۆ موسوڵمانان ، ئەميرێتی رەحمەت بوو . وەڵڵاهی نەمان ئەتوانی لە دەوری بەیت نوێژ بکەین بە ئاشکارا تا حەزرەتی عومەر موسوڵمان بوو .

ئیبن وسەعد لە حەدیثی صوهەیب ریوایەت ئەکا کە فەرموویەتی : لەو وەختەدا کە ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ موسوڵمان بوو موشریکەکان وتیان : (انتصف القوم منا . قسطلاني . ٦ ـ ٩٨ . وفيه : حديث سبق في مناقب ابي بكر : دخلت ، خرجت ، فعلت ، انا وابو بكر وعمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ .)

**٩٣٤/٥٧ عبدالله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] قال : بينما هو في الدار خائفا ، اذ جاء العاص بن وائل السهمي ابو عمرو عليه حلة حِبَرَةٍ وقميص مكفوف [مخيط] بحرير وهو من بني سهم ، وهم حلفاؤنا في الجاهلية ، فقال له : ما بالك ؟ قال : زعم قومك انهم سيقتلونني ان اسلمت ، قال : لا سبيل اليك ، بعد ان قالها اَمِنتُ ، فخرج العاص ، فلقي الناس قد سال بهم الوادي . فقال : اين تريدون ؟ فقالوا : نريد هذا ابن الخطاب الذي صبا . قال : لا سبيل اليه . فكرَّ الناسُ . ح ـ ٦/١٨٤**

**٩٣٥/٥٨ وعنه : لما اسلم عمر ـ رضي الله تعالى عنه ـ اجتمع الناس عند داره وقالوا : صبأ عمر ، وانا غلام فوق ظهر بيتي ، فجاء رجل عليه قباء من ديباج . فقال : قد صبأ عمر ، فما ذاك ؟ فانا له جار . قال : فرأيت الناس تصدعوا عنه . فقلت : من هذا الرجل ؟ [قالوا . نسخة] فقال : العاص بن وائل . ح ـ ٦/١٨٤**

**تەرجەمە :**

١ ـ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی : لە

وەختێکا ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ بە ترسەوە لە ماڵەوە بوو عاصی بنی وائیلی سەهمیی هات دەستێ لیباسی (حبرە)ی ئاورێشمی لەبەرا ، کراسێکی بە ئاوریشم دووراوی لەبەرا بوو ، عاص لە عەشیرەتی بەنی سەهمە ، سوێنخواری ئێمە بوون لە زەمانی جاهیلییەتا . عاص پێی وت : لە چ حاڵێکای ؟ فەرمووی : قەومەکەت لایان وایە کە ئەمکوژن ؛ چونکی موسوڵمان بووم . عاص وتی : رێیان نی یە بۆ لای تۆ [یەعنی من نایێڵم بێنە سەرت] عومەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : کە عاص وای وت ئەمین بووم و ترسم نەما [چونکی عاص پیاوێکی موطاع بوو] .

عاص چوەدەرێ بە خەڵق گەیی لێشاویان وادیی مەککەی پڕ کردبوو ، لێی پرسین : بۆ کوێ ئەچن ؟ وتیان : تەمامانە بچین بۆ سەر عومەری خەطاب لە دین وەرگەڕاوە . وتی : رێتان نی یە بۆ لای ئەو . خەڵقەکە بە جارێ گەڕانەوە .

٢ ـ عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەفەرموێ : کە عومەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ موسوڵمان بوو خەڵق لەبەر ماڵەکەیا کۆبوونەوە ، وتیان : عومەر لەدین وەرگەڕاوە . منیش مناڵ بووم لەسەر بانی ماڵی خۆمان بووم ، پیاوێ هات کەوایێکی دیباجی لەبەرا بوو ، وتی : عومەر لەدین وەرگەڕاوە چی بوە ؟ من موحافیظی ئەوم . خەڵقەکەم چاو پێکەوت کە هەموو بڵاوەیان لێکرد . پرسیم ئەمە کێیە ؟ باوکم ، یا خەڵقی تر ، وتیان : ئەوە عاصی کوری وائیلە .

**٥٩/٩٣٦ اسلم [مولی عمر ـ رضي الله تعالی عنه ـ] قال . سألني ابن**

عمر [رضي الله تعالى عنه] عن بعض شأنه يعني عمر [رضي الله تعالى عنه] فاخبرته ، فقال : ما رأيتُ احدا قط بعد رسول الله ـ ﷺ ـ من حين قبض [عليه الصلاة والسلام] كان اجدَّ واجود حتى انتهى [الى آخر عمره] من عمر بن الخطاب [رضي الله تعالى عنه] ح ـ ٦/٩٩

تەرجەمە :

ئەسلەم ئەڵێ : عەبدوڵلای کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ بەعزێ ئەحواڵی حەزرەتی عومەری لێپرسیم خەبەرم دایە . عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : دوای وەفاتی پێغەمەر ـ ﷺ ـ لەو وەختەوە تا نیهایەتی عومری عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ کەسم نەدیوە لە پاش پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە لە عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ جیددی ترو سەخی تر بووبێ .

٦٠/٩٣٧ عن ابي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال رسول الله ـ ﷺ ـ : لقد كان فيما قبلكم من الامم محدَّثون [ملهمون] فان يكن في أمتي احد فانه عمر .

زاد زكريا بن ابي زائدة عن سعد . عن ابي سلمة ، عن ابي هريرة ـ رضي الله تعالى عنه . قال : قال النبيُّ ـ ﷺ ـ : لقد كان فيمن كان قبلكم من بني اسرائيل رجال يُكَلَّمون [تكلمهم الملائكة] من غير ان يكونوا انبياء ، فان يكن من امتي منهم أحد فعمر .

قال ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ : من نبي ولا محدث [وصله ابن عيينه ، وعبد بن حميد ، بلفظ : كان ابن عباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ يقرأ : «وما ارسلنا من قبلك من : رسول ولا نبي»[1] ، ولا محدَّثٍ] ح ـ ٦/٩٩

---

(١) بڕوانە : سوورەتی حەج ، ئایەتی : (٥٢)

**تەرجەمە :**

ئەبوهورەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : لە ئوممەتی پێش ئێوەدا لە بەنی ئیسرائیل چەند پیاوێ بوو وا کە مەلائیکە قسەیان لەگەڵ کردوون و ئیلهامیان کراوەتە سەر ، بێ ئەمە کە پێغەمەر بن . ئەگەر لە ئوممەتی منا یەکێ لەوانە بێ ئەوە عومەرە .

ئیبن و عەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لەو ئایەتی سوورەتی (حەج)ە دا کە مەعنای وایە : ئەی محەمەد لە پێش تۆوە نە هیچ رەسوولێ ، نە هیچ نەبییێ ، نەهیچ (محدث) یێکمان نەناردوە کە شەیطان قسەییێکی خۆی تێکەڵ بەو ئایەتە نەکردبێ کە بۆی وەحی کراوە ، ئەو وەختە کە شەیطان وای کرد خوا ئەوە مەحو ئەکاتەوە کە شەیطان لە ئەثنای وەحیەکەدا وتوویەتی ، تا خەڵق بە وەحی بزانن ، ئایەتەکە تەثبیت ئەکا کە خەڵق لێیان نەپەشۆکێ . وەك لە سوورەی (والنجم)دا پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە گەیی یە سەر (ومناة الثالثة الاخرى) شەیطان لەو بەینەدا ئەوەی تێکەڵ کرد وتی : ئەو بتە گەورانە شەفاعەتیان لە لای خوا رجا ئەکرێ ، موشریك بەوە دڵخۆش بوون ، حەتا لە ئاخری سوورەتەکەدا لەگەڵ پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە سەجدەی برد ئەوانیش هەموو سەجدەیان برد . لە دواییا حەزرەتی جیبریل ـ علیه السلام ـ خەبەری دا بە پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە شەیطان ئیشێکی وای کرد . پێغەمەر ـ ﷺ ـ بەوە زۆر مەحزوون بوو ، خوا بەم ئایەتی سوورەتی حەجە تەسەللی پێغەمەری دا ـ علیه الصلاة والسلام ـ

فەقەط بەیضاوی بەم مەعنایە رازی نی یە ، حەقیش وایە کە پێی رازی نەبێ ؛ چونکە ئەگەر شەیطان بتوانێ حیلەییێکی وا لە وەحیا بکا ئیعتیماد بە ئایاتی قورئان نامێنێ .

مەعنای صەحیحی ئەمەیە کە بەیضاوی لێی ئەداتەوە : کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئارەزووی شتێکی بوو کە بیکا شەیطان بێت چەند ئارەزووی تری دنیایی بێنێ بە دلا ، خوا ئارەزووی دنیایی یەکەی لە دڵ ئەکاتە دەرێو ئەباتی لەسەر ناکاو ، ئەو ئایەتانەی کە داعین بۆ ئەوە کە ئیشتیغالی بێ بە ئاخیرەتەوە ئەچەسپێنێتە دڵی . مەسئەلەی غەرانیق(١) درۆیە واقیع نەبوە .

ئیبن و عەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لە قیرائەتی خویا (محدثون)ی لێ زیاد کردوە .

ئەم حەدیثە لە طەرەف پێغەمەرەوە ـ ﷺ ـ شەهادەتی تیایە کە قسەو ئیجتیهادی حەزرەتی فاروقی ئەکبەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ هەمووی بە ئیلهامە . خەطای تیا نی یە ، (واجب الاتباع)ە ، بە تەنها ئەبێ بە حوججەت . چۆن نابێ بە حوججەت لە چواردە جێی قورئانا رەئیی موافەقەتی قورئانی کردوە ؟

**٩٣٨/٦١ عبدالله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] قال : ما سمعت عمر [رضي الله تعالى عنه] لشيئ قط يقول : إني لأظنه كذا الا كان كما يظن . بينما عمر [رضي الله تعالى عنه] جالس اذ مرَّ به رجل جميل ، فقال عمر : لقد اخطأ ظني ، او إن هذا على دينه في الجاهلية او لقد كان كاهنهم ، عليَّ الرجل [سواد بن قارب] فَدُعِيَ له ، فقال له ذلك . فقال [سواد] : ما رأيت كاليوم استُقْبلَ به رجل مسلم . قال : فاني اعزم عليك الا ما اخبرتني ! قال : كنت كاهنهم . قال : فما اعجب ما جائتك**

(١) مەبەست لە (غەرانیق) ئەوەیە گوایە کە پێغەمەر ـ د ـ ئایەتی «ومناة الثالثة الأخرى»ی خوێندۆتەوە (تلك الغرانيق العلى وإن شفاعتهن لترتجى)ی بەدەمدا هاتوە ، تا دوایی جیبریل ـ د ـ ئاگاداری کردۆتەوە .

به جنيتك ؟ ! قال : بينما انا يوما في السوق جائتني اعرف فيها الفزع . فقالت : الم تر الجن وابلاسها [خوفها] ويأسها من بعد إنكاسها ولحوقها بالقلاص واحلاسها [غير موذون . وروي : ورحلها العيس باحلاسها] .

قال عمر [رضي الله تعالى عنه] : صدق . بينما انا عند آلهتهم اذ جاء رجل بعجل فذبحه ، فصرخ به صارخ لم اسمع صارخا قط اشد صوتا منه ، يقول : يا جليح [أي وقح المكافيح والمكاشف] امر نجيح [من النجاح الظفر بالبغية] [رجل فصيح يقول : لا اله الا انت [الله] فوثب القوم ، قلت : لا ابرح حتى اعلم ما وراء هذا . ثم نادى : يا جليح امر نجيح رجل فصيح يقول : لا اله الا الله ، فقمت ، فما نَشِبْنا [لبثنا] اَن قيل : هذا نبي . ح ـ ٦/١٨٥

تەرجەمە :

عەبدوڵلای کوڕی ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەڵێ : قەط نەمبیستوە لە عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ دەرحەق شتێ کە فەرمووبێتی : ظەننم وایە کە وایە . . ئیللا ئەو شتە ئەبێ وەك ظەننەکەی ئەو بووبێ . وەختێ تەشریفی دانیشتبوو پیاوێکی جوان بە لایا رابورد . فەرموی : ظەننم بە خەطا چوە[1] دەرحەقی کە وتوومە سەوادی کوڕی قاریب لەسەر دینی جاهیلییەتی ماوە یا کاهینی قەومەکەی خۆی بوە . ئا بۆم بانگ‌کەن ! بۆیان بانگ‌کرد ، خەبەری ئەوەی دایێ کە لە پاش‌ملەی فەرمووبووی ، سەواد وتی : قەط شتی وام نەدیوە وەك ئیمرۆ کە لە بەرەوڕووی پیاوێکی موسوڵمانا بیڵێن ! عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ

(١) لێرەدا وا جوانترە کە بنووسرێ : «یا من بەهەڵەدا چووم یا سەوادی کوڕی قاریب لەسەر دینی جاهیلیەتی ماوە ، یا . . .»

فەرمووی : ئەمرت پێ ئەکەم هەر ئەبێ خەبەرم بدەیتێ . فەرمووی : کاهینیان بووم . عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : عەجایبترینی ئەوانەی کە جنی یەکەت بۆی هێناوی چی یە ؟ سەواد ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : رۆژێ لە بازارا بووم هاتە لام ، عەلامەتی ترسی پێوە دیار بوو وتی :

نابینی جینن و ترسی ؟
سەرنگوونی و مەئیووسی ؟
سواری وشترو پەلاسی
[بۆ هیدایەت ئەگەڕێ
بۆ مەککە کەوتۆتە ڕێ
نین هیچ موسوڵمانیان
وەکوو گاورەکانیان
خێرا هەڵسە تۆیش بچۆ
لە بتپەرستی ی لاچۆ
لای صەفوەتی هاشمی
چاو بیرە سەرو دەمی]

[سەواد ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : منی خەبەردار کردو ترسانمی پێی وتم : ئەی سەواد خوا ـ عز شأنه ـ پێغـەمەرێکی نـاردوە هەڵسە بچۆرە خزمەتی ، مەسعوود ئەبی و لـەسەر ڕێی ڕاست ئـەبی .
شەوی دواییش هات لە خەو خەبەری کردمەوە وتی :

عەجایب مام لە جنی
لە ئیش و شوێنکەوتنی

جل له وشترکردنی
ریگەی مەککەی گرتوه
شوێن هیدایەت کەوتوه
له پێش وەك له پاش نی‌یه
دواکەوتووی دین باش نی‌یه
سا هەڵسه برۆ زووکه
هاشمی‌ی ئارەزووکه
چاویشت بەرزکەرەوه
بۆ لای ئەو سەروەرەوه

شەوی سێیەم هات خەبەری کردمەوه وتی :

عەجائیب مام له جنی
له نەفیر عام کردنی
کورتانی دا له وشتر
دەس‌خا هیدایەت زووتر
پیاوخراپ وەك چاك نی‌یه
پیاوی چاك هیلاك نی‌یه
هەڵسه بۆ لای خوڵاصەی
هاشم بۆنکه هەناسەی
موئمینەکانیان پاکن
کوففاریان غەمناکن

سەواد ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەڵێ : موسوڵمانەتی کەوتە دڵەوه ، چوومە مەدینه ، کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : مەرحەبا ئەی سەوادی کوڕی قاریب ، ئەزانم چی تۆی هێناوه . سەواد عەرزی‌کرد : شیعرم

وتوه لێم ببیه . سه‌واد فه‌رمووی : وتم :

اتاني رأيي بعد ليل وهجعة
ولم اك فيما قد بليت بكاذب
ثلاث ليال قوله كل ليلة :
اتاك نبي من لؤي بن غالب
فشمرت عن ساقي الازار ووسطت
بي الذعلب الوجناء عند السباسب
فأشهد ان الله لا رب غيره
وانك مأمون على كل غائب
وانك ادنى المرسلين شفاعة
الى الله يا ابن الأكرمين الأطايب
فمرنا بما يأتيك ، يا خير مرسل
وان كان فيما جاء شيب الذوائب
فكن لي شفيعا يوم لا ذو شفاعة
سواك بمغنٍ عن (سواد بن قارب)

پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ پێكه‌نی تا ددانی خرێی ده‌ركه‌وت (دلائل بيهقى) .

سەروەرم ! من شیعرەکانی ترم تەرجەمە کرد ، بە خراپم نەزانی کە تەرجەمەی ئەکەم ؛ چونکی شیعری جنۆکەیە . فەقەط ئەم شیعرانەی دوایی چونکە مەدیحەیە ئومێدم وایە کە خۆت یا مەلا سەلام بە نەظم تەرجەمەی کەن . جێم بۆ هێشتوویتەوە . السلام علیکم][1] .

ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : سەواد راست ئەکا ، لە وەختێکا من لای بتەکانیان بووم پیاوێ گوێرەکەیێکی هێنا سەری بڕی ، [ظاهیر وایە بۆ بتەکان] بانگکەرێ بەسەر ئەو پیاوەیا نەڕان ، قەد نەڕەی وا دەنگ بەشیددەتم نەبیستبوو . ئەیوت [یەعنی بەو پیاوە] . ئەی بێ حەیای ، بێ ئابڕووی کە بە ئاشکارا دوشمنایەتی ئەکەی ! شتێکی وا ظوهووری کردوە کە بەو شتە ئینسان ظەفەر بە مەقصوود ئەبا ، پیاوێکی فەصیح ئەفەرموێ : (لا الـه الا الله) ئەو قەومەی کە لەوێدا حازر بوون لە جێی خۆیان ڕاپەڕین . حەزرەتی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : لێرە نابزووم تا بزانم دوایی یەکەی چۆن ئەبێ ؟ لە دوای ئەوە بانگی کرد وتی : ئەی بێحەیای ، بێئابڕوو شتێك ظوهووری کردوە کە بەو شتە ظەفەر بە مەقصوود ئەبرێ . ئەفەرموێ : (لا اله الا الله) ئیتر هەڵسام زۆری پێ نەچوو وتیان : ئەوە پێغەمەرە ظوهووری کردوە .

[ئەبونەعیم لە (دلائل النبوة) یا ئەفەرموێ : ئەبوجەهل صەد وشتری وەعد دا بەوەی کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ بکوژێ . عومەر ـ رضي الله

---

(١) ئەم قسەی لەگەڵ خوالێ خۆش بوو مامۆستا مەلا حسەینی هاورێی گیانی یەتی . بەڵام نە مامۆستا خۆیی و نە مامۆستا مەلاسەلام شیعرەکانیان تەرجەمە نەکردوە .

تعالى عنه ـ فەرمووی : بە ئەبوجەهلم وت : ئەی (ابو الحكم) ضامنی یەتی یەکەت کە صەد وشترت وەعدە داوە بەوەی پێغەمەر ـ ﷺ ـ بکوژێ راستە یا نا ؟ وتی : بەڵێ وەعدەم داوەو بووم بە ضامن .

ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : شیرەکەم بەست ، چووم قەصدی پێغەمەرم کرد ـ ﷺ ـ بە لای گوێرەکەیێکا رابوردم ، تەمایان = بوو = سەری برن ، راوەستام سەیرم ئەکردن ، کەچی هاوارکەرێ هاواری ئەکرد لە ناو گوێرەکەکەوە ئەیوت : ئەی ئالی (ذریح) شتێکی خەلاصکار ظوهووری کردوە ، پیاوێ بە زمانێکی فەصیح بانگ ئەکا ، لە دڵی خۆما وتم : لەم ئیشەدا من نەبم هیچ مەقصوودێکی تر نی یە . چوومە لای خوشکەکەم ، سەعیدی کوڕی زەیدی لە لا بوو . (الى آخر القصة في اسلامه) قسط ٦ ـ ١٨٦ .

ئەسلەم ئەڵێ : عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ پێی فەرمووین : حەزەکەن ئیسلامەتی خۆمتان بۆ بەیان بکەم کە چۆن موسوڵمان بووم ؟ وتمان : بەڵێ . فەرمووی : دوشمنی خوێنینی پێغەمەر بووم ـ ﷺ ـ . رۆژێکی گەرما نەعیمی کوڕی عەبدوڵڵای نەممام تووش بوو ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەویش موسوڵمان بوو ، ئیسلامەتی یەکەی خۆی ئەشاردەوە ، پێی وتم : ئەی (ابن الخطاب) بۆ کوێ ئەچیت ؟ تۆ لای خۆت ئەڵێی : من وامەو ، وامە . یەعنی لەسەر دینی قورەیش ثابیتی و ئەڵێی : هەرکەسێ موسوڵمان بێ وای لێ ئەکەم و وای لێ ئەکەم ! وا ئەم موسوڵمانەتیە کەوتۆتە ماڵی ئێوەوە ، خوشکەکەت لە دینی خۆی وەرگەڕاوەو موسوڵمان بوە !

به غەضەبەوە گەڕامەوە ماڵەوە ، چوومە لای خوشکەکەم ، پێم‌وت : ئەی دوشمنی نەفسی خۆی . بیستوومە کە لە دین وەرگەڕاوی ؟ شتێکم بە دەستەوە بوو هەڵم‌ئەبری‌و بەوە لێم ئەدا ، خوێنی پیا هاتەخواریّ‌و گریا . لە دواییا وتی : ئەی (ابن الخطاب) چیت لە دەست یێ بیکە موسوڵمان بووم ! تێفکریم کتێبێ لە گۆشەیێکی هۆدەکەدا بوو پێم‌وت : ئەوەم بدەرێ . وتی : نادەمێ تۆ ئەهلی ئەوە نیت ، لە جەنابەت غوسڵ ناکەی ، خۆت پاك ڕاناگری ، ئەم کتێبەیش ئینسانی پاك نەبێ کەس دەستی لێ نادا !

هەر وازم لێ نەهێنا تا دایە دەستم تێفکریم (بسم الله الرحمن الرحیم)ی تیا بوو ، کە گەییمە (الرحمن الرحیم) ترسم لێ نیشت‌و ڕقم هەڵساو ، لە دواییدا هاتمەوە سەر خۆو هەڵم‌گرت ، ئەوەی تیا بوو ﴿سبح لله ما في السماوت والارض وهو العزیز الحکیم﴾[1] هەرچی لە ئەرزو ئاسمانایە هەموو بە زمانی حاڵ یا بە زمانی (قال) تەسبیحاتی خوا ئەکەن ، هەرخوایە غاڵب بێ ، بە = سەر = هەرچییێکا کە ئیرادەی بکاو ، هەرچی ئەکا هەمووی موافیقی حیکمەتە ، پێش‌و پاش‌و نەتیجەکەی ئەزانێ‌و (مطلع)ە بەسەریا . کە بە لای هەر ئیسمێ لە (اسماء الله)دا ڕائەبوردم ڕقم هەڵەستا ، دووبارە شوعوورم ئەهاتەوە بە بەرا ، تا گەییمە ﴿آمنوا بالله ورسوله . . . =(تا)= ان کنتم مؤمنین﴾[1] ئەو وەختە وتم : (اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله) ئەوانە کە خۆیان لەوێدا شاردبۆوە ، هەموو هاتنەدەرێ‌و لە خۆشییانا دەستیان کرد بە تەکبیرکێشان .

(١) بڕوانە : سورەتی (حەدید) ئایەتەکانی (١ ـ ٧)

که چوومه خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ بەرۆکی کراسەکەی گرتم‌و ڕایکێشام بۆ لای خۆی ، فەرمووی : ئەی (ابن الخطاب) موسوڵمان ببە ! خوایا هیدایەتی بدە ! وتم : (اشهد ان الا اله الا الله وانك رسول الله) موسوڵمانان بە یەك دەفعە تەکبیرێکیان کرد ، لە هەردوو طەرەفی مەکەدا دەنگی دایەوە . لە دواییا چووم ، لە دەرگای خاڵم دا پێم‌وت : خەبەرت هەیە کە لە دینی قورەیش وەرگەڕاوم ؟ دەرگاکەی بە کراوەیی بۆ بەجێ هێشتم ڕۆیی ، کە خەڵق کۆبوونەوە چوومە لای پیاوێ کە هیچ سیرڕێکی خەڵق ناشارێتەوە ، بە دزی‌یەوە پێم‌وت : من لە دین وەرگەڕاوام ، بۆ خاطری = ئەوە = خەبەر بڵاوکاتەوە بە ناو خەڵقا ؛ تا ئەو ئەذاو جەفایەی کە تووشی موسوڵمانان ئەبێ بە منیش بگا ، ئەو پیاوە بە دەنگێکی بەرز بانگی کرد : کە عومەری کوڕی خەطاب لە دین وەرگەڕاوەتەوە ! خەڵقم لێ کۆبوەوە لێیان ئەدام‌و لێم ئەدان ، تا خاڵم هات‌و وتی : چی قەوماوە ؟ وتیان : عومەری خەطاب لە دین وەرگەڕاوە . خاڵم لەسەر (حجر) وەستاو بە فەقیانەکەی ئیشارەتی کردو وتی : ئەی خەڵقینە من پەنای خوشکەزاکەی خۆمم داوە لە ئەمانی منایە . خەڵقم لێ تەکی‌یەوە ، هەرکەسێکم ئەدی لە موسوڵمانان لێیان ئەدرا ، من هیچ کەس لێی نەدەدام . وتم : ئەمە هیچ نی‌یە کە خەڵق لێی بدرێت‌و من هیچ موتبەلا نەبم بەوی موسوڵمانان پێی موبتەلا بوون .

ڕاوەستام ، کە خەڵق لە حیجرا کۆبوونەوە ، چوومە لای خاڵم پێم‌وت : ضامنێتی‌یەکەم دایەوە بەسەرتا . هەر بەم نەوعە خەڵق لێیان ئەدام‌و منیش لە خەڵقم ئەدا ، تا خوا ـ عز وجل ـ ئیسلامەتی عەزیزو غاڵب کرد .

ئیبن‌و ئیسحاق ئەم خەبەرەی ڕایویەت کردوە ، ئەڵێ : ئەوی لە

صەحیفەکەدا بوە سوورەی (طه) بوو . مونافاتی لەگەڵ پێشوەکەی نی‌یە کە (سبح لله ما في السماوت) خوێنەوە . ئەگونجێ صەحیفەیەك نەبووبێ ، یا هەردوو سوورەتەکەی تیا بووبێ . قسط ٦/١٨٦

حادیثەی سەواد لە زەمانی پێغەمەرێتی پێغەمەرا بوە - ﷺ - موعجیزەیە . حادیثەی عومەر - رضي الله تعالى عنه - ئەبێ دوو حادیثە بێ . ئەوی لە بوخاریدایە پێش زەمانی نوبووەت بوەو ئیرهاصە ، ئەوی لە قەسطەلانیدایە موعجیزەیە دوای ئیددیعای نوبووەت بوەو شیوعی ئیسلام .

حەدیثەکە فەضلی سەوادیشی تیایە - رضي الله تعالى عنه - .

١٨٣ / ١٠٦٠ عبدالله بن عمر[1] - رضي الله تعالى عنهما - عن ابيه قال : كان فرض [ابوه] للمهاجرين الاولين اربعة آلاف في اربعة [آلاف ، او في اربعة اعوام] وفرض لابن عمر ثلاثة آلاف وخمسمائة فقيل له [لعمر - رضي الله تعالى عنه -] : هو من المهاجرين فلِمَ نقصتَه من اربعة آلاف ؟ قال عمر [رضي الله تعالى عنه] : انما هاجر به ابواه . [وكان عُمُرهُ احدى عشرة سنة واشهرا] يقول : ليس هو كمن هاجر بنفسه ح - ٦/٢١٦ .

لە فەضائیلی عومەرا - رضي الله تعالى عنه - ی بنووسن .

(١) وەرگێر - خ - چوار حەدیثی دەربارەی فەضائیلی عومەر - خ - لە باسی فەضائیلی عەبدوڵلای کوڕی‌و یارانی دیکەدا نووسیوە . لێرەدا نووسیویە : [لێرەدا حەدیثی ١٨٣/١٠٦٠ ، ١٨٤/١٠٦١ ، ١٨٥/١٠٦٢ ، ١٨٦/١٠٦٣ بنووسن ، نومرۆکانی بگۆڕن] ئێمە حەدیثەکان دەگوێزینەوە ئێرە ، بەڵام هەر بە ژمارەکانی خۆیان دەیان‌نووسین‌و ، کە - خودا یار بێ - گەیشتینە ئەوێ ئەو چوار ژمارە دەپەڕێنین ، بۆ ئەوەی هەموو ژمارەکان تا ئەوێ نەگۆڕێن .

**تەرجەمە :**

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : عومەر - رضي الله تعالى عنه - بۆ موهاجیرینی ئەووەڵین چوار هەزار درهەمی لە چوار [ساڵا لە چوار ضەرب بکرێ] مەعاش قەطع کرد . بۆ عەبدوڵڵای سێ هەزارو پێنصەدی بڕی یەوە . عەرزیان کرد : کە عەبدوڵڵایش لە موهاجیرینە بۆچی کەمت بۆ ئەو مەعاش بڕی یەوە ؟ فەرمووی : ئەو دایكو باوکی هیجرەتیان پێکردوە ، وەکوو ئەوانە نی یە کە خۆیان هیجرەتیان کردبێ .

ئەم حەدیثە فەضلی عەبدوڵڵای تیایە کە هیجرەتی کردوە . فەضلی عومەری تیایە کە ئەولادی جگەرگۆشەی خۆیی بەرابەر نەکردوە بە سائیری موهاجیرینو لەوانی بە کەمتر داناوە .

لەفظی حەدیثەکە ئەوەیە : چوار هەزاری لە چوار بۆ بڕیونەوە . قەسطەلانی دوو مەعنای لێ ئەداتەوە :

١ - چوارهەزار لە چوار هەزار ضەرب بکرێ = (١٦ر٠٠٠ر٠٠٠) شانزە ملیۆن . ئەم مەعنایە مەعقوول نی یە .

٢ - چوار هەزار لە چوار ساڵا ساڵی هەزار . مەعقوولە ، ئەمما کەمە .

ئیحتیماڵێکی تریشی هەیە : چوار هەزار لە چوار ضەرب بکرێ ، شانزە هەزار ئەکا ، ساڵی چوار هەزار .

ئەم ئیختیلافە لە عەدەدا بێ ئەهمی یەتە خەلەل بە مەقصەد ناگەیێنێ . ئەوی موهیم بێ بەیانی فەضلی ئەو دوو مەردەیە .

**١٠٦١/١٨٤ عن ابي بردة بن ابي موسى الأشعري - رضي الله تعالى عنه - قال : قال لي عبدالله بن عمر - رضي الله تعالى عنهما - : هل تدري ما قال ابي لابيك ؟ قال : قلت : لا . قال : فان ابي قال لابيك : يا ابا**

**موسى هل يسرك اسلامنا مع رسول الله ـ ﷺ ـ وهجرتنا معه ، وجهادنا معه ، وعملنا كله معه بَرَدَ لنا [ثبت وسَلِمَ] وان كل عمل عملناه بعده نجونا منه كفافا ؛ رأسا برأس ؟ فقال أبي [اي أبوك] : لا والله ، قد جاهدنا بعد رسول الله ـ ﷺ ـ وصلينا ، وصمنا ، وعملنا خيرا كثيرا ، واسلم على ايدينا بشر كثير . . . وانا لنرجو ذلك ، فقال ابي : لكني انا والذي نفس عمر بيده ! لوددت ان ذلك بَرَدَ لنا ، وان كل شيئ عملنا بعد نجونا منه كفافا راسا برأس . فقلت : ان اباك والله خير من ابي ! [لان مقام الخوف افضل من مقام الرجاء] خ ـ ٦/٢١٦**

**تەرجەمە :**

ئەبوبەردەی کوڕی ئەبوو مووسای ئەشعەریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : عەبدوڵڵای کوڕی ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لێی پرسیم : ئەزانی باوکم چی بە باوکت وت ؟ وتم : خەیر . وتی : باوکم بە باوکتی وت : (یا ابا موسى) ئەوەت پێ خۆشە کە ئیسلامەتی و هیجرەت و ، غەزاو ئەو عەمەلانە کە لە خزمەت پێغەمەرا کردوومانە ـ ﷺ ـ بە سەلامەتی بۆمان بمێنێ و ، لەوەی کە لە دوای پێغەمەر ـ ﷺ ـ کردوومانە نەجاتمان ببێ و سەربەسەر لە ژێر گوناهی دەرچین و واز لە ئەوابی بێنین ؟ باوکت وتی : خەیر ، وەڵڵاهی لە دوای پێغەمەر ـ ﷺ ـ غەزامان کردوەو ، نوێژمان کردوەو ، رۆژوومان گرتوەو ، ئیشی خێرمان کردوەو ، زۆر خەڵقمان لەسەر دەست موسوڵمان بوەو . . . ئێمە ئومێدی ئەوانەمان هەیە . باوکم فەرمووی : ئەمما من قەسەم بەو ذاتەی نەفسی عومەر لە دەستی قودرەتیایە ! حەزەکەم ئەوانەی کە لە خزمەت ئەوا کردوومانە بە سەلامەتی بۆم دەرچن ، هەرچیەکمان لە دوای ئەو کردوە سەربەسەر بە بێ ئەواب و بێ عەذاب نەجاتمان لێی ببێ . وتم : وەڵڵاهی

باوکی تۆ ـ کە عومەرە ـ ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە باوکی من ـ کە ئەبوو مووسایە ـ ـ رضي الله تعالى عنه ـ چاکتر بوە . [چونکی مەقامی باوکی تۆ خەوف بوە ، مەقامی باوکی من رەجا بوە ؛ چونکی مەقامی خەوف لە مەقامی رەجا بە فەضلترە . باوکی تۆ لە باوکی من چاکتر بوە]

لە فەضائیلی حەزرەتی عومەریا بنووسن ـ رضي الله تعالى عنه ـ .

**١٠٦٢/١٨٥ عبدالله بن مسعود ـ رضي الله تعالى عنه ـ عن عبدالرحمن بن يزيد قال : سألنا حذيفة عن رجل قريب السمت والهَدْي من النبيّ ـ ﷺ ـ حتى نأخذ عنه . فقال : ما اعرف احدا اقرب سمتا [اي هيئة حسنة] وهَدْيا ودلاً بالنبيّ ـ ﷺ ـ من ابن ام معبد . ح ـ ١٣٤/٦ ت ، ن . وفي : خ ـ ٦٠/٩ من حين يخرج من بيته الى ان يرجع فيه لاندري ما يصنع اذا خلا .**

**تەرجەمە :**

عەبدورەحمانی کوڕی یەزید دەفەرموێ : لە حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ مان پرسی : کە پیاوێ کە هەیئەت و طەریقەت و مەقامی نزیك بێ بە پێغەمەر ـ ﷺ ـ کێیە ؟ فەرمووی : هیچ کەس نازانم کە سیرەت و ئەخلاق و هیدایەتی لە (ابن ام عبد) نزیکتر بێ بە پێغەمەر ـ ﷺ ـ لەو وەختەوە لە ماڵ یێتە دەرەوە تا ئەچێتە ماڵەوە کە خۆی بە تەنهابێ نازانین چی ئەکا .

**١٠٦٣/١٨٦ ابو موسى الاشعري [رضي الله تعالى عنه] يقول : قدمت أنا وأخي [ابو رهم ، او ابو بردة] من اليمن فمكثنا حينا ما نرى الا أن عبدالله بن مسعود [رضي الله تعالى عنه] رجل من اهل البيت النبي ـ ﷺ ـ لما نرى من دخوله ودخول امه على النبيّ ـ ﷺ ـ ح ـ ١٣٤/٦ . م ـ ٣٦٩/٩**

تەرجەمە :

ئەبو مووساى ئەشعەریی - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : من و [ئەبو رهم ، یا ئەبو بوردەی] برام لە یەمەن = گەراینەوە = هاتینە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - هەر وامان ئەزانی کە عەبدوڵڵای کوری مەسعوود - رضي الله تعالى عنه - یەکێکە لە ئەهلی بەیتی پێغەمەر - ﷺ - ئەوەندە خۆیو دایکی ئەچوونە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - .

## من فضائل عمر
### - رضي الله تعالى عنه -

١٨٧/١٠٦٤ عن ابي عثمان النهدي : قال : سمعت ابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - اذا قيل له : هاجر [اسلم . اخرى] قبل ابيه يغضب [لما فيه من رفعته على ابيه] قال : وقدمت انا وعمر على رسول الله - ﷺ - [عند بيعة الرضوان] فوجدناه قائلا ، فرجعنا الى المنزل ؛ فارسلني عمر [رضي الله تعالى عنه] وقال : اذهب فانظر : هل استيقظ [عليه الصلاة والسلام] ؟ فأتيته فدخلت عليه ، فبايعته ، ثم انطلقت الى عمر ، فأخبرته : انه قد استيقظ ، فانطلقنا اليه نهرول هرولة ، حتى دخل عليه ، فبايعه ، ثم بايعته [ثانيا] ح - ٢١٧/٦ ويأتي نحوه إن شاء الله في الغزوات ح - ٣/٣٤٢/٦

تەرجەمە :

ئەبوعوثمانی نەهەدیی - رحمه الله - ئەفەرموێ : لە ئیبن و عومەرم بیست - رضي الله تعالى عنهما - کە عەرزیان بکردایە : کە ئەو لە پێش باوکیا هیجرەتی کردوە [موسوڵمان بوە . اخرى] بەوە رقی هەڵەستا .

فەرمووی : [مەنشەئی ئەم غەلەطە ئەوەیە] کە منو باوکم [لە بەیعەتی ریضـوانا] چـووینە خـذمەتی پێغـەمەر ـ ﷺ ـ تـەشـریفی نـوستبـوو ، قەیلوولەی ئەکرد ، گەڕاینەوە بۆ جێی خۆمان ، لە دواییا عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ناردمی فەرمووی : بچۆ بزانە تەشریفی لە خەو هەڵساوە یان نا ؟ چوومە خذمەتیو موبایەعەم لە خذمەتا کرد . [یەعنی لـەسەر ئەوە کە خەڵق موبایەعەیان لە خذمەتا کردبوو] لە دواییدا گەڕامەوە بۆ خذمەت عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ خـەبەرم دایێ کـە تەشـریفی خەبەری بۆتەوە . هەردوکمان بە هەڕاکردن چووین بـۆ خذمـەتی ، تا عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ چوە ژووریٚ خذمەتیو موبـایەعـەی لە خذمەتا کرد ، منیش دووبارە موبایەعەم لە خـذمەتیـا کردەوە . [ئـەم موبایەعەیە کە خەڵق وا تێئەگەن کە من لە پێش باوکما هیجرەتم کردوە]

ئەم حەدیثە لە فەضائیلی حەزرەتی عومەرا بنووسن .

# مناقب عثمان
## ـ رضي الله تعالى عنه ـ

٦٢/٩٣٩ عبيدالله بن عدي بن الخيار اخبر ان المِسْوَر بن مخرمة ، وعبدالرحمن بن الاسود بن عبديغوث قالا : ما يمنعك ان تَكَلَّمَ عثمان لأخيه [لامه] الوليد ؟ [بن عقبة بن ابي معيط ـ لعنه الله ـ وكان عثمان عزل سعد بن ابي وقاص ـ رضي الله تعالى عنهما ـ عن الكوفة ، وولاها مكانه ذاك ابن اللعين] فقد اكثر الناس فيه [لعزله سعدا ـ رضي الله تعالى عنه ـ وهو احد العشرة ، وقال له ـ عليه الصلاة والسلام : «اِرْمِ فداك ابي وامي» وكان فاتح كنوز كسرى ، وصاحب المناقب السنية ـ كما يأتي ـ انشاء الله تعالى ـ وولى مكانه ابن عدو رسول الله ـ ﷺ ـ من ليس له شيئ من المحاسن]

فقصدت لعثمان حتى خرج الى الصلاة . قلت : ان لي إليك حاجة ، وهي نصيحة لك . قال : يا ايها المرء منك ! قال معمر : أُراه قال : اعوذ بالله منك ! فانصرفت ، فرجعت اليهما اذ جاء رسول عثمان [رضي الله تعالى عنه] فاتيته ، فقال : ما نصيحتك ؟ فقلت : ان الله سبحانه [وتعالى] بعث محمدا ـ ﷺ ـ بالحق ، وانزل عليه الكتاب ، وكنتَ ممن استجاب لله ولرسوله ـ ﷺ ـ فهاجرت الهجرتين [هجرة الحبشة وهجرة المدينة] = وصحبت رسول الله ـ ﷺ ـ ورأيت هديه =[1] وقد اكثر الناس في شأن الوليد . قال : ادركت رسول الله ـ ﷺ ـ ؟

---

(١) له (وصحبت) هوه تا ئيره كه‌وتبوو ، ئيمه خستمانه‌وه شوينى خوى .

قلت : لا ، ولكن خَلَص اليَّ من علمه ما يخلصُ الى العذراء في سترها [لكونه شائعا ذائعا] .

قال : اما بعد : فان الله بعث محمدا ـ ﷺ ـ بالحق ، فكنتُ ممن استجاب لله ولرسوله ، وآمنتُ بما بعث به ، وهاجرتُ الهجرتين ـ كما قلت ـ وصحبتُ رسول الله ـ ﷺ ـ وبايعتهُ . فوالله ما عصيته ولا غشَشْته حتى توفاه الله . ثم ابو بكر مثله . ثم عمر مثله . ثم استُخْلِفْتُ ، افليس لي من الحق مثل الذي لهم ؟ قلت : بلى . قال : فما هذه الاحاديث التي تبلغني عنكم ؟ اما ما ذكرت من شأن الوليد فسنأخذ فيه بالحق ـ ان شاء الله تعالى ـ ثم دعا عليا ، فأمره ان يجلده فجلده ثمانين . ح ـ ١٠٣/٦

٦٣/٩٤٠ وفي اخرى عنه : ان المِسور بن مخرمة ، وعبدالرحمن بن الاسود بن عبديغوث قالا له : ما يمنعك ان تكلم خالك عثمان [ليست امه اخته ، بل من رهطه] في اخيه [لأمه] الوليد بن عقبة ؟ [اللعين] وكان اكثر الناس فيما فعل به . . . قال عبيد الله : فانتصبتُ لعثمان حين خرج الى الصلاة ، فقلت له : ان لي اليك حاجة وهي نصيحة ، فقال : ايها المرء اعوذ بالله منك ! فانصرفت .

فلما قضيت الصلاة جلست الى المسور والى ابن عبديغوث ، فحدثتهما بالذي قلت لعثمان وقال لي . فقالا : قد قضيت الذي كان عليك . فبينما انا جالس معهما اذ جاءني رسول عثمان ، فقالا لي : قد ابتلاك الله ـ تعالى ـ ، فانطلقت حتى دخلت عليه ، فقال : ما نصيحتك التي ذكرت آنفا ؟ قال : فتشهدت ، ثم قلت : ان الله بعث محمدا ـ ﷺ ـ وانزل عليه الكتاب ، وكنتَ ممن استجاب لله ورسوله ـ ﷺ ـ وآمنتَ به ، وهاجرتَ الهجرتين الاولين ، وصحبتَ رسول الله ـ ﷺ ـ ورأيتَ هديه . . . وقد اكثر الناس في شأن الوليد بن [اللعين] عقبة ، فحق عليك ان تقيم عليه الحد .

فقال لي : يا ابن اخي [اختي . أبي ذر] ادركتَ رسول الله ؟ قال : قلت : لا ، ولكن قد خلص اليَّ من علمه ما خلص الى العذراء في سترها . قال : فتشهد عثمان ، فقال : ان الله قد بعث محمدا ـ ﷺ ـ بالحق ، وانزل عليه الكتاب ، وكنتُ ممن استجاب لله ورسوله ـ ﷺ ـ ، وآمنتُ بما بعث به محمد ـ ﷺ ـ وهاجرتُ الهجرتين الاولين ـ كما قُلتَ ـ وصحبتُ رسول الله ـ ﷺ ـ وبايعتهُ ، والله ما عصيته ولا غششتهُ حتى توفاه الله ، ثم استخلف الله ابا بكر فوالله ما عصيته ولا غششته ، ثم استخلف عمر ، فوالله ما عصيته ولا غششته ؛ ثم استُخْلِفْتُ افليس لي عليكم [من الحق] مثل الذي كان لهم عليَّ ؟ قال : بلى . قال : فما هذه الاحاديث التي تبلغني عنكم ؟ فاما ما ذكرت من شأن الوليد بن عقبة [اللعين] فسنأخذ فيه ـ ان شاء الله تعالى ـ بالحق . قال : فجلد الوليد اربعين جلدة ، وامر عليا ان يجلده ، وكان هو يجلده . ح ـ ٦/١٨٩ .
هذا مغن عن الاول .

دوو حەدیثە عەینی یەك ، ئەم ریوایەتە چەند کەلیمەیێکی زیاترە ، (مغنی) یە لە ئەووەڵەکەی ، هەوەستان هەیە حەذفی بکەن .
تەرجەمە :

عوبەیدوڵلای کوڕی عەدیی ، کوڕی خیار ئەفەرموێ : میسوەری کوڕی مەخرومە ـ رضي الله تعالى عنه ـ و عەبدورەحمانی کوڕی ئەسوەدی کوڕی عەبدی یەغووث ئەمریان پێ کردم : بۆچی تۆ قسە ناکەی لە خذمەت خاڵتا کە عوثمانە ؟ [رضي الله تعالى عنه ـ خاڵی حەقیقی نی‌یە ، لە قەومی ئەوە] دەرحەق وەلیدی کوڕی عوقبە [کە بەسەرخۆشیی نوێژ ی سبەینێی چوار رکات کردوە] خەڵق زۆر قسەی لێ ئەکەن [کە پیاوی وەك سەعدی لە عیراق عەزل کردوەو ، سەرخۆشێکی وەك وەلیدی داناوە لە

جێی ئەو پیاوە گەورە کە صەحابی یەو لە عەشەرەی موبەشەرەیە ، مەناقیبێکی زۆری هەیە . ]

عوبەیدوڵلا ئەفەرموێ : راوەستام تا ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالی عنه ـ تەشریفی هات بۆ نوێژ عەرزم کرد : ئیحتیاجێکم لە خزمەتتا هەیە ، کە نەصیحەتە بۆ تۆ ، فەرمووی : ئەی پیاو پەنا ئەگرم بە خوا لە تۆ ! کە وای فەرموو گەرامەوە ، کە نوێژم کرد چووم لای میسوەرو عەبدورەحمان دانیشتم ، چیم بە حەزرەتی عوثمان وتوبوو چی جواب دامەوە . . بۆم گێڕانەوە . فەرموویان : ئەو وەظیفەی لەسەر تۆ بوو بەجێت هێنا .

لەو وەختەدا کە لە لایان دانیشتبووم پیاوی ئیمامی عوثمان هات ، وتی : حەزرەتی عوثمان بانگت ئەکا . میسوەرو عەبدورەحمان پێیان وتم : خوا موبتەلای کردی . چوومە خدمەتی ، فەرمووی : نەصیحەتەکەی نەختێ لەمەوپێش وتت چی یە ؟ کەلیمەی شەهادەتم هێنا ، عەرزم کرد : خوا ـ عز وجل ـ محەمەدی ناردوە ـ ﷺ ـ ، قورئانی نازڵ کردۆتە سەر ، تۆیش لەوانە بووی کە ئیجابەتی خواو رەسوولی خوات کردوە ـ ﷺ ـ . ئیمانت پێ هێناوە ، هەردوو هیجرەتی پێشووت کردوە بۆ حەبەشەو بۆ مەدینە ، صوحبەتی پێغەمەرت کردوە ـ ﷺ ـ هیدایەتی ئەوت دیوە . . . خەڵق دەرحەق وەلیدی کوڕی عوقبەی لەعین کە حەددی لێ نادەیت زۆرت قسە لێ ئەکەن . فەرضە لە سەرت کە حەددی بەسەرا ئیجرا بکەی .

عوثمان ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : تۆ گەیبوی بە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ؟ عەرزم کرد : بە خزمەتی نەگەییوم ، ئەمما عیلمی ئەو ئەوەندە شیووعی بووەو مەشهوورە لە ناو خەڵقا کە بە کچی ناو پەردە گەییوە ، وەك

چۆن بەو گەییوە وایش بە من گەییوە . عوبەیدوڵڵا فەرمووی : ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ کەلیمەی تەشەهودی هێنا ، فەرمووی : وەك تۆ وتت خوا ـ عز وجل ـ محەمەدی ـ ﷺ ـ بە حەق ناردوە ، کتێبی بۆ ناردوە ، لەوانەم کە ئیجابەتی خواو رەسوولی خوام کردوە ـ عز شأنه ! و ﷺ ـ ئیمانم هێناوە بەوەی کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ی پێ نێرراوە ، هەردوو هیجرەتم کردوە ، صوحبەتی پێغەمەرم کردوە ـ ﷺ ـ ، بەیعەتم پێ کردوە ، وەڵڵاهی تا وەفاتی فەرموە موخالەفەم نەکردوە ، غەششم لە خذمەتا نەکردوە ، لە دوای ئەو خوا حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ی کرد بە خەلیفە . وەڵڵاهی موخالەفەم نەکرد ، غەششم لەگەڵ نەکرد . دوای ئەو حەزرەتی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ کرا بە خەلیفە ، وەڵڵاهی موخالەفەم نەکرد ، غەششم لەگەڵ نەکرد . دوای ئەو من بووم بە خەلیفە ، ئایا ئەو حەقانەی کە ئەوان بوویانە بەسەر منەوە منیش وەك ئەوان هیچ حەقم بەسەر ئێوەوە نی یە ؟ عەرزم کرد : بەڵێ هەتە . فەرمووی : ئەی ئەم قسانەی کە لە ئێوەوە بە من ئەگا دەرحەق وەلیدی کوڕی عوقبەی لەعین = چین = ؟ ئەوی تۆ ئەڵێی کە داری حەددی لێ نەدراوە (ان شاء الله) حەقی لێ ئەستێنم . عوبەیدوڵڵا فەرمووی : [لە دوای ئەمە کە حەمران و صەعبی کوڕی جەثامە شەهادەتیان لێدا] ئەمری فەرموو بە حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ چل داری لێدا .

ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ وە نی یە لە ئیجرای حودوودی شەرعیدا ئیهمالی کردبێ . نیهایەت چونکی (شرعاً) لای ثابت نەبووبوو بۆیە تەئخیری کردبوو ، کە (شرعا) ثابت بوو دەزبەجێ ئیجرای کرد . ئەو چوار ئیمامەو عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ـ رضي الله تعالى

عنهم ـ بە قەد ذەڕڕە قوصووریان نی‌یە . ئومەرای شەیخەین‌و حەزرەتی عەلیش ـ رضي الله تعالى عنهم ـ وا بوون . ئەصحابی کیرام ـ رضي الله تعالى عنهم ـ بێ قوصوور بوون ، لە شەهادەتی حەزرەتی عوثمانا هیچیان پێی ئالوودە نەبوون . لە طەرەف ئۆردووی میصری‌و قیبطی یەوە شەهید کرا ـ رضي الله تعالى عنهم ـ .

٩٤١/٦٤ سعيد بن زيد ، بن عمرو ، بن نفيل في مسجد الكوفة يقول : والله لقد رأيتني وان عمر [رضي الله تعالى عنه] لموثقي على الاسلام قبل ان يسلم عمر ، ولو ان اُحُداً ارفضٍّ للذي صنعتم بعثمان ـ رضي الله تعالى عنهم ـ لكان محقوقا ان يرفضّ [يزول عن مكانه]
ح ـ ٧/١٨٣/٦
تەرجەمە :

سەعیدی کوڕی زەیدی ، کوڕی عەمری ، کوڕی نوفەیل [کە خۆی ئامۆزای ئیمامی عومەر بوو ، باوکی ئیختیلاف لە نوبووەتیا هەیە ، خۆی لە عەشەرەی موبەشەرەیە ، هەر دۆعاییکی کردبێ (لاردّ) بوە ـ رضي الله تعالى عنه وعن ابيه ـ] لە مزگەوتی گەورەی کووفەدا ئەیفەرموو : من خۆم وا دیی کە عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە پێش ئەمەوە کە موسوڵمان بێ ، لە سەر موسوڵمان بوونم پێوەندی کردبووم عەذابی ئەدام . ئەمما لەبەر ئەوەی کە ئێوە بە عوثمانتان کرد ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەگەر کێوی ئوحود لە جێی خۆی لابچێ حەق وایە لابچێ [مەقصوودی وایە ئەو ظوڵمەی کە ئێوە لە ئیمامی عوثمانتان کرد موشریك بە موسوڵمانی نەکردوە .]

[صاحیبی (صفوة) له ئه‌نه‌س - رضي الله تعالى عنه - ریوایه‌ت ئه‌کا که ئیمامی عومه‌ر - رضي الله تعالى عنه - که خه‌به‌ری ئه‌وه‌ی پێ گه‌یی که سه‌عیدی زاوایی و خوشکه‌که‌ی موسوڵمان بوون - رضي الله تعالى عنهما - سه‌عیدی خست به پێ شێلای ، خوشکه‌که‌ی ئیمامی عومه‌ر - رضي الله تعالى عنها - هات ئیمامی عومه‌ری له مێرده‌که‌ی ده‌فع کرد ، که ئیمامی عومه‌ر مسته‌کۆڵه‌یێکی پیا مالّی خوێنی له ده‌م و لووتی هێنا . قسطلانی] .

[ئه‌م حه‌دیثه هه‌م فه‌ضلی عوثمان و ، سه‌عیدو ، فاطیمه‌ی خوشکی ئیمامی عومه‌ری تیایه - رضي الله تعالى عنهم - یه‌عنی ئه‌و حه‌ربی به‌ینی ئه‌صحابی کیرامه بۆ خوێنی عوثمان بێ‌شه‌رعیی تیا نه‌بوه‌و له‌سه‌ر حه‌ق بوه] .

٩٤٢/٦٥ عثمان بن مَوْهب قال : جاء رجل من أهل مصر حج البيت ، فرأى قوما جلوسا ، فقال : من هؤلاء القوم ؟ [فقالوا . كش] قال : هؤلاء قريش . قال : فَمَنِ الشيخ فيهم ؟ قالوا : عبدالله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] قال : يا ابن عمر اني سائلك عن شيئ فحدثني عنه : هل تعلم ان عثمان فرَّ يوم احد ؟ قال : نعم . فقال : تعلم انه تغيب عن بدر ولم يشهد ؟ قال : نعم . قال : هل تعلم انه تغيب عن بيعة الرضوان فلم يشهدها ؟ قال : نعم . قال : الله أكبر !

قال ابن عمر [رضي الله تعالى عنهما] تعال ابين لك : اما فراره يوم احد ؛ فأشهد ان الله تعالى عفا عنه وغفر له [كما في آل عمران] وأمَّا تغيبه عن بدر ؛ فانه كان تحته بنت رسول الله - ﷺ - وكانت مريضة ، فقال له رسول الله - ﷺ - : ان لك اجر رجل ممن شهد بدراً وسهمه . واما تغيبه عن بيعة الرضوان ؟ فلو كان احد اعز ببطن مكة من عثمان لبعثه مكانه .

**فبعث رسول الله ـ ﷺ ـ عثمان [الى اهل مكة لِيُعْلِمَ قريشا انه ـ عليه الصلاة والسلام ـ إنّما جاء معتمرا لا محاربا] وكانت بيعة الرضوان بعد ما ذهب عثمان [رضي الله تعالى عنه] الى مكة . فقال رسول الله ـ ﷺ ـ بيده اليمنى : هذه يد عثمان ، فضرب بها على يده ، فقال : هذه لعثمان . فقال له ابن عمر : اذهب بها الآن معك . ح ـ ٦/ ١٠٥**

**ته‌رجه‌مه :**

عوثمانی کوڕی مه‌وهه‌ب ئه‌فه‌رموێ : پیاوێ له ئه‌هلی میصر هات حه‌جی کرد ، چاوی که‌وت به جه‌ماعه‌تێ دانیشتبوون ، ئه‌و پیاوه ـ سا هه‌ر که‌سێ بێ ـ پرسی : ئه‌وانه کێن ؟ وتیان : قوره‌یشن . وتی : ئه‌و شێخه کێیه له ناویانا ؟ وتیان : عه‌بدوڵڵای کوڕی عومه‌ره ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئه‌و پیاوه عه‌رزی‌کرد : وتی : ئه‌ی ئیبن و عومه‌ر سوئالت لێ ئه‌که‌م له شتێك جوابم بده‌ره‌وه . لێت مه‌علوومه که عوثمان له رۆژی ئوحودا فیراری کرد ؟ فه‌رمووی : به‌ڵێ . وتی : ئه‌زانی که له غه‌زای به‌در پاش‌که‌وت نه‌چوو ؟ فه‌رمووی : به‌ڵێ . وتی : ئه‌زانی که له (بیعة الرضوان)ا غائیب بوو له‌وێ نه‌بوو ؟ فه‌رمووی : به‌ڵێ . پیاوه‌که له خۆشییانا که قسه‌ی ئیبن و عومه‌ر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ موافیقی ئیعتیقادی ئه‌و بوو وتی : (الله اكبر) !

ئیبن و عومه‌ر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فه‌رمووی : بێ تێت‌بگه‌یێنم : فیرارکردنی ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ له غه‌زای ئوحودا ؛ من شه‌هاده‌ت ئه‌ده‌م که خوا ـ عز وجل ـ لێی خۆش بوو .

[له سووره‌تی ئالی عیمرانا ئه‌فه‌رموێ : ئه‌وانه‌ی که ئه‌و رۆژه‌ی دوو له‌شکر به‌رابه‌ر وه‌ستان و له‌شکری ئیسلام فیراریان کرد به واسیطه‌ی

ئەوە بوو کە شەیطان زەللەی پێکردن ؛ بۆ تالآن کردن تیراندزەکان لەو جێیەی کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ بووی تەعین کردن . . جوێ بوونەوە ، بە تەحقیق خوا لییان خۆش بوو . ئەڵبەتە خوا ـ عز وجل ـ غەفوورەو گوناە عەفو ئەکا . حەلیمە لە عەذاب دانا عەجەلە ناکا تا تەوبەی لێ بکرێ . ]

غائیب بوونی لە غەزای بەدریش لەبەر ئەوە بوو چونکی کچی پێغەمەری ـ ﷺ ـ کە حەزرەتی (رقیـە) یە ـ رضي الله تعـالی عنها ـ لـە باخەلآ بوو ، نەخۆش بوو . [پێغـەمەر ـ ﷺ ـ ئـەمری کـرد کە ئـەوو ئوسامەی لە لا بمێنن ، بەو ناساغی یە بە بیست ساڵی ی وەفاتی کرد ـ رضي الله تعالی عنها ـ] پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێی فەرموو : ئەجری یەکێ لەوانەت هەیە کە حازری بەدر بوون و ، حیصەی یەکێکیش لەوان .

لە (بیعة الرضوان) یش کە بەجێ ما ؛ پێغەمەر ـ ﷺ ـ ناردی بـۆ مەککە کە خەبەریان بداتێ کە بۆ عومرە هاتوەو بۆ حەربکردن نەهاتوە ، ئەگەر یەکێکی لە عوثمان عەزیزتر ببوایە لا پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەوی ئەنارد لە باتی ئەو . (بیعة الرضوان) یش دوای ئەوە بوو کە عوثمان ـ رضي الله تعالی عنه ـ رۆییبوو بۆ مەککە .

[لە دوای ئەو خەبەر بلآوبۆوە کـە موشـریکان خـەریکی ئەوەن حەرب لەگـەڵ پێغەمـەرا بکەن ـ ﷺ ـ مـوسوڵمـانانیش کـەوتنەخـۆ بۆ حەرب ، پێغەمە ر ـ ﷺ ـ لە ژێر شەجەرەی ریضوانا موبایەعەی لەگەڵ ئەصحاب کرد کە فیـرار نەکـەن] . پێغەمـەر ـ ﷺ ـ بە دەستی راستی موبارەکی خۆی ئیشارەتی فەرموو ، فەرمووی : ئەمە دەستی عوثمانە . ماڵیی بە دەستی چەپی موبارەکی خۆیا ، فەرمووی : ئەم بەیعەتە لە باتی عوثمان [دیارە دەستی پێغەمەر ـ ﷺ ـ بۆ عوثمان ـ رضي الله تعالی عنه ـ صەد هەزار جار لە دەستی خۆی چاترە] ئیبن و عومەر ـ رضي الله تعالی

عنه ـ فەرمووی : ئیمجا بەم جوابانەوە بڕۆرەوە [دەرحەق عوثمان عەقیدەت باش بێ] .

ئەم حادیثانە جۆێبەجۆێ هەر یەك مەنقەبەییێکی زۆر گەورەیە بۆ حەزرەتی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ .

نەخۆشی ئەهل و عەیال و خزم مەعذرەت تەشکیل = ئەکەن = بۆ هەموو شت .

بە قەد ئیمکان ئیزالەی شوبهە لازمە .

٩٤٣/٦٦ عن ابي موسى ـ رضي الله تعالى عنه ـ ان النبيَّ ـ ﷺ ـ كان قاعدا في مكان فيه ماء قد انكشف عن ركبتيه ، او ركبته ، فلما دخل عثمان غطاها . ح ـ ٦/١٠٣

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی لە جێیێکی ئاوارا دانیشتبوو ، هەردوو ئەژنۆی ، یاخو فەرمووی : ئەژنۆی هەڵمالیبوو ، کە ئیمامی عوثمانی چوە خذمەت ئەژنۆی موبارەکی داپۆشي .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ حەیای لێکرد بە موقابەلەی ئەوە کە زۆر بە حەیا بوە .

٩٤٤/٦٧ عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت : كان رسول الله ـ ﷺ ـ مضطجعا في بيته كاشفا عن فخذيه ، او ساقيه ، فاستأذن ابو بكر فأذن له ، وهو على تلك الحال ، فتحدث . ثم استأذن عمر فأذن له ، وهو كذلك ، فتحدث . ثم استأذن عثمان ؛ فجلس رسول الله ـ ﷺ ـ وسوى ثيابه . قال محمد [بن حرملة] : ولا أقول ذلك في يوم واحد . فدخل فتحدث ، فلما خرج قالت عائشة : دخل ابو بكر فلم تهتش له ولم تباله ، ثم دخل عمر فلم تهتش له ولم تباله . ثم دخل عثمان فجلستَ

وسويتَ ثيابك : فقال : الا آستحي من رجل تستحي منه الملائكة ؟
ح ـ ٩/ ٢٩٠
تەرجەمە :

عائیشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی لە ماڵەوە راکشابوو ، هەردوو رانی ، یا فەرمووی : هەردوو قاچی موبارەکی دەرخستبوو ، ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالی عنە ـ تەشریفی هات ئیذنی خواست ، ئیذندرا ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ وەضعی یەتی خۆی تێك نەدا ، قسەی لە خذمەتا فەرموو . لە دواییا ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالی عنە ـ هات ئیذنی خواست بۆ حوضوور ئیذندرا . پێغەمەر ـ ﷺ ـ لەسەر ئەو حاڵە ما ، ئەویش لە خذمەتیا قسەی کرد . لە دواییا ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالی عنە ـ تەشریفی ئیذنی خواست بۆ حوضوور ، [ئیذندراو] پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی دانیشتو جلەکانی خۆیی رێكخست . محەمەدی راویی ئەڵێ : ئەوە تەنها لە رۆژێکا نەبوو . ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالی عنە ـ هاتەژوورێو قسەی لە خذمەتا کرد . = عائیشە ئەفەرموێ : = کە رۆیی عەرزی پێغەمەرم کرد ـ ﷺ ـ : کە ئەبوبەکر هاتە ژوورێ هیچ موبالاتت پێ نەکرد . لە دواییا عومەر هات هیچ موبالاتت پێ نەکرد . لە دواییدا عوثمان هات هەڵسای دانیشتیو خۆت کۆکردەوە ! فەرمووی : ئەمن حەیا نەکەم لە کەسێ کە مەلائیکە حەیای لێ ئەکا ؟

٩٤٥/٦٨ عائشة [رضي الله تعالى عنها] زوج النبي ـ ﷺ ـ وعثمان [رضي الله تعالى عنه] أخبرا ان أبا بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ استأذن على

رسول الله وهو مضطجع على فراشه ، لابس مرط عائشة ، فاَذِن لابي بكر وهو كذلك ، فقضى اليه حاجته ، ثم انصرف ، ثم استأذن عمر [رضي الله تعالى عنه] فاذن له ، وهو على تلك الحال ، فقضى اليه حاجته ، ثم انصرف ، قال عثمان : ثم استأذنتُ عليه ، فجلس ، وقال لعائشة : اجمعي عليك ثيابك ! فقضيت اليه حاجتي ثم انصرفت . فقالت عائشة : يا رسول الله ما لي لم اَرَكَ فَزِعتَ لأبي بكر وعمر [رضي الله تعالى عنهما] كما فزِعتَ لعثمان ؟ قال رسول الله - ﷺ - : ان عثمان رجل حيّيٌ ، واني خشيت اِنْ اَذِنت له على تلك الحال ان لا يبلغ اليَّ في حاجته . م - ٩/ ٢٩١

تەرجەمە :

عائیشەو عوثمان - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموون : ئەبوبەبکر - رضي الله تعالى عنه - ئیذنی خواست بۆ حوضووری پێغەمەر - ﷺ - پێغەمەر - ﷺ - لەسەر جێی خۆی راکشا بو ، لیباسێکی عائیشەی دابوو بە خۆیا ، ئیذنی دا هاتە خدمەتی ، لەسەر ئەوحاڵەتە . ئیحتیاجی یەکەی بەجێهێناو گەڕایەوە . حەزرەتی عومەریش تەشریفی هات . هەروا . ئیمامی عوثمان ئەفەرموێ : من چووم ئیذنم خواست . پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی هەڵساو دانیشت ، ئەمری بە حەزرەتی عائیشە کرد : خۆت کۆکەرەوە ! ئیحتیاجی یەکەم عەرزکرد ، بەجێی هێناو گەڕامەوە . حەزرەتی عایشە فەرمووی : (یا رسول الله) بۆچی وام نەدیت وەك ئیهتیمامت بە عوثمان کرد ئیهتیمامت نەکرد بە ئەبوبەکرو عومەر ؟ پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : عوثمان پیاوێکی زۆر بە حەیایە ، لەوە ترسام ئەگەر لەسەر ئەو حاڵە ئیذنی بدەم بێتە لام ئیحتیاجی یەکەی نەگەیێنێ بە من .

له فه‌ضائیلی ئه‌م سێ ئیمامه ـ رضي الله تعالى عنه ـ دا حه‌دیثی (اثبت احد)و حه‌دیثی ئه‌بوموموسای ئه‌شعه‌ریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ که بوه به ده‌رگاوانی پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ واریده ، له موعجیزاتا به‌یان کراوه . (فراجع)[1] .

---

(١) ئه‌م قسه‌یه مه‌به‌ستی ئه‌م دوو حه‌دیثه‌یه : (٥٩١/٥٣) و (٥٩٦/٥٨) که به‌ر به‌رگی دوه‌م ده‌که‌ون .

# فضائل اسد الله الغالب
## علي ابن ابي طالب ـ رضي الله تعالى عنه ـ

دایکی فاطیمەیە کچی ئەسەدی کوڕی هاشمە ، ئەووەڵ هاشمییێکە موسوڵمان بووبێ ـ رضي الله تعالى عنه ـ في فضله حديث : انت مني وانا منك ح ـ ٤٠٦/٤ في الصلح وفي عمرة القضاء .

**٩٤٦/٦٩ عن سهل بن سعد ـ رضي الله تعالى عنه ـ ان رسول الله ـ ﷺ ـ قال : لأعطين الراية غدا رجلا يفتح الله على يديه . قال : فبات الناس يدوكون ليلتهم [اى يخوضون] أَيُّهُمْ يعطاها ؟ فلما اصبح الناس غدوا على رسول الله ـ ﷺ ـ كُلُّهم يرجون (كش) ان يعطاها ، فقال : اين عليٌّ بن ابي طالب ؟ فقالوا : يشتكي عينيه يا رسول الله . قال : فأَرسِلوا اليه ، فأتوني به . فلما جاء بصق في عينيه ، ودعا له فبرء ، حتى كأن لم يكن به وجع [بل لم يرمد ولم يصدع بعد] فاعطاه الراية فقال علي [رضي الله تعالى عنه] : يا رسول الله اقاتلهم حتى يكونوا مثلنا ؟ فقال : اُنْفُذْ [امض] على رسلك [هينك] حتى تنزل بساحتهم ، ثم اذعهم الى الاسلام ، وأخبرهم بما يجب عليهم من حق الله فيه . فوالله لان يهدي الله بك رجلا واحدا خير لك من ان يكون لك حمر النعم ح ـ ١١١/٦**

**تەرجەمە :**

سەهلی بنی سەعدی ساعیدیی ـ رضي الله تعالى عنه ـ

ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : سبەینێ بـەیباخـەکە ئـەدەمە دەست پیاوێ کە خوا لەسەر دەستی ئەو فەتحی خەیبەر ئەکا . سەهل فەرمووی : خەڵق ئەو شەوەیان بەوە رۆژ کردەوە : ئاخۆ بە کێی عەطا بفەرموێ ؟ کە رۆژ بۆوە خـەڵق بەیـانی زوو هەمـوو چوونـە خزمـەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ کو للێکیان ئومێدی وابوو کە بەوی عەطا بفەرمـوێ . فەرمووی : عەلی لە کوێیە ؟ عەرزیان کـرد : چاوی یێشێ (یـا رسول الله) : فەرمووی : بنێرن بە شوێنیا بۆم بێنن . کە تەشریفی هات تفی موبارەکی کردە ناو چاویەوە ، چاوی وا چاك بۆوە وەکوو هیچ چاوئێشەی نەبووبێ . [ئیتر لە پاش ئەوەیش قەت نە چاوی ئێشا ، نە سەری ئێشا] بەیباخەکەی پێ عەطا فەرموو . حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزیکرد : (یا رسول الله) تا وەکوو ئێمەیان لێ بێ شەریان لـەگەڵ بکەم ؟ فەرمووی : بە ئاهیستە برۆ تا ئەگەیتە قەراخ ماڵەکـانیان ، لـە دواییا دەعوەتیان بکەرە سەر ئیسلامەتی ، خەبەریان بدەرێ بەوەی کە لە ئیسلامەتیدا لەسـەریان واجبـە لە (حقـوق الله) . وەڵڵاهی خـوا ـ عز وجل ـ ئەگەر بە واسیطەی تۆوە تەنها پیاوێ هیدایەت بدا لە حەیواناتی دۆشەنی سوور [کە لای عەرەب مەقبووڵە] چاترە بۆ تۆ .

**٩٤٧/٧٠ عن سلمة بن الاكوع [رضي الله تعالى عنه] قال : كان عليٌّ [رضي الله تعالى عنه] قد تخلف عن النبيّ ـ ﷺ ـ في (غزوة) خيبر ، وكان به رمد ، فقال : انا أتخلف عن رسول الله ـ ﷺ ـ ؟ فخرج عليّ ، فلحق بالنبيّ ـ ﷺ ـ فلما كان مساء الليلة التي فتحها الله في صباحها ، قال رسول الله ـ ﷺ ـ : لاعطينَّ الراية ، او ليأخذنَّ الراية غدا ، رجلا [وبالرفع] يحبه الله ورسوله ، أو قال : يحب الله ورسوله ، يفتح الله عليه ، فـاذا نحن بعليّ ـ وما نرجوه ـ فقالوا : هذا عليّ ، فاعطاه رسول الله ـ ﷺ ـ**

[الـرايـة . كش] فـفـتـح عـليـه . ح ـ ٦/١١١ ، م ـ ٩/٣٠٣ ، ح ـ ٥/١٢٤ .

**تەرجەمە :**

سەلمەی کوڕی ئەکوەع لە شـوجعانی عـەرەب و سەلاحشـووری پێغەمەر = بوو = ـ ﷺ ـ ئەفەرموێ : عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە غـەزای خەیبـەرا لە پێغـەمەر ـ ﷺ ـ دواکـەوت ، چـاوی ئـەیێشـا ، فەرمووی : من لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ دواکەوم ؟ تەشریفی لە مەدینە چوە دەرێ ، بە پێغەمەر ـ ﷺ ـ گەیی [ئەبوبەکری نارد بۆ قەڵای خەیبـەر نەگیرا ، عومەری نارد نەگیرا . حاکم في الاكليل .] کە ئێوارێی شەوی ئەو سبەینێیە داهات کە فەتحی خەیبەری تیـاکرا . . پێغـەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : سبەینێ بەییاخەکە ئەدەم بە پیاوێ . یا فەرمووی : پیاوێ وەری‌ئـەگرێ ، کـە خواو رەسـوولی خوا ئـەویـان خـۆش بـوێ . یـا فەرمووی : کە خواو رەسوولی خوای خۆش بوێ ، خوا خەیبەر لەسەر دەستی ئەوا فەتح ئەکا . حەزرەتی = عەلی = پەیدا بوو ؛ چونکی چاوی ئەیێشا هیچ ئومێدمان نەبوو کە بێت . عەرزیان‌کرد : (یا رسول الله) ئەوە عەلی‌یە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ بەییاخەکەی پێ عەطا فەرموو ، خوا فەتحی خەیبەری لەسەر کرد . [. . . . .]

٩٤٨/٧١ عن ابي حازم [سلمة بن دينار] ان رجلا جاء الى سهل بن سعد ـ رضي الله تعالى عنه ـ فقال : هذا فلان لامير المدينة [مروان بن الحكم . . .] يدعو عليا [رضي الله تعالى عنه وخذل الله من سبه وعابه] عند المنبر قال : فيقول : ماذا قال يقول له ابو تراب ؟ فضحك . قال : والله مـا اسماه الا النبيُّ ـ ﷺ ـ ومـا كـان لـه اسم اَحبّ اليـه منـه . فاستطعمت الحديثِ سهلا ، وقلت : يا ابا عباس كيف [ذلك . ذر] ؟

قال دخل علي علىٰ فاطمة [رضي الله تعالى عنهما] ثم خرج ، فاضطجع في المسجد ، فقال النبيُّ اين ابن عمك ؟ قالت : في المسجد . فخرج اليه [ﷺ ـ ورضي عنه] ، فوجد رداءه قد سقط عن ظهره ، وخلص التراب الى ظهره ، فجعل يمسح التراب عن ظهره فيقول ؛ اجلس يا ابا تراب ! مرتين . ح ـ ٦/١١١ .

**تەرجەمە :**

ئەبوحازم سەلمەی کوڕی دینار ئەفەرموێ : پیاوێ هاتە لای سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدیی ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزی‌کرد : کە فلانی ئەمیری [نا لایقی] مەدینە دەرحەق حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ناماقووڵی ئەکا . سەهل ـ رضي الله تعالى عنه ـ لێی پرسی : [مەروان] چە ناماقووڵی‌یێ ئەکا ؟ عەرزی‌کرد : پێی ئەڵێ [ئەبو توراب] . سەهل پێکەنی فەرمووی : وەڵڵاهی غەیری پێغەمەر ـ ﷺ ـ کەس ناوی نەناوە بە ئەبوتوراب . حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە لای لەو ناوە خۆشتر ناوێ تری نەبوە .

ئەبو حازم ئەفەرموێ : کە سەهل ـ رضي الله تعالى عنه ـ وای فەرموو حەزم‌کرد : تامی حەدیثەکەی لێ بچێژم ، عەرزم‌کرد ، یا ئەبو عەباس ئەوە چۆن بوو ؟ فەرمووی : حەزرەتی عەلی تەشریفی چووە لای حەزرەتی فاطیمە ـ رضي الله تعالى عنها ـ لە دواییدا حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی چووە دەرێ بۆ مزگەوت تیا راکشا ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی چوە لای فاطیمە ـ رضي الله تعالى عنها ـ لێی پرسی : کوڕی مامت لە کوێیە ؟ فەرمووی : [دەمقاڵێکمان بوو ، لێم تۆرا چوو بۆ مزگەوت . في اخرى] وا لە مزگەوتە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی چوو بۆ مزگەوت بۆ لای ، وای دی کە بەرماڵەکەی لە کۆڵ

کەوتۆتـە خوارێ ، پشتی خـۆڵاویی بوە . پێغـەمەر ـ ﷺ ـ بـە دەستی موبارەکی خۆی خۆڵو تۆزی لە پشتی حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەسری‌و ئەیفەرموو : هەڵسە دانیشە (ابا تـراب) ! دوو دەفعەی فەرموو . [....]

٩٤٩/٧٢ عن سعد بن عبيدة قـال : جاء رجـل [نافـع بن الازرق الخارجي ...] الى ابن عمر فسأله عن عثمان [رضي الله تعالى عنـه] فذكر عن محـاسن عمله ، قال : لعلك ذلـك يسوؤك ؟ قـال : نعم . قال : فارغم الله بانفك ! ثم سأله عن عليّ [رضي الله تعالى عنه] فذكر محاسن عمله . قال : هو ذاك بيته اوسط بيوت النبيّ [وعند النسائي : فقال : انظر الى منزله من نبيّ الله ـ ﷺ ـ ليس في المسجد غير بيته] ثم قال : لعل ذلك يسوؤك ؟ قال : اجل . قال : فأرغم الله بانفك ! انطلق فاجهد عليَّ جهدَك . ح ـ ٦/١١٢ ن .

**تەرجەمە :**

سەعدی ئیبن‌و عوبەیدە ئەفەرموێ : پیاوێ ، کە نافیعی کوڕی ئەزرەقی خاریجی یە ، هاتە خدمەت حەزرەتی عەبدوڵڵای کوڕی ئیمامی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ دەرحـەق ئیمامی عـوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ سوئالی لێ‌کرد ، ئیبن‌و عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ بەحثی لە مەنقەبەی حەزرەتی عوثمان بۆکرد ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە دوایی دا بە (ابن الازرق)ی فەرموو : رەنگە پێت ناخۆش بێ کە بەحثم لە چاکەی کرد ؟ وتی : بەڵێ . حەزرەتی ئیبن‌وعومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ پێی فەرموو : کە وابێ خوا ـ عز وجل ـ لووتت لە خۆڵەوە گلێنێ ، لە دوایی دا (ابن الازرق) دەرحەق حەزرەتی عەلی لێی پرسی ـ رضي الله تعالى عنهما ـ بەحثی مەحاسینی بۆکرد . فەرمووی : حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالى

عنه - ئەوە ماڵەکەیەتی لە مزگەوتا ، لە ناوەراستی مـاڵەکـانی پێغەمـەرا - ﷺ - بزانە چەندە لە پێغەمەرەوە - ﷺ - نزیکە ؟ غەیری هۆدەی ئەو هۆدەی کەسی تر لە مزگەوتا نییە . لە دوایی دا ئیبن وعومەر - رضي الله تعالى عنهما - بە نافیعی فەرموو : رەنگە لات ناخـۆش بێ کە مـەدحی حـەزرەتی عەلیم - رضي الله تعـالى عنه - بـۆ کـردی ؟ وتی : بـەڵێ . فەرمووی : خوا - عز وجل - لووتت پێ لە ئەرز نێ ، ئیتر برۆ مل بشکێنە هەرچیت لە دەست بێ دەرحەقم هیچ قوصوور مەکە .

٩٥٠/٧٣ عن مصعب ، عن سعد بن ابي وقاص [رضي الله تعـالى عنه] قال : خَلَّفَ رسول الله - ﷺ - عليَّ ابنِ ابي طالب - رضي الله تعالى عنه - في غزوة تبوك ، فقال : يا رسول الله تُخَلِّفني في النساء والصبيان ؟ فقال : اما ترضى ان تكون مني بمنزلة هارون من موسى ؟ غير انه لا نبيَّ بعدي .

وعن عامر ابنه الآخر ، عن ابيه ، وليس فيه حديث التخلف . ولفظه : قال رسول الله - ﷺ - لعليٍّ [رضي الله تعالى عنه] : انت مني بمنزلة هارون من موسى الا انه لا نبيَّ بعدي .

قال سعيد [بن المسيب] : فأحببت ان اشافه بها سعدا ، فلقيت سعدا [رضي الله تعالى عنه] فحدثته بما حدثني به عـامر ، فقـال : انا سمعته . فقلت : انت سمعته ؟ قـال : فوضـع اصبعيه عـلى اذنيه ، فقـال : نعم ، وإلا فـاستكَّتـا [كـاحمـرٌ من سـكٍّ ، اى صَمَّتـا] م - ٨/٢٩٧/٩ ، ح - ١١٣/٦ وليس فيه حديث التخلف ن ، جه . وفي رواية احمد : فقال عليٌّ - رضي الله تعالى عنه - : رضيت ، رضيت .

تەرجەمە :

لە سەعدی بني ئەبی وەقاص - رضي الله تعالى عنه - ریوایەت کراوە

كە پێغەمەر - ﷺ - حەزرەتی عەلی ی لە غەزای تەبووکا بەجێ هێشت .
حەزرەتی عەلی - رضي الله تعالى عنه - عەرزی کرد : لە ناو ژنان و منالانا بەجێم ئێلی ؟ پێغەمەر - ﷺ - پێی فەرموو : رازی نابی بەوە کە تۆ لەگەڵ منا وەکوو هاروون وابی بە نیسبەت حەزرەتی مووسا - علیه السلام - ەوە ؟ ئەوەندەی هەیە کە لە دوای من هیچ پێغەمەر نی یە .

لە ریوایەتی ئەحمەدا - رضي الله تعالى عنه - حەزرەتی عەلی - رضي الله تعالى عنه - دوو دەفعە فەرمووی : رازیم ، رازیم .

بەمە دوشمنی ئەهلی بەیت شەق ببەن .

٩٥١/٧٤ عن عبيدة عن علي - رضي الله تعالى عنه - قال [لاهل العراق لما قدمها واخبرهم ان رأيه كرأي عمر - رضي الله تعالى عنه - في عدم بيع امهات الاولاد ، وانه رجع عنه ، فرأى ان يبعن . وقال له عبيدة السلماني : رأيك ورأي عمر - رضي الله تعالى عنه - في الجماعة احب اليَّ من رأيك وحدك في الفرقة] : أقضوا كما كنتم تقضون ؛ فاني اكره الاختلاف حتى يكون للناس جماعة ، او اموت كما مات اصحابي ، فكان ابن سيرين يرى أن عامة ما يروى على عليّ [رضي الله تعالى عنه] من مخالفة الشخين : الكذبُ . ح - ١١٣/٦

تەرجەمە :

حەزرەتی عەلی - رضي الله تعالى عنه - کە تەشریفی چوو بۆ عێراق لە خوصووصی بەیعی (ام الولد)ا رەئیی وابوو کە نافرۆشین . وەك رەئیی ئیمامی عومەر - رضي الله تعالى عنه - لە پاشا رەئیی گۆڕرا کە ئەفرۆشرێ . عەبیدەی سەلمانی عەرزی کرد : رەئیی تۆو رەئیی عومەر - رضي الله تعالى عنه - لە موافەقەتا لە تەنها رەئیی تۆ چاکترە لە جوێبوونەوەتا لە عومەر - رضي الله تعالى عنه - . حەزرەتی عەلی

ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : تا ئێستە چۆنتان حوکم کردوە کە نافرۆشرێن ئێستەیش هەروا حوکم بکەن بە نەفرۆتنی ، من لام ناخۆشە کە ئیختیلافم بێ لەگەڵ شەیخەینا تا خەڵق هەموو (متفق) بن ئیختیلاف لە بەینا نەبێ ، یا ئەمرم وەکوو رەفیقەکانم مردوون لەسەر (اتفاق) .

ئیبن‌وسیرین ئەفەرموێ : بەم فەرموودەی حەزرەتی عەلی‌یە مەعلووم ئەبێ هەرچی دەرحەق حەزرەتی عەلی ریوایەت‌کراوە کە موخالەفەی شەیخەینی کردوە . . هەمووی درۆیە .

فەضلی حەزرەتی عەلی لەم حەدیثەدا ئەوەیە کە بۆ خاتری ئەمە ئیختیلاف نەکەوێتە ناو ئومەتەوە وازی لە رەئیی خۆی هێناوە ، مەنفەعەتی عامەی تەرجیح داوە بەسەر مەنفەعەتی شەخصیی خۆیا . ـ رضي الله تعالى عنه ـ .

٩٥٢/٧٥ عن ابي هريرة [رضي الله تعالى عنه] ان رسول الله ـ ﷺ ـ قال يوم خيبر : لأُعطينَّ هذه الراية رجلا يحب الله ورسوله ، يفتح الله على يديه . قال عمر بن الخطاب : ما احببت الأمارة الا يومئذ ، قال : فتساورت لها [اى تطاولت] رجاء ان ادعى لها . قال : فدعا رسول الله ـ ﷺ ـ عليَّ ابن ابي طالب ، فاعطاه اياها ، قال : امش ولا تلتفت حتى يفتح الله عليك . قال : فسار عليّ شيئا ثم وقف ولم يلتفت ، فصرخ : يا رسول الله على ماذا اقاتل الناس ؟ قال : قاتلهم حتى يشهدوا ان لا اله الا الله ، وأن محمدا رسول الله ، فاذا فعلوا ذلك فقد منعوا منك دماءهم واموالهم الا بحقها ، وحسابهم على الله .[1] = م ـ ٩/ ٣٠٠ =

(١) دانەر لێرەدا ئیشارەی بۆ شوێنی حەدیثەکە ـ واتە سەرچاوەکەی ـ نەکردوە .

**تەرجەمە :**

ئەم حەدیثەیش وەك حەدیثەكەی پێشووی وەهایە . ئەوەی زیادە كە حەزرەتی عومەر - رضي الله تعالى عنه - یش لەوێ بوە ، ئومێدی بوە كە بەبیاخەكەی تەسلیم بكرێ ، ئەوەیشی تیایە كە پێغەمەر - ﷺ - ئەمری بە ئیمامی عەلی فەرموو : برۆو ئاوڕ مەدەرەوە ، ئەویش كەمێ رۆیی و وەستا ، بێ ئەمە ئاوڕبداتەوە . لە پێغەمەری پرسی - ﷺ - : كە لەسەرچی شەڕیان لەگەڵ بكەم ؟ یەعنی بە ذەڕڕە موخالەفەی ئەمری نەكرد .

٩٥٣/٧٦ عن ابي حازم ، عن سهل بن سعد [رضي الله تعالى عنه] قال : استعمل على المدينة رجل [. . . . .] قال : فدعا سهل بن سعد ، قال : فامره ان يشتم عليًّا ، قال : فابى سهل . فقال له : امَّا اذا ابيت فقل : لعنَ الله ابا تراب . فقال سهل [رضي الله تعالى عنه] : ما كان لعليٍّ اسم احبَّ اليه من ابي التراب ، وان كان ليفرح اذا دعي بها . فقال له : اخبرنا عن قصته لم سُمِّيَ ابا تراب ؟ قال : جاء رسول الله - ﷺ - بيت فاطمة [رضي الله تعالى عنه] فلم يجد عليا في البيت ، فقال : اين ابن عمك ؟ فقالت : كان بيني وبينه شيئ فغاضبني ، فخرج ، فلم يَقِلْ عندي . فقال رسول الله - ﷺ - لانسانٍ : انظر اين هو ؟ فجاء فقال : يا رسول الله هو في المسجد راقد ، فجاءه وهو مضطجع قد سقط رداؤه عن شقه ، فاصابه تراب . فجعل رسول الله - ﷺ - يمسحه عنه ويقول : قم ابا التراب ، قم ابا التراب . م - ٣٠٦/٩ ، ح - ١١١/٦ كتب هذا في ٩٤٨/٧١ بفرق يسير .

**تەرجەمە :**

ئەبو حازم ـ رحمه الله ـ لە سەهلی کوری سەعدی ساعیدی یەوە ریوایەت ئەکا کە فەرمووی : پیاوێ [. . . .] [لە فتح الباری دا ئەڵێ : ئەو پیاوە مەروانە . . .] لەسەر مەدینە کرا بە ئەمیر ، ئەمری پێ کرد کە جوێن بدا بە ئیمامی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ سەهـل ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئیمتیناعی کرد لە جوێن پێدانی ، ئەو نەتەوەی لەعینە وتی : هەر جوێنی پێ نادەی بڵێ : (لعن الله ابـا التراب) [. . . . .] سـەهل فەرمووی ـ رضي الله تعالى عنه ـ : لای حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ، ولعن من لعنه وسبه . من کان ـ لە ناوی (ابی التراب) خۆشەویستر ناوێکی تری نەبوو ، بەو ناوە بانگ بکرایە پێی فەرەحناك ئەبوو . ئەبو حازم عەرزی سەهلی کرد ـ رضي الله تعالى عنه ـ : (قصه)ی ئەوە چۆنە بۆچ پێی ئەڵێن (ابو التراب) ؟ فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشـریفی بردە ماڵی حەزرەتی فاطیمە ـ رضي الله تعالى عنهـا ـ ئیمامی عـەلی ی لێ نەبینی . پرسی : ئامۆزات لە کوێیە ؟ عەرزی کرد : دەم قاڵێکمـان لە بەینا بوو چووە دەرێ ، لای من چێشتەخەوی نەکرد . پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە کەسێکی فەرمـوو : بچۆ بـروانە لـە کوێیـە ؟ هاتـەوە عەرزی کـرد : تەشریفی لە مزگەوتا نوستوە (یا رسول الله) . پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی چـوو بە لایـەوە ، لەوێ راکشـابوو ، بـەرمـاڵـەکـەی لـە تـەنیشتێکی داخزابوو ، تۆزاوی بووبوو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ تۆزەکـەی لێ ئەسـری و ئەیفەرموو : هەڵسە (ابو التراب) هەڵسە (ابو التراب) . [دوو جار]

لە مزگەوتا نوستن دروستە ، ئاشتکردنەوەی ئینسانی رق هـەڵساو سـوننەتـە ، لەطیفـە لەگـەڵ کردنی و بـۆ دڵهێنانـەوەجێی چوونـە لایشی سوننەتە .

چ تەئویلێ قابیلە بکرێ بۆ ئەو بێحەیایانەی رووڕەشانـەی دنیاو ئاخیرەتـە ؟ (فسبحان الله !) خـوا لە نـەسلی مـەروان عـومـەری بنی عەبدولعەزیز ـ رضي الله تعالى عنه ـ ێنێتە وجوود !

٩٥٤/٧٧ عن سعد بن ابي وقاص [رضي الله تعالى عنه] قال : امر معاوية بن ابي سفيان سعدا [رضي الله تعالى عنه] فقال : ما منعك ان تسبَّ ابا التراب . فقال : اما [دام] ما ذكرتُ ثلاثا قالهن له رسول الله ـ ﷺ ـ فلن اسبه . لان تكون لي واحدة منهن احب اليَّ من حمر النعم : سمعت رسول الله ـ ﷺ ـ يقول له ـ وقد خَلَّفهُ في بعض مغازيه ـ فقال له عليّ : يا رسول الله خلَّفتني مع النساء والصبيان ! فقال له رسـول الله ـ ﷺ ـ : اما ترضى ان تكون مني بمنزلة هارون من موسى ؟ الا انه لا نبوة بعدي .

وسمعته يقول يوم خيبر : لأعطينَّ الراية رجلا يحب الله ورسوله ، ويحبه الله ورسوله . قال : فتطاولنا لها ، فقال : ادعوا لي عليا ، فأتي به أرمدُ ، فبصق في عينيه ، ودفع الراية اليه ، ففتح الله عليه .

ولما نزلت هذه الآية : ﴿قل : تعالوا ندع أبناءنا وأبناءكم [ونساءنا ونسـاءكم ، وأنفسنـا وأنفسكم . ثم نبتهـل فنجعـل لعنـة الله عـلى الكاذبين﴾ . آل عمـران][1] دعا رسـول الله ـ ﷺ ـ عليا ، وفـاطمة ، وحسنا ، وحسينا ، فقال : اللهم هؤلاء أهلي . م ـ ٢٩٨/٩

تەرجەمە :

عامیری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ـ رحمه الله تعـالى ، ورضي عن ابيه ـ ئەفەرموێ : موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ئەمری کرد

---

(١) بڕوانە : سوورەتی ئالی عیمران ، ئایەتی : (٦١)

به سه‌عد ـ رضي الله تعالى عنه ـ وتی : چی‌ یه‌ تۆی مه‌نع‌ کردوه‌ له‌وه‌ که‌ جوێن بده‌ی به‌ عه‌لی (ابـو التراب) ؟ سـه‌عد ـ رضي الله تعـالى عنه ـ فه‌رمووی : ئاگات له‌ خۆت بێ ! پێغـه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ سێ شتی ده‌رحـه‌ق حه‌زره‌تی عه‌لی فه‌رموه‌ ، قه‌ط له‌ فکرم ناچێته‌وه‌ ، ئه‌گه‌ر من یه‌کێکم له‌و سێ شته‌ ببێ له‌ هه‌موو مالێیاتی سوور له‌ لام چاکتر ئه‌بێ . (مادام) ئه‌و سێ شته‌م بیته‌فکر جوێنی پێ نادەم :

پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ که‌ عه‌لی ی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ی له‌ به‌عزێ غه‌زادا نه‌برد له‌ خذمه‌تی خۆیا . . حـه‌زره‌تی عه‌لی عـه‌رزی‌کرد : (یـا رسول الله) من له‌گه‌ڵ ژن‌و منالآنا به‌جێ ییـڵی ؟ له‌ پێغـه‌مه‌رم ـ ﷺ ـ بیست پێی فه‌رموو : رازی نابی به‌وه‌ کـه‌ تۆ بـه‌ نیسبه‌ت منـه‌وه‌ وه‌کوو هاروون وابی به‌ نیسبه‌ت مووساوه‌ ؟ ئه‌وه‌نده‌ی هه‌یـه‌ که‌ لـه‌ دوای من پێغه‌مه‌ر نی‌یه‌ .

لـه‌ پێغه‌مـه‌رم بیست ـ ﷺ ـ له‌ رۆژی خـه‌یبه‌را ئـه‌یفـه‌رمـوو : بـه‌یباخـه‌که‌ ئـه‌ده‌م به‌ یـه‌کێ ، بـه‌ پیـاوێ ، خـواو ره‌سـوولی خـوای خۆشه‌وێ ، خواو ره‌سوولی خوایش ئه‌ویان خۆشه‌وێ . سه‌عد ـ رضي الله تعالى عنه ـ فه‌رمووی : هه‌موو ملمان بۆ درێژ کرد ، فـه‌رمووی : عه‌لیم بۆ بانگ بکه‌ن عه‌لییان هێنا ، چاوی ئه‌یێشـا ، تفی مویـاره‌کی خۆیی کرده‌ ناو هه‌ردوو چاوی‌یه‌وه‌و به‌یباخه‌که‌ی ته‌سلیم فه‌رموو ، خوا خه‌یبه‌ری له‌سه‌ر ده‌ستا فه‌تح کرد .

[کـه‌ نه‌صـارا ئیددیعـای ئه‌وه‌یـان کرد کـه‌ عیسا ـ عليـه الصلاة والسلام ـ کوڕی خوایه‌ ، خوا ـ عز وجل ـ له‌ سووره‌تی ئالی عیمرانا به‌یانی چۆن‌هاتنه‌دنیای حه‌زرتی عیسای فه‌رموو به‌ موقابه‌له‌ی ئه‌وه‌ که‌ حه‌زره‌تی عیسا به‌ بێ باوك خه‌لقکردنیان کردوه‌ به‌ ده‌لیل له‌سه‌ر ئه‌وه‌ که‌ عیسا ئه‌بێ

کوڕی خوا بێ . . . خوا ـ عز وجل ـ ئەو ئایەتەی نازڵ فەرموو کە مەثالی وایە : بە بێ شك مەثەلی حەزرەتی عیسا لە لای خوا وەکوو مەثەلی ئادەم وایە ، کە لەگڵ خەلقی فەرموو لە پاشا ئەمری پێ فەرمو : ببە ، ئەویش بوو . یەعنی خوا موقتەدیرە لە هیچەوە شت خەلق بکا ، خەلقی (١) عیسایشی بە بێ باوك وا خەلق کردوە ، کە وابێ هەرکەسێ دەرحەق عیسا موجادەلەت لەگەڵ بکا] پێیان بڵێ : ئەی نەصارا بێن ئێمە کورەکانمان بانگ ئەکەین ، ئێوەیش کورەکانتان بانگ بکەن [ژنەکانمان بانگ ئەکەین و ژنەکانتان بانگ بکەن ، نەفسی خۆمان بانگ ئەکەین و نەفسی خۆتان بانگ بکەن ، لە دواییا لە خوا ئەپاڕێینەوە طەلەبی ئەوەی لێ ئەکەین کە خوا لەعنەت بکا لەوەی کە درۆزنە] کە خوا ئەم ئایەتەی نازڵ کرد ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەلی و ، فاطیمەو ، حەسەن و ، حوسەینی بانگ کردو ، فەرمووی : یا ڕەببی ئەمانە ئەهلی منن . [یەعني لە دوای ئەمانە ئیتر من چۆن جوێن بدەم بە حەزرەتی عەلی کە : وەك هاروون وابێ ، کە موحیب و مەحبووبی خواو پێغەمەری بێ ، کە وەك نەفسی پێغەمەر بێ ـ ﷺ ـ کە ئەهلی ئەو بێ ؟]

نەوەوی ـ رحمه الله ـ بۆ ئەم نەوعە حەدیثانە تەئویلێکی زۆر ضەعیف ئەکا . تەماشای بفەرموون بە ئینصاف ، تەئویلی مەقبوول تەئویلی قەریبە .

ئێستە هەردوو لا لە حوزووری خوادان ـ عز وجل ـ (أحکم الحاکمین)ە بە عەدالەت حوکم لە بەینیانا ئەکا ، حەقی هەموویان جێبەجێ ئەکا . ئیتر ئێمە هەرچی بڵێین زیادەو بێ فائیدەیە . هەزارو

---

(١) ئەم (خەلقی) یە نەبێ ماناکەی باشتر دەڕوات .

سێصه‌دو ئه‌وه‌نده ساڵه‌ی به‌سه‌را رابوردوه .

عن ذِر [بن حُبيش ـ رضي الله تعالى عنه ـ وكان من المعمرين ، أدرك الجاهلية ، ومات سنة اثنتين وثمانين وهو ابن مائة وعشرين ، وقيل : واثنتين وعشرين ، وقيل : سبع وعشرين . نووي] قال : قال عليٌّ ـ رضي الله تعالى عنه ـ : والذي فلق الحبة ، وبرأ النسمة ! إنه لعهد النبيِّ الأمّيِّ إليَّ : أن لا يحبني الا مؤمن [وأنا وملا حسين نحبه] ولا يبغضني إلا منافق [. . . .] م ـ ١ / ٤١١

**ته‌رجه‌مه :**

حه‌زره‌تی عه‌لی ـ رضي الله تعالى عنه ـ فه‌رمووی : قه‌سه‌م به‌وه‌ی دانه له‌ت ئه‌كاو ، گیاو گه‌نم و جۆو دانه‌وێڵه‌ی لێ ئه‌روێنێ‌و ، نوطفه‌ی كردوه به ئینسان ! به بێ شك پێغه‌مه‌ری (امّی) ـ ﷺ ـ عه‌هدی له‌گه‌ڵ منا كردوه كه غه‌یری (مؤمن) من ناحوبیێنێ‌و غه‌یری مونافیق من نابوغضێنێ"[1] .

[هه‌رچی ئه‌هلی سوننه‌ت بێ خۆشی ئه‌وێ ، هه‌ركه‌سێ بی بوغضێنێ‌و جوێنی پێ بداو ئه‌مركا به جوێنپێدانی ئه‌و كه‌سه مونافیقه ، وه‌ك ئه‌و مونافیقه‌یه كه له‌و حه‌دیثه‌دایه له ئیمانا رابورد : «ثلاث مَنْ كنَّ فيه فهو منافق . . . او كما قال»]

(١) وه‌رگێر ـ خ ـ گه‌لێ جار له شه‌رحی قه‌سطه‌لانی‌و نه‌وه‌وی وه‌رده‌گرێ‌و ، له ناو حه‌دیثه‌كه‌دا ده‌ینوسێ . كاتێك دێته‌سه‌ر ته‌رجه‌مه‌ی حه‌دیثه‌كه ئه‌و وه‌رگیراوه ته‌رجه‌مه ناكا ، وه‌ك لێره‌دا ده‌رباره‌ی ذیری كوری حوبه‌یش ده‌بینرێت . زیاد له‌مه‌یش لێره‌دا ژماره‌ی بۆ ئه‌م حه‌دیثه دانه‌ناوه .

# فضائل اصحابه

- عليه الصلاة والسلام ، ورضي عنهم -

## فضائل قرابته - عليه الصلاة والسلام -

## فضل فاطمة - رضي الله تعالى عنها -

### وفيها حديث المباهلة وآيتها .

٩٥٥/٧٨ مسور بن مخرمة [رضي الله تعالى عنه] حدث أنه سمع رسول الله - ﷺ - على المنبر وهو يقول : ألا إن بني هشام بن المغيرة إستأذنوني أن يُنكِحُوا ابنتهم عليَّ ابن أبي طالب فلا آذن لهم ، ثم لا آذن لهم ، ثم لا آذن لهم - إلا أن يحب ابن أبي طالب أن يطلق ابنتي ويُنكحَ ابنتهم ، فانَّما ابنتي بضعة مني ، يَريبني ما رابها ويوذيني ما آذاها .
م - ٣٥٦/٩

تەئریخی وەلادەتی ٤١ (من المولد النبوي) - عليه الصلاة والسلام - (تأريخ وفاتها سنة ١١ ليلة) سێشەمەی رەمەزان .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە سەر مینبەر ئەیفەرموو : بزانن کە بەنی هیشامی کوڕی موغیرە ـ یەعنی کەس و کاری ئەبوجەهل ، ئەوانەیان کە موسوڵمان بوون ـ ئیذنیان لێ خواستم کە کچی خۆیان لە عەلی کوڕی ئەبو طالیب مارەکەن . ئیذنیان نادەم ، لە دواییا ئیذنیان نادەم ، لە دواییا ئیـذنیان نادەم [سێ دەفعە] مەگەرەکی کوری ئەبو طالیب حەزکا کە کچەکـەم طەلاق‌داو کچی ئەوان بهێنێ . کچی من هەر پارچەیێ گۆشتە لە من ، ئەوی ئەو بخاتە غائیلەوە منیش ئەخاتە عئیلەوە ، ئەوی ئەذیەتی ئەو بدا ئەذیەتی منیش ئەدا .

٩٥٦/٧٩ علي بن الحسين [رضي الله تعالى عنهما] حدث ابن شهاب ، أنهم حين قدموا المدينة من عند يزيد [الملعون] ابن معاوية مقتل الحسين بن علي [رضي الله تعالى عنهما] لقيه المسور بن مخرَمة . فقال له : هل لك اليّ حاجةٌ تأمرني بها ؟ قال : فقلت له : لا . قال له : هل أنت معطيّ سيف رسول الله ـ ﷺ ـ ؟ فاني أخاف أن يغلبك القوم عليه وأيم الله لان أعطيتني لا يُخْلَصُ إليه أبدا ! حتى تبلغ نفسي . إن علي ابن ابي طالب [رضي الله تعالى عنه] خطب بنت أبي جهل على فاطمة [رضي الله تعالى عنها] فسمعتُ رسول الله ـ ﷺ ـ وهو يخطبُ الناس في ذلك على منبره هذا ، وأنا يومئذ محتلم ، فقال : إن فاطمة مني ، وإني أتخوّف أن تفتن في دينها . قال : ثم ذكـر صهرا لـه من بني عبدشمس ، فـأثنى عليه في مصاهرته إياه ، فأحسن ، قال : حدثني فصدقني ووعـدني فأوفى لي ، وإني لست أُحرِّم حلالا ولا أُحِلُّ حراما ، ولكن والله لا تجتمع بنت رسول الله ـ ﷺ ـ وبنت عـدو الله مكـانـا واحـدا أبـدا . م ـ ٩/٣٥٦ ، ح ـ ٥/١٩٣ .

ته‌رجه‌مه :

عه‌لی ئه‌صغه‌ری کوڕی ئیمامی حسه‌ین - رضي الله تعالی عنهما - فه‌رمووی : که له طه‌ره‌ف یه‌زیدی له‌عینی کوڕی موعاویه‌وه ئیذن دراین و هاتینه مه‌دینه له زه‌مانی شه‌هاده‌تی حه‌زره‌تی حسه‌ینی کوڕی حه‌زره‌تی عه‌لی - رضي الله تعالی عنهما ، ولعن قاتلهما - میسوه‌ری کوڕی مه‌خرومه - رضي الله تعالی عنه - ی چوه خدمه‌ت ، عه‌رزی فه‌رموو : ئیحتیاجییێك هه‌یه ئه‌مرم پێ بکه‌ی بیکه‌م ؟ وتم : خه‌یر . میسوه‌ر فه‌رمووی : عه‌رزم‌کرد : شیری موباره‌کی پێغه‌مه‌رم ئه‌ده‌یتێ - ﷺ - ؟ چونکی ئه‌ترسم که خه‌ڵق - یه‌عنی به‌نی ئومه‌ییه - غه‌ڵه‌به‌ت به‌سه‌را بکه‌ن و ، به زۆر لێت بستێنن . ئه‌گه‌ر بیده‌ی به من [بۆت حیفظ بکه‌م] وه‌ڵڵاهی تا نه‌مکوژن قه‌ت نایێڵم که‌س ده‌ستی بیگاتێ .

[زی بخارا می رود این سوخته][1]

---

(١) ئه‌مه نیوه‌ی به‌یتێکی (مثنوی) یه (قزلجی) به نموونه‌ی لادان له بابه‌تێکه‌وه بۆ بابه‌تێکی دیکه هێناویه‌تی . له (تصریف ملا علی) له باسی مه‌صده‌ری (فعل)ی لازمدا نووسیویه . مامۆستا مه‌لا ره‌شید - خ - چه‌ند جارێك ئه‌م شیعره‌ی نووسیوه . جگه له‌م شوێنه له حه‌دیثی ژماره (٦٣٢) یشدا نووسیویه . ئه‌مه ته‌واوی شیعره‌که‌یه :

شمع مریمرا بهل أفروخته

زی بخارا می رود إین سوخته

له چاپی (تصریف ملا علي) دا له باتی (زی بخارا) (زینجارا) نووسراوه .

میسوەر - رضي الله تعالی عنه - فەرمووی : عەلی کوڕی ئەبو طالیب - خوای لێ رازی بێ - خوازبێنی کچی ئەبوجەهلی کرد بەسەر حەزرەتی فاطیمەی بهێنێ - رضي الله تعالی عنها - .

له پێغەمەرم - ﷺ - بیست لەو خوصووصەوە خوطبەی ئەخوێن لەسەر ئەم مینبەرە ، من ئەو رۆژە باڵغ بووبووم ، فەرمووی : فاطیمە لە منە ، ترسم هەیە لەوە کە بە واسیطەی هەوێوە لە دینا تووشی فیتنە ببێ .

میسوەر فەرمووی کە : پێغەمەر - ﷺ - دوای ئەو فەرموودەی بەحثی زاوایێکی خۆیی فەرموو لە ئەولادی عەبدی شەمس ، ئەنای لەسەر کرد بە ئەنایێکی باش . فەرمووی : قسەی بۆ کردم راستی پێ وتم ، وەعدەی پێدام بۆی بەجێ هێنام ، من حەلاڵ حەرام ناکەم ، حەرامیش حەلاڵ ناکەم ، ئەمما وەڵلاهی کچی - رسول الله ، ﷺ - لەگەڵ کچی دوشمنی خوا بە ئەبەدیی لە جێیەکا بە یەکەوە نابن .

اولادها : حسن ، حسين ، محسن ، زينب ، ام كلثوم ، رقية . - رضوان الله عليها وعليهم - ازدواجها مع علي - رضي الله تعالى عنه - بعد بدر في السنة الثانية .[1]

٩٥٧/٨٠ وعنه أن علي بن أبي طالب [رضي الله تعالى عنه] خطب بنت أبي جهل وعنده فاطمة بنت رسول الله - ﷺ - [ورضي عنها] فلما سمعت بذلك فاطمة [رضي الله تعالى عنها] أتت النبي - ﷺ - فقالت له : إن قومك يتحدثون أنك لا تغضب لبناتك وهذا علي ناكحا ابنة أبي جهل !

(١) دانەر - خ - ئەم قسەی دوایی تەرجەمە نەکردوە کە ئەمە مانـاکەیـەتی : حەزرەتی فاطیمە : حەسەنو ، حوسەینو ، موحسینو ، زەینەبو ، (ام كلثوم)و روقیەی بوە . دوای جەنگی بەدر لە ساڵی دووی کۆچیدا شووی کردوە بە حەزرەتی عەلی .

قال المسور : فقام النبي ـ ﷺ ـ فسمعته حين تشهد ، ثم قال : أمّا بعد : فإني أنكحت أبا العاص ابن الربيع [ابنته زينب ـ رضي الله تعالى عنها ـ] فحدثني فصدقني ، وإن فاطمة ابنة محمد [ﷺ ورضي الله تعالى عنها] مضغة مني ، وإنما اكره أن يفتنوها ، وإنها والله لا تجتمع بنت رسول الله ـ ﷺ ـ وبنت عدو الله عند رجل واحد أبدا . قال : فترك عليٌّ ـ رضي الله تعالى عنه ـ الخطبة . م ـ ٣٥٧/٩

تەرجەمە :

میسوەر ئەفەرموێ : عەلی کوری ئەبو طالیب ـ رضي الله تعالی عنه ـ که حەزرەتی فاطیمەی کچی پێغەمەری ـ ﷺ ـ ی لە ژێر نیکاحا بوو ، خوازبێنی کچی ئەبوجەهلی کرد . که حەزرەتی فاطیمە ئەوەی بیست تەشریفی هاتە خذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزی کرد : خزمەکانت وا ئەزانن کە تۆ بۆ کچەکانت غەضەبت هەڵناستێ . ئەوا عەلی کچی ئەبو جەهل ئەهێنێ !

پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی هەڵسا ، گوێم لێ بوو کە شەهادەتی هێنا ، لە پاشا فەرمووی : (اما بعد) من کچی خۆمم [کە حەزرەتی زەینەبە یە ـ رضي الله تعالی عنها] لە ئەبولعاصی کوری رەبیع نیکاح کرد ، قسەی راستی لەگەڵ کردم ، فاطیمەی کچی محەمەد ـ ﷺ ـ پارچەیێ گۆشتە لە من ، هەر ئەوەم پێ ناخۆشە کە تووشی فیتنەی بکەن . وەڵلاهی کچی (رسول الله) ـ ﷺ ـ و کچی دوشمنی خوا قەط نابێ لای پیاوێ ببن . میسوەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالی عنه ـ وازی لە خوازبێنی یەکە هێنا .

٩٥٨/٨١ ابن عمر عن ابي بكر ـ رضي الله تعالى عنهم ـ قال : ارقبوا محمدا ـ ﷺ ـ في أهل بيته . ح ـ ١١٦/٦

تەرجەمە :

ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : موراعاتی محەمەد بکەن ـ ﷺ ـ لە دەرحەق ئەهل و بەیتی .

٩٥٩/٨٢ يزيد بن حيان قال : إنطلقت أنا وحصين بن سيرة ، وعمر بن مسلم الى زيد بن أرقم ـ رضي الله تعالى عنه ـ فلما جلسنا اليه قال له حصين : لقد لقيت يا زيد خيرا كثيرا : رأيتَ رسول الله ـ ﷺ ـ وسمعتَ حديثَهُ ، وغزوت معه ، وصليت خلفه ، لقد لقيت يا زيد خيرا كثيراً . حدثنا يا زيد ما سمعت من رسول الله ـ ﷺ ـ قال : يا ابن أخي ! والله لقد كبرتْ سِنِي ، وقَدِمَ عهدي ، ونسيت بعض الذي كنت أعي من رسول الله ـ ﷺ ـ فما حدثتكم فاقبلوه ، وما لا فلا تكلفونيه : ثم قال : قام رسول الله ـ ﷺ ـ يوما فينا خطيبا بماء يدعى (خُمًّا) بين مكة والمدينة ؛ فحمد الله وأثنى عليه ، ووعظ ، وذكَّر ، ثم قال : أما بعد : ألا ايها الناس فإنما أنا بشر يوشك أن يأتي رسول ربي فأجيبَ ، وأنا تارك فيكم ثقلين :

اولهما كتاب الله فيه الهدي ، والنور . فخذوا بكتاب الله واستمسكوا به ، فحث على كتاب الله ورغب فيه .

ثم قال : وأهل بيتي ، أذكركم الله في أهل بيتي ، أذكركم الله في أهل بيتي ، أذكركم الله في أهل بيتي [ثلاثا] فقال له حصين : ومن أهل بيته يا زيد ؟ أليس نساؤه من أهل بيته ؟ قال : نساؤه من أهل بيته ، ولكن أهل بيته من حرم الصدقة بعده ، قال : ومن هم ؟ قال : هم آل عليٍّ ، وآل عقيلٍ ، وآل جعفرَ ، وآل عباس ، قال : كل هؤلاء حرم الصدقة ؟ قال : نعم . م ـ ٣٠٣/٩

وفي اخرى : كتاب الله ، فيه الهدي ، والنور من استمسك به

وأخذ به كان على الهدي ، ومن اخطأه ضل م ـ ٩/٣٠٥

وفي اخرى : كتاب الله هو حبل الله ، من اتبعه كان على الهدى ، ومن تركه كان على الضلالة . وفيه : فقلنا : من اهل بيته ؟ نساؤه ؟ قال : لا وايم الله ! ان المرأة تكون مع الرجل العصر من الدهر ، ثم يطلقها فترجع الى ابيها وقومها . اهل بيته : اصله ، وعصبته الذين حرموا الصدقة بعده . م ـ ٩/٣٠٦

تەرجەمە :

حصەینی کوڕی سیره عەرزی زەیدی کوڕی ئەرقەمی کرد ـ رضي الله تعالی عنه ـ : تۆ خێرێکی زۆرت تووش بوە : چاوت بە پێغەمەر ـ ﷺ ـ کەوتوە قسەت لێ بیستوە ، لە خزمەتیا غەزات کردوە ، نوێژت لە پشتەوە کردوە . . تووشی گەلێ خێر بووی . یا زەید قسەی ئەوەمان بۆ بکە کە لە پێغەمەرت بیستوە ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئەی کوڕی برای خۆم ! وەڵڵاهی پیر بووم ، زۆر دەمێکە لە خزمەتی دوور بووم ، بەعزێکم لەوانە کە لێم بیستوە لە فکرم چۆتەوە . ئەوی قسەتان بۆ بکەم لێم قەبووڵ بکەن ، ئەوی بۆتان بەحث نەکەم تەکلیفم لێ مەکەن ، لە دواییا زەید فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ لەسەر ئاوی (خوما) کە لە بەینی مەککەو مەدینەدایە ، بە خەطیبی لە بەینمانا تەشریفی راوەستا ، حەمدو ثەنای خوای کرد ، ذیکری خوای کرد ، وەعظی دادا بۆ خەڵق . لە دواییا فەرمووی : (اما بعد) : ئەی خەڵقینە خەبەردار بن من غەیری بەشەر هیچی تر نیم [یەعنی مەلائیکە نیم کە نەمرم] نزیکە کە فروستادەی خوام بێتە لاو ئیجابەتی دەعوەتی بکەم . من دوو شتی گرانو بەقیمەتتان لە ناوا بەجێ پێلم :

ئەووەڵیان : (کتاب الله) یە ، هیدایەتی تیایە ، نووری تیایە ،

دەست بە (کتاب الله)وە بگرن . هەرکەسێ دەستی پێ بگرێ ، بیگرێتە گوێ لەسەر هیدایەت ئەبێ . . هەرکەسێ تەرکی بکا لەسەر گومراهی ئەبێ .

۲ ـ لە دواییا فەرمووی : ئەهلی بەیتیشتان لە ناوا بەجێ ئێلم [سێ دەفعە لەسەر یەك] فەرموو ی : دەرحەق ئەهلو بەیتم خواتان ـ عز وجل ـ ئێنمەوە فیکر [یەعنی مەچن بەگژ یانا ، لێیان مەدەن ، جوێنیان پێ مەدەن ، مەیان کوژن ، ئەذاو جەفایان مەدەن ، . . .] حوصەین عەرزی زەیدی کرد : ـ رحمه الله تعالی ، ورضي عنه ـ : یا زەید ئەهلی بەیت کێن ؟ بۆ ژنەکانی لە ئەهلی بەیتی نین ؟ فەرمووی : ژنەکانی لە ئەهلی بەیتی ئەون [بەم مەعنایە لە خزمەتیا ئەبن لە مالا ، نەفەقەیان ئەکێشێ ، ئەمری بە ئیحتیرامیان کردوە] (لکن) ئەهلو بەیتی حەقیقی ئەو نین ، ئەهلو بەیتی حەقیقی ئەو ئەوانەن کە لقی شەجەرەی ئەوبن ، صەدەقەیان لێ حەرام بێ ، لە دوای ئەو مەحرووم بوون لە صەدەقە . حوصەین فەرمووی : ئەوانە کێن ؟ فەرمووی : ئەوانە ئالی عەلین ، ئالی عەقیلن ، ئالی جەعفەرن ، ئالی عەباسن [رضي الله تعالی عنهم اجمعین] . حوصەین فەرمووی : وتم : بۆ ئەوانە هەموویان صەدەقەیان لەسەر حەرامە ؟ فەرمووی : بەلێ .

لە ریوایەتەکەی ترا ئەفەرموێ : ئەزواجی طاهیراتی لە ئەهلی بەیتی ئەو نین [یەعنی ئەهلی بەیتی گۆشتو خوێنی ئەو نین] چونکی وەللاهی ژن زەمانێکی دوورو درێژ لەگەل مێردیدا دائەنیشێ لە دواییا [بە دوو کەلیمە] طەلاقی ئەدا ئەچێتەوە مالی باوانی .

[ژن بە دوو کەلیمە یێتە لای مێرد بە دوو کەلیمە یا بە مردنی مێرد لێی جوێ ئەبێتەوە . ئەهلی بەیتی حەقیقی ئەو خزمو کەسو کارەن کە

ئینسان خۆی بەدارا داو بە بەردا دا نیسبەت‌و عەلاقەی لەو پێ قەطع نەکرێ] .

٩٦٠/٨٣ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ ان فاطمة والعباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أتيا ابا بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ يلتمسان ميراثهما : ارضه من فَدَك وسهمه من خيبر ، فقال ابو بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ : سمعت النبي ـ ﷺ ـ يقول : لا نورَثُ ، ما تركناه صدقة ، انما يأكل آل محمد في هذا المال ، والله لقرابة رسول الله ـ ﷺ ـ احبُّ اليّ ان اصل من قرابتي . ح ـ ٢٧٢/٦ ، م ـ ٣٦٣/٧

تەرجەمە :

حەزرەتی عائیشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : حەزرەتی فاطیمەو عەبباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ تەشریفیان هاتنە خذمەت حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ داوای ئیرثیان لێ‌کرد لە ئەرزی فەدەك‌و سەهمی پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە خەیبەر . ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ م بیستوە ئەیفەرموو : ئێمە [یەعنی هەموو ئەنبیا ـ عليهم الصلاة والسلام ـ] ئیرثمان لێ ناگیرێ ، ئەو ماڵەی کە لە دوای خۆمان بەجێی بێڵین صەدەقەیە . ئالی محەمەد لەم ماڵە هەر لێی ئەخوا [یەعنی بە قەدەری ئیحتیاجی ، بۆی نییە تەمەللوکی بکا] وەڵڵاهی صیلەی رەحم بەجێهێنان لەگەڵ خزمی نزیکی پێغەمەر ـ ﷺ ـ م پێ خۆشترە لەوەی کە صیلەی رەحم لەگەڵ خزمانی خۆم بەجێ بێنم .

٩٦١/٨٤ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ ان فاطمة ـ عليها السلام ـ [المناسب ـ رضي الله تعالى عنها ـ] بنت النبي ـ ﷺ ـ ارسلَتْ الى ابي بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ تسأله ميراثها من رسول الله ـ ﷺ ـ مما أفاء

الله عليه بالمدينة وفَدَك وما بَقِيَ من خمس خيبر ، فقال ابو بكر [رضي الله تعالى عنه] : ان رسول الله - ﷺ - قال : لا نورثُ ، ما تركناه صدقة ، انما يأكل آل محمد في هذا المال ، واني والله لا اغير شيئا من صدقة رسول الله - ﷺ - عن حالها التي كان عليها في عهد رسول الله - ﷺ - ولأعملنَّ فيها بما عمل به رسول الله - ﷺ - فابى ابو بكر ان يدفع الى فاطمة منها شيئا .

فوجدت فاطمة على ابي بكر [رضي الله تعالى عنهما] في ذلك ، فهجرته ؛ فلم تكلمه حتى توفيت ، وعاشت بعد النبيِّ - ﷺ - ستة اشهر ، فلما توفيت دفنها زوجها عليٌّ [رضي الله تعالى عنه] ليلا ولم يؤذِن بها ابا بكر [رضي الله تعالى عنه] وصلى عليها ، وكان لعليٍّ [رضي الله تعالى عنه] من الناس وجه حياة فاطمة [رضي الله تعالى عنها] فلما توفيت استنكر عليٌّ وجوه الناس ، فالتمس مصالحة ابي بكر [رضي الله تعالى عنهما] ومبايعته ، ولم يكن يبايع تلك الاشهر ، فأرسل الى ابي بكر [رضي الله تعالى عنه] : ان ائتنا ولا يأتنا احد معك كراهية لمحضر عمر [رضي الله تعالى عنه] فقال عمر : لا والله لا تدخل عليهم وحدك ! فقال ابو بكر [رضي الله تعالى عنه] وما عسيتهم ان يفعلوا بي ؟والله لآتينهم ! فدخل عليهم ابو بكر ، فتشهد عليٌّ [رضي الله تعالى عنهما] فقال : انا قد عرفنا فضلك ، وما اعطاك الله ، ولم ننفس علينا خيرا ساقه الله اليك . ولكنَّك استبددت علينا بالامر ، وكنا نرى لقرابتنا من رسول الله - ﷺ - نصيبنا حتى فاضت عينا ابي بكر [رضي الله تعالى عنه] .

فلما تكلم ابو بكر [رضي الله تعالى عنه] قال : والذي نفسي بيده ! لقرابة رسول الله - ﷺ - احبُّ اليَّ ان اصل من قرابتي . واما الذي شجر بيني وبينكم من هذه الاموال فلم آل فيها عن الخير ، ولم اترك امرا رأيتُ

رسول الله ـ ﷺ ـ يصنعه فيها الا صنعته . فقال عليٌّ لأبي بكر [رضي الله تعالى عنهما] : موعدك العشيَّة للبيعة ، فلما صلى ابو بكر [رضي الله تعالى عنه] الظهر رقيَ المنبر ، فتشهد ، وذكر شأن عليٍّ وتخلُّفَهُ عن البيعة وعُذْره بالذي اعتذر اليه ، ثم استغفر وتشهد عليٌّ [رضي الله تعالى عنه] فعظَّم حق ابي بكر [وذكر فضله وسابقته في الاسلام ، ثم مضى الى ابي بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فبايعه . مسلم] وحدث انه لم يحمله على الذي صنع نفاسةً على ابي بكر ، ولا انكارا للذي فضَّله الله به ، ولكنا كنا نرى لنا في هذا الامر نصيبا ، فاستبد علينا ، فوجدنا في انفسنا ، فَسُرَّ بذلك المسلمون ، وقالوا : اصبت ، وكان المسلمون الى علي قريبا حين راجع الأمر بالمعروف . ح ـ ٦/٣٦٢ ، م ـ ٧/٣٥٩

[وصحح ابن حبان وغيره من حديث ابي سعيد الخدري ـ رضي الله تعالى عنه ـ ان علياً بايع ابا بكر في اول الامر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ واما مافي مسلم عن الزهري ان رجلا قال له : لم يبايع عليٌّ ابا بكر حتى ماتت فاطمة ـ رضي الله تعالى عنها ـ ولا احد من بني هاشم . . . فقد ضعفه البيهقي بان الزهري لم يسنده . والرواية الموصولة عن ابي سعيد ـ رضي الله تعالى عنه ـ اصح . قسطلاني] .

ته‌رجه‌مه :

حه‌زره‌تی عائیشه ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئه‌فه‌رموێ : حه‌زره‌تی فاطیمه‌ی کچی پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ، ورضي عنها ـ ناردیه خذمه‌ت حه‌زره‌تی ئه‌بوبه‌کر ـ رضي الله تعالى عنه ـ داوای میراثی پێغه‌مه‌ری لێ ئه‌کرد ـ ﷺ ـ له ئه‌وه‌ی که خوا له مه‌دینه‌دا به‌سه‌ریا رژانبوو ، له فه‌ده‌ك‌و ،

لەوەی کە لە خومسی خەیبەر مابووەوە . ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرموویەتی : ئێمە ئیرثمان لێ ناگیررێ ، ئەوی لە پاشمان بەجێ بمێنێ صەدەقەیە . لەم ماڵە ئالی محەمەد هەر لێی ئەخۆن [نابێ بە موڵکیان] وەڵڵاهی من لە صەدەقەی پێغەمەر ـ ﷺ ـ هیچ شتێك تێك نادەم لەو حاڵەتەی کە لە زەمانی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ لەسەری بوە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە چە نەوعێکی لە عەمەل هێنابێ منیش وای لەگەڵ ئەکەم .

ئەبوبەکر هیچ شتێکی لەوەی کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ بەجێی هێشتبوو نەدا بە حەزرەتی فاطیمە ـ رضي الله تعالى عنها ـ لەوەوە لێی زیر بوو ، تەرکی کرد ، تا وەفاتی کرد قسەی لەگەڵ ئەبوبەکرا ـ رضي الله تعالى عنه ـ نەکرد . لە دوای پێغەمەر ـ ﷺ ـ شەش مانگ ژیا . کە وەفاتی کرد [لەسەر وەصیەتی خۆی] حەزرەتی عەلی بە شەو دفنی کردو نوێژی لەسەر کرد ، خەبەری بە حەزرەتی ئەبوبەکر نەدا ـ رضي الله تعالى عنه ـ حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە حەیاتی حەزرەتی فاطیمەدا ـ رضي الله تعالى عنها ـ لەبەر خاتری ئەو لە ناو خەڵقا حورمەتی بوو ، کە ئەو وەفاتی کرد ئەو حورمەتەی لە ناو خەڵقا نەما .

ئەو شەش مانگەی حەیاتی فاطیمە ـ رضي الله تعالى عنها ـ حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ بەیعەتی بە حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ نەکردبوو . دوای وەفاتی حەزرەتی فاطیمە ـ رضي الله تعالى عنها ـ کە حیسی بێحورمەتی خۆیی لەناو ئەصحابی کیراما کرد تەشەبوثی بەوە کرد کە صولح لەگەڵ ئەبوبەکرا بکا ـ رضي الله تعالى عنها ـ ، خەبەری ناردە خذمەتی کە تەشریفی بێ ، ئەمما کەسی تر لە خذمەتی خۆیا نەهێنێ ؛ چونکی حەزی نەدەکرد کە حەزرەتی عومەری لە

خذمەتا بێ . کە ئەو دەعوەتە گەیی بە حەزرەتی عومەر ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : خەیر وەڵڵاهی نابێ بە تـەنها بچیت . یەعنی مـەبادا بێحورمەتیت لە خذمەتا بکەن . حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : ظەن نابەم کە شتێکی وام لەگەڵا بکەن . وەڵڵاهی ئەچم [یەعنی بە تەنها] تەشریفی چوو .

حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : ئێمە فەضلی تۆمان و ئەو خێرەی خوا ـ عز وجل ـ بە تۆی ئینعام کـردبوو ئـەمانـزانی لەسەر ئەو خێرە کە خوا بۆی ناردووی ، وە نی یە حەسوودیمان پێ بردبێ . ئەمما تۆ بێ ئەمە مەشوەرەتێ بە ئێمە بکەی سەر بەخود قەبووڵی خەلافەتت کرد ، ئێمەیش وامان ئەزانی لەبەر ئەمە کە خزمایەتیمان هەیە لە خزمەتی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ حەقێکمان هەیە لەم خەلافەتا [یەعنی هیچ نەبێ ئەبوو پرسێکمان پێ بکرایەو بخوێنرایینەوە] .

حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالی عنـه ـ بەم فـەرموودانـەی حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالی عنه ـ فرمێسك لە چاوی هـات ، کە دەستی فەرموو بە قسەفەرموون ، فەرمووی : قەسەم بەوەی نەفسی من لە دەستی قودرەتی ئەوایە حـەز بەوە زیـاترەکـەم کە صیلەی قـەرابەتی پێغەمەر ـ ﷺ ـ بەجێ بێنم لە بەجێهێنانی صیلەی قەرابەتی خـۆم ، ئەو لق و پۆپ تێك ئاڵاوی یەیش کە لەبەینمانا بوو لە خوصووصی ئەو ماڵەی کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ بەجێی هێشتبوو ، لەو ماڵەدا هیچ قوصوورم لە خێرتیا نەکردوە . لەوانەی کە دیومە پێغەمـەر ـ ﷺ ـ لەو مـاڵەدا کـر دوویەتی هیچم تەرك نەکردوە هەمووم کردوە .

ئیمامی عەلی ـ رضي الله تعالی عنه ـ عەرزی فەرموو : وەعدەمان ئێوارێ بێ بۆ بەیعەت ، کە حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالی عنه ـ

نوێژی نیوەڕۆی کرد ، تەشریفی چوە سەر مینبەر ، کەلیمەی شەهادەتی هێنا ، بەیانی ئەوەی فەرموو کە بۆچ عـەلی ـ رضي الله تعالی عنـه ـ لە بەیعەتا پاش کەوتو ، بەو عوذرەی کە عەلی ـ رضي الله تعالی عنه ـ بۆی هێنابوەوە مەعذووری گرت .

لە پاش ئەو حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئیستیغفاری کـردو کەلیمـەی شەهـادەتی هێناو ، تـەعظیمی حـوقـووقی حـەزرەتی صەدیقی کردو فەرمووی : نە حەسەد نە ئینکاری فەضیلەتی حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالی عنه ـ منی نەهێناوەتە سەر ئەمە کـە درەنگ بەیعەتم پێکرد . (لكن) ئێمەیش لەم خەلافەتەدا بەشێکمان تیا هەیە ، ئەبوو پرسێکمان پێ بکرایە ، پرسێکی پێ نەکردین خەلافەتی قەبـووڵ کرد ، لەوەوە دڵگیر بووین . موسولمانان بە فەرموودەی حەزرەتی عەلی مەسروور بوون ، هەموو فەرموویان : حەقتەو راست ئەکەی . بەوە کە حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالی عنه ـ روجـووعی کردەوە ئـەلای ئەو ئەمرە مەعرووفە کە موافەقەی خەڵقە لە بەیعەتـا . . لە نـاو ئەصحـابا حورمەتی حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالی عنه ـ زیادی کرد .

[ئیبن و حیببان حەدیثێ لە ئەبوسەعیدی خدری رایوایەت ئـەکا تەصحیحی ئەکا ، ئەفەرموێ : کە حەزرەتی عەلی لە ئەووەڵەوە بەیعەتی پێکرد] (فوفق یا سلام)[1]

---

(١) رەنگە لەم وشەیە دووشتی مەبەست بووبێ : یەکەم دوعا بێ ، واتـە : یا سەلام تەوفیق بدە . دوەم : سەلام تۆ هەوڵ بدە تەوفیق لە نێوانیانا بکەیت و ناکۆکی یەکە لابەیت . دیارە کە مامۆستا مەلا سەلامیش ئەمەی نەکردوە .

# مناقب جعفر ابن ابي طالب

- رضي الله تعالى عنه -

**٩٦٢/٨٥ عن ابي هريرة - رضي الله تعالى عنه - ان الناس كانوا يقولون : اكثر ابو هريرة ، واني كنت الزم رسول الله - ﷺ - بِشِبَعِ بطني ، حتى لا آكل الخمير ، ولا البس الحبير ، ولا يخدمني فلان ولا فلانة ، وكنت الصق بطني بالحصباء من الجوع ، وان كنت لاستقرئ الرجل الآية هي معي كي ينقلب بي فيطعمني ، وكان اخير الناس للمسكين جعفر بن ابي طالب [رضي الله تعالى عنه] كان ينقلب بنا فيطعمنا ما كان في بيته ، حتى ان كان ليخرج إلينا العكة التي ليس فيها شيئ ، فيشقها فنعلق ما فيها ! ح - ٦/١١٤ .**

**ته‌رجه‌مه :**

ئه‌بو هوره‌یره - رضي الله تعالى عنه - ئه‌فه‌رموێ : خه‌ڵق ئه‌ڵێن ئه‌بو هوره‌یره زۆر حه‌دیث ریوایه‌ت ئه‌کا . من به نانه‌زگ لازمی پێغه‌مه‌ر بووم - ﷺ - لێی جوێ نه‌بوومه‌وه ، حه‌تا نانی هه‌ڵاتووم نه‌ده‌خوارد ، جلی باشم له‌به‌ر نه‌ده‌کرد ، فلان پیاوو فلان جاری‌یه خدمه‌تیان نه‌ده‌کردم ، له برسانا به‌ردم به زگمه‌وه ئه‌به‌ست ، له یه‌کێك خوێندنه‌وه‌ی ئایه‌تێکم لێ طه‌له‌ب ئه‌کرد ، که ئه‌و ئایه‌ته خۆیشم ئه‌مزانی له لام بوو ، مه‌قصوودم ئه‌وه بوو [به عه‌لامه‌ت فه‌رق به برسێتیم بکاو] بمباته ماڵه‌وه شتێکم ده‌رخوارد بدا . [هیچیان نه‌یان ئه‌بردمه ماڵه‌وه] جه‌عفه‌ری کوڕی ئه‌بوطالیب - رضي الله تعالى عنه - له هه‌موو که‌س چاکتر بوو بۆ فه‌قیر ؛ ئه‌یبردینه ماڵه‌وه ، چی له ماڵه‌که‌یا بوو ده‌رخواردی ئه‌داین ، حه‌تا به‌عزێ وه‌قت هیزه‌یه‌ك که هیچ رۆنی تیا نه‌مابێ بۆی ئه‌هێناین ، بۆی پارچه پارچه

ئەكردين و ئەوى پێوە بوو ئەمان لستەوە .

يەعنى بۆيە لە خەڵق زياتر حەديث ريوايەت ئـەكەم ؛ چـونكى ئەوى ئەوان نەيان ئەبيست من لە پێغەمەر م - ﷺ - ئەبيست .

لەم حەديثەدا فەضلى جەعفەرى تيايە - رضي الله تعالى عنه - كە زۆر سەخى بوەو بە مەرحەمەت بوە لەگەڵ فەقيرو فوقەرادا . فەضـلى ئەبوهورەيرەيشى تيايە - رضي الله تعالى عنه - كە زۆر قانيع بوەو ، زۆر طاليبى عيلم بوە .

٩٦٣/٨٦ عن الشعبي ان ابن عمر - رضي الله تعالى عنهما - كان اذا سلم على ابن جعفر [عبدالله] قال : السلام عليك يا ابن ذي الجناحين [لقوله - عليه الصلاة والسلام - له : هنيئا لك ابوك يطير مع الملائكة في السماء . طبراني . وفي حديث ابي هريرة - رضي الله تعالى عنـه - عند الترمذي والحاكم ، باسناد على شرط مسلم : انه - ﷺ - قال : مرَّ بي جعفر الليلة في ملأ من الملائكة ، وهو مخضب الجناحين بالـدم ، وفي حديث ابن عباس - رضي الله تعالى عنهما - مرفوعا : دخلت البارحة الجنة فرأيت فيها جعفرا يطير مع الملائكة . طبراني . وفي اخـرى عنه : ان جعفرا يطير مع جبريل وميكائيل له جناحان عوضه الله - عز وجل - من يديه لما استشهد بمؤتة قطعت يداه وبيده الراية . من قسطلاني] قال ابو عبدالله : الجناحان كل ناحيتين . ح - ١١٥/٦

تەرجەمە :

شيعبى ئەفەرموێ : عەبدوڵلاى كوڕى عومەر - رضي الله تعالى عنهما - كە سەلامى لە عەبدوڵلاى كوڕى جەعفەر ئەكرد - رضي الله تعالى

عنها ـ ئەیفەرموو : (السلام علیك) ئەی کوڕی (ذو الجناحین) [چونکی پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێی فەرموو : چاوت روون ، باوکت لە ئاسمانا لەگەڵ مەلائیکەدا ئەفرێ ، هەم فەرمووی : ئیمشەو جەعفەرم پێگەیی لە ناو جەماعەتێ لە مەلائیکەدا هەردوو باڵی لە خوێنا بوو . هەم ئیبن و عەبباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لە پێغەمەرەوە ـ ﷺ ـ کە فەرمووی : شەوی رابوردوو چوومە بەهەشتەوە ، چاوم بە جەعفەر کەوت لەگەڵ مەلائیکەدا ئەفری .

طەبەرانێ لە ریوایەتێکی تریا : جەعفەر لەگەڵ جیبرەئیل و میکائیل ئەفری دوو باڵی هەبوو خوا لە باتی هەردوو دەستی ـ کە لە (موٶتە) دا کە سەرعەسکەر بوو ، بەییاخی بەدەستەوە بوو ، هەردوو دەستی قەطع کراو شەهید بوو ـ پێی عەطا فەرموو . قسطلانی]

بوخاریی ئەفەرموێ : جەناح بە هەردوو طەرەفی شت ئەڵێن .

# عباس

## - رضي الله تعالى عنه -

٩٦٤/٨٧ عن انس - رضي الله تعالى عنه - ان عمر بن الخطاب [رضي الله تعالى عنه] كان اذا قحطوا استسقى بالعباس [رضي الله تعالى عنه] فقال : اللهم انا كنا نتوسل بنبيِّنا - ﷺ - فتسقينا ، وانا نتوسل اليك بعم نبينا [ﷺ ، ورضي عنه] فاسقنا ! قال : فيسقون . ح - ١١٥/٦

ته‌رجه‌مه :

عومه‌ری کوڕی خه‌طاب - رضي الله تعالى عنه - كه بێ‌بارانی بوایه به عه‌باسی كوڕی (عبدالمطلب) له خوا طه‌له‌بی بارانی ئه‌كرد . ئه‌یفه‌رموو : (یا ربي) ئێمه (توسّل)مان به پێغه‌مه‌رمان ئه‌كرد بۆ باران ، بارانت بۆ ئه‌بارانین ، ئێسته ته‌وه‌سول به مامی پێغه‌مه‌ر ئه‌كه‌ین - ﷺ - بۆ باران ، بارانمان بۆ ببارێنه . ئه‌نه‌س ئه‌فه‌رموێ : بارانیان بۆ ئه‌بارێنرا .

# فضائل الحسنين

٩٦٥/٨٨ [١]ولد الحسن سنة ثلاث في رمضان ، وسمم من طرف زوجته بأمر يزيد اللعين سنة خمسين . وولد الحسيُن في شعبان سنة اربع ، واستشهد بكربلاء يوم عاشورا سنة احدى وستين - رضي الله تعالى عنهما - [. . . .]

٩٦٦/٨٩ ابو بكرة [نفيع - رضي الله تعالى عنه -] سمعت رسول الله - ﷺ - على المنبر ، والحسن - رضي الله تعالى عنه - الى جنبه ينظر الى الناس مرة ، واليه مرة ، ويقول : ابني هذا سيد ، ولعل الله ان يصلح به بين فئتين من المسلمين . ح - ١٢٨/٦

---

(١) دانەر - خ - ژمارەی حەدیثی بۆ ئەم قسەیە داناوە تەرجەمەیشی نەکردوە . ئەمە حەدیث نی یەو قسەیەکە لە قەسطەلانی ی وەرگرتوەو ئەمەیش ماناکەیەتی : حەسەن - خ - لەرەمەزانی سالّی سێی کۆچیدا لەدایك بوەو ، لە سالّی پەنجادا بە دەرمانخواردکراوی کۆچی دوایی کردوە . حسەینیش - خ - لە شەعبانی سالّی چواری کۆچیدا لە دایك بوەو لە عاشوورای سالّی شەصت و یەکی کۆچیدا لە کەربەلا شەهید کرا .

تەرجەمە :

ئەبوبەکرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە پێغەمەرم ـ ﷺ ـ بیست تەشریفی لەسەر مینبەر بوو ، حەسەن ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە تەنیشتی‌یەوە بوو ، جارێ تەماشای خەڵقی ئەکرد ، جارێکیش تەماشای حەزرەتی حەسەنی ئەکرد . ئەیفەرموو : ئەم کوڕی منە سەییدە ، ئومێدم هەیە کە خوا بە واسیطەی ئەوەوە صوڵح بکا لە بەینی دوو فیرقەی موسوڵمانانا .

صدق رسول الله ـ ﷺ ـ فلعنة الله على من سممه او امر او رضي به .

في الادب : كان رسول الله ـ ﷺ ـ يأخذني ، فيقعدني على فخذه ويقعد الحسن على فخذه الأخرى ، ثم يضمهما ، ثم يقول : اللهم ارحمهما فاني ارحمهما[1] . ح ـ ٩/١٩

٩٦٧/٩٠ عن اسامة بن زيد ـ رضي الله تعالى عنهما ـ عن النبي ـ ﷺ ـ انه كان يأخذه والحسنَ [رضي الله تعالى عنه] ويقول : اللهم اني احبهما فأَحِبَّهما او كما قال . [وفي الادب : اللهم اني ارحمه فارحمهما] . ح ـ ١٢٨/٦ ، ح ـ ٩/١٩

تەرجەمە :

ئوسامەی کوڕی زەید ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ منو حەزرەتی حەسەنی ئەگرتو حەسەنی لەسەر رانی راستیو منی لەسەر رانی چەپی دائەنا ، بەیەکی‌یەوە ئەگوشینو

(١) دانەر ـ خ ـ مانای قسەکەی دوایی نەکرد ؛ دیارە لەبەر ئەوەیە کە ماناکە لە قسەکەی ئوسامەوە نزیکەو . دواییش بە کورتی قسەکە لەو حەدیثەدا تەرجەمە کراوە .

ئەیفەرموو : یارەببی من ئەمانەم خۆش ئەویٚ تۆیش خۆشت بویٚن . من رەحمیان پیٚ ئەکەم تۆیش رەحمیان پیٚ بکە .

لەعنەت لەوەی کە رەحمی نەکرد بەو خۆشەویستی پیٚغەمەرە ـ ﷺ ـ و ئەمری کرد کە زەهریان دایێ .

٩٦٨/٩١ عن انس بن مالك ـ رضي الله تعالى عنه ـ أُتِيَ عُبَيد الله بن زياد [الذي جعله معاوية ابن ابيه لعنه الله] برأس الحسين بن علي ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فجُعِل في طست فجعل [اللعين] ينكت [بابـه نصر . يضرب بقضيب له في انفه وعينه ، فقال له زيد بن ارقم ـ رضي الله تعالى عنه ـ : ارفع قضيبك فقد رأيت فم رسول الله ـ ﷺ ـ في موضعه .

وعند الطبراني : إنه كان يقرع ثنايا الحسين بقضيبه ، فقال له زيد بن ارقم ـ رضي الله تعالى عنه ـ : ارفع قضيبك عن هاتين الثنيتين ، فوالله الذي لا اله الا هو ! لقد رأيت شفتي رسول الله ـ ﷺ ـ على هاتين الثنيتين يُقبِّلُهما ، ثم بكى . فقال ابن الزياد [اللعين] : ابكى الله عينك ! فوالله لولا انك شيخ قد خرفت وذهب عقلك لضربت عنقك ! فقام وصرخ ، وقال : يا معاشر العرب ! انتم بعد اليوم عبيد ؛ قتلتم ابن فاطمة وامَّرتم ابن مرجانة ، وهي ام زياد ، فهو يقتل خياركم ويستعبد شراركم ، فبعدا لمن رضي بالذل والعار] وقال في حسنه شيئا .

فقال انس : كان اشبههم برسول الله ـ ﷺ ـ وكان مخضوبا بالوشمة [معجما ومهملا]

[ولما قتل الحسين ـ رضي الله تعالى عنه ـ بكى الناس فأكثروا . وقتل الله ابن زياد ـ لعنه الله ومن ارسله ـ سنة اثنتين وستين ، قتله ابراهيم ابن الاشتر ، وكان المختار بن ابي عبيد الثقفي ارسله لقتاله ، وجيء براسه ورأس اصحابه . . . بين يدى المختار ، فجاءت حية دقيقة

تخللت الرؤوس حتى دخلت في فم ابن الزياد ـ لعنه الله ـ وخرجت من منخره ودخلت من منخره وخرجت من فمه . ثُمَّ ارسل المختار رأسه وبقية الرؤس لمحمد بن الحنفية ، او الى عبدالله بن الزبير . قسطلاني] .

**تەرجەمە :**

ئەنەسی بنی مالیك ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : سەری موبارەکی حسەینی کوڕی ئیمامی عەلی‌یان ـ رضي الله عنهما ـ هێنایە لای عوبەیدوڵلای لەعینی کوڕی زیادی ، کوڕی باوکی خۆی ، لە ناو تەشتێکا دایان نا ، (ابن الزیاد)ی مەلعوون بە دارێ لە دەم و ددان و لووتی موبارەکی ئەدا . [زەیدی بنی ئەرقەم ـ رضي الله تعالى عنه ـ بەو مەلعوونەی فەرموو : ئەو دارە لەسەر ئەو دەم و ددانە موبارەکە لابەرە . (والله الذي لا اله الا هو) پێغەمەر ـ ﷺ ـم دیوە کە ئەو ددانەی ماچ ئەکرد . ئەوەی فەرموو گریا . شەیطانی سەگی لەعین فڵطانی : خوا هەر بتگرێنێ ! وەڵلاهی ئەگەر پیرێکی فانی‌ی خەرەفاو نەبوویتایە لە گەردەنم ئەدای !

زەید ـ رضي الله تعالى عنه ـ هەڵسایە پێیان ، بە دەنگێکی بەرز بانگی کرد : ئەی جەماعەتی عەرەب ! لەم رۆ بەدواوە ئێوە هەموو عەبدن ، ئەسیرن ، کوڕی حەزرەتی فاطیمەتان شەهید کرد ـ رضي الله تعالى عنهما ـ کوڕی مەلعوونی مەرجانەتان کرد بە ئەمیر ، چاکەکانتان ئەکوژێ و خراپەکانتان ئەکا بە ئەسیر . دوور بن لە رەحمەتی خوا ئەوانەی کە بە ذیللەت و عار رازی ئەبن ! کە حەزرەتی حسەین ـ رضي الله تعالى عنه ـ شەهید کرا خەڵقی زۆری بۆ گریان .

خوا لە دوای ساڵێ ئیبن‌ومەرجانەی بە دەستی ئیبراهیمی بنی ئەشتەر بە جەهەننەم گەیان . موختاری کوڕی ئەبو عوبەیدی ئەقەفی

ئيبراهيمى ناردبوو بۆ شەڕى ئەو مەلعوونە بە جەهەننەميان گەيان ، سەرە مەلعوونەكەى ئەوو سەرى لەشكرە مەلعوونەكانيان هێنايە لاى موختار ، مارێكى باريك هات بەناو سەرە خەبيثەكانا گەڕا ، سەرى ئەو مەلعوونەى دۆزى‌يەوە ، چوە ناو دەمى و لە كونە لووتى‌يەوە هاتە دەرێ ، خزايە كونە لووتيەوەو لە دەمى هاتەدەرێ . موختار ئەو سەرە خەبيثانەى ناردە خذمەت حەمەحەنيفە ، يا خو (ابن الزبير) ـ رضي الله تعالى عنهم ـ]

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه . ئەفەرموێ : حەزرەتى حسەين ئەشبەهى ئەهلى بەيت بوو بە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ريشى موبارەكى لە وسمە گرتبوو ، ئيبن و زيادى لەعين بەحثى لە جوانى حەزرەتى حسەين كرد ـ رضي الله تعالى عنه ـ ح ـ ١٢٨/٦

**٩٦٩/٩٢ البراء بن عازب ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : رأيت النبيَّ ـ ﷺ ـ والحسن بن عليّ [رضي الله تعالى عنهما] على عاتقه . . يقول : اللهم اني أُحبُّه فأَحِبَّهُ ح ـ ١٢٩/٦ ، م ـ ٣١٩/٩ . ت ، ن .**

**تەرجەمە :**

پێغەمەرم دى ـ ﷺ ـ حەسەنى كوڕى على ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لەسەر شانى موبارەكى بوو ، ئەيفەرموو : يا رەببى من خۆشم ئەوێ تۆيش خۆشت بوێ .

**٩٧٠/٩٣ عن ابي هريرة [رضي الله تعالى عنه] عن النبيّ ـ ﷺ ـ انه قال لحسن [رضي الله تعالى عنه] : اللهم اني أُحبُّه فَأَحِبَّهُ واحبب من يحبه . م ـ ٣١٨/٩**

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەرحەق حەسەن فەرمووى : خوايا من خۆشم

ئەویٚ تۆیش خۆشت بویٚ ، ئەو کەسەیشت خۆش بویٚ کە خۆشی ئەویٚ .

وەڵڵاهی ! منیش خۆشم ئەویٚ ، مەلا حسەینیش خۆشی ئەویٚ .

٩٧١/٩٤ عن عقبة بن الحرث قال : رأيت ابا بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ وحمل الحسن [رضي الله تعالى عنه] وهو يقول : بأبي شبيه بالنبيّ ـ ﷺ ـ ليس شبيه بعليّ ، وعليٌّ يضحك [رضي الله تعالى عنهم] . ح ـ ٦/١٢٩

وعنه قال : صلى ابو بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ العصر ، ثم خرج يمشي [مع علي رضي الله تعالى عنه] فرأى الحسن بن علي [رضي الله تعالى عنهما] يلعب مع الصبيان ، فحمله على عاتقه ، وقال : بابي . . .

تەرجەمە :

ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ حەزرەتی حەسەنی هەڵگرت ، ئەیفەرموو : باوکم بە صەدەقەی بیٚ بە پیٚغەمەر ئەشوبهیٚ ـ ﷺ ـ نەك بە عەلی ـ عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ پیٚئەکەنی .

٩٧٢/٩٥ عن انس ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : لم يكن احد اشبه بالنبيّ ـ ﷺ ـ من الحسن بن علي [رضي الله تعالى عنهما] ح ـ ٦/١٣٠ ت .

تەرجەمە :

ئەنەس ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : هیچ کەس لە حەسەنی کوڕی عەلی ـ رضي الله تعالى عنهما ـ زیاتر نەشوبهاوە بە پیٚغەمەر ـ ﷺ ـ .

٩٧٣/٩٦ ابن ابي نعيم : سمعتُ عبدالله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] وسأله [اي رجل من اهل العراق ، ت] عن المحرم . قال شعبة :

احَسَبُه يقتل الذباب . فقال : اهل العراق يسألون عن الذباب وقد قتلوا ابن ابنة رسول الله - ﷺ - ! وقال النبيّ - ﷺ - : هما ريحانتاي من الدنيا . ح - ٦/ ١٣٠ ت ح - ٩/ ١٥

ولفظه عنه ايضا : قال : كنت شاهدا لابن عمر [رضي الله تعالى عنهما] وسأله رجل عن دم البعوض [يصيب الجسد . ت] فقال : ممن انت ؟ فقال : من اهل العراق . قال : انظروا الى هذا يسألني عن دم البعوض ، وقد قتلوا ابن النبيّ - ﷺ - ! وسمعتُ النبيّ - ﷺ - يقول : هما ريحانتاي من الدنيا . ح - ٩/ ١٥

تەرجەمە :

پیاوێ لە ئیبن‌وعومەری پرسی [رضي الله تعالى عنهما] لە ریوایەتێکا لە مێشی لێ پرسی : کە دروستە پیاوی موحریم بیکوژێ یا دروست نی‌یە ؟ لە ریوایەتێکا لە خوێنی مێشوولەی لێ پرسی کە لە بەدەنەوە ئەچێ . . ئیبن‌وعومەر - رضي الله تعالى عنهما - لێی پرسی : خەڵقی کوێی ؟ وتی : خەڵقی عێراقم . فەرمووی : تەماشای ئەمە بکەن لە خوێنی مێشوولەم لێ ئەپرسێ کەچی خۆیان کوری کچی پێغەمەریان - ﷺ - کوشتوە ! لە پێغەمەرم بیست - ﷺ - ئەیفەرموو : حەسەن‌و حسەین ریحانەی دنیای منن .

رەنگە ئەو پیاوە سوئالی لە مێشیش‌و لە مێشوولەیش کردبێ . (ابن ابي نعيم) یا یەکێ لە راوی‌یەکان جارێ مێش‌و جارێ مێشوولەی لێ ریوایەت ئەکەن .

٩٧٤/٩٧ عن ابي هريرة الدوسي - رضي الله تعالى عنه - قال : خرج النبيُّ - ﷺ - في طائفة النهار ، لا يكلمني ولا أكلمه ، حتى أتى [جاء . م] سوق بني قينقاع [بتثليث النون] فجلس بفناء بيت فاطمةَ [ثم انصرف

حتى أتى خِباءَ فاطمة .م] [رضي الله تعالى عنها] فقال : اثمَّ لُكع ؟ أثم لكع ؟ [اى الصغير] فحبَسَتْه شيئا ، فظننت انها تلبسه سخابا [قلادة من طيب ] او تغسله [مخففا ومشددا] فجاء يشتد حتى عانقه وقبله [يعني حسنا .م] وقال : اللهم [اني أُحبُّه م] احِبّه واحِبَّ من يحبُّه ح ـ ٤/٤٨ ، م ـ ٩/٣١٨ ن ، جه . فلم يلبث ان جاء يسعى حتى اعتنق كل واحد منهما صاحبه .م .

تەرجەمە :

ئەبو هەرەیرە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە رۆژێکا تەشریفی چوە دەرێ نە قسەی لەگەڵما ئەفەرموو نە لە خزمەتیا قسەم ئەکرد ، تا تەشریفی چوو بۆ بازاڕی بەنی قەینوقاع ، لە تەنیشت ماڵی حەزرەتی فاطیمە ـ رضي الله تعالى عنها ـ وە تەشریفی دانیشت ، پرسی فەرمووی : بچکۆلە لە کوێیە ؟ . بچکۆلە لە وێیە ؟ حەزرەتی فاطیمە ـ رضي الله تعالى عنها ـ نەختێ بەندی کرد ، وابزانم مێخەك بەندی ئەکاتە ملەوە یا ئەیشوا . لە دواییا تەشریفی بە هەڕاکردن هات ، تا پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەستی کردەملی و ماچی کردو فەرمووی : خوایا تۆ خۆشت بوێ و ئەو کەسەیشت خۆش بوێ کە خۆشی ئەوێ .

خوا رووی ئەوانە رەش کە حەزیان لێ نەکردوە لە دنیاو ئاخیرەتا . . .

٩٨/٩٧٥ اياس عن ابيه قال : لقد قدت بنبيّ الله ـ ﷺ ـ والحسن والحسين [رضي الله تعالى عنهما] بغلته الشهباء ، حتى ادخلتهم حجرة النبيّ ـ ﷺ ـ هذا قدامه وهذا خلفه . م ـ ٩/٣٢٠

تەرجەمە :

باوکی ئەیاس [ ] ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ و

حەسەن و حسەین [رضي الله تعالى عنهما] سواری ئێستره سپیلکەکەی پێغەمەر بووبوون ـ ﷺ ـ ئەمیان لەبەردەمیەوەو ئەویان لە پاشکۆیەوە ، بۆم راکێشان تا بردمنە حوجرەی پێغەمەرەوە ـ ﷺ ـ .

**٩٧٦/٩٩ قالت عائشة [رضي الله تعالى عنها] : خرج رسول الله ـ ﷺ ـ غداة وعليه مرط مرحل ـ معجما ومهملا ـ من شعر اسودَ فجاء الحسن بن عليٍّ [رضي الله تعالى عنهما] فادخله ، ثم جاء الحسين فدخل معه ، ثم جاءت فاطمة فادخلها ، ثم جاء علي فادخله [رضي الله تعالى عنهم] ثم قال : ﴿انما يريد الله ليذهب عنكم الرجس اهل البيت ، ويطهركم تطهيرا﴾[1] .**

**تەرجەمە :**

حەزرەتی عائیشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : رۆژێ بەیانی پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی چوە دەرێ عەباییکی خوریی رەشی نەخشاوی لەبەرا بوو ، حەسەنی کوڕی عەلی هات خستیە ناو عەباکەیەوە ، لە دواییا حسەین هات ئەویش چوە ژێر عەباکەوە ، لە دواییا فاطیمە هات ئەویشی بردە ژێر عەباکەیەوە ، لە دواییا عەلی هات ئەویشی بردە ناو عەباکەیەوە . لە دواییا فەرمووی : [ئەی ئەهلی بەیت خوا دەرحەق ئێوە لە بەینی چاکەو خراپەداو ، پاكو پیساو ، عەذابو ئەوابا] هەر چاکیو پاکیو ئەوابی ئیرادە کردوە لە موجیبی عەذابتان دوورخاتەوە لە گوناە پاکتانکاتەوە [یەعنی پیسیو عەذابو عیقابو مارو دووپشکی جەهەننەم بۆ دوشمنی ئەوانە] ـ رضي الله تعالى عنهم وارضاهم ـ .

---

(١) بڕوانە : سوورەتی : ئەحزاب ، ئایەتی : (٣٣)

# معاوية وابواه

٩٩/٩٧٧[1] عن ابن ابي مليكة قال : اوتر معاوية بعد العشاء بركعة وعنده مولى لابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] وهو كريب] ، فأتى ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] فقال : دعه فانه قد صحب النبي - ﷺ - وفي اخرى : انه فقيه . ح - ٦/١٣٥

تەرجەمە :

[........]

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو مولەیکە ئەفەرموێ : موعاویە ڕکاتێ نوێژی وەتری کرد . کورەیبی مەولای ئیبن و عەبباسی - رضي الله تعالى عنهما - لە لا بوو . کورەیب چوو عەزری ئیبن وعەبباسی کرد - رضي الله تعالى عنهما - فەرمووی : وازی لێ بهێنە ؛ چونکی صوحبەتی لە خدمەت پێغەمەرا بوە - ﷺ - لە ریوایەتەکەی ترا ئەفەرموێ : فەقیهە .

ئەبوذەر ؛ راویی بوخاریی ئەفەرموێ : ئیبن و عەبباس - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : موعاویە کە ڕکاتێکی کردوە خەطای نەکردوە ئیصابەتی کردوە ؛ چونکی فەقیهە .

لە قەسطەلانیدا ئەفەرموێ : موعاویە سپی بوە ، جوان بوە ، لەوانەیە کە صیفەتی حیلمیان بوە . . .

---

(١) دانەر - خ - ژمارە (٩٩)ی بە هەڵە دوویات کردوەتەوە .

١٠٠/ ٩٧٨ عن ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] قال : كنت الْعَبُ مع الصبيان ، فجاء رسول الله - ﷺ - فحطأني حطأة [بە طەریقی مولاطەفە بەری دەستی ماڵی بە پشتما . من نووي] . وقال : اذهب وادع لي معاوية ، قال : فجئت ، فقلت : هو يأكل ، قال : ثم قال لي : اذهب فادع لي معاوية . قال : فجئت ، فقلت : هو يأكل . فقال : لا اشبع الله بطنه ! قال ابن المثنى : قلت لأمية : ما حطأني ؟ قال : قفدني قفدة . م-١٠/ ٣٦

تەرجەمە :

ئیبن و عەبباس - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : لە ناو منالآنا یاریم ئەکرد ، پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی هات دەستی ماڵی بە پشتما ، فەرمووی : بچۆ موعاویەم بۆ بانگ کە ، چووم و هاتمەوە ، عەرزم کرد : نان ئەخوا . لەدواییا ئەمری پێ فەرمووم : بچۆ موعاویەم بۆ بانگ کە . چووم و هاتمەوە عەرزم کرد : نان ئەخوا . فەرمووی : قەت خوا زکی تێر نەکا !

فاستجاب الله دعاءه - عليه الصلاة والسلام - .

تەنها ئەم حەدیثە کافی یە بۆ فەضلی موعاویە .

١٠١/ ٩٧٩ عن عبدالرحمن بن عبد رب الكعبة ، قال : دخلت المسجد فاذا عبدالله بن عمرو بن العاص - رضي الله تعالى عنه - جالس في ظل الكعبة ، والناس مجتمعون عليه . فأتيْتُهم ، فجلستُ اليه ، فقال : كنا مع رسول الله - ﷺ - في سفر ، فنزلنا منزلا ، فمنا من يصلح خِباء ، ومنا من ينتضل ، ومنا من هو في جشره [الدواب التي ترعى] اذ نادى منادي رسول الله - ﷺ - : الصلاة جامعةً . فاجتمعنا الى رسول الله - ﷺ - فقال : انه لم يكن نبي قبلي الا كان حقا عليه ان يدل أمته على خير

ما يعلمه لهم ، وينذرهم شر ما يعلمه لهم وان امتكم هذه جعل عافيتها في اوله ، وسيصيب اخرها بلاء وامور تنكرونها ، وتجيئ فتنة فيُرقق بعضها بعضا ، وتجيئ الفتنة فيقول المؤمن : هذه مهلكتي ثم تنكشف وتجيئ الفتنة فيقول المؤمن : هذه هذه . فمن احب ان يُزَحْزَحَ عن النار ويُدْخَلَ الجنَّةَ فلتأته منيته وهو يؤمن بالله واليوم الآخر . وليأت الى الناس الذي يحب ان يؤتى اليه . ومن بايع اماما فاعطاه صفقة يده ، وثمرة قلبه فليعطه ان استطاع ، فان جاء آخر ينازعه فاضربوا عنق الآخر .

فدنوت منه فقلت له : اَنشُدك الله آنت سمعت هذا من رسول الله ـ ﷺ ـ ؟ فاهوى الى اذنيه وقلبه بيديه وقال : سمِعَتْهُ اذناى ووعاه قلبي . فقلت له : هذا ابن عمك معاوية يأمرنا ان نأكل اموالنا بيننا بالباطل ، ونقتل انفسنا ، والله ـ عز وجل ـ يقول : يا ايها الذين آمنوا ﴿لا تأكلوا اموالكم بينكم بالباطل الا ان تكون تجارة عن تراضٍ منكم . ولا تقتلوا انفسكم ان الله كان بكم رحيما﴾[1] [نساء] قال : فسكت ساعة ، ثم قال : اطعه في طاعة الله : واعصه في معصية الله ـ عز وجل ـ م ـ ٨/٤٢

تەرجەمە :

عەبدورەحمانى كوڕى (عبدرب الكعبة) فەرمووى : چوومە (مسجد الحرام) تێفكريم عەبدوڵلاى كوڕى عەمرى كوڕى عاصى لێ بوو ـ رضي الله تعالى عنه ـ لەبەر سێبەرى كەعبەدا دانيشتبوو ، خەڵقى لێ كۆبوويووەوە ، منيش چوومە لايان لە لاى دانيشتم ، عەبدوڵلا فەرمووى : لە سەفەرێكا لە خدمەتى پێغەمەرا بووين ـ ﷺ ـ لە جێێ دابەزين ، بەعزێكمان خێوەتى رێك ئەخست ، بەعزێكمان تيرى

(١) بڕوانە : سوورەتى نيساء . ئايەتى : (٢٩)

ئەهاویتە نیشان ، بەعزێکمـان حەیـوانی ئەلـەوەڕان ، ئەوەنـدەم زانی بـانگەری پێغـەمەر - ﷺ - بـانگی دا بۆ نـوێژ ، لـە پێغـەمـەر - ﷺ - گردبووینەوە ، فەرمووی : هیچ پێغەمەرێکی پێش من نەبوە کە لەسەری فەرز نەبووبێ کە هەرچی بە خێری ئەزانێ بۆ ئوممەتەکەی نیشانی بدا ، ئەوی بە شەری ئەزانێ بۆ ئوممەتەکەی . . ئوممەتەکەی لێ بترسێنێ ، ئەم ئوممەتی ئێـوە سەلامـەتو عافێتی بـۆ خراوەتـە ئەووەڵـەوە [وەك زەمانی شەیخەین لـە دوای زەمانی سـەعادەت] ئـاخری ئـەم ئوممـەتە تـووشی موصیبەتو بەلاو بەعزێ شت ئەبێ کە بە خراپی ئەزانن [لە شەهادەتی حەزرەتی عوثمانەوە - رضي الله تعالى عنه - دەستی پێکرد] فیتنەیێك یێ بەعزێکی - بـەعزێکی لای خـەڵق سووك ئـەکا ؛ یـەعنی ئەووەڵ بـە نیسبەت دوەمەوە سووك ئەنوێنێ [مەثەلا شەهادەتی عوثمان - رضي الله تعالى عنه - لە خورووجی موعاویە لەسەر ئیمامی عەلی - رضي الله تعالى عنه - ئەهوەنتر بوو ، زەمانی ئەو لە وەقعـەی کەربـەلاو سائیـری . . . ئەهوەنتر بوو . وهکذا «کلما دخلت امة لعنت اختها» دوایی رەحمەت بۆ پێشوو ئەنێرێ] .

ئەم مەعنایە ئەگەر (یُرَقِّقُ) بخوێنرێتەوە ، ئەگەر (یَرْفُقُ) - یەعنی بە (فێ) بخوێنرێتەوە - یەعنی بەعزێکی رەفاقەتی بەعزێکی ئەکا ؛ یەعنی یەك لە دوای یەك یێن . ئەگەر (یَدْفِقُ) بخوێنرێتەوە یەعنی فیتنە وەك فوارە فیتنەی تر هەڵئەدا .

مەثالی هەموو ئیحتیمالەکان ئەوەیە : فیتنە لە دوای فیتنە یێ ، لێك ناپسێنەوە . (من نووی)

فیتنە یێت موئمین ئەڵێ : ئەم فیتنەیە هیلاکی یە بۆ من ، لە دواییدا ئەو فیتنەیە ئەڕواو نامێنێ . فیتنە یێ موئمین ئەڵێ : ئەم فیتنەیە ! ئـەم

فیتنەیە ! یەعنی فیتنەیێکە دنیا سەرەوژێر ئەکا کە وەك بەحر شەپۆل ئەدا . ئەگەر کەسێ حەز ئەکا کە لە ئاگر دوورکەوێتەوەو بچێتە بەهەشتەوە ئەو کەسە ئیشێکی وا بکا کە لەسەر حاڵەتێ بمرێ کە ئیمانی بە خواو رۆژی ئاخیرەت بێ ، هەم بە نەوعێ بچێتە لای خەڵق کە خۆی حەزەکا خەڵق بەو نەوعە بێنە لای ، یەعنی خۆی چۆن ئەیەوێ کە خەڵق موعامەلەی باشی لەگەڵ بکەن ، حورمەتی بگرن ، هیچ خراپیی لەگەڵ نەکەن ، غەیبەتی نەکەن ، ماڵی نەخۆن ، جوێنی پێ نەدەن . . . (والحاصل) بە هیچ نەوعێ زەرەریان بۆی نەبێ ، خۆیشی وابێ لەگەڵ خەڵقا [وەکوو ئەو حەدیثەی کە لە ئیمانا رابورد کە ئەفەرموێ : هیچ کەسێ لە ئێوە نابێ بە موئمینی کامیل تا چی بۆ خۆی خۆشەوێ بۆ برای دینی خۆیی خۆش بوێ . هەیهات بۆ ئەکثەری موسوڵمانانی ئێستە ! خوا ئیصلاحمان بکا بە رەحمەتی خۆی]

هەرکەسێ بەیعەتی لەگەڵ ئیمامێکا کرد ، دەستی خستە ناو دەستییەوە ، هەموو ئیختیاری خۆی تەفویضی ئەو ئیمامە کرد ئەگەر بتوانێ جگەرگۆشەی خۆی بدا بەو ئیمام وپادشایە . . . بیداتێ . یەعنی بە هەموو نەوعێ : مەنفەعەتی خۆیی تیا بێ ، یا زەرەری خۆیی تیا بێ بیداتێ هیچی لێ دریغ نەکا . ئەگەر لە دوای ئەمە کە بەیعەت بە ئیمامێ کراو کردیان بە پادشاە شایەد یەکێکی تر هات بۆ ئەمە کە خۆی ببێ بە پادشاە نیزاع لەگەڵ ئیمامەکەی پێشو بکا بیکوژن ، لە گەردنی بدەن .

عەبدورەحمانی کوری عەبدی رەببی کەعبە ئەفەرموێ : لە عەبدوڵلام پرسی ـ رضي الله تعالى عنه ـ وتم : بە خوات سوێن ئەدەم تۆ ئەمەت بیست لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ؟ عەبدوڵلا هەردوو دەستی بردبوو بۆ گوێیی و دڵی فەرمووی : هەردوو گوێم لێی بیستو ، دڵم حیفظی کرد .

به عه‌بدوڵلام وت : ئه‌وه موعاویه‌ی ئامۆزای خۆته ؛ ئه‌مرمان پێ ئه‌کا که به ناحه‌ق ماڵی یه‌کتر بخۆین و ، یه‌کتری بکوژین ، خوایش - عز وجل - له قورئانی که‌ریما ، له سووره‌ی نیسادا ئه‌فه‌رموێ : ئه‌ی ئه‌وانه‌ی که ئیمانتان هێناوه . به غه‌یری تیجاره‌تێ که به خواهیش و ره‌زای خۆتان ئه‌یکه‌ن به باطیل به ناحه‌ق ماڵی یه‌کتری مه‌خۆن ، به ناحه‌ق یه‌کتوی مه‌کوژن . خوا - عز وجل - که ئه‌م نه‌هیه‌تان لێ ئه‌کا بۆییکتان لێ ئه‌کا ؛ چونکی وای ئیراده بوه که ره‌حمتان پێ بکا .

عه‌بدوره‌حمان ئه‌فه‌رموێ : عه‌بدوڵلا - رضي الله تعالى عنه - قه‌درێ بێده‌نگ بوو [. . . .] ، فه‌رمووی . له‌وه‌دا ئیطاعه‌ی خوای تیا بێ ئیطاعه‌ی بکه ، له‌وه‌دا که له خوا عاصی بوونی تیایه تۆیش له‌و عاصی ببه به گوێی مه‌که . [بۆیه عه‌بدوڵلا - رضي الله تعالى عنه - له کوشتاری صه‌حابه‌و ئه‌هلی به‌یتا له باوکی و موعاویه جوێ بوه‌وه‌و بێطه‌ره‌ف لێی مایه‌وه - رضي الله تعالى عنه - ] .

١٠٢ / ٩٨٠ عن عبدالله [رضي الله تعالى عنه] قالت ام حبيبة [امنا ام المؤمنين رضي الله تعالى عنها] زوج النبيّ - ﷺ - : اللّهم امتعني بزوجي رسول الله - ﷺ - وبابي ابي سفيان ، وبأخي معاوية . قال [عبدالله] : فقال النبيّ - ﷺ - : قد سألتِ الله لآجالٍ مضروبة ، وأيّام معدودة ، وارزاق مقسومة ، ولن يُعَجِّل شيئا قبل حِلّه او يؤخر شيئا عن حله . ولو كنتِ سألتِ الله ان يعيذك من عذاب في النار ، او عذاب في القبر كان خيرا او افضل .

قال : وذُكِرَتْ عنده القردة - قال مسعر : وأراه قال (والخنازير) - من مسخ فقال : ان الله لم يجعل لمسخ نسلا ولا عقبا ، وقد كانت القردة والخنازير قبل ذلك . م - ١٠ / ١٠١

**تەرجەمە :**

(ام حبيبه)ی دایکمان - رضي الله تعالى عنها - زەوجەی پێغەمەر - ﷺ - دۆعای کرد ، فەرمووی : یارەبی خوایا لەذذەتیابم بکەی بە زەوجم کە رەسوولوڵڵایە - ﷺ - و بە باوکم کە ئەبوسوفیانەو ، بە موعاویەی برام . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : تۆ شتێکت لە خوا ویست کە موقەددەر کراوەو براوەتەوە ، ئەجەلێکت ویست کە موعەییەن کراوە لە غەیری وەختی خۆیا نایێت ، لە وەختی خۆی دواناکەوێ ، ئەییامێکت لە خوا ویست کە ژمێرراوە زیاد نابێ و کەم نابێ ، رزقێکت ویست کە تەقسیم کراوە ، هەرکەس بەشی خۆی وەرگرتوە ، ئەگەر لە خوات - عزوجل - بویستایە کە لە عەذابی ئاگر ، یا فەرمووی : لە عەذابی ناو قەبر ، بتپارێزێ بۆ تۆ چاکتر ئەبوو . یا فەرمووی : فەضلی زیاتر ئەبوو . خوا هیچ شتێك لە پێش وەختی خۆیا ناهێنێ و پێشی ناخا ، لە وەختی خۆی دواناخا .

عەبدوڵڵا فەرمووی : بەحثی مەیموونیشی لە خذمەتا کرا . میسعەری راویی ئەڵێ : وا بزانم بەحثی بەرازیشی لە خذمەتا کرا ، کە مەیموون جوولەکەیەو مەسخ بۆتەوە ، بەرازیش نەصاران کە مەسخ بوونەوە ، پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : خوا - عز وجل - بەو ئینسانانەی کە مەسخی کردۆتەوە نەسلی نەداوەتێ . مەیموون و بەراز لە پێش ئەوەیشا هەر بوون .

لەم حەدیثە وا دەرەکەوێ کە هەموو (ماسوی الله) هەمووی لەوەپێش لە عیلمی خوادا هەموو خوصووصیێکی قەرار دراوە ، براوەتەوە . ناگۆررێ . دۆعاکردن و نەکردنیش ، موسوڵمان بوون و کافریش . بەهەشتی و جەهەننەمیش ، عابیدی و فاسقیش . . .

هەمووی براوەتەوە . ئەوی بۆ بەهەشت خەلق کرابێ هەر ئەبێ عەمەلی چاك بکا . شایەد عەمەلی خراپەیشی کرد تۆبەی لێ ئەکا . ئەوی بـۆ جەهەننەم خەلق کرابێ ، با حەفتا ساڵیش عیبادەت و تەقوا بکا . هەر ئەبێ لەسەر خراپە بمرێ (اعاذنا الله) .

کە وابێ مەڵێن : دۆعاو عیبادەت بۆچ بکـەین ؟ بەوە نـابین بـە جەبری‌یە ؛ چونکی لە ئەزەلەوە لە عیلمی خودادا وا مونطەبیع بوە وەکوو ئەبێ ، وەکوو چۆن شەبەح لە ئاوێنەدا مونطەبیع ئەبێ . ئاوێنە ئەو شتە ناگۆڕێ ، خیلاف ئەوی تیا مونطەبیع نابێ . یەعنی لە ئەزەلا وا مەعلووم بوە کە ئەو ئینسانە بە ئیختیاری خۆی ئەو ئیشە ئەکا چاك بێ یا خراب بێ .

دۆعاکەی (ام حبيبه) ـ رضي الله تعالى عنها ـ دەرحەق پێغـەمەر ـ ﷺ ـ و ئەبو سوفیان قەبووڵ نەبوو ، چونکی دوای ئەوان موددەیێ ما ، دەرحەق موعاویە گیرا بوو ؛ چونکی وا موقەددەر کرابوو کە فیتنە بخاتە ناو موسوڵمانانەوە .

# ابو سفيان

١٠٣/٩٨١ ابن عبّاس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : كان المسلمون لا ينظرون الى ابي سفيان ، ولا يقاعدونه . فقال للنبيّ ـ ﷺ ـ : يا نبي الله ثلاث اعطنيهن . قال : نعم . قال : عندي احسن العرب واجمله ام حبيبة بنت ابي سفيان ازوجكها ، قال : نعم . قال : ومعاوية تجعله كاتبا بين يديك قال : نعم . قال : وتأمرني حتى اقاتل الكفار كما كنت أُقاتل المسلمين ، قال : نعم .

قال ابو زُمْيل [الرواي عن ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] : ولولا انه طلب ذلك من النبي ـ ﷺ ـ ما اعطاه ؛ لانه لم يكن يسأل شيئا الا قال نعم . م ـ ٤٠٨/٩

**تەرجەمە :**

ئیبن وعەبباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : موسـوڵمانـان تەماشای ئەبوسوفیانیان نەدەکرد لەبەر کـردەوەی پێشووی ، لـەگەڵیـا دانەنیشتن . ئەبو سوفیان عەرزی پێغەمەری ـ ﷺ ـ کرد : سێ شتم پێ عەطا بفەرموو ؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بەڵێ . ئەبو سوفیان وتی :

١ ـ یەکێکم لایە کە جوانترینی عەرەبە (ام حبیبە)ی کچی ئەبوسوفیان لێت نیکاح ئەکەم ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بەڵێ .

[ام حبیبە ـ رضي الله تعالى عنها ـ کە باوكو برای هەموو کافر بوون لە مەککەداو حەربیان لەگەڵ خواو پێغەمەر ئەکرد ـ علیه الصلاة والسلام ـ موسوڵمان بووبوو ، هیجرەتی کردبوو بۆحەبەش ، یا لەو وەختەدا کە تەشریفی لە حەبەش بوو ، یا لە دوای هیجرەت کە

موهاجیری ئەوێ تەشریفیان لە حەبەشەوە هاتنەوە بۆ مەدینە پێغەمەر ـ ﷺ ـ مارەی کرد . ئەبوسوفیان لە ساڵی هەشتی هیجرەتا ، دوای فەتحی مەککە . . . خۆی و موعاویە موسوڵمان بوون ، ئەویش نابەدڵ . کە وابێ طەلەبی ئەبوسوفیان وا بوە کە بە رەزای خۆی نیکاحەکەی تازە بکاتەوە . (والله اعلم . من نووي)

٢ ـ موعاویەی کوڕم بکەی بە کاتب لە بەردەستی خۆتا بێ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بەڵێ .

٣ ـ ئەمرم پێ بفەرمووی شەڕ لەگەڵ کافرانا بکەم وەك لەمەوپێش شەڕم لەگەڵ موسوڵمانانا ئەکرد . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بەڵێ .

ئەبوزومەیل ـ کە راویی حەدیثەکەیە لە ئیبن و عەبباسەوە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : ئەگەر ئەبوسوفیان ئەوەی لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ طەلەب نەکردایە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەو سێ شتەی پێ عەطا نەدەفەرموو ؛ چونکی پێغەمەر ـ ﷺ ـ هیچ شتێکی لێ داوا نەکراوە کە بفەرموێ : نا ، فەرموویەتی (نعم) مەگەر مومکین نەبووبێ [وەك طەلەبی مسیلمە]

ئەم حەدیثە . . . .

## هند بنت عتبة بن ربيعة ، والدة معاوية

٩٨٢/١٠٤ له فه‌تحا موسوڵمان بوو له دوای ئه‌بو سوفیان ، ژنێکی به ده‌عیه‌و عینوان‌و صاحیب عه‌قڵ بوو ، له غه‌زای ئوحودا ده‌م‌و ، لێوو ، لووت‌و ، گوێی حه‌زره‌تی حه‌مزه‌ی بڕی - رضي الله تعالى عنه - له ده‌م‌و ، لێوو ، لووت‌و ، گوێی شوهه‌دای ئوحود ملیوانکه‌یێکی دروستکرد ، کردیه ملی . ملیوانکه به‌قیمه‌ته‌که‌ی خۆیی دا به (وه‌حشی) له موکافه‌ئه‌تی ئه‌وه‌دا که حه‌زره‌تی حه‌مزه‌ی شه‌هید کرد - رضي الله تعالى عنه - جگه‌ری له‌تکرد خستیه ده‌میه‌وه که بیخوا ، جویی‌و پێی قووت نه‌چوو . [پێغه‌مه‌ر - ﷺ - فه‌رمووی : خوا ئیراده‌ی نه‌کردوه که هیچ جوزئێ له ئه‌جزای حه‌مزه بچێته ناو ئاگره‌وه (كما يأتي ان اشاء الله - تعالى - في الغزوات] قسطلاني - ٦ - ١٦٤ .

عائشة - رضي الله تعالى عنها - قالت : جاءت هند بنت عتبة ، قالت : يا رسول الله ما كان على ظهر الارض من اهل خِباء أحبَّ اليّ أن يُذلُّوا من اهل خبائك ، ثم ما أصبح اليوم على ظهر الارض أهل خباء أحب اليّ أن يعزّوا من أهلِ خبائك . قالت : [فقال رسول الله - ﷺ - م] وايضا والذي نفسي بيده [ثم . م] قالت : يا رسول الله ان أبا سفيان رجل مِسّيك [ممسك . اخرى . م . . شحيح اخرى . م .] فهل عليَّ حرج ان أُطْعِمَ من المال الذي له عيالنا ؟ قال : لا أُراه الا بالمعروف . ح - ١٩٦/٨ ، م . ٢٧٦/٧

وفي اخرى ليس فيها البحث عن الذلة والعزة قالت : يا رسول الله إِن أبا سفيان رجل شحيح ، وليس يعطيني ما يكفيني وولدي إِلا ما

أخذت منه وهو لا يعلم . فقال : خذي ما يكفيك وولدك بالمعروف .
ح ـ ١٩٦/٨ ، م ـ ٢٧٤/٧ .
تەرجەمە :

عائیشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ فەرمووی : هیندی کچی عوتبەی دایکی موعاویە هاتە خدمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزیکرد : (یا رسول الله) لەسەر رووی ئەرزا ئەهلی بەیتێ نەبوە کە حەز بکەم لە ئەهلی بەیتی تۆ زیاتر لە ذیللەتا بێ ، لە دواییا ئیمرۆ هیچ ئەهلی بەیتێ نییە لەسەر ئەرزا کە حەز کەم لە ئەهلی بەیتی تۆ زیاتر لە عیززەتا بێ . حەزرەتی عائیشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ فەرمووی : کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : قەسەم بەوەی کە نەفسی من لە دەستی قودرەتیایەتی دیسان [لێی زیاد ئەکەی ، حوببی ئێمەت زیاتر ئەبێ ، زیاتر لە بوغضی ئێمە ئەگەرێیتەوە] وتی : (یا رسول الله) ئەبوسوفیان پیاوێکی چرووکەو ئەوەندەم ناداتێ کە بەشی خۆمو منالەکانم بکا ، هیچ گوناهی هەیە کە بە بێ ئیندنی ئەو لە مالی ئەو خەرج بکەم بۆ منالەکانمان ؟ پێغەمەر ـ فەرمووی : ظەننم نییە کە بە غەیری میقداری موناسب بە حالی ئەوو ئێوە بۆت دروست بێ [بە عادەت بۆ ئەمثالی ئێوە چەندە کیفایەت ئەکا بۆ خۆتو منالەکانت لە مالی ئەو خەرج بکە]

[ئەمە ئەحوالی موعاویەو دایکو باوکی ؛ دایکو باوکی لە دوای ئەمە کە موسولمان بوون زەرەریان نەگەیان بە خەلق ، نەیشگەیینە زەمانێ کە دەستیان ببێ زەرەر بگەیێنن . (واما حساب معاوية فعلى الله وهو احكم الحاكمين)]

# فضائل امنا ام المؤمنين خديجة بنت خويلد

## - رضي الله تعالى عنها -

١٠٥/ ٩٨٣ عبدالله بن جعفر [رضي الله تعالى عنهما] قال : سمعت عليا - رضي الله تعالى عنه - قال : سمعت رسول الله - ﷺ - يقول : خير نسائها [اي الدنيا] مريم [بنت عمران . م] وخير نسائها [اي هذه الامة] خديجة [بنت خويلد . م] واشار وكيع الى السماء والارض . م]
ح - ٦/ ١٦٠ ، م - ٩/ ٣٢٤

تەرجەمە :

[حەزرەتی خەدیجە - رضي الله تعالى عنها - نە لە پیاوان‌و لە ژنان هیچ کەس نەبوە لە پێش ئەوا موسوڵمان بووبێ ، وەزیری صادقی پێغەمەر بوو - ﷺ - پێغەمەر - ﷺ - لە موشریکان هەر ئەذاو جەفای دیبێ خەدیجە - رضي الله تعالى عنها - دڵخۆشی ی داوەتەوەو حوزن‌و کەدەری لە دڵ کردۆتە دەرێ . پێغەمەر - ﷺ - عومری بیست‌و پێنج ساڵ بوو کە مارەی کرد ، بیست‌و پێنج ساڵ لای پێغەمەر - ﷺ - مایەوە ، دە ساڵ دوای نوبووەت وەفاتی کرد لە رەمەزانا . فەضڵی‌و موعاوەنەتی بۆ پێغەمەر - ﷺ - بێ پایانە . قسطلانی]

ئیمامی عەلی - رضي الله تعالى عنه ، وقهر اعداءه - ئەفەرموێ : لە پێغەمەر - ﷺ - م بیست ئەیفەرموو : چاکترینی ژنی دنیا [یەعنی لە بەینی ئەرزو ئاسمانا لە زەمانی خۆیا] مەریەمی کچی عیمرانە ، چاکترینی هەموو ژنی سەر ئەرز [یەعنی لە زەمانی خۆیا] خەدیجەی کچی

خوەيليدە . وەكيع ـ كە يـەكێكە لـە راوييان ـ ئيشـارەتى ئەلاى ئـەرزو ئاسمان كرد .

[طەبەرانى و بەزار بە مەرفووعيى لـە عەمـارى كوڕى يـاسيرەوە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ريوات ئەكەن كە حەزرەتى خەديجە ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەضلى هەيە بەسەر ژنانى ئوممەتى منا هەروەك مەريـەم كە فەضلى هەيە بەسەر ژنى دنيادا .

[نەسائى بە حەديثى صەحيح ريوايەت ئەكا لە ئيبن و عەباسەوە ـ رضي الله تعـالى عنهما ـ (مـرفوعـا) كە : گـەورەترينى ژنـانى ئەهـلى جەننەت : خەديجەيە ، فاطيمەيە ، مـەريەمـە ، ئاسيـەيە ـ رضي الله تعالى عنهن ـ قسطلانى]

١٠٦/ ٩٨٤ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت : ما غِرْتُ على امرأة للنبيّ ـ ﷺ ـ ماغِرتُ علي خديجة ، هلكتْ قبل ان يتزوجني ؛ لما كنت أسمعه يذكرها ، وأمره الله أن يبشرها ببيت من قصب [لؤلؤ مجوف] وإن كان ليذبح الشاة فيهدي في خلالها منها ما يسعهن ح ـ ٦/ ١٦١ وفي اخرى وتزوجني بعدها بثلاث سنين بـدل هلكت قبل ان يتـزوجني .

ح ـ ٦/ ١٦١ ، م ـ ٩/ ٣٢٩ .

تەرجەمە :

عائيشة ـ رضي الله تعـالى عنها ـ ئـەفەرمـوێ : بۆ هيـچ ژنێكى پێغەمەر ـ ﷺ ـ غيرەتم نەبزووتوە ئەوەندەى كە غيرەتم بزووتوە دەرحەق خەديجە ، كە سێ ساڵيش دواى وەفاتى ئەو پێغەمەر ـ ﷺ ـ منى هێناوە ؛ چونكى زۆرم لێ ئەبيست كە ناوى ئەبرد بە چاكە ، خوايش ئەمرى پێ فەرمووبوو كە موژدەى بداتێ بەوە كە لە بەهەشتا خانوويێكى لە دوڕ بۆ دروستكراوە ، هەم پێغەمەر ـ ﷺ ـ مـەڕى سەر ئـەبرى بـۆ هەمـوو

دۆستو ئەحبابی ئەوی ئەوەندە ئەنارد کە بەشی هەموویان بکا .

١٠٧/٩٨٥ وعنها ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت : ماغِرت على أحد من نساء النبيّ ـ ﷺ ـ ماغِرت على خديجة ، وما رأيتها ، ولكن كان النبيّ ـ ﷺ ـ يكثر ذكرها ، وربما ذبح الشاة ثم يقطعها أعضاء ثم يَبْعثُها في صداثق خديجة ، فربما قلت له : كأنه لم يكن في الدنيا الا خديجة ! فيقول : كانت ، وكانت ، وكان لي منها ولد . ح ـ ٦/١٦٢ ، م ـ ٩/٣٢٩ وفيه : قد رزقت حُبَّها .

تەرجەمە :

حەزرەتی عائیشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : لە هیچ ژنێکی پێغەمەر ـ ﷺ ـ غیرەتم نەهاتۆتە جۆش ئەوەندەی کە لە خەدیجە غیرەتم هاتۆتە جۆش ، نەیشم‌دیبوو ، ئەمما پێغەمەر ـ ﷺ ـ زۆری ناو ئەبرد ، زۆر جار مەڕی سەرەبڕی پارچەپارچەی ئەکردو ئەینارد بۆ دۆستو ئەحبابی خەدیجە . زۆر جار عەرزی پێغەمەرم ئەکرد ـ ﷺ ـ : ئەمە چی‌یە وەك لە دنیادا غەیری خەدیجە هیچ ژن نەبووبێ ؟ ! ئەیفەرموو : وابووەو ، وابوە ، لەو منالم بوە ، حوببی لە دلا چەسپیوە ، بوە بە رزقم .

١٠٨/٩٨٦ عن اسماعيل بن أبي خالد قال : قلت لعبد الله بن أبي أوفى ـ رضي الله تعالى عنهما ـ [أكان . م] بَشَّر النبيُّ ـ ﷺ ـ خديجةَ ؟ قال : نعم ببيت من قصب لا صخب فيه [صياح] ولا نصب [تعب] م ـ ٩/٣٢٦

تەرجەمە :

ئیسماعیل ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : عەرزی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفام کرد : ئایا پێغەمەر ـ ﷺ ـ موژدەی داوە بە حەزرەتی خەدیجە

- رضي الله تعالى عنها - ؟ فەرمووی : بەڵێ مژدەی داوەتێ کە لە بەهەشتا خانوویێکی لە دوڕ بۆ دروستکراوە ، نە دەنگەدەنگی تیایە نە نارەحەتی .

[وعند أحمد عن عائشة - رضي الله تعالى عنها - پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : لە وەختێکا کە خەڵق پێم کافر بوون خەدیجە ئیمانی پێ هێنام ، لە وەختێکا کە خەڵق پێیان ئەوتم : تۆ درۆ ئەکەی خەدیجە وتی : راست ئەکەی ، لە وەختێکا کە مەحرووم بووم لە ماڵی خەڵق نەیان دامێ خەدیجە دایمێ ، خوا کە مەحروومی کردم لەوە کە لە ژنەکانی ترم منالم ببێ لە خەدیجە خوا منالی پێ بەخشیم . قسطلاني] .

۹۸۷/۱۰۹ عن أبي هريرة - رضي الله تعالى عنه - قال : أتى جبريل [عليه السلام] النبيّ - ﷺ - [وهو بحراء . طبراني] فقال : يا رسول الله هذه خديجة قد أتت معها إناء فيه إدام ، او طعام ، او شراب ، فإذا هي أتتك فاقرأ - عليها السلام - من ربها ومني . [فقالت : هو السلام ومنه السلام وعلى جبريل السلام . طبراني . وزاد النسائي عن أنس : وعليك يا رسول الله السلام ورحمة الله وبركاته . قسطلاني] وبشرها ببيت في الجنة من قصب لا صخب فيه ولا نصب . ح - ۱٦۲/٦ ، م - ۳۲٦/۹ مرسل صحابي

تەرجەمە :

جیبریل - عليه الصلاة والسلام - تەشریفی هاتەخزمەت پێغەمەر - ﷺ - لە غاری حیرادا ، فەرمووی : یارەسوولەڵلا ، ئەوە خەدیجەیە ظەرفێکی پێیە پێخۆری تیایە ، یا فەرمووی ، طەعامی تیایە ، یا

فەرمووی : شەربەتی تیایە [راویی بە شك کەوتوە] کە هاتە لات لە خواوەو لە منەوە سەلامی لیّ بکەو ، موژدەی بدەریّ کە لە بەهەشتا خانوویێکی هەیە لە دورِ نە دەنگە دەنگی تیایە نە نارەحەتیّ .

موکافاتی ئەوە کە حەزرەتی خەدیجە - رضي الله تعالى عنها - دەفعی هەموو دڵنارەحەتییێکی کردوە لە پێغەمەر - ﷺ - لە موددەی حەیاتیا بە قەد ذەرِە دڵی نەئێشانوە .

. . . . . .

٩٨٨/١١٠ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت : بشر رسول الله - ﷺ - خديجة بنت خويلد [رضي الله تعالى عنها] ببيت في الجنة . م - ٣٢٦/٩

٩٨٩/١١١ وعنها قالت : لم يتزوج النبيّ - ﷺ - على خديجة حتى ماتت . م - ٣٢٨/٩

تەرجەمە :

پێغەمەر - ﷺ - موژدەی دا بە خەدیجە - رضي الله تعالى عنها - کە لە بەهەشتا بە خانوویێ[1] بۆی دروستکراوە . تا وەفاتی نەکرد پێغەمەر - ﷺ - ژنی بەسەر نەهێنا .

---

(١) ئەگەر بگوترێ : بە خانوویێ کە لە بەهەشتا بۆی دروستکراوە . . باشترە .

١١٢/ ٩٩٠ وعنها - رضي الله تعالى عنها - قالت : إستأذنتْ هالة بنت خويلد اخت خديجة على رسول الله - ﷺ - ، [ورضي عنهما] ، فعرف استئذان خديجة [رضي الله تعالى عنها - لشبه صوتها بصوت اختها] فارتاع لذلك [أي فزع وتغيّر] فقال : اللهم [اجعلها] هالة . قالت : فغِرْتُ ، فقلت : ما تذكر من عجوز من عجائز قريش حمراء الشدقين هلكت في الدهر ؟ ! قد أبدلك الله خيرا منها .

[وعند احمد والطبراني : قالت عائشة - رضي الله تعالى عنها - فقلت : قد أبدلك الله بكبيرة السن حديثةَ السنِّ ، فغضب حتى قلت : والذي بعثك بالحق ! لا أذكرها بعد هذا إلاّ بخير] ح - ٦/١٦٣ ، م - ٩/٣٢٨

تەرجەمە :

حەزرەتی عائیشە - رضي الله تعالى عنها - ئەفەرموێ : هالەی کچی خوەیلید ، خوشکی حەزرەتی خەدیجە - رضي الله تعالى عنها - ئیذنی خواست کە بێتە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - پێغەمەر - ﷺ - وەیزانی خەدیجەیە - رضي الله تعالى عنها - کە ئیستیذان ئەکا ؛ چونکی دەنگیان بە یەك ئەشویها ، لەوەوە پێغەمەر - ﷺ - رەنگی تێکچو ، فەرمووی : خوایا هالە بێ . . . لەوە زۆر هاتمە غیرەت ، عەرزم کرد : ئەمە چی یە ئەوەندە پیرێژنێ لە پیرێژنەکانی قورەیشی لالەغاوە سووری ددان لەدەمانەماو یێنیەوە فکری خۆت کە زەمانێکی دوورو درێژە کە نەماوە ؟ ! خوا لە باتی ئەو یەکێکی چاتری داویتێ [لە باتی پیری ساڵ تازەییکی پێ عەطا فەرمووی . پێغەمەر - ﷺ - زۆر رقی هەڵسا ، بە نەوعێ تا عەرزم کرد : قەسەم بەوەی تۆی بە حەق رەوانەکردوە ! ئیتر لەمەولا بە چاکە نەبێ ناوی نابەم] .

چەندە گەورە بوە ؟ ! بەو هەموو حوسن و جەماڵەوە کە حەزرەتی عایشە بوویەتی لەسەر ئەو رقی هەڵسا ، تا حەزرەتی عایشەی مەجبوور کُرد بەوە کە تۆبەی پێکرد دەفعەیێکی تر بە خراپە ناوی نەبا - رضي الله تعالى عنهما -

# فضائل عائشة

## رضي الله تعالى عنها - و تزوجه بالنبيّ - عليه الصلاة والسلام -

کچی ئـەبوبـەکری صـەدیقە ، دایکی (ام الـرومان)ی[1] کچی عامیرە ، کونیەی (ام عبدالله)یە بـە ناوی عـەبدوڵـڵای کوڕی زوبـەیر - رضي الله تعالى عنهم - هەشت ساڵ لە پێش هیجرەتا لە دایك بوە ، لە وەختی وەفاتی پێغەمەرا - ﷺ - هەژدە ساڵ بوو ، چواریەکی ئەحکامی شەرع لەو ریوایەت کراوە ، (افقه)و (اعلم)ی ئینسانی زەمانی خۆی بوە ، عەقڵو رەئیی لە هەموو کەس مەتینتر بوە ، لە زەمانی خۆیا کەس نەبوە لەو عالمتر بێ بە فیقەو ، طیبو ، شیعر .

محـەمەدی بنی شـەهابی زوهـری ئەڵێ : عیلمی هـەموو ژنـانو ئەزواجی طاهیرات لەگەڵ عیلمی ئەوا موقایەسە بکرێ عیلمی ئەو لە هەموویان زیاترە .

لای پێغەمەر - ﷺ - لە هەموو ئەزواجی طاهیرات مـەحبوویـتر بوە .

خـوا - عز وجـل - لە مـەسئەلـەی ئیفکا بـە (نەصی قـورئـانی) تەبرى يەی کردوە .

---

(١) یانی دایکی عائیشەیە . واتە عائیشة کچی (ام الرومان)ە .

له ساڵی پەنجاو هەشتا وەفاتی کردوە . لە شەوی سێ شەمەی حەڤەمینی رەمەزان لە زەمانی موعاویەدا . ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - نوێژی لەسەر کرد - رضي الله تعالى عنها - . قسطلاني . ٦ - ١٣٦ .

٩٩١/١١٣ عائیشه - رضي الله تعالى عنها - قالت : قال رسول الله - ﷺ - يوما : يا عائش هذا جبريل يقرئكِ السلام ، فقلت : [و . نسخة] عليه السلام ورحمة الله وبركاته . ترى مالا ارى . تريد رسول الله - ﷺ - ح - ١٣٧/٦ ، م - ٣٤٠/٩ وليس فيه : تريد . . الخ

تەرجەمە :

حەزرەتی عائیشەی دایکمان ئەفەرموێ : رۆژێ پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : عایشۆڵێ ئەمە جیبریلە سەلامت لێ ئەکا . وتم : (وعليه السلام ورحمة الله وبركاته) ئەوی ئێمە نای‌بینین تۆ ئەیبینی . خیطابە لەگەڵ پێغەمەرا - ﷺ - .

سەلام ناردن - مطلقا - سەلام ناردنی ئەجنەبی صالیح بۆ ئەجنەبی‌یەی صالیحە کە خۆفی مەفسەدە نەبێ . . . سونئەتە . جوابی فەرزە . زیادکردنی (ورحمة الله) وبركاته سونئەتە . لە ناو کاغەزیشا بنووسرێ جوابی فەرزە ، بە زمان یا بە نووسین .

٩٩٢/١١٤ عن أبي موسى الأشعري - رضي الله تعالى عنه - قال : قال رسول الله - ﷺ - كمل [بحركات الميم] من الرجال كثير ، ولم يكمل من النساء اِلاّ مريم بنت عمران ، وآسية امرأة فرعون . وفضل عائشة على النساء كفضل الثريد على سائر الطعام ح - ١٣٧/٦ ، م - ٣٢٥/٩ ، ت ، ن ، جه . وفي حديث ابن حبان : أما ترضين أن تكوني زوجتي في الدنيا والآخرة ؟ قسط ٦ - ١٣٨ .

تەرجەمە :

پێغـەمەر ـ ﷺ ـ فـەرمووی : لـە پیاوانـا گەلێ کـەس گەیـیونـە دەرەجەی کەمال ، لە ژنانا تەنها مەریـەم و ، ئاسیـەی ژنی فیرعـەون پێگەییون .

[ئیبن و حیببان ریوایەت ئەکـا کە پێغـەمەر ـ ﷺ ـ بـە عایشـەی فەرموو : رازی نابی بەوە کە لە دنیاو ئاخیرەتا ژنی من بی ؟] فەضلُ عائیشە بەسەر ژنانی ترا وەکوو فەضلی تریت وایە بەسەر سائیری طەعاما .

ئەم حەدیثە ئیمای تیایە کـە حەزرەتی مـەریەمەو ئـاسیە گـەییونـە دەرەجەی (نبوة) ـ علیهما السلام ـ . ئەگەر موراد دەرەجەی ویلایەت بێ لازم ئەکا لە ژنانا هیچ (ولیة) نەبووبێ ، وایش نی یە ، هەموو ژنە ئەنبیا ـ غەیری ژنێکی نووح و ، ژنی لووط ـ علیهما الصلاة والسلام ـ بە بێ شك هەموو (ولیە) بوون ، سائیری ئەزواجی طاهیرات و حەزرەتی فاطیمەو ، هەموو ژنە صەحابیەو ئـەمثالی رابیعـەی عەدەوی یـە ـ رضي الله تعالى عنهن ـ . . هەموو وەلی یە بوون ، ئەممانـە گەییـونە غـایەتی کـەمال کـە دەرەجەی نوبووەتە .

٩٩٣/١١٥ ابو وائل قال : لما بعث عليّ عمارا والحسن ـ رضي الله تعالى عنهم ـ الى الكوفة ليستنفرهم خطب عمار فقال : إني لأعلم أنها زوجته في الدنيا والآخرة ولكن الله ابتلاكم لتتبعوه أوإياها . ح ـ ١٣٨/٦ مرّ في وقعة الجمل

تەرجەمە :

ئەبو وائیل ئەفەرموێ : کە حەزرەتی عەلی ی عەممـارو حەزرەتی حەسەنی ـ رضي الله تعالى عنهم ـ نارد بۆ کووفە کە نەفیری عامیان پێ بکا بۆ موقابەلەی حەزرەتی عائیشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ عەممار ـ رضي الله

تعالى عنه ـ خوطبەی خوێن ، لە ئەثنای خوطبەکەدا فەرمووی : کە ئەزانم لێم (محقق)ە کە حەزرەتی عائیشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ژنی دنیاو ئاخیرەتی پێغەمەرە ـ ﷺ ـ ئەمما خوا ئێوەی موبتەلای ئەم وەقعەیە کردوە ئیمتیحانتان ئەکا کە : تابیعی خوا ئەبن بەمە کە ئیطاعەتی ئیمامی حەق بکەن یا تابیعی عائیشە ئەبن ـ رضي الله تعالى عنها ـ ؟

**٩٩٤/١١٦ عن القاسم بن محمد أن عائشة [رضي الله تعالى عنها] اِشتكت فجاء ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] فقال : يا ام المؤمنين تَقْدَمين على فَرَط صدق [اى السابق الى المنزل الصادق] على رسول الله ـ ﷺ ـ وعلى أبي بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ح ـ ١٣٨/٦**

**تەرجەمە :**

قاسمی کوڕی محەمەدی کوڕی صەدیق ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : حەزرەتی عایشەی دایکمان ـ رضي الله تعالى عنها ـ نەخۆش کەوت ، عەبدوڵڵای بنی عەبباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ تەشریفی هات بۆ عەیادەتی ، فەرمووی : ئەی دایکی هەموو موسوڵمانان تەشریفت ئەچێتە خدمەت کەسێ کە = لە = پێش ئوممەتەوە تەشریفی چوە کە مەنزڵمان بۆ حازر بکا کە پێشکەوتوویێکی صادقەو راستە ؛ تەشریفت ئەچێتە خدمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ و خدمەت حەزرەتی صەدیقی ئەکبەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ .

**٩٩٥/١١٧ عروة [بن الزبير ـ رضي الله تعالى عنه ـ] أن رسول الله ـ ﷺ ـ لما كان في مرضه جعل يدور في نسائه ، ويقول : أين أنا غدا ؟ حرصا على بيت عائشة . قالت عائشة [رضي الله تعالى عنها] : فلما كان يومي سكن . ح ـ ١٣٨/٦ . موصول في صورة المرسل .**

تەرجەمە :

پێغەمەر - ﷺ - لە مەرەضی وەفاتیدا ئەگەڕا لە بەینی ئەزواجی طاهیراتا ، ئەیفەرموو : سبەینێ من لە کوێم ؟ ئەم سوئالەی بۆیـە بوو حیرصی لەسەر ئەوە بوو کە تەشریفی نەقڵ بکاتە بەیتی حەزرەتی عائیشە - رضي الله تعالى عنها - [ئەزواجی طاهیرات هەموو موساعەدەیان کرد ، تەشریفی نەقڵی کردە هۆدەی حەزرەتی عایشە - رضي الله تعالى عنها -] حەزرەتی عائیشە - رضي الله تعالى عنها - = ئەفـەرموێ : = لـە ڕۆژی نەوبەتی منا وەفاتی کرد - عليه الصلاة والسلام - (فهنيئا له ذلك اليوم ، يوم لقائه الرفيق الاعلى) .

١١٨/٩٩٦ وعنه [عن عائشة - رضي الله تعالى عنها ظاهرا] قال : كان الناس يتحرون بهداياهم يوم عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت عائشة [رضي الله تعالى عنها] : فاجتمع صواحبي الى ام سلمة [رضي الله تعالى عنها] فقلن : يا ام سلمة والله إن الناس يتحرون بهداياهم يوم عائشة ، وإنا نريد الخير كما تريد عائشة ، فمري رسول الله - ﷺ - أن يأمر الناس أن يُهدوا اليه حيثما كان أو حيثما دار . قالت : فذكرتْ ذلك ام سلمة للنبيّ - ﷺ - قالت : فأعرض عني ، فلما عاد اليّ ذكرتْ له ذلك فأعرض عني ، فلما كان في الثالثة ذكرت له ، فقال : يا ام سلمة لا تـوذيني في عائشة ، فإنه والله ! ما نزل عليّ الوحي وأنا في لحاف امرأة منكن غيرها .

ح - ١٣٩/٦

تەرجەمە :

خەڵق کە دیارییان ئەبرد بۆ حەزرەتی پێغەمەر - ﷺ - ئەگەڕان چە ڕۆژێ نەوبەتی حەزرەتی عائیشەیە ، لەو ڕۆژەدا دیارییەکەیان تەقدیم ئەکرد . حەزرەتی عائیشە - رضي الله تعالى عنها - فەرمووی : کە هەموو

هەویکانم لە لای (ام سلمه) دا کـۆبوونـەوە ، وتیان : (یـا ام سلمه) وەڵڵاهی خەڵق هەموو بۆ رۆژی عائیشه ئەگەرێن ، لەو رۆژەدا هەدی یە ئەبەنە خذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ چۆن ئەو حەز بە خێر ئـەکا ئێمـەیش حەزی پێ ئەکەین ، عەرزی پێغەمەر بکە ـ ﷺ ـ کە ئەمر بکا بە خەڵق کە خۆی تەشریفی لای هەر ژنێکی بێ هەدی یەکەی بۆ ببەنە ئەوێ . عائیشه ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : (ام سلمه) ئەوەی عەزری پێغەمەر کرد ـ عليه الصلاة والسلام ـ (ام سلمه) فەرمووی : رووی لێ وەرگێرام ، کە نۆبەی خۆم هاتەوەو تەشریفی هات دووبارە عەرزم کرد ، دووبـارە رووی لێ وەرگێرام . لـە دەفعەی سێ یـەمیشا عـەرزم کـرد ؛ فەرمووی : ئەی (ام سلمه) لە خوصووصی عایشەوە ئەذییەتم مەدە ، وەڵڵاهی ! لە ژێر لێفەی هیچ کامتانا ـ غەیری عایشە ـ وەحیم بۆ نازڵ نەبوە .

۹۹۷/۱۱۹ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت : إن كان رسول الله ـ ﷺ ـ ليتفقد يقول : أين أنا اليوم ؟ أين أنـا غدا ؟ استبـطاء ليوم عـائشة . قـالت : فلما كان يـومي قبضه الله بـين سحـري ونحـري .

م ـ ۳۳٦/۹

تەرجەمە :

حەزرەتی عایشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمـووی : پێغەمـەر ـ ﷺ ـ بۆ رۆژی من ئەگەڕا ؛ ئەیفەرموو : ئیمرۆ لەکوێم ؟ سبەینێ لە کوێ ئەبم ؟ رۆژی منی بە دوورو درەنگ ئەزانی . کە رۆژی من هات خوا لە بەینی جەرگەو دڵما قەبضی رۆحی کرد ـ عليه الصلاة والسلام ـ .

۹۹۸/۱۲۰ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] ان الناس كانوا يتحرون بهـداياهم يـوم عائشـة ، يبتغـون بـذلـك مـرضـاة رسـول الله ـ ﷺ ـ

م ـ ۳۳۲/۹

**تەرجەمە :**

عائیشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : خەڵق ئەگەڕان بۆ ڕۆژی حەزرەتی عائیشة ، لەو ڕۆژەدا دیارییان ئەبردە خدمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ بەوە طەلەبی ڕەضای پێغەمەریان ئەکرد ـ ﷺ ـ .

**١٢١/٩٩٩** عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] زوج النبيّ ـ ﷺ ـ قالت : أرسل أزواج النبي ـ ﷺ ـ فاطمة بنت رسول الله ـ ﷺ ـ الى رسول الله ـ ﷺ ـ فاستأذنت عليه وهو مضطجع معي في مرطي فأذن لها ، فقالت : يا رسول الله اِن أزواجك أرسلنني اليك يسألنك العدل في اِبنة أبي قحافة ، وأنا ساكتة ، قالت : فقال لها رسول الله ـ ﷺ ـ : أي بنية اَلسْتِ تُحِبِّين ما احبّ ؟ فقالت : بلى . قال : فأَحبِّي هذه . قالت : فقامت فاطمة حين سمعت ذلك من رسول الله ـ ﷺ ـ فأخبرهن بالذي قالت ، وبالذي قال لها رسول الله ـ ﷺ ـ . فقلن لها : ما نراك أغنيت عنا من شئ ، فارجعي الى رسول الله ـ ﷺ ـ فقولي له : اِن أزواجك ينشدنك العدل في ابنة أبي قحافة . فقالت : والله لا أُكلم فيها أبدا .

قالت عائشة [رضي الله تعالى عنها] فأرسلت أزواج النبيّ ـ ﷺ ـ زينب بنت جحش : زوج النبيّ ـ ﷺ ـ [ورضي عنها] وهي التي كانت تساميني منهن في المنزلة [أي تعادلني وتضاهيني] عند رسول الله ـ ﷺ ـ ولم اَرَ امرأة قط خيرا في الدين من زينب ، وأتقى لله ، وأصدق حديثا ، وأوصل للرحم ، وأعظم صدقة ، وأشدّ اِبتذالا لنفسها في العمل الذي تصدق به ، وتقرب به الى الله ـ تعالى ـ ما عدا سَوْرة مَن حد كانت فيها تسرع منها الفيئة ، قالت : فاستأذنت على رسول الله ـ ﷺ ـ ورسول الله ـ ﷺ ـ مع عائشة في مرطها على الحالة التي دخلت فاطمة [رضي الله تعالى عنها] عليها وهوبها ، فأذن لها رسول الله ـ ﷺ ـ فقالت : يا رسول الله اِن

أزواجك أرسلنني اليك يسألنك العدل في إبنة أبي قحافة . قالت : ثم وقعت بي ، فاستطالتْ عليّ ، وأنا أرقب رسول الله ـ ﷺ ـ وأَرْقبُ طرفه ؛ هل يأذن لي فيها ؟ قالت : فلم تبرح زينب حتى عرفت أن رسول الله ـ ﷺ ـ لايكره أن أنتصر . قالت : فلما وقعتُ بها لم أنشبها [أن أثخنتها غلبة . م اخرى] حين أنحيت عليها [قصدتها بالمعارضة] فقال رسول الله ـ ﷺ ـ وتبسم : إنها ابنة أبي بكر . م ـ ٩/٣٣٣

**تەرجەمە :**

عائیشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ ئەفەرموێ : ئەزواجی پێغەمەر ـ ﷺ ـ ورضي عنهن ـ حەزرەتی فاطیمەی کچی پێغەمەریان ـ ﷺ ـ ناردە لای پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئیستیذانی کرد ، پێغەمەریش ـ ﷺ ـ لەگەڵ منا لە ژێر مەوجەکەما راکشابوو ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئیذنی دا . فەرمووی : (یا رسول الله) ژنەکانت منیان ناردۆتە خذمەتت عەداڵەتیان لێت ئەوێ لە خوصووصی کچی ئەبوقوحافەوە . حەزرەتی عائیشە فەرمووی : منیش بێدەنگ بووم . پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە فاطیمەی فەرموو : ئەی کچی خۆم بۆ تۆ ئەوەت خۆش ناوێ کە من خۆشم ئەوێ ؟ فاطیمە فەرمووی : بەڵێ خۆشم ئەوێ . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : کە وابێ ئەمت خۆش بوێ .

حەزرەتی عائیشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ فەرمووی : کە فاطیمە ـ رضي الله تعالی عنها ـ ئەمەی لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ بیست هەڵساو ئەوەی کە عەرزی پێغەمەری کردبووو ئەو جوابەی کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ دایەوەی بۆ ئەزواجی گێرایەوە . پێیان فەرموو : هیچ فائیدەیێکت بۆمان نەبوو ، بچۆرەوە عەرزی بکە : کە ژنەکانت سوێندت ئەدەن ، دەرحەق کچی ئەبو قوحافە طەلەبی عەداڵەتت لێ ئەکەن . حەزرەتی فاطیمە ـ رضي الله تعالی عنها ـ فەرمووی : وەڵلاهی قەط قسە لە عایشە ناکەم .

عائيشه - رضي الله تعالى عنها - فەرمووی : ئەزواجی پێغەمـەر - ﷺ - زەینەبی کچی جەحشیان نارد ، کـە ئەویش ژنی پێغـەمەر بـوو - ﷺ ورضي عنها - زەینەب لە جوانیو حورمەتا لە لای پێغەمەر - ﷺ - لە دەرەجەی منا بوو ، لە دنیادا هیچ ژنی وەکوو ئەوم نەدیوە ، لە هەموو ژن تەقوای لە خوا زیاتر بوو ، قسەی لە هەمـوویان راستـتر بوو ، لـە هەموویان زیاتر صیلەی رەحمی بەجێ ئەهێنا ، صەدەقەی لە هەموویان زیاتر بوو ، لە هەموویان بەسەعیتر بوو لەو عـەمەلی صـالیحەدا کـە ئەیکردو بەوە (تقرب)ی (الى الله) ئەکرد . . . ئەوەندەی هەیە توندیو تیژییێکی بوو کە زوو لێی پەشیمان ئەبۆوەو بەسەر ئەچوو .

حەزرەتی عایشە - رضي الله تعالى عنهـا - فەرمـووی : زەینەب ئیستیذانی کرد ، پێغەمەر - ﷺ - لەگەڵ عایشەدا لە ناو مەوجی ئەوا بوو لەسەر ئەو حاڵەتەی کە حەزرەتی فاطیمە - رضي الله تعالى عنها - چوە خذمەتی . پێغەمەر - ﷺ - ئیذنی دا . وتی : (یا رسول الله) ژنەکانت منیان ناردۆتە خذمەت ئەیانەوێ کە دەرحەق کچی ئەبوقوحافە عەداڵەت بەجێ بێنی . لە دوایـیدا زەینەب دەستی کـرد بە لـەسەروگـوێلاك دانی من[1] ، زۆری درێژ کردەوە ، منیش مونتەظیری پێغەمـەر بووم - ﷺ - تەماشای چاویم ئەکرد تا بزانم ئیذنم ئەدا قسە بکەم یان نا ؟ فەرمووی :

(١) مەبەستی لە «لەسەرو گوێلاكدان» لێدانو دارکاریکردن نییەو ، مەبەستی قسەپێوتنە ، وەك دەڵێن : فلان کەسی داشۆرد . مانای وا نییە دایە بەر ئاو ، یان لە حەوزی هەڵکێشا .

زەینەب هەر وازی نەهێنا تا لێم مەعلووم بوو کە پێغـەمەر ـ ﷺ ـ پێی ناخۆش نی یە کە حەقی خۆم بکەمەوە . کە رووم تێکردو دەستم کرد بە موعارەضەکردنی هیچ مۆڵەتم نەدا تا بێدەنگم کردو غەلـەبەم بـەسەرا کرد . پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێکەنی و فەرمووی : ئەمە کچی ئەبوبەکرە .

قسەی زەینەب بە عایشەو جوابدانەوەی عایشە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ شتێکی وا نەبوە کە بە شەرع مەمنووع بووبێ ؛ گینـا پێغەمـەر ـ ﷺ ـ زەینەبی بێدەنگ ئەکردو تەحسینی حەزرەتی عائیشەیشی نەدەکرد ، بەڵکو بێدەنگی ئەکرد .

١٢٢/ ١٠٠٠ قـاسم بن محمد عن عـائشة ـ رضي الله تعـالى عنهـا ـ قالت : كان رسول الله ـ ﷺ ـ إذا خرج أقرع بين نسائه . فطارت القرعة على عائشة وحفصة فخرجتا معه جميعا . وكان رسول الله ـ ﷺ ـ إذا كان بالليل سار مع عائشة يتحدث معها ؛ فقالت حفصة لعائشة : ألا تركبين الليلة بعيري وأركب بعيرك فتنظرين وأنظر ؟ قـالت : بلى . فـركبت عائشة على بعير حفصة ، وركبت حفصة على بعير عائشة . فجاء رسول الله ـ ﷺ ـ الى جمل عائشـة وعليه حفصـة ، فسلم ثم سار معهـا حتى نزلوا ، فافتقدته عائشة فغارَتْ ، فلما نزلوا جعلت تجعـل رجلها بـين الأذخر وتقول : يا رب سلط عليّ عقربا أو حية تلدغني ! رسولك ولا أستطيع أن اقول له شيئا . ح ـ ٨/ ١٠٠ ، م ـ ٩/ ٣٣٨

[وعند الاسماعيلي : ورسول الله ـ ﷺ ـ ينظر . قسطلاني]

تەرجەمە :

عایشە ـ رضي الله تعـالى عنها ـ ئـەفەرمـوێ : پێغەمـەر ـ ﷺ ـ تەشریفی بچوایە بۆ سەفەرێ قورعەی ئەکێشا لە بەینی حەرەمەکانیا . دەفعەیێ قورعـە لەسـەر عایشـەو حەفصـە دەرچوو ، هـەردوکیان لـە

خذمەتیا چوون ، پێغەمەر - ﷺ - کە شەو دائەهات لەگەڵ حـەزرەتی عایشەدا ئەرۆیی قسەی لەگەڵ ئەکرد . حەفصە بە عائیشەی وت : بۆتۆ سواری وشترەکەی من نابی‌و منیش سواری وشترەکەی تۆ ببم تێفکرین بزانین چی ئەبێ ؟ عایشە وتی : بەڵێ ، یەعنی باشـە . عایشـە سواری وشترەکەی حەفصە بوو و حەفصە سواری وشتـرەکەی عـائیشە بـوو . پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی هاتە لای وشترەکەی عایشەو حەفصەی سوار بوو بوو سەلامی کردو تەشریفی لەگەڵیا رۆیی تا باریان خست . عایشە ئەو شەوە پێغەمەری - ﷺ - ون‌کرد ، غیرەتی جۆشی سەند کە دابەزین پێی خۆی خستە ناو زورناتکی ئەویۆەو ئەیفەرموو : یارەببی دووپشکێ یا مارێکم بەسەرا (مسلط) بکەی پێمەوە دا ! ئەوە پێغەمەرە - ﷺ - ناتوانم هیچی پێ بڵێم . [کـە ئیمشـەو بـۆچیت بـەجێ‌هێشتم چـوویتـە لای حەفصە ؛ چونکی خەتای خۆم بوو]

لە سەفەرا دروستە قورعە لە بەینی ژنانا بکێشرێ کە کامیان لەگەڵ خۆی ببا . بە قەضاگێرانەوەی ئەو موددەیە لازم نی‌یـە . ئەمـا ئەگـەر سەفەری موباح نەبێ نە بە قورعە نە بە بێ قورعە دروست نی‌یە بەعزێکیان ببرێ‌و بەعزێکیان نەبرێ . ئەگەر کردی ئەبێ ئەو موددە بـە ئەوانی تـر بەقەضا بگێریتەوە .

لەم حەدیثانی پێشوەوە مەعلووم ئەبێ کە ئینسان هەر لە : نۆبەو ، جـل‌و ، خواردنـا . . لە بـەینی ژنانـا لە سـەری عەدالـەت لازمـە . موکەللەف نی‌یە بەوەی کە بە قەد یەك مەحەببەتی لەگەڵیان ببێ ؛ چونکی لە قودرەتی بـەشەرا نی‌یـە ﴿ولن تستطيعـوا أن تعدلـوا بين النســاء ولو

حرصتم﴾[1] ئەبەدیيا ئێوە ناتوانن کە لە لە بەینی ژنانا عەدالەت بەجێ بێنن با حەریصیش بن لەبەجێهێنانیا .

لە سەفەریشا لە وەختی ڕۆیینا قەسم لازم نی‌یە بۆ ئەوانەی کە لەگەڵینی ، لە قۆناغا لازمە .

حەسەدبردنی ژنانی پیاوێ بەیەکتری عەفوی لێ‌دراوە ، غیرەتکێشانیان بۆ مێردەکەیان دروستە بەو شەرطە ئیرتیکابی شتێ حەرامی تیا نەکرێ وەك جوێن ، وەك غەیبەت . لە سەروگوێلاکی درا موقابەلەی بەو شەرطە دروستە .

---

(١) بڕوانە : سوورەتی نیساء ، ئایەتی ٢٩ .

# بسم الله الرحمن الرحيم

## الالف الثاني[1]

١٠٠١/١٢٣ قالت : كنت ألعب بالبنات عند النبيّ - ﷺ - وكان لي صواحب يلعبن معي ، فكان رسول الله - ﷺ - إذا دخل يَتَقمَّعْن [يتغيين] منه ، فيُسَرِّبهن [فيرسلهن] الي فيلعبن معي . ح - ٧٤/٩ ، م - ٣٣٢/٩

تەرجەمە :

حەزرەتی عايشە - رضي الله تعالى عنها - فەرمووی : لای پێغەمەر - ﷺ - ياريم بە بووك ئەكرد [ئەوی كە كچان لە دارو چيتو لۆكە ئەيكەن] بەعزێ دەستەخوشكم بوو ئەوانيش لەگەڵ منا يارييان پێ ئەكرد ، كە پێغەمەر - ﷺ - تەشريفی ئەهاتەوە دەستە خوشكەكانم خۆيان لێ ئەشاردەوە . پێغەمەر - ﷺ - ئەيناردنەوە لام ياريمان ئەكرد .

موساعەدەكردنی منالْ بۆ ياری كردن سوننەتە .

ئەو بووكانەی كە كچان لە شكڵی ئينسان و حەيواناو منالاّ دروستی ئەكەن و ياريی پێ ئەكەن دروستە . بەڵكو موساعەدەكردنيان سوننەتە ؛ چونكی موقەددیمەيە بۆ فێربوونی منالْ بەخەمكردنيان و ئيشی ناو مالْ .

---

(١) مەبەستی ئەوەيە تا ئێرە هەزار حەديث تەرجەمە كراوە . لێرەوە هەزاری دوەمە .

قياس لەوە هەرچی فائیدەیێکی ببێ لەو نەوعە شتانە دروستە .
وەك (فطوغراف) لە تەذکەرەی نوفووسا ، لە سەنەدی تاپۆدا ، لە وەثیقەی ژن و مێردا ؛ چونکی زۆر حیلەی تیا ئەکرێ . (انما الاعمال بالنيات) . (الضرورات تبيح المحظورات)

ضەروورەت شتی مەمنووع حەلاڵ ئەکا ، وە حەتتا لە حینی حاجەتا بە دەرەجەی ئیحتیاجی یەکە ، نەك هەر بۆی حەلاڵ ببێ . . . سوننەتیش ئەبێ ، وەك ئەو میثالانە . فەرزیش ئەبێ وەك گۆشتی مردارەوەبوو ، وەك گۆشتی بەراز کە حەیات (توقف)ی ببەستێتە سەر .

ژنێ مارە بکا تەماشاکردنی سوننەتە .

حەکیم بۆی دروستە تەماشای ژن بکا ، حەتتا دەست لە فەرجیشی بدا ، کە ئیحتیاجی نەما دووبارە حەرام ئەبێتەوە .

بەعزێ وەقت حەلاڵیش حەرام ئەبێ ، نان خواردن . ئاوخواردنەوە زەرەری ببێ بۆ نەخۆش لێی حەرام ئەبێ . ئەم نەوعە ئەحکامانە لە حینی حاجەتا ئینقیلابیان لە بەینا ئەبێ . (لا حرج في الدين)

١٢٤/١٠٠٢ عنها ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت : تزوجني النبيّ ـ ﷺ ـ وأنا بنت ست سنين [وبنى بي وأنا بنت تسع سنين . قالت ، م] : فقدمنا المدينة ، فنزلنا في بني الحرث بن الخزرج ، فوُكِعت ، فتمرق شعري [إنتتف] فوفي [كثر] جُمَيمة [ما سقط عن المنكبين ، وإذا بلغ الى شحمة الأذنين سمي وفرة] فأتتني امي : ام الرومان ، وإني لفي أرجوحة [گوریسی دیلانێ] ومعي صواحب لي ، فصرخت بي ، فأتيتها ، لا أدري ما تريد بي ، فأخذت بيدي حتى أوقفتني على باب الدار ، وإني لأنهج [فعل أو أفعل ، أتنفس نفسا عاليا من الأعياء] حتى سكن بعض نفسي ، ثم أخذتُ شيئا من ماء فمسحت به وجهي ورأسي ، ثم أدخلتني الدار ،

فاذا نسوة من الأنصار في البيت ، فقلن على الخير والبركة وعلى خير طائر [حظٍّ ونصيب] فأسلمتني اليهن فاصلحن ، [فغسلن رأسي ، وأصلحنني م ـ ١٥٨/٦] من شأني ، فلم يَرُعني [فلم يفجأني] إلا رسول الله ـ ﷺ ـ فأسلمنني اليه وأنا يومئذ بنت تسع سنين . خ ـ ٢٠٢/٦ م ـ ١٥٧/٦ . جه .

[وعند أحمد : فإذا رسول الله ـ ﷺ ـ جالس على سرير ، وعنده رجال ونساء من الأنصـار ، فأجلستني في حجـره ، ثم قالت : هؤلاء أهلك يا رسول الله ، بارك الله لك فيهم ، فوثب الرجال والنساء ، وبنى بي رسول الله ـ ﷺ ـ في بيتنا . قسطلاني]

١٢٥/١٠٠٣ وعنها أن النبي ـ ﷺ ـ تزوجها وهي بنت سبع سنين ، وزفَّت اليه وهي بنت تسع سنين ولعبها معها ، ومات عنها ، وهي بنت ثمان عشرة . م ـ ١٥٩/٦

١٢٦/١٠٠٤ وعنها [رضي الله تعالى عنها] قالت : تزوجني رسول الله ـ ﷺ ـ في شوال ، وبنى بي في شوال ، فأيّ نساء رسول الله ـ ﷺ ـ كان أحظى عنده مني ؟ قال [عروة] : وكانت عائشة [رضي الله تعالى عنها] تستحب أن تدخل نساءها في شوال . م ـ ١٦٠/٦

تەرجەمە :

حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ ئەفـەرموێ : عـومرم شەش ساڵ بوو کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ مارەی کردم ، لە ریوایەتەکەی ترا : عومرم حەوت ساڵ بوو [یەعنی کەسرەکەی بە ساڵێ حسێب کردوە ، لەم ریوایەتەدا کەسرەکەی حسێب نەکردوە] [هاتە لام عومرم نە ساڵ بوو . م] [کە لە دوای پێغەمەر ـ ﷺ ـ لەگەڵ (ام الرمان)ی دایکم و ئەسمای خوشکم] هاتینە مەدینە ، لە ناو بەنی حەرثی کوڕی خەزرەجا دابەزین ،

تووشی لەرزو تا بووم ، سەرم رووتایەوە ، مووی سەرم نەختێ زۆر بوو تا ناوشانم درێژ بۆوە ، لە ناو دیلانێدا لەگەڵ چەند دەستە خوشکێکما دیلانێمان ئەکرد . (ام الرومان)ی دایکم بانگی کردم ، چوومە لای ، نەمەزانی چی لێم ئەوێ ، دەستی گرتم بردمی ، تا لەبەر دەرگایماڵەوە رای وەستانم ، لەبەر مانـدوێتی هەنـاسەم سـوار بووبـوو ، تا نـەختێ پوشووم بەبەرا هاتەوە ، نەختێ ئاوم کرد بەسەر سەرو دەموچاوما ، لە دواییدا بردمێ ژوورێ کـە تێفکریم بـەعزێ ژنـە ئەنصـاری لێ بوو ، وتیان : لەسەر خێرو بەرەکەت و قسمەت و نەصیبێکی چـاکا هـات . دایکم دایمە دەست ئەوان ، سەریان شتم و رێکیان خستم ، ئەوەندەم زانی پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی حازر بوو ، منیان تەسلیم کرد ، ئەو رۆژە عومرم نۆ ساڵ بوو .

لە ریوایەتی ئەحمەدا ئەفـەرموێ : کـە چوومـە ژوورێ پێغەمـەر ـ ﷺ ـ لـەسەر تـەختێ دانیشتبوو ، بـەعزێ پیـاوو ژنی ئەنصـاریی لە خذمەتیا دانیشتبوون ، دایکم منی خستە باوەشی پێغـەمەرەوە ـ ﷺ ـو وتی : ئەمانە هەموو کەس و کاری تۆن خوا بە بەرەکەتیان بکا بۆت . لە دواییدا ئەوان هەڵسان رۆیین . پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە ماڵی خۆمانا زەفـافی لەگەڵ کردم .

لە ریوایەتەکەی ترا ئەفەرموێ : بە حەوت ساڵی ی مارەی کردم ، بە نۆساڵی ی کردمیان بە بـووك بۆی = بـووك و یاری یـەکانی خـۆی پێ بوو = ، هەژدەساڵ بووم وەفاتی کرد .

لە ریوایەتەکەی دواییدا ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە مـانگی شەووالا مارەی کردم ، لە شەووالیشا هاتەلام ، چە ژنێکی پێغەمـەر ـ ﷺ ـ هـەیە لـە من لە لای خـۆشەویسـتر بێ ؟ عورووە ئـەفەرمـوێ :

حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ وای حەزەکرد کە ژنانی خزمی هەر لە مانگی شەووالا بەبووکیی ببرێن .

خـۆجـوانکـردنی ژن بـۆ مێـرد ، ژنهێنـان لـە شـەووالا ، دۆعابۆکردنیان سوننەتە . بەعزێ ژنی خۆیی لە بەعزێکیان خۆشتر بوێ مەعفووە . موساعـەدەکردنی منـالآن بو یـاریکردن سـوننەتـە . (دون البلوغ) کچ بەشوودان دروستە . لـە هەشت تێپـەڕیی لە بـەشوودانیـا مەحذوور نی یە .

**١٢٧/١٠٠٥ وعنها ـ رضي الله تعالى عنها ـ ان النبيّ ـ ﷺ ـ قال لها : أريتُكِ في المنام مرتين : أرى أنك في سرقة [قطعة] من حرير ويقول [جبريل ـ عليه السلام ـ] : هـذه امرأتـك فأكْشِفُ ، فـإذا هي أنتِ . فأقول : إن يك هذا من عندالله يمضه ح ـ ٣٠٣/٦ ، م ـ ٣٢٩/٩ وفي رواية : ثلاث مرات . قسطلاني .**

**تەرجەمە :**

حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفـەرموێ : پێغـەمەر ـ ﷺ ـ پێی فەرمووم : لە خەوما دوو جار ، لە ریوایەتێکا سێ جار تۆم پێ نیشان درا ، تۆم لـە ناو پـارچەیێ ئـاوریشما دی . جیبـریل ـ علیـە السلام ـ فەرمووی : ئەمە ژنی تۆیە ، ئاوریشمەکەم لەسەر لادای کـە تێفکریم تۆ بووی ، وتم : ئەگەر ئەمە لە طەرەف خواوە بێ ئیمضـای ئەکا ، یەعنی ئەیکا .

**١٢٨/١٠٠٦ عروة بن الزبير [رضي الله تعالى عنـه] قال : تـوفيت خديجة ـ رضي الله تعالى عنها ـ قبل مخرج النبي ـ ﷺ ـ الى المدينة بثلاث سنين [أو أربع أو خمس] فلبث سنتين أو قريبا من ذلك [ثم دخل على سودة ـ رضي الله تعالى عنها ـ قبل أن يهاجر] ونكح عائشـة [رضي الله**

تعالى عنها] وهي بنت ست سنين ، ثم بنى بها في شوال وهي بنت تسع سنين . ح ـ ٦/٢٠٤ .

هذا الحديث مرسل ، والأقرب أنه تحمله عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ .

ته‌رجه‌مه :

عورروه ئه‌فه‌رموێ : خه‌ديجة ـ رضي الله تعالى عنها ـ وه‌فاتی كرد سێ ساڵ له پێش ئه‌مه‌دا كه پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ته‌شريفی بچێ بۆ مه‌دينه [به‌عزێك ئه‌ڵێن : چوار ساڵ ، به‌عزێك ئه‌ڵێن : پێنج ساڵ له پێش هيجره‌تا . له دوای ئه‌و له پێش هيجره‌تاو له پێش ئه‌مه‌دا كه حه‌زره‌تی عائيشه ـ رضي الله تعالى عنها ـ ماره بكا سوده‌ی ماره كرد ـ رضي الله تعالى عنها ـ له پاشا حه‌زره‌تی عائيشه‌يشی ـ رضي الله تعالى عنها ـ ماره كرد عومری شه‌ش ساڵ بوو ، كه له شه‌ووالا چوه زه‌فافه‌وه عومری عايشه نۆ ساڵ بوو .

١٠٠٧/١٢٩ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت : قال لي رسول الله ـ ﷺ ـ إني لأعلم إذا كنتِ عني راضية وإذا كنتِ عليَّ غضبى . قال : قلت : ومن أين تعرف ذلك ؟ قال : أمَّا إذا كنتِ عني راضية فإنكِ تقولين : لا ورب محمد ، وإذا كنتِ غضبى قلت : لا ورب ابراهيم . قالت : قلت : أجل والله يا رسول الله ! ما أهجر إلا اسمك . م ـ ٩/٣٣٠ ، ح ـ ٨/١٠٨

ته‌رجه‌مه :

حه‌زره‌تی عايشه ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئه‌فه‌رموێ : پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ پێی فه‌رمووم : ئه‌زانم كه كه‌ی لێم رازيت و كه‌ی لێم عاجزی ، عه‌رزم كرد : به چی ئه‌وه ئه‌زانی ؟ فه‌رمووی : كه لێم رازی بی ئه‌ڵێی

خەیر قەسەم بە رەببی محەمەد . کە لێم عاجز بی ئەڵێی : خەیر قەسەم بە رەببی ئیبراهیم . عەرزم‌کرد : بەڵێ وایە ، وەڵڵاهی (یا رسول الله) من کە لێت عاجز بیم هەر ناوت تەرك ئەکەم . [یەعنی حوببی ذاتی موبارەکت هەر لە دڵمایە ، قەط لێی ناچێتە دەرێ] .

١٣٠/١٠٠٨ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] [موقوفا إلا آخره فمرفوعا ، وفي بعض رواية ـ بينها القسطلاني ـ مرفوعا كله] قالت : جلس إحدى عشرة امرأة [في قرية من قرى اليمن ، وفي رواية إبن الهيثم بمكة] فتعاهدن وتعاقدن أن لا يكتمن من أخبار أزواجهن شيئا [حسنة أو سيئة] :

١ ـ قالت الأولى : زوجي لحم جمل غَثٍّ [أي : شديد الهزال] على رأس جبل [وعر ، ت . أي كثير الأحجار ، يصعب الرقيُّ اليه] لا سهل فيرتقى [لصعوبة المسلك] ولا سمين [أي الجمل ، أو اللحم] فينتقل .

تەرجەمە :

عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : یازدە ژن لە ئەهلی یەمەن لە مەجلیسێکا کۆبوونەوەو دانیشتن ، عەهدو پەیمانیان کرد لەسەر ئەمە کە ئەحواڵی مێردەکانیان ـ چاك بێ یا خراپ ـ نەشارنەوە ، هەمووی لەو مەجلیسەدا بگێرنەوە بۆ یەك .

١ ـ ئەووەڵ ژن کە قسەی کرد وتی : مێردەکەی من گۆشتی وشترێکی لەرە لەسەر شاخێکی بەرزی بەردەلانی‌یە ، کە سەرکەوتنی زۆر زەحمەتو بە مەشەققەتە ، سەرکەوتنی سووك نی‌یە کە ئینسان بە رەحەتی بچێ بیهێنێ ، گۆشتەکەیش قەڵەو نی‌یە کە ئینسان زەحمەتی بۆ بکێشێو بچێ بیهێنێ . [یەعنی مێردەکەم زۆر بەخیلو چرووکە ، هیچ نادا بە ماڵو مناڵی ، زۆر ترۆو جەنگانی‌و تووڕەو

توندو تیژ و بەدخولقە ، لەگەڵی دەرنابرێو هەڵناکرێ . ]

٢ ـ قالت الثانية : زوجي لا أبثُّ خبره [لطوله وشناعته] اني أخاف أن لا أذره أن أذكره ، أذكرُه عجُرَه وبَجُره [عيوبه] .

ژنی دوەم وتی : خەبەری مێردەکەم دوورو درێژە ، ناتوانم هەمووی بڵێم ، ئەگەر بیڵێم ئەبێ هەموو عەیبو خراپی یەکەی بڵێم ، هیچی تەرك نەکەم . [یەعنی کە وتم پێی ئەگاتەوە ، کە پێی گەییوە تەڵاقم ئەدا ، منالیشم لێی هەیە ناتوانم لێی جوێبمەوە] .

٣ ـ قالت الثالثة : زوجي العَشَنَّقُ [الطويل المذموم السيئ الخلقِ الأحمق] إن أنطِقْ أُطلَّقْ ، وإن أسكُتْ أُعلَّقْ . لا أيما ولا ذات بعل] .

ژنی سێیەم وتی : مێردەکەم درێژێکی بەدخوڵقی ئەحمەقە ، ئەگەر عەیبی بڵێم [پێی ئەگاتەوەو] تەڵاق ئەدرێم ، ئەگەر نەیڵێم بە موعەللەقی ئەمێنمەوە ؛ نە بێوەژنم کە بتوانم شوو بکەم بە پیاوێکی باش ، نە مێرددارم کە فائیدەم لێی دەس کەوێ .

٤ ـ قالت الرابعة : زوجي كَليلِ تِهامة [ليس فيه أذى ، بل فيه راحة ولذاذة عيش] لا حرٌّ ولا قُرٌّ ، ولا مخافة ولا سآمة .

ژنیچوارەم وتی : مێردەکەم وەك شەوی حیجاز وایە ؛ نارەحەتی تیا نی یە ، هەر رەحەتیو لەذەتی عەیشی تیایە ، نە گەرمێکی وایە کە ئینسان پێی نارەحەت بێ ، نە ساردێکی وایە کە ئینسان سەرمای بێ ، نە ترسی تیایە لە هیچ ، نە ئینسان لێی مەلوول ئەبێ . یەعنی خوڵقێکی باشی هەیە .

٥ ـ قالت الخامسة : زوجي إن دخل فَهِدَ [أي يصير كالفهد ، ويغفل عن معايب البيت ، أو معناه : يثب عليَّ كالفهِد للجماع] ، وإن

خرج أسِدَ ، ولا يسأل عما عَهِدَ .
ژنی پێنجەم وتی : مێردەکەم کە هاتە ماڵەوە وەك شبری لێ یێ ، گورج خەوی لێ ئەکەوێ لە عەیبی ناوماڵ غافڵ ئەبێ . [یا وەك ئەو پەلامارم ئەداتێو سوارم ئەبێو ، موجامەعەم لەگەڵ ئەکا ، ئەوەندەی خۆشەویێم صەبرم لێ ناکا .] . [نازانم (فهد) چی یە ؟ مەیموونە ؟ سەگساره ؟ دەڵەکە ؟] . کە چوە دەرێ ئەبێ بە شێر ، لەوە کە لای بەجێ هێشتووم ناپرسێتەوە .
[فەهد : حەیوانێکە زۆر ئەنوێ ، زۆریش هەرا ئەکا ، وەصفیَ کردوە بە سەخاو حوسنی موعاشەرە] .
لە قەسطەلانیدا ئیحتیمالێکی تر ئەڵێ زۆر دوورو نامەعقولە . تەماشای کە چۆن ئەم مەدحە ظاهیره ئەکا بە ذەمێکی شەنیع . نووسینی عەیبە .

٦ ـ قالت السادسة هند : زوجي إن أكل لفَّ ، وإن شرب إشتف ، وإن إضطجع إلتفّ ، ولا يولج الكفَّ ليعلم البثّ [أي الحزن] .
شەشەم وتی : مێردەکەم کە خواردی لوولی ئەدا ، کە خواردی‌یەوە دڵۆپی تیا ناهێڵێ ، کە پاڵ‌کەوت خۆی لە لێفەکەوە ئەپێچێنەوە ، دەست ناخاتە ناو جلەکانمەوە تا بزانێ حاڵی ژنەکەی چی یە ، یاری‌یێ یا گاڵتەو مەحەبەتێکم لەگەڵ بکا . یەعنی بەخیلە ، زۆرخۆرە ، لە ماڵو منالّ ناپرسێتەوە ، هەر ورگی خۆیی ئەوێ .

٧ ـ قالت السابعة حبي بنت علقمة : زوجي غياياء [خائب جاهل] أو [قالت] عياياء [وللنسائي : غياياء من غير شك] طباقاء [أحمق ، أو لا يحسن المجامعة] كل داء له داء شجّك أو فلّك . أو جمع كـلاً لك .

ژنی حەوتەم وتی : مێردەکەم نەفام و بێ‌خێرە ، ئەحمەقە ، هیچی پێ ناکرێ ، موعامەلەی ژن و مێردیی نازانێ ، هەموو دەردی دنیا لەوا جەمعە ، یا سەرت ئەشکێنێ یا بەدەنت بریندار ئەکا ، یا هەردووکت بۆ کۆ ئەکاتەوە ؛ یەعنی سەریشت ئەشکێنێ و لەشیشت بریندار ئەکا .

٨ ـ قالت الثامنة [ياسر بنت جوس] : زوجي الريح ريح زَرْنَب [طيب] ، والمسُّ مس أرنب .

هەشتەم وتی : مێردەکەم دەستلێدانی وەك دەستلەکەروێشکدانە ، نەرم و شلە ، بۆنی وەك بۆنی عەطر خۆشە .

٩ ـ قالت التاسعة : زوجي رفيع العِماد ، طويل النِّجاد ، عظيم الرِّماد ، قريب البيت من الناد .

ژنی نۆیەم وتی : مێردەکەم کۆڵەکەی خانوەکەی بەرزە [لە دوورەوە ئەبینرێ کە بۆ میوانداریی بیچنێ] شەریطی شیرەکەی درێژە ، [یەعنی بالا بەرزە] خۆڵەمێشی زۆرە [یەعنی بە دائیم بۆ میوان ضیافەت ئەکاو زۆر ئاگری لە مەطبەخا ئەسووتێ ، یەعنی پیاوێکی بەشەوکەت و سەخی یە] خانوەکەی لە مەجلیسی قەومەکەیەوە نزیکە بۆ تەدبیری شت ، موراجەعەی عەقڵی ئەو ئەکەن ، یەعنی لە ناو قەومەکەیا صاحیب رەئی و بە حورمەتە ، موعاشەرەی خۆشە ، صاحێب کەرەم و حوسنی خولقە .

١٠ ـ قالت العاشرة [كبشة بنت الأرقم] : زوجي مالك ، وما مالك ؟ مالك خير من ذلك ، له إبل كثيرات المَبارِك ، قليلات المسارح ، وإذا سمعن صوت المزهر أيقنَّ أنهن هوالك .

ژنی دەیەم وتی : مێردەکەم ماڵداره ، ئەمما چە ماڵدارێکی گەورەیە ؟ ماڵدارێکە لەوە زیاترو چاکترە کە وتم . زۆر وشتری هەیە جێ مۆڵیان زۆرە ، جێ لەوەڕیان کەمە ، یەعنی کە ئێوارێ لە لەوەڕ هاتنەوە گەلێکیان لێ سەرئەبڕرێ ، گەلێکیان بۆ سەربڕین لە ماڵەوە ئەهێڵرێنەوە ، بۆسبەینێ ئەوەندەیان نامێنێ کە ئەچنە لەوەڕ ، هەر لێیان کەم ئەبێتەوە ، کە میوانیان هات و لە خۆشیانا عوودو کەمانیان لێداو وشترەکان گوێیان لەو عوودو کەمانە بوو لێیان یەقین ئەبێ کە هیلاك ئەبن و سەرئەبڕرێن بۆ میوان .

١١ ـ قالت الحادية عشرة [أم زرع بنت اكيمل بن ساعد عاتكة اليمنية] : زوجي أبو زرع ، فما أبو زرع ؟ اَناسَ أذنيّ [أي حرك] وملأ من شحم عضديّ ، وبحجني [عظّمني] فَبَجَحتْ اليّ نفسي [وبَجَّحَ نفسي ، فتبجّحت اليّ نفسي . ن أي فرَّحني ففرحت] وجدني في أهل غُنَيمة بشق [موضع ، أو في مشقة لقلة العيش ، أو في غار جبل] فجعلني في أهل صهيل وأطيط [وجامل ن . أي صاحب جمل] ، ودائس [يدوس الزرع] ومَنَقّ [نقي الطعام] ، وعنده أقول فلا أُقَبّح ، وأرْقد فاتَصبَّح ، وأشرب فأتَقنح [وفي رواية الهيتم : وآكل فاتمنح]

أم أبي زرع ! فما أم أبي زرع ؟ عكومها [أعدالها وغرائرها] رداح [ثقيل لكثرة ما فيها] وبيتها فِساح [واسع] .

إبن أبي زرع مضجعه كَمَسَلِّ شطبة [كمسلول السعفة الخضراء مهفهف . أو كالسيف المسلول لرونقه واستوائه ومهابته] ويشبعه ذراع الجفرة [ولد المعز الى أربعة اشهر ، وزاد إبن الأنباري :

ويرويه فيقة اليعرة ـ ما يجتمع من اللبن في الضرع بين الحلبتين . واليعرة العناق . ويميس في حلة النترة ؛ أي يتبختر في الـدرع اللطيفة] .

بنت أبي زرع ! فـما بنت أبي زرع ؟ طوع أبيهـا وطوع أمهـا ، [مطيعهما(!)] وزاد الزبير : وزين اهلها ونسائها] ومِلْءُ كسائها ، وغيظ جارتها .

جارية أبي زرع ! فما جارية أبي زرع ؟ لا تبث حديثنا تبثيثا ، ولا تُنَقِّثُ ميرتنا تنقيثا [لا تنفقه بـالسرقـة وغيرهـا] ولا تملأ بيتنـا تعشيشا [بالكناسة والقمامة] قالت : خرج أبو زرع والأوطـاب [زقاق اللبن] تمخض ، فلقي امرأة معها ولدان كالفهـدين يلعبان من تحت خصـرها برمانتين ، فطلقني ونكحها ، فنكحت بعده رجلا سَرِيًا [سيدا] ركب شَرِياً [فرسا جوادا] وأخذ خطيا وأراح عليَّ نعما ثَرِيًا [كثيرا] وأعطاني مِنْ كل رائحة [مال تأتيـه وقت الرواح] زوجـا . وقال : كـلي أم زرع ، وميري أهلك . قال : فلو جمعت كُلَّ شيْ ما أعطانيه ما بلغ أصغر آنيةِ أبي زرع !

قالت عائشة [رضي الله تعالى عنها] : قال رسـول الله ـ ﷺ ـ : كنت لكِ كأبي زرع لأم زرع [إلاَّ أنه طلقها وأنا لا أُطلقك ، الزبير] قال أبو عبد الله عن هشام : ولا تعشعش بيتنا تعشيشا . قال أبو عبدالله : وقال بعضهم فانقمح ـ بالميم ـ وهذا أصح . [أي أروي] م ـ ٩/٣٥٤ ، ح ـ ٨/٧٧ ، ن ، ت .

وفي أخـرى : عيايـاء طبـاقـاء ، ولم يشـك . وقـال : قليـلات المسارح . وصفر ردائها ، وخير نسائها ، وعقـر جارتهـا ، ولا تَنْقُث ميرتنا تَنقِيثاً . وقال : وأعطاني من كل ذابحة زوجا . م ـ ٩/٣٥٤ .

[وعند مسلم : وحقر جارتها أي : دهشتها . وزاد الطبـراني : وحَيْنُ جارتها أي هلاكها . وزاد ابن السكيت : قبَّاء : هضيمة الحشا ، جائلة الوشاح . فعماء : ممتلئة الأعضاء . عكناء : ذات عكن . طياء : بطنها هيفاء . نجلاء : واسعة العين . دعجاء : شديدة سواد العين . زجـاء : مقوسـة الحاجب . قنـواء : طـويلة الانف ، دقيقـة الارنبـة محدبتها . مؤنقة : معجبة . معنقة : مغذية بالعيش النـاعم . . . كلها صفة بنته الحسنة . ]

وعند الزبير بن بكار عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ : دخل عليَّ رسول الله ـ ﷺ ـ وعندي بعض نسائه ، فقال يخصني بذلك : يـا عائشة ! أنا لك كأبي زرع لأم زرع . قلت : يا رسول الله ما حديث أبي زرع وأم زرع ؟ قال : إن قرية من قرى اليمن كان بها بطن من بطون اليمن ، وكـان منهن إحدى عشـرة امـرأة ، وإنهن خـرجن الى مجلس فقلن : تعالين فلنذكر بعولتنا بما فيهم ، ولا نكذب . قسطلاني . وبهذه الرواية يصير الحديث كله مرفوعا . = قسط ٨٥ =

تەرجەمە :

ژنی یـانـزەهـەم وتی : مێـردی من ئـەبـوزەرعـە . ئـەمـا چەئەبوزەرعەیێکە ؟ گوێی پڕ کردووم لە گوارە ، قۆڵی پڕ کردووم لە بەزو گۆشتا ، گەورەی کردووم لـە ناو خـەڵقا ، خـۆمم لە لا گـەورە بوو ، فەرەحی دامێ ، فەرەحناك بووم ، منی لە ناو قەومێکی فەقیری صاحێب مەڕی کەم دەستکەوت ، هێنامیە ناو عەشیرەتێکی صاحێبی ئەسپ و مـایین چـاك ، هێنامیـە ناو صـاحیب وشتری بـارزۆر ، لە بـەر گرانی بارەکانیان جیرەی داری کـۆپانـەکانیـان ئەهـات ، هێنامیـە ناو ئـەهلی صاحیب زەراعەت و خەرمان ، هێنامیە ناو قەومێکی خـۆراك تەمییـزو

پاکەوە . قسەی لە لا ئەکەم کەس نالێ خراپت وت ، ئەنووم سبحەینێ ئەکەمەوە هەڵم‌ناستێنن بۆ ئیش و فرمان ؛ چونکی ئیشکەر زۆرە . ئەخۆمەوە بە هەوەسی خۆم ، ئەخۆم و دەرخواردی خەڵقیشی دەدەم .

دایکی ئەبو زەرع چە دایکێك ؟ ! خەرارو جەواڵی قورس و پڕ ە ، ئەوەندە شتیان تیایە گران بوون ، خانوەکەی واسیع و گەورەیە .

کوڕی ئەبوزەرع چە کوڕێکە ؟ ! جێ نوستن و خەوی وەك جێ شووڵێکی سەوزە کە لە توێکوڵ پاکرابێ ، یا وەکوو کالانی شیر وایە ، خۆی وەکوو شیری لە کالان‌دەرهاتوو وایە ؛ صاف و بەرِراق و شەجیع و ئازا ، پێجکێکی کارژۆڵە تێری ئەکا ، ئەوەندە کەم‌خۆرە ، نەختێ شیر تێری ئەکا .

کچی ئەبوزەرع چە کچێك ؟ ! موطیعی دایك و باوکیەتی ، زینەتی ئەهلی ماڵی خۆیانە ، پڕ بە کراسیەتی ، رق‌هەڵسێنەری کچە دراوسێ‌یەتی ، لە بەر جوانیی بە داخەوە ئەیکوژێ ، ناوقەد باریکە ، ئەعضای لە گۆشت پڕە لەوەی لێوەبێ ، زکی لەبەر گۆشت چین‌چینە ، چاوگەورەیە ، چاوڕەشە ، برۆ کەوانە ، لووتی درێژ و باریك و بەرِراق و بەرانیە ، خەڵق ئەخاتە حیرەتەوە ، لە عەیشێکی فەرەح و زۆرا پەروەردە بوە .

جاریەی ئەبوزەرع چە جاریەیەکە ؟ ! قسەی ماڵەوە ناباتە دەرەوە ، شتی ناوماڵ کەم ناکا ؛ بە عەفوای نادا ، ماڵمان پڕ ناکا لە خەوش و خاڵ .

(ام زرع) وتی : ئەبوزەرع بۆ سەفەرێ چوە دەرەوە ، لە وەختێکا کە شیرەکەمان وەخبو بێ بە ماست ، یەعنی لە وەختی سبەینێدا ، یا لە وەختی فەرەحیدا . تووشی ژنێ بوو کەفەلزل ، دوو کوڕی بوو ، بە دوو

هەنار لە ژێر کەفەڵیا یارییان ئەکرد . منی تەڵاق‌داو ئەوی هێنا ، لە دوای ئەو شووم کرد بە پیاوێکی گەورە ، سواری ئەسپی ئەصیل ئەبوو ، رمی باشی خەطی بەدەستەوە ئەگرت ، هەموو ئێواران وشترو گاگەل‌و مەرگەلی زۆر بۆ ئەهاتەوە . لە هەموو نەوعێ لە حەیوان جووتێکی دامێ ، پێی‌وتم : ئەی (ام زرع) بخۆو بە دیاریش بۆ قەوم‌و قیلەت بنێرە . ئەو هەموو شتانە کە ئەو دایمێ هەمووی کۆبکەیتەوە هەمووی بە زەرفێکی زۆر بچووکی ئەبوزەرع نابێ لە لام .

حەزرەتی عایشە فەرمووی : لە دوای ئەم حیکیایەتە = پێغەمەر = پێی فەرمووم : ئەی عایشە من بۆ تۆ وەك ئەبوزەرع وامە بۆ (ام زرع) ئەمما ئەبوزەرع ئومم‌وزەرعی تەڵاق‌دا من تۆ تەڵاق نادەم . ]

موصاحەبەو حەسەبی حاڵ (!) دروستە . تەلطیفی ئەهل‌و عەیال سونتەتە .

# حديث الافك[1]

١٣١/١٠٠٩ عائشة [رضي الله تعالى عنها] زوج النبي - ﷺ - قالت : كان رسول الله - ﷺ - إذا أراد أن يخرج سفرا أقرع بين نسائه ؛ فأيتهن خرج سهمها خرج بها رسول الله - ﷺ - معه .

قالت عائشة [رضي الله تعالى عنها] : فأقرع بيننا في غزوة غزاها [غزوة المريسيع ، وهي غزوة بني المصطلق] فخرج فيها سهمي ، فخرجت مع رسول الله - ﷺ - وذلك بعدما أنزل الحجاب ؛ فانا أُحْمَلُ في هودجي وأُنزَل فيه مسيرنا . . . حتى إذا فرغ رسول الله - ﷺ - من غزوه وقفل راجعا ودنونا من المدينة ، آذن ليلة بالرحيل . فقمت حين آذنوا بالرحيل ، فمشيت حتى جاوزت الجيش ، فلما قضيت من شأني أقبلت الى الرحل ، فلمست صدري ، فإذا عِقْدي من جزع ظفار [مدينة باليمن] قد انقطع . فرجعت فالتمست عقدي ، فحبسني ابتغاؤه ، وأقبل الرهط الذي كانوا يرحلون [بي . نسخة] فحملوا هودجي ، فرحلوه على بعيرى الذي كنت أركب ، وهم يحسبون أني فيه .

---

(١) رووداوی (ئیفك) ئەو رووداوەیە كە حەزرەتی عائیشە ـ خ ـ (وەك لەمەولا بە درێژی باس دەكرێت) لەو غەزادا لە سوپاكە بەجێ ماو ، دوایی مونافیقەكان بوختانیان پیاكردو ، رووداوەكە ماوەیەكی خایاندو ، قسەو باسی ناو ماڵو سەردەمی خەڵكی مەدینە بوو . تا خودا لە سوورەتی (نور)دا پاكیێتی حەزرەتی عائیشەی راگەیاندو ، ئەوانەی بەدرۆخستەوە كە ویستیان خانەوادەی پێغەمبەر ـ د ـ لەكەدار بكەن .

سەرەتای ئایەتەكان بەم شێوە دەست پێدەكات ﴿إن الذين جاؤا بالافك . . .﴾ بەم بۆنەوە رووداوەكەیش بە رووداوی (ئیفك) ناوی دەركرد .

قالت : وكانت النساء إذ ذاك خفافاً لم يُهبَّلن [من هُبِّل أو هَبـل كعلم ، او هَبَل كنصر . من نـووي] ولم يغشهن اللحم ، إنما يـأكلن العُلْقة [القليل] من الطعام ، فلم يستنكر القوم خفة (ثقل .م] الهودج حـين رحلوه وحملوه ، وكنت جاريـة حـديثة السن . فبعثـوا الجمـل وساروا ، ووجدت عقـدي بعدمـا استمر الجيش ، فجئت منـازلهم ، وليس بها داع ولا مجيب . فتيممت منزلي الذي كنت فيه . وظننت أن القوم سيفقدونني ، فيرجعون اليَّ ، فبينـا أنا جـالسة في منـزلي غلبتني عينيً . فنمت .

تەرجەمە :

عائیشەی حەرەمی پێغەمـەر ـ ﷺ ـ ورضي عنها ـ فـەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی بچوایە بۆ سەفەرێ لە بەینی ژنەکانیا قورعەی ئەکێشا ، هەرکامێکیان قورعەی دەربچوایە پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەوەی لـە خذمەت خۆیا ئەبرد .

لە غەزای (مـر یسیع)ا کـە پێغەمـەر ـ ﷺ ـ تەشـریفی ئەچـوو قورعەی لە بەینمانا کێشا ، لەو قـورعەدا قـورعەی من دەرچـوو ، لە خذمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ چووم ، ئەوە لە دوای نوزوولی ئایەتی حیجاب بوو ، منیش لەو سەفەرەدا لە ناو کەژاوەدا سوارئەکرام و دائەبەزێنرام . . تا پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە غەزاکەی بوەوەو تەشریفی گەڕایەوە بۆ مەدینەو لە مەدینە نزیك بووینەوە ، شەوێ ئەمری کرد : کە بار کەن و کەونەڕێ ، کە ئەمر کرا بە بارکردن هەڵسام بۆ قەزای حاجەت ڕۆییم تا لە لەشکرەکە تێپـەڕ بووم . کـە لە قـەزای حاجـەت بوومـەوەو گـەڕامـەوە بـۆ لای بـارخانـەکـەمـەوە دەستم دا لـە سنگم ملیـوانکـەکـەم بچـڕابـوەوە ، ملیوانکەکەیشم لە بەردی ظەفار بوو ، کە شارێکە لە یەمەن .

گەڕامەوە کە بۆ ملیوانکەکەم بگەڕێم ، بۆی‌گەڕانم درەنگی پێ خستم ، ئەوانەی کە کەژاوەکەی منیان لە وشترەکە ئەنا هاتن کەژاوەکەیان هەڵگرتم‌و نایانە سەر وشترەکەی کە سواری ئەبووم . وایان ئەزانی کە لە ناو کەژاوەکەدام .

حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ فەرمووی : ئەو وەختە ژنان سووك بوون ، گۆشت قورسی نەکردبوون ، هەر بە قەد نەمرو نەژی کەمیان ئەخوارد . گرانی‌و سووکی‌ی کەژاوەکە کە هەڵیان‌گرت‌و نایان لە وشترەکە لە لایان عەجائیب نەما ، من ئەو وەختە کچێکی تازەساڵ بووم . یەعنی منداڵ بووم‌و قورس نەبووم . وشترەکەیان هەڵسان‌و ڕۆیین ، کە لەشکرەکە کەوتنەڕێ ملیوانکەکەم دۆزی‌یەوەو هاتمەوە بۆ جێی لەشکرەکە ، نە بانگکەری لێ بوو نە جوابدەرەوە . چوومەوە ئەو جێیەی کە لێی بووم ، وا تێگەییم کە بۆم ئەگەڕێن‌و یێن بە شوێنما . لەو وەختەدا کە لە جێگەکەی خۆما دانیشتبووم خەو غەڵەبەی لێ‌کردم‌و نوستم .

**وكان صفوان بن معطّل السّلمي ثم الذكواني قد عرّس من وراء الجيش ، فأدلج [سار آخر الليل] فأصبح عند منزلي ، فرأى سواد إنسان نائم فأتاني فعرفني حين رآني ، وقد كان رآني قبل أن يضرب الحجاب عليَّ ، فاستيقظت باسترجاعه حين عرفني ، فخمّرت وجهي بجلبابي ، والله ! ما يكلمني كلمة ولا سمعت منه غير كلمة استرجاعه حتى أناخ راحلته ، فوطئ على يدها ، فركبتها ، فانطلق يقود بي الراحلة حتى أتينا الجيش بعدما نزلوا موغرين [نازلين في شدّة الوغرة . أي الحر] في نحر الظهيرة [وقت القائلة] فهلك من هلك في شأني . وكان الذي تولّى كِبْرَهُ عبدالله بن أُبيّ بن سلول [المنافق] .**

**تەرجەمە :**

صەفوانی کوڕی موعەططەلی سەلەمیی زەکوانی لە دوای لەشکرەکەوە لە ئاخری شەوا لێی نوستبوو ، شەورەوی ئاخری شەوی کرد ، لای مەنزڵەکەی منەوە رۆژی لێ بووەوە ، قەراڵتی ئینسانێکی نوستووی بەدی‌کرد ، هات بە لامەوە ، کە چاوی پێم‌کەوت ناسیمی‌یەوە ، لە پێش ئەمەدا کە خۆداپۆشینمان بۆ نازڵ بێ منی دیبو بە [إنا لله وإنا اليه راجعون] ی ئەو خەبەرم بۆوە ، رووی خۆمم بەو لیباسەی کە لەبەرما بوو داپۆشی . وەڵڵاهی ! کەلیمەیێ قسەی لەگەڵ نەکردم ، کەلیمەیێکم لێ نەبیست غەیری (استرجاع) ەکەی . تا وشترەکەی بیخ‌داو پێی نا بە سەردەستی وشترەکەداو سواری بووم . سەری وشترەکەی راکێشا تا هاتینە ناو لەشکرەکەوە لە وەختی گەرمای نیوەڕۆدا ، بۆ ئیستراحەت باریان لێ‌خستبوو . ئیتر ئەوی دەرحەق من بە هیلاکا چوو هیلاك بوو . ئەوی کە موعظەمی قسەی ئیفکی راژانبووەوە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوولی موناڤیق بوو .

**فقدمنا المدينة ، فاشتكيت حين قدمنا شهرا والناس يفيضون في قول أهل الافك ، ولا أشعر بشيءٍ من ذلك ، وهو يريبني [من راب ، أو أراب] في وجعي إني لا أعرف من رسول الله - ﷺ - العطف الذي كنت أرى منه حين أشتكي . إنما يدخل رسول الله - ﷺ - فيسلم ثم يقول : كيف تيكم ؟ فذاك يريبني ولا أشعر بالشرِّ .**

**حتى خرجت بعدما نقِهتُ وخَرَجتْ معي أم مسْطح قبل المناصع ، وهو مُتَبَرَّزُنا ، ولا نخرج إلا ليلا الى ليل ، وذلك قبل أن نتخذ الكُتُفَ قريبا من بيوتنا ، وأمرنا أمر العرب الأُوَل [وبفتح فتشديد] في التنزه . وكنا نتأذى بالكُتُفِ أن نتخذها عند بيوتنا ، فانطلقت أنا وأم مسطح ،**

وهي بنت أبي رُهْم بن المطلب بن عبد منـاف ، وأمها بنت صخـر بن عامر ، خالة ابي بكر الصديق [رضي الله عنه] وابنها مِسْطح [عامر] بن أثاثة ، بن عباد ، بن المطلب . فأقبلت أنا وبنت أبي رُهْم قِبَلَ بيتي حين فرغنا من شأننا ، فعثرَتْ أم مسطح في مرطها ، فقالت : تعس مسطح ! فقلت لها : بئس ما قلت ! أتسبين رجلا قد شهد بدرا ؟ ! قالت : أي هنتاه ! أوَ لمْ تسمعي ما قال ؟ قلت : وماذا قال ؟ قالت : فأخبرتني بقول أهل الافك . فازددت مرضا الى مرضي .

تەرجەمە :

هاتینەوە مەدینە ، کە گەییینە مەدینـە مانگێ نـەخۆش کـەوتم ، خەڵقیش هەر قسەیان لە قسەی ئەهلی ئیفك ئەکردو ، منیش خەبەرم لە هیچ نەبوو . هەر ئەوە منی ئەخستە شوبهەوە لە نەخۆشی یـەکەمـا ئەو لوطفە کە لە پێغەمەرم - ﷺ - ئەدی کە نەخۆش بوومایە ئەم جارە لێم نـەئەدی . ئـەوەندە نـەبێ تەشـریفی ئـەهـاتو سـەلامی ئـەکـردو ، ئەیفەرموو : نەخۆشەکەتان چۆنە ؟ ئەوە ئەیخستمە شوبهەوە ، بێخەبەر بووم لە شەڕ .

تا لە دوای ئەوە کە لە نەخۆشی یەکەم ئیفاقەم بوو ، ئێشتا تەواو نەکەوتبوومەوە سەر خۆم ، چوومە دەرێو (أم مسـطح) یش لەگمـەڵما هـات بـۆ (منـاصـع) کـە جێگـەیێکـە لـە دەری مـەدینـە ئـەوێ جێی چوونەسەراومان بوو ، هەر شەواوشەو ئەچووینە دەرێ بۆ سەراو . ئەوە لە پێش ئەوەدا بوو کە لە نزیك ماڵەکانمانا ئابدەستخانە دروست بکەین . هەروەك عەرەبی پێشوووابووین ، لە چوونەسەراوا بێزمان ئەکرد لەوە کە عادەبخانە لە لای خانوەکانمانەوە دروست بکەین . منو (ام مسـطح) لێماندا ڕۆیین . (ام مسطح) کچی ئەبو روهم بوو ، ئەبوروهم کوڕی

موطەلیبی کوڕی عەبدولمەناف بوو ، دایکی (ام مسطح) کچی صەخری کوڕی عامیر بوو ، پووری ـ خوشکی دایکی ـ ئەبوبەکری صـەدیق بو ـ رضي الله تعالى عنه ـ [نـاوی ام مسطح سـەلما بـو] . کوڕەکـەی کە میسطەحە کوڕی ئەثاثەی ، کوڕی عوببادی ، کوڕی موطەلیب بوو [لە دوای قەزای حاجەت] من و کچی ئەبوڕوهم روومان کردەماڵەوە . (ام مسطح) پێی هەڵەنگوت لەو جلەی کە لەبەریا بوو . وتی : دەك مـلی میسطەح بشکێ ! پێم وت : چەشتێکی خراپت وت ! بۆ جوێن ئەدەی بە پیاوێ کە لە غەزای بەدرا بووبێ ؟ وتی : ئەی فلانە بۆ نەت بیستوە کە چی وتـوە ؟ وتم : چی وتوە ؟ وتی و خـەبـەری قسـەی ئـەهـلی ئیفکی بـۆ گێڕامەوە . نەخۆشیم لەسەر نەخۆشی یەکەم زیادی کرد .

فلما رجعت الى بيتي فـدخل عـليَّ رسول الله ـ ﷺ ـ فسلم ، ثم قال : كيف تيكم ؟ قلت : أتأذن لي أن آتي أبويَّ ؟ قالت : وأنا حينئذ أريد أن أتيقَّنَ الخبر من قبلهما ، فأذن لي رسول الله ـ ﷺ ـ فجئت أبويَّ فقلت لأمِّي : يا أُمتاه ما يتحدث الناس ؟ فقالت : يا بنيَّة هوني عليكِ ، فوالله ! لَقلَّما كانت امرأة قط وضيئة عند رجل يحبها ، ولها ضـرائر اِلاَّ كثرْنَ عليها . قالت : قلت : سبحان الله ! وقد تحدث النـاس بهذا ؟ قالت : فبكيت تلك الليلة حتى أصبحت لا يرقأ لي دمع ، ولا اكتحل بنوم . ثم أصبحت أبكي .

ودعا رسول الله ـ ﷺ ـ عليَّ بن ابي طالب [رضي الله تعالى عنه] وأسامة بن زيد [رضي الله تعالى عنه] حين استَلْبَث الوحيُ يستشيرهما في فراق أهله . قالت : فأما أسامة بن زيد فأشار على رسـول الله ـ ﷺ ـ بالذي يعلم من براءة أهله ، وبالذي يعلم في نفسه لهم من الود . فقال : يا رسول الله هم أهلك ولا نعلم إلاخيرا . وأما علي بن أبي طالب فقال :

لِم يضيق الله عليك والنساء - سواها - كثير . وإن تسأل الجارية تَصدُقْك . قالت : فدعا رسول الله - ﷺ - بريرة ، فقال : أي بريرة هل رأيتِ مِن شيْ يُريبك [أو من راب يريب] من عائشة ؟ قالت له بريرة : والذي بعثك بالحق ! إِنْ رأيت عليها أمرا قط أغمِصُه عليها أكثر من أنها جارية حديثة السن تنام عن عجين أهلها ، فتأتي الداجن فتأكُله .

كه گەڕامەوە بۆ ماڵەوە پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی هاتەلام ، سەلامی کرد ، لە دوای سەلام فەرمووی : ئەوە چۆنە ؟ عەرزم کرد : (یا رسول الله) ئیذنم ئەدەی کە بچمە لای دایكو باوکم ؟ عائیشە - رضي الله تعالى عنها - فەرمووی : ئەو وەختە کە ئیذنم خواست مەقصوودم وابوو کە لە طەرەف ئەوانەوە تەحقیقی خەبەرەکە کە چی یە بیکەم . پێغەمەر - ﷺ - ئیذنی دام .

چوومەوە لایان بە دایکم وت : ئەی دایە خەڵق قسە لە چی ئەکەن ؟ وتی : ئەی کچی خۆم خۆت سەخڵەت مەدە . وەڵلاهی ! کەم وا بوە کە ژنێ جوان لای پیاوێ بێو ئەو پیاوە ئەو ژنەی خۆش بوێو هەوێ زۆری بێو قسەی زۆری لێ نەکەن . عایشە - رضي الله تعالى عنها - فەرمووی : وتم : (سبحان الله !) بۆ خەڵقی لەمە ئەدوێن ؟ !

فەرمووی : ئەو شەوە تا ڕۆژ بووەوە هەر گریام فرمێسکم نەدەنیشتەوە ، خەو نەئەچوە چاوم . ڕۆژم لێبووەوە ئەگریام . پێغەمەر - ﷺ - عەلی ی کوڕی ئەبوطالیبو ئوسامەی کوڕی زەیدی بانگکرد [رضي الله تعالى عنهم] لەو وەختە کە وەحی وەستابوو نەئەهات . موشاوەرەی لە خوصووصی جوێبوونەوەی لە عەیالی خۆی لەگەڵ کردن . فەرمووی : ئەمما ئوسامە لە خوصووصی بەریبوونی عەیالی پێغەمەر - ﷺ - وەو ، خوصووصی ئەو مەحەبیەتو صەداقەتەی کە

لەگەڵیانا هەیەتی ئەوی ئەیزانی عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ وتی : (یا رسول الله) ئەوانە ئەهلی خۆتن ، دەرحەقیان غەیری خێر هیچی تر نازانین .

عەلی کوری ئەبوطالیب وتی : (یا رسول الله) خوا ژنی لێ قات نەکردووی . غەیری ئەو ژن زۆرە . [یەعنی زۆر سەغڵەتی خۆت مەدە ، شوبهەت لێی هەیە تەڵاقی بدەو یەکێکی تر بهێنە . ئیتر ئەمە بە موقتەضای بەشەری‌یەت بوو بە سەبەبی ئەمە کە حەزرەتی عایشە تا وەفاتی کرد نەیوت : عەلی . بوو بە سەبەبی وەقعەی جەمەل . لەگەڵ موعاویەدا (اتفاق)ی کرد لە (علیه)ی حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالى عنهما ـ . . . ]

ئیمامی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ : ئەگەر لە جاری‌یەکەی بپرسی ئەو راستیت عەرز ئەکا . [ئەم قسەی حەزرەتی عەلی‌یە ـ رضي الله تعالى عنه ـ وای لێ دەرەکەوێ کە ئەوەی عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ بۆیە نەبوو کە ئەو تەصدیقی ئەهلی ئیفك بکا ، یا ئیشتیراکی لەگەڵیانا بووبێ . هەر بۆ (تسلّي) حوزنی پێغەمەر بو ـ ﷺ ـ] پێغەمەر ـ ﷺ ـ بەریرەی بانگ کرد لێی پرسی : ئەی بەریرە تۆ هیچت لە عائیشە دیوە کە بەوە لێی بکەوی‌یە شوبهەوە ؟ بەریرە عەرزی کرد : قەسەم بەوەی کە تۆی بە حەق ناردوە ! هیچ شتێکم لێ نەدیوە کە لێی بە عەیب بگرم ، غەیری ئەوە کە جاری‌یەیەکی تازەساڵەو ئەنوێ‌و لە هەویری ماڵەوە غافڵ ئەبێ‌و بزنی ناوماڵ ئێن هەویرەکەی ئەخۆن .

**قالت : فقام رسول الله ـ ﷺ ـ على المنبر ، فاستعذر من عبدالله بن أبي بن سلول . قالت : فقال رسول الله ـ ﷺ ـ وهو على المنبر ـ : يا معشر المسلمين ! من يعذرني من رجل قد بلغني أذاه في أهل بيتي ؟**

الله ! ما علمت على أهل إلا خيرا . ولقد ذكروا رجلا ما علمت عليه خيرا ، وما كان يدخل على أهلي إلا معي .

فقام سعد بن معاذ الأنصاري [رضي الله تعالى عنه] فقال : أنا أعذرك منه يا رسول الله : إن كان من الأوس ضربنا عنقه ، وإن كان من إخواننا الخزرج أمرتنا ففعلنا أمرك .

قالت : فقام سعد بن عبادة [رضي الله تعالى عنه] وهو سيد الخزرج ، وكان رجلا صالحا ، ولكن إجتهلته الحمية . فقال لسعد بن معاذ : لعمر الله ! لا تقتله ولا تقدر على قتله . فقام أُسيد بن حضير ـ وهو ابن عم سعد بن معاذ [رضي الله تعالى عنهما] ـ فقال لسعد بن عبادة : كذبت ، لعمر الله ! لنقتلنه فإنك منافق ، تجادل عن المنافقين . فثار الحيان : الأوس ، والخزرج حتى همُّوا أن يقتتلوا ـ ورسول الله ـ ﷺ ـ قائم على المنبر ـ فلم يزل رسول الله ـ ﷺ ـ يخففهم حتى سكتوا ، وسكت .

قالت : وبكيت يومي ذلك لا يرقأ لي دمع ولا أكتحل بنوم ، ثم بكيت ليلتي المقبلة لا يرقأ لي دمع ، ولا أكتحل بنوم . وأبواي يظنان أن البكاء فالق كبدي . فبينما هما جالسان عندي ، وأنا أبكي ، إستأذنت عليَّ امرأة من الانصار ، فأذنت لها ، فجلست تبكي .

**تەرجەمە :**

حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی لەسەر مینبەر راوەستاو عوذری لە خەڵق طەڵەب کرد . کە (تجزیە)ی عەبدوڵڵای ، کوڕی ئوبەیی ، کوڕی سەلوول بکا ؛

چونكى ئيفتيراى به حه‌زره‌تى عايشه كردوه . له‌سه‌ر مينبه‌ر فه‌رمووى : ئه‌ى جه‌ماعه‌تى موسليمين كىٚ به مه‌عذوورم ئه‌زانىٚ ده‌رحه‌ق پياوىٚ كه ئه‌ذاو جه‌فاى ئه‌وم ده‌رحه‌ق ئه‌هل‌و به‌يتم پيٚگه‌ييوه‌ته‌وه ؟ وه‌للّاهى ! غه‌يرى خيٚر ده‌رحه‌ق ئه‌هلى به‌يتم هيچى ترم نه‌ديوه . به پياويٚكيشه‌وه ئيفتيرايان پىٚ كردوه كه غه‌يرى خيٚرله‌و پياوه هيچ خراپى ئه‌وم لىٚ مه‌علووم نه‌بوه ، له‌گه‌لْ منا نه‌بووبىٚ نه‌هاتوٚته ناو مالْى ئيٚمه‌وه .

سه‌عدى كورِى مه‌عاذ ـ رضي الله تعالى عنه ـ ته‌شريفى هه‌لْسا . فه‌رمووى : (يا رسول الله) من به مه‌عذوورت ئه‌گرم ؛ ئه‌گه‌ر ئه‌و پياوه له ئه‌وس بىٚ له گه‌ردنى ئه‌ده‌ين ، ئه‌گه‌ر له برااده‌رانى خه‌زره‌جيمان بىٚ ئه‌مرمان پىٚ ئه‌فه‌رمووى ئه‌مره‌كه‌ت به‌جىٚ بيٚنين .

حه‌زره‌تى عايشه فه‌رمووى : سه‌عدى بنى عوباده كه سه‌ييدى خه‌زره‌ج بوو هه‌لْسا . سه‌عدى بنى عوباده پياويٚكى صالْح بو ، ئه‌مما حه‌مى يه‌ت ئه‌و جه‌هاله‌ته‌ى پيٚكرد : به سه‌عدى كورِى مه‌عاذى وت : قه‌سه‌م به خوا ! نايكوژىٖ‌و ناتوانى بيكوژىٖ .

له دواى ئه‌و ئوسه‌يدى كورِى حوضه‌ير ـ كه ئاموٚزاى سه‌عدى كورِى مه‌عاذ بوو ـ رضي الله تعالى عنهما ـ هه‌لْسا ، به سه‌عدى كورِى عوباده‌ى فه‌رموو : دروٚت‌كرد ، قه‌سه‌م به خوا ! ئه‌يكوژين . به ته‌حقيق توٚ مونافيقى ، موجاده‌له بوٚ مونافيقان ئه‌كه‌ى . ئه‌وس‌و خه‌زره‌ج هه‌ردوكيان په‌لامارى يه‌كترى‌يان دا كه به گژ يه‌كا بچن . پيٚغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ته‌شريفى له‌سه‌ر مينبه‌ره‌كه‌ى راوه‌ستابو هه‌ر خه‌ريك بوو رقه‌كه‌يانى ئه‌نيشانه‌وه ، تا بيٚده‌نگ بوون ، ئه‌ويش بيٚده‌نگ بوو .

حه‌زره‌تى عايشه ـ رضي الله تعالى عنها ـ فه‌رمووى : ئه‌و روٚژه هه‌ر گريام فه‌رميٚسكم نه‌ده‌نيشته‌وه‌و خه‌و نه‌ده‌چوه چاوم ، شه‌وى

دواییش هەر گریام فرمێسکم نەئەنیشتەوەو خەو نەئەچوە چاوم . دایكو باوکم وایان ئەزانی کە گریان جەرگم لەت ئەکا . لەو وەختەدا کە ئەوان لام دانیشتبوون و منیش ئەگریام ژنێ لە ئەنصار ئیذنی خواست بۆ لام ، ئیذنم داو هات و دانیشت و ئەگریا .

قالت : فبينا نحن على ذلك دخل علينا رسول الله ـ ﷺ ـ ثم جلس . قالت : ولم يجلس عندي منذ قيل لي ما قيل . وقد لبث شهرا لا يوحى اليه في شأني بشيْ . قالت : فتشهد رسول الله ـ ﷺ ـ حين جلس ، ثم قال : أما بعد : يا عائشة ! فإنه بلغني عنكِ كذا وكذا ؛ فإن كنتِ بريئة فيبرئكِ الله ، وإن كنتِ ألْمَمْتِ بذنب فاستغفري الله وتوبي اليه . فإن العبد إذا اعترف بذنب ثم تاب تاب الله عليه . قالت : فلما قضى رسول الله ـ ﷺ ـ مقالته قلص دمعي ، حتى ما أُحِسُّ منه قطرة . فقلت لأبي : أجب عني رسول الله ـ ﷺ ـ فيما قال . فقال : والله ما أدري ما أقول لرسول الله ـ ﷺ ـ . فقلت لأمي : أجيبي عني رسول الله ـ ﷺ ـ فقالت : والله ما أدري ما أقول لرسول الله ـ ﷺ ـ فقلت ـ وأنا جارية حديثة السن ، لا أقرأ كثيرا من القرآن ـ : إني والله لقد عرفت أنكم قد سمعتم بهذا حتى استقر في نفوسكم وصدقتم به . فإن قلت لكم : إني بريئة ـ والله يعلم إني بريئة ـ لا تصدقوني بذلك . ولئن اعترفت لكم بأمر ـ والله يعلم إني بريئة ـ لتصدقونني . وإني والله ما أجد لي ولكم مثلا إلا كما قال أبو يوسف [عليهما الصلاة والسلام : ﴿فصبر جميل ، والله المستعان على ما تصفون﴾[1] قالت : ثم تحولت واضطجعت على فراشي .

(١) يوسف /١٨ .

**تەرجەمە :**

حەزرەتی عائیشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ فەرمووی : کە ئێمە لەسەر ئەو حاڵەدا بووین پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی هات و دانیشت . لەو رۆژەوە کە ئەو ئیفتیرایە دەرحەقم بێژرابو لە لام دانەنیشتبوو . مانگێ رابوردبوو دەرحەقم هیچ وەحی نازڵ نەبووبوو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ کە تەشریفی دانیشت کەلیمەی شەهادەتی هێنا ، لە دواییا فەرمووی : (اما بعد) ئەی عائیشە ! لە دەرحەق تۆوە ئەوەو ئەوەم پێگەییوەتەوە . ئەگەر بەری بیت خوا ـ عز وجل ـ تەبرییەت ئەکا . ئەگەر گوناهێکت لێ واقیع بووبێ (استغفار) بکەو تۆبەی لێ بکە ؛ چونکی عەبد کە ئیقراری بە گوناهی خۆی کردو تۆبەی لێ کرد خوا تۆبەی لێ قەبووڵ ئەکا .

کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ قسەکەی تەواو فەرموو فرمێسکەکەم نیشتەوە وا چوە دواوە حیسسی قەترەیێکم لێ نەدەکرد کە لێی بێتە خوارێ ، فەرمووی : بە باوکم وت : بابە لە باتی من جوابی پێغەمەر بدەرەوە ـ ﷺ ـ باوکم فەرمووی : وەڵڵاهی نازانم چی عەرزی پێغەمەر بکەم ـ ﷺ ـ [یەعنی ئێمە لەوی چاتر نازانین کە جوابی بدەینەوە] عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ ئەفەرموێ : بە دایکم وت : تۆ جوابی پێغەمەر بدەرەوە ـ ﷺ ـ دایکم وتی : وەڵڵاهی نازانم چی عەرزی پێغەمەر بکەم ـ ﷺ ـ .

عائیشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ ئەفەرموێ : من کچێکی مناڵ بووم ، لە قورئان ئەوەندەم نەدەزانی ، یەعنی عیلم و عەقڵم ئەوەندە زۆر نەبوو کە بتوانم بە تەواوەتی مودافەعەی خۆم بکەم ، عەرزم کرد : وەڵڵاهی ئەزانم کە ئێوە ئەمەتان بیستوە تا لە دڵتانا جێگیر بوە ، بە تەواوی چەسپیوەتە دڵتان ، پێتان بروا کردوە ، ئەگەر بڵێم : من بەریم ـ خوایش

عیلمی بەوە هەیە کە بەریم ـ ئێوە پێم بروا ناکەن . ئەگەر ئیقرار بکەم بە شتێك [کە من لێی بەریم] ـ خوایش ئەزانێ کە بەریم ـ ئێوە پێم باوەر ئەکەن . وەڵلاهی من بۆ من و ئێوە مەثەلێ نادۆزمەوە [کە خۆمانی پێ بشوبهێنین] ئەوە نەبێ کە باوکی یوسف ـ علیه الصلاة والسلام ـ فەرمووی : ئیش و کاری من [دەرحەق یوسف و براکەی] هەر صەبرکردنە ، هەر خوایە کە یاری‌یەی لێ طەلەب بکرێ لەسەر ئەو شتەی کە ئێوە ئەیلێن . حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : لە دوای ئەوە وەرگەرام و لەسەر جێگەکەم راکشام .

[تەماشای عەقل و کیاسەتی حەزرەتی عایشە بکەن ـ رضي الله تعالى عنها ـ لە پێشەوە خۆی جوابی پێغەمەری ـ ﷺ ـ نەدایەوە ، بە تەرتیب حەوالەی لە خۆگەورەتری کرد ، کە ئەوان ئیظهاری عەجزیان کرد ئەو وەختە بە جوابێکی مەعقوول و موختەصەر چە جوابێکی شیرینی دایەوە و ئیعتیمادی دایە سەر خواو (تمثيل)ی بە فەرموودەی حەزرەتی یەعقووب کرد ـ علیه الصلاة والسلام ـ ؟

ئەو وەقعەیە لە غەزای (بنی المصطلق)ا بوو چوار ساڵ دوای هیجرەت . لەو وەختەدا حەزرەتی عایشەی دایکمان ـ رضي الله تعالى عنها ـ عومری سێنزە ساڵ بوو ، ئیحتیمالی هەیە ئێشتا بلووغی نەبووبێ . بزانن بەو منالی‌یە چە جوابێکی مەنطیقیی دایەوە ، کە ئەمجا تاق‌تاقە لە کیباری عولەما موقتەدیر بێ بەسەر جوابێکی وەهادا ؟ فرضي الله تعالى عنها] .

قالت : وأنا والله حينئذ أعلم أني بريئة ، وأن الله مُبرِئي ببراءتي ، ولكن والله ما كنت أظنُّ أن يُنزلَ في شأني وحي يتلى ، ولشأني كان أحقر في نفسي من أن يتكلم الله ـ عز وجل ـ فيَّ بأمر يُتلى . ولكني كنت أرجو أن

يرى رسول الله - ﷺ - في النوم رؤيا يبرئني الله بها . قالت : فوالله ما رام رسول الله - ﷺ - مجلسه [ما فارقه] ولا خرج من أهل البيت أحد حتى أنزل الله - عز وجل - على نبيه - ﷺ - فأخذه ما كان يأخذه من البُرَحاء [من الشدة] عند الوحي حتى أنه لينحدر [لينصب] مثل الجمان [أي الدر] من العرق في اليوم الشاتي من ثقل القول الذي أُنزل عليه .

قالت : فلما سُري عن رسول الله - ﷺ - [كشف وأُزيل] وهو يضحك ، فكان أول كلمة تكلم بها أن قال : أبشري يا عائشة ! أما الله فقد برأكِ . فقالت لي أُمّي : قومي اليه ، فقلت : والله لا أقوم اليه ولا أحمد إلا الله . هو الذي أنزل براءتي .

قالت : فأنزل الله - عز وجل - : ﴿إن الذين جاؤا بالافك عصبة منكم [عبد الله بن ابي بن سلول المنافق ، وحسان بن ثابت ، ومسطح بن أُثاثة ، وحمنة بنت جحش ، وزيد بن رفاعة . ومن ساعدهم] لا تحسبوه شرًا لكم ، بل هو خير لكم . . ﴾ عشر آيات .

[بقيتها : ﴿لكل امرئ منهم ما اكتسب من الِاثم ، والذي تولى كبره منهم له عذاب عظيم (١) لولا اذ سمعتموه ظن المؤمنون والمؤمنات بانفسهم خيرا ، وقالوا : هذا اِفك مبين (٢) لولا جاؤا عليه بأربعة شهداء ! فإذ لم يأتوا بالشهداء فاولائك عند الله هم الكاذبون (٣) ولو لا فضل الله عليكم ورحمته في الدنيا والآخرة لمسكم فيما أفضتم فيه عذابٌ عظيم . (٤) إذ تلقونه بألسنتكم ، وتقولون بأفواهكم ما ليس لكم به علم ، وتحسبونه هينا وهو عند الله عظيم . (٥) ولولا إذ سمعتموه قلتم : ما يكون لنا أن نتكلم بهذا سبحانك هذا بهتان عظيم . (٦) يعظكم الله أن تعودوا لمثله - أبداً - إن كنتم مؤمنين . (٧) ويبين الله لكم الآيات ، والله عليم حكيم . (٨) إن الذين يُحبُّون أن تَشِيعَ الفاحشةُ في

الـذين آمنوا لهم عـذاب أليم في الدنيـا والآخرة ، والله يعلم وأنتم لا تعلمون . (٩) ولولا فضـل الله عليكم ورحمته وأن الله رؤف رحيم . (١٠)﴾[1]

فأنزل الله ـ عز وجل ـ هؤلاء الآيات ببراءتي قالت : فقال أبو بكر [رضي الله تعالى عنه] ـ وكان ينفق على مسطح لقرابته منه وفقره ـ : والله لا أُنفق عليه شيئا أبدا بعد الذي قال لعائشة ! فأنزل الله ـ عز وجل ـ : ﴿ولا يأتل أو لو الفضل منكم والسعـة أن يؤتوا أولي القـربى . . (الى قوله) : [والمساكين والمهاجرين في سبيل الله ، وليعفوا وليصفحوا] الا تحبون أن يغفر الله لكم ؟ [والله غفور رحيم . ]﴾

قال عبد الله ابن المبارك : هذه أرجى آية في كتاب الله . فقال أبو بكر : والله ! إنِّي لَأحبُّ أن يغفر الله لي . فرجع الى مسطح النفقة التي كان ينفق عليه . وقال : لا أنزعها منه أبدا .

تەرجەمە :

حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : وەڵڵاهی ! ئەو وەختە ئەمزانی کە من بەریم ، ئەمزانی کە خوا بە واسیطەی بەرائەتی من لەو ئیفتیرایە تەبرىيەم ئەکا . ئەمما وەڵڵاهی ! ظەنم نەدەبرد کە خوا ـ عز وجل ـ دەرحەق من وەحییێك ئەنێرێ کە بخوێنرێ . دەرەجەی من لە لام لەوە کەمتر بوو کە خوا ـ عز وجل ـ لە دەرحەق منا قسەیێکی وا بفەرموێ کە بخوێنرێ . ئەمما ئومێدم بو کە پێغەمـەر ـ ﷺ ـ لە خـەوا خەوێ ببینێ کە خوا ـ عز وجل ـ بەو خەوە تەبرىيەم بکا .

(١) النور /١٠ ـ ٢٠ .

فـەرمووی : وەڵـلاهی ! پێغەمـەر ـ ﷺ ـ لـە مـەجلیسـەکـەی جوێنەبۆوەو هیچ کەسیش لە ئەهلی بەیت نەچـوە دەرێ تا خـوا ـ عز وجل ـ وەحیی نازڵ کردە سەر پێغەمەر ـ ﷺ ـ . ئـەو شیددەتـەی کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە وەختی نوزوولی وەحیا ئەیگرت تا وای لێ ئەهات لە ڕۆژی ساردی زستانا لەبەر گرانی ئەو کەلامەی کە نازڵ ئەبوە سەری وەك دور عـەرەقی لێ ئەهـاتە خـوارێ . . ئەم جـارەیش گـرتی . کـە ئـەو شیددەتەی لەسەر لاچوو پێئەکەنی ، ئەووەڵ کەلیمەیێ کە تەکەللومی پێ فەرموو ئەوە بوو فەرمووی : =مژدە بێ = ئەی عـایشە ئـەمما خـوا تەبری‌یەی کردی . دایکم پێی وتم : هەڵسە بچۆرە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ [شوکری ئەم نیعمەتە بەجێ بێنەو دەستوپێی ما... تم : وەڵلاهی ! ناچمە لایی و غەیری خوا حەمدو شوکری هیچ کەس ناکەم . هەر ئەوە کە بەرائەتی منی نازڵ فەرموە . عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : خوا ئەم دە ئایەتەی نازڵ فەرموو کە مەعنای وایە :

ئەوانە کە لە ڕێی حەق لایان‌داو بوهتانیان کرد جەماعەتێکن = لە ئێوە = [کە ئیبن و ئوبەیی و ، حەسانی کوڕی ثابیت‌و ، میسطەحی کوڕی ئـوثاثـەو ، حەمنـەی کچی جـەحش‌و ، زەیـدی کـوڕی ڕیفـاعـەو . هەمپایان . ] ئەی پێغەمەرو ئەهلی بەیت ! ئەوە بۆ خۆتان بە شەڕ مەزانن بـەڵکو ئـەوە خێرێکی زۆر گـەورەیە بـۆ ئێوە [خـوا ـ عز وجـل ـ بەوە ئەجرێکی زۆرتـان ئەداتـەوەو بەرائـەتی حەزرەتی عـایشەو صـەفوان‌و دەرەجەو حورمەتیان لە لای خۆی بەیان ئەفەرموێ] بۆ هەر یەکێ لـە ئەهلی ئیفك بە قەد قسەلێکردنەکەی خۆی جەزاییکی هەیە [لە دنیـادا وەکوو میسطەح و حەسان کە چاویان کوێر بوو ، حەسان گۆج بوو . یا لە دنیاو ئاخیرەتا وەکوو ئیبن و ئوبەی لە دنیادا ڕەزیل و ڕسوا بوو ، مەشهوور

بوو به نیفاق ، له ئاخیره‌تا عه‌زابی جه‌هه‌نه‌می هه‌یه] ئه‌وه‌ی که به‌شی زۆری بلاوکرده‌وه له ناو خه‌ڵقاو رازانیه‌وه له‌و ئـه‌هلی ئیفکـه ئه‌وانـه‌ن عه‌زابێکی گه‌وره‌یان هه‌یه .[1] [یا له دنیادا که هه‌مـوو داری حه‌دیـان لێدرا ، یا له ئاخیره‌تا ئه‌گه‌ر تۆبه‌ی لێ نه‌کا وه‌ك عه‌بدوڵلا] بۆچی که له‌و وه‌خته که ئه‌و ئیفکه‌تان بیست ژن‌و پیاوی موسوڵمان حوسنی ظه‌نیان به خۆیان = نه‌بردو = نه‌یانوت : ئه‌مه ئیفتیرایێکی زۆر ئاشکرایه . ؟ بۆچی له‌سه‌ر ئه‌وه چوار شاهێیان نه‌هێنا ؟ که هیچ شاهێدیان نه‌هێنا [چونکی که‌س نه‌بوو] دیاره ئه‌وانه له حوزووری خوادا هه‌موو درۆزنن . ئه‌گه‌ر خوا له دنیاو ئاخیره‌تا فه‌ضل‌و ره‌حمه‌تی نه‌بوایه به‌سه‌رتانا ، ئه‌ی ئه‌هلی ئیفك ، له‌و قسه قه‌بیحه‌ی که ده‌متان تێوه‌دا عه‌ذابێکی زۆر زۆر گه‌وره‌ی بۆ ئه‌ناردن [که حه‌قاره‌ت‌و داری حه‌د به نیسبه‌ت ئه‌وه‌وه هه‌ر هیچ نه‌بێ] له‌و وه‌خته‌دا ئه‌و عه‌ذابه‌تان بۆ ئه‌هات که ئه‌و قسه پیس‌و ناشیرینه‌تان له ده‌م یه‌ك ئه‌بچری‌یه‌وه‌و ده‌ماو[illegible]ان ئه‌خست به ده‌م قسه‌یێکی وا ئه‌که‌ن که هیچ عیلمتان پێی نه‌بێ وا ئه‌زانن که ئه‌وه شتێکی سووکه‌و گوناهی نی‌یه . که‌چی لای خوا زۆر گه‌وره‌یه‌و ، گونـاهێکی زۆری هه‌یـه‌و ، عه‌ذابی به شیدده‌ته .

---

(١) لێره‌دا به گـوێره‌ی ئـایه‌تـه‌که ئـه‌گه‌ر بنـووسرێ : «ئـه‌وه‌ی به‌شی زۆری بلاوکردنه‌وه‌ی ئه‌و تاوانه‌ی گرته‌ئه‌ستۆی خۆی . . . تۆڵه‌یێکی گه‌وره‌ی بۆ هه‌یه .» باشتره .

[ئەمە سێ شت کە هەر یەکێکی بە جوێ عەذابی زۆری هەیە :

١ ـ دەماودەم خستن .

٢ ـ بە بێ ئەمە کە عیلمی پێی ببێ قسەلێکردن .

٣ ـ لەگەڵ ئەمەدا کە لە لای خوا زۆر گەورەیە بە بوچووك[1] زانیبو موبالات پێ نەکردنی] .

بۆچی کە بیستتان نەتانوت : بۆ ئێمە نی یە کە تەکەللومی پێ بکەین و تەعەجوبتان لێ نەکردو نەتانوت (سبحانك) ئەی خوایە تەنزیهو تەقدیسی تۆ ئەکەین ؟ ئەم قسەیە بوهتانێکی زۆر گەورەیە [چونکی ئەصلی خۆی ئیفتیرایە ، ئیفتیرا بە موسوڵمان گوناهی زۆرە ئەگەر ئەو ئیفتیرایە بە قەذف بێ و ئەو قەذفە بە ئەصحابی کیرام بێ و با خوصووص بە یەکێ لە ئەزواجی طاهیرات بێ . . . ئەبێ گوناهی چەندە گەورە بێ ؟ ئەو زەوجەیش لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ لە ئەکثەری ئوممەت مەحبوویتر بێ و بە تەقواو بە زوهدتر بێ ئەبێ چلۆن بێ ؟]

خوا ـ عز وجل ـ وەعظتان بۆ دائەداو نەصیحەتتان ئەکا کە دەفعەیێکی تر بە ئەبەدی عەودەت نەکەنەوە سەر ئەو نەوعە ئیفتیرایە ئەگەر ئێوە موسوڵمانن و بە دڵ باوەڕتان هەیە ؛ چونکی موسوڵما نەتی تەواو بە تەواوەتی ئینسان لەو نەوعە گوناهانە مەنع ئەکا .

خوا بۆ ئێوە ئەو ئایەتانەی کە دەلالەت ئەکەن لەسەر ئەحکامی دینی و دنیەوی و ئاداب و ئەخلاق بەیان ئەکا . خوا ئەحواڵی ئێوە ئەزانێ ، عیلمی هەیە بە عاقیبەتی هەموو شتێ ، هیچ حوکمێکی بێ حیکمەت نی یە .

(١) لە دەسخەتەکەدا بەو جۆرەیە ، بەڵام ناتەواویەکی تێدایە ، دەبێ بگوترێ : «بە بچووکی زانیبوو موبالاتی پێ نەکردبوو . . .» یان «بە بچووك بزانرێ و موبالاتی پێ نەکرێ . .» .

ئەلبەتتە ئەو کەسانەی کە حەز ئەکەن کە لە ناو ئەو کەسانەدا کە ئیمانیان هەیە بە ئەوامیرو نەواهی و ، بە خواو رەسوولی خواو حەز ئەکەن دەرحەق ئەو موئمینانە شتێ کە مووجیبی عەیبو عار بێو قەبیح بێ شیووع ببێ و بڵاوبێتەوە لە ناو خەڵقا بۆ ئەو نەوعە ئینسانانە لە دنیاو ئاخیرەتا عەذابێکی زۆر بە ئێش هەیە . لە دنیادا حەدیان لێ ئەدرێ ، لە ئاخیرەتا بە ئاگری جەهەننەم ئەسووتێن بەوە هەر خوا عیلمی هەیە ئێوە نایزانن ؛ چونکی هەر (اطلاع) تان بەسەر بەعزێ ظاهیرا هەیەو ئاگاتان لەوە نیە کە لە ناو دڵایە .

ئەگەر فەضلو رەحمەتی خوا نەبوایە ، بەسەر ئێوەدا خوا بە رەئفەتو رەحمەت نەبوایە [لەگەڵ ئێوە مەگەر هەر خۆی بزانێ چە غەضەبێکی بەسەرا ئەڕژانن !]

﴿يا أيها الذين آمنوا لا تتبعوا خطوات الشيطان [بإشاعة الفاحشة] ومن يتبع خطوات الشيطان فإنه يأمر بالفحشاء والمنكر . ولولا فضل الله عليكم ورحمته ما زكى منكم من أحد أبدا ، ولكن الله يزكي من يشاء والله سميع عليم[1]﴾

ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە تابیعی شەیطان مەبن ، پەیرەوی ئەو مەکەن هەر کەسێ شوێن شەیطان بکەوێو پەیرەوی ئەو بکا هەر ئیشی قەبیح ئەکاو شتێك ئەکا کە شەرع ئینکاری کردبێ ؛ چونکی شەیطان هەر ئەمر بە شتی قەبیحو شتێك کە شەرع مەنعی کردبێ ئەکا .

(١) بڕوانە : سوورەتی نوور ، ئایەتی : (٢١)

ئەگەر فەضلی خواو رەحمەتی لەسەر ئێوە نەبوایە بەم نەوعە کە رێی تەوبەی پێنیشان داون‌و تۆبەتان لێ قەبووڵ ئەکاو بە تۆبەو حودوودی شەرعیی لە گوناە پاکتان ئەکاتەوە . خوا هیچ کەسێکی لە ئێوە بە تۆبەو ئیجرای حودوودی شەرعی لە گوناە پاك نەئەکردەوە . ئەمما ئەوەندە هەیە خوا چونکی بە فەضل‌و رەحمەتە ئەوانەی کە خوا ئیرادەی هەیە کە پاك بنەوە هیدایەتیان ئەدا بۆ تەویە بەوە پاکیان ئەکاتەوە . خوا - عز وجل - گوێی لە تەویەیانەو ، عیلمی هەیە بە نی‌یەتی دڵیان ئەزانێ کێ ئیخلاصی هەیەو کێ نی‌یەتی .

حەزرەتی عایشە - رضي الله تعالى عنها - ئەفەرموێ : خوا لە بەرائەتی من لەو ئیفتیرایەدا ئەم ئایەتانەی نازڵ فەرموو ، حەزرەتی ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - لەبەر خزمایەتی‌و فەقیری میسطەح نەفەقەو گوزەرانی میسطەحی ئەدا . . سوێنی خوارد فەرمووی : وەڵلاهی لە دوای ئەمە کە میسطەح ئەم قسەیەی بە عایشە وت ئیتر لەمەولا بە ئەبەدیی من نەفەقەی نادەمێ . . خوا - عز وجل - ئەم ئایەتەی نازڵ فەرموو کە تەرجەمەی وایە :

ئەو کەسانەی کە ئەهلی فەضلن‌و دەستیان ئەڕواو (اقتدار)و ماڵیان هەیە سوێن نەخۆن کە هیچ نەدەن بە خزم‌و فەقیرو ئەوانە کە (محض) لە رێی خوادا هیجرەتیان کردوە ، لە قوصووریان ببوورن ، چاو لە باحەتیان بپۆشن ، بۆچ ئێوە خۆتان حەز ناکەن کە خوا لێتان خۆش بێ‌و عەذابتان نەدا بەو گوناەو قوصوورەی ئەیکەن ؟ خوا لەگەڵ ئەمە کە قودرەتی هەیە بەسەرتانا غەفوورە کە لە گوناهتان ئەبوورێ‌و ، رەحیمە رەحمتان پێ ئەکا . یەعنی چون خوا - عز وجل - چەندە گەورەیە لە ژوور ئەوەوە کەس نی‌یە قودرەتی بەسەر هەموو ماسیوای خۆیا هەیە دەرحەق

ئەو گوناهکردن لە هەموو گوناهێ گەورەترە لەگەڵ ئەمە ئەو لە گوناهی ئێوە خۆش ئەبێ کەسێکیش کە دەرحەق ئێوە قوصوورێکی ببێ ئێوەیش لە قوصوورەکەی ببوورن .

میسطەح هەم خزمی ئەبوبەکر بوو هەم فەقیر بوو هەم بە شەهادەتی خوا موهاجیری - في سبيل الله - بوو . بە سێ نەوع بەر ئەم ئایەتە ئەکەوێ ، لە ئەهلی بەدریشە .

(حبان)ی کوڕی مووسا کە مامۆستای[1] لەم حەدیثەدا ئەڵێ : عەبدوڵلای کوڕی موبارەك کە مامۆستای ئەوە فەرمووی : ئەم ئایەتە بۆ موسوڵمانان لە هەموو ئایەتێکی قورئان ئومێدبەخشترە بە ئینسان ؛ چونکی (ضمنا) بەیانی ئەوە ئەکا کە خوا عەفوی خۆش ئەوێ ، وەعدەی قەطعی‌ی تیایە کە بە تەوبە لە گوناه خۆش ئەبێ ، تەصریحی تیایە کە (مطلقا) لە گوناه خۆش ئەبێ .

حەزرەتی عایشە - رضي الله تعالى عنها - ئەفەرموێ : کە حەزرەتی ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - لە دوای نوزوولی ئەم ئایەتە فەرمووی : وەڵلاهی ! من حەزەکەم کە خوا لێم خۆش ببێ . نەفەقەکەی میسطەحی بۆ ئیعادە کردەوە فەرمووی : وەڵلاهی ! ئیتر بە ئەبەدیی لێی قەطع ناکەم .

---

(١) لێرەدا شتێك نووسراوە بۆم نەخوێنرایەوە ، تەماشای قەسطەلانیم کرد هیچی لەسەر نەنووسیبوو . نەوەویش دەڵێ : لەم جارە زیاتر لە (صەحیحی موسلیم)ا ناوی ئەم (حبان) ە نەهاتوە .

قالت عائشة [رضي الله تعالى عنها] : وكان رسول الله - ﷺ - سأل زينب بنت جحش [رضي الله تعالى عنها] زوج النبيِّ - ﷺ - عن أمري ما علمتِ ، أو ما رأيتِ ؟ فقالت : يا رسول الله أحمي سمعي وبصري ، والله ! ما علمت إلا خيرا . قالت عائشة [رضي الله تعالى عنها] : وهي التي كانت تساميني [تفاخرني وتضاهيني بجمالها ومكانها عند النبي - ﷺ -] من أزواج النبي - ﷺ - فعصمها الله بالورع ، وطفقَتْ أختها حمنة بنت جحش تحارب لها ، فهلكت فيمن هلك .
م - ١٠/ ٢٣٠ - ٢٤٤ ، ح - ٦/٣٢٦ - ٣٣٠ بفرق ما .

وفي رواية : قال عروة : كانت عائشة تكره أن يسب عندها حسان ، وتقول : إنه قال :

فإن أبي ووالده وعرضي × لعرض محمد منكم وقاء م - ١٠/ ٢٤٤

وقال عروة : قالت عائشة [رضي الله تعالى عنها] والله إن الرجل الذي قيل له ما قيل ليقول [متعجبا مما نسبوه اليه . بخاري] : سبحان الله . فوالله الذي نفسي بيده ! ما كشفت عن كنف [أي سترها] أنثى قط . قالت : ثم قتل بعد ذلك في سبيل الله شهيدا . م - ١٠/ ٢٤٥ ، ح - ٦/ ٣٣٠

تەرجەمە :

حەزرەتی عائیشە - رضي الله تعالى عنها - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - لە زەینەبی کچی جەحشی زەوجی پێغەمەری پرسی - ﷺ ، ورضي عنها - دەرحەق من ؛ فەرمووی : چی ئەزانی ، یا چیت دیوە لە عایشە ؟ زەینەب وتی : (یا رسول الله) گوێو چاوی خۆم لەوە ئەپارێزم وەڵلاهی غەیری خێ ‌ ‌ چی تر نازانم .

عایشە - رض‌ ‌ - الله تعالى عنها - فەرمووی : لە ئەزواجی پێغەمەر

ـ ﷺ ـ تەنها ئەو بوو کە بە جەمال‌و مەنزیلەت لە خـزمەت پێغـەمەرا ـ ﷺ ـ فـەخرم بـەسەرا بکـاو وەکوو من وابێ . بـە واسیطەی وەرع‌و تەقوایەوە خوا مـەعصوومی کـرد لەو حـادیثەیـە . حەمنـەی خوشکی ـ کچی جەحش ـ حەربی بۆ ئەکرد لەگەڵ ئەوانەی کە بە هیلاك چوون ئەویش بە هیلاکا چوو .

عورۆوە ئەڵێ : حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالی عنهـا ـ حەزی نەئەکرد کە لە لای ئەو جوێن بدرێ بە حەسان ئەیفەرموو : حەسان لە مەدحی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ وتوویەتی : باوك‌و دایك‌و عیرضم قەڵغانـە بۆ عیرضی پێغەمەر ـ ﷺ ـ .

عـوروە ئـەڵێ : حـەزرەتی عـایشـــە ـ رضي الله تعـالی عنهـــا ـ ئـەفەرمـوێ : وەڵلاهی ! ئـەو پیاوە کـە ئەو قسـەی دەرحـەق کـراوە ـ تەعەجوبی لێ ئەمێنێ ـ ئەڵێ : قەسەم بەوەی کە نەفسی من لە دەستی قودرەتیایە ! تا ئێستە من سەترم لەسـەر هیچ ژنێ لانـەداوە [یەعنی لـە مـوددەی عومـری خۆمـا لەگـەڵ هیچ ژنێ مـوعامـەلەی ژن‌و مێـردیم نەکردوە . صەفوان ـ رضي الله تعالی عنه ـ نێرەمووکە بوو ، ئەوی پێوە بوو وەك ریشووی سەرپۆش وابوو . قسطلاني]

عایشە ـ رضي الله تعالی عنها ـ ئەفەرموێ : لە دوای ئەوە لە رێی خوادا بە شەهیدی کوژرا .

لـە م ـ ۲٤٦/۱۰ = دا = زۆر بە مـوختەصـەری حەدیثێکی تـر ریوایەت ئەکا لەو حەدیثە موختەصەرەدا ئـەم زیادەی تیـا هەیـە : کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەحقیقی مەسئەلەکە لە بەریرە ئەکاو جـوابی پێغەمـەر ـ ﷺ ـ ئەداتەوە ، بەعزێ ئەصحابی پێغەمەر ـ ﷺ ـ بـە تونـدەوە پێی ئـەڵێن : لـە حوزووری پێغـەمەرا ـ ﷺ ـ راست بـرۆ ، حەتـا قسەی

خـراپیشیان پیّوت . بـەریرە ـ رضي الله تعـالى عنها ـ فـەرمـووی : (سبحان الله) وەڵلاهی ! زەرەنگەر لە ئاڵتوونی خالیص چی بزانیّ منیش لە عایشە ئەوە ئەزانم .

**فەوائیدی ئەم حەدیثە :**

١ ـ دروستە قورعەکێشان لە بەینی ژنانا کە کامیان ببا بۆ سەفەر .
٢ ـ بۆ سەفەر قورعەکیشان واجبە .
٣ ـ قەزای ئەو موددەتە کە بەجیّماون لازم نی‌یە .
٤ ـ دروستە ژن‌بردن بۆ سەفەر .
٥ ـ دروستە ژنان بچنە غەزا .
٦ ـ دروستە ژن سواری کەژاوە بیّ .
٧ ـ دروستە پیاو خزمەتی ژن بکا لە سەفەرا .
٨ ـ رۆیینی عەسکەر تەوەققوفی بەستۆتە سەر ئەمری ئەمیریان .
٩ ـ دروستە ژن بیّ ئیذنی مێردی بچیّ بۆ دەفعی ئیحتیاجی خۆی .
١٠ ـ دروستە ژن ملیوانکەو ئەسبابی زینەت لەعەمەل بێنیّ .
١١ ـ ئەوی ژن سوار بکا ئەگەر مەحـرەمی نەبیّ بـە بیّ لوزووم نـابیّ قسەی لەگەڵ بکا .
١٢ ـ ئیقتیصاد لە خواردن‌و پۆشینا لە فەضیلەتی ئەخلاقە .
١٣ ـ دروستە ئینسان بۆ ئیحتیاجییێك لە لەشکر دوا بکەویّ ، ئەگەر مەجبووری‌یەتی نەبیّ بۆ ئەمە کە هەموویان بەیەکەوە برۆن .
١٤ ـ موعاوەنەتی غەمنـاك‌و لەرِیّ‌مـاوەو ، گەرِان بـۆ شتیّ‌ون‌بووو ، ئیکرامی ئینسانی صاحیب قەدر سوننەتە .

١٥ - حوسنی ئەدەب لەگەڵ ژنانی بێگانەدا لە هەموو وەختێکا لازمە . ئەبێ ئەو کەسە لە پێشیەوە بڕوا لە تەنیشت و پشتی یەوە نەڕوا .

١٦ - سوننەتە ئینسان تەرجیحی خەڵق بدا بەسەر خۆیا لە سواری و جێی دانیشتن و خواردن و هەموو شتێکا .

١٧ - کەسێ موصیبەتێکی دینی یا دنیایی بۆ خۆی یا بۆ کەسێکی تری حیس کرد . . سوننەتە (استرجاع) بکا ، بڵێ (إنا لله وإنا اليه راجعون) .

١٨ - لازمە ژن خۆی سەتر بکا لە پیاوی بێگانە ، ئەو پیاوە با پیاوێکی صالحیش بێ .

١٩ - بێ ئەمە کە ئینسان سوێن بدرێ دروستە سوێن خواردن .

٢٠ - شتێکی ناخۆش بەسەر ئینسانا بێ بە زانینی مەحزوون ببێ چاك وایە لێی بشارڕێتەوە ، مەگەر ئیحتیاجی حاصل ببێ وەك (ام مسطح) و حەزرەتی عایشە - رضي الله تعالى عنهما - .

٢١ - تەلطیفی ماڵ و مناڵ سوننەتە .

٢٢ - کەسێ لە ماڵ و مناڵی کەوتە شوبهەوە - تا بەرطەرەفی ئەکا - بۆی هەیە کە مولاطەفەیان لێ کەم کاتەوە .

٢٣ - پرسینی حاڵی نەخۆش سوننەتە .

٢٤ - ژن بۆ ئیحتیاجییێك بچێ بۆ جێگەیێ - بۆ ئەمینی - یەکێکی ئەمین لەگەڵ خۆی ببا .

٢٥ - کەسێ - با خزمی خۆیشی بێ - کە خراپەی لەگەڵ ئینسانی بەشەرەف و فەضیلەت کرد ئەبێ ئینسان بیکەرهێنێ .

٢٦ ـ کەسێ قسەی بە ئەهلی فەضل وت سونەتە مودافەعەی بکرێ .
٢٧ ـ ژن بێ ئیذنی مێرد بۆی دروست نی یە بچێتە ماڵی باوکی .
٢٨ ـ دروستە (تعجب) بە لەفظی (سبحان الله) .
٢٩ ـ بۆ دەفعی شوبهەو بۆ مەصلەحەت موشاوەرەکردن لەگەڵ ئەوانەی کە ئیعتیمادیان پێ ئەکا سونەتە .
٣٠ ـ دروستە تەفتیش و تەحقیقی ئیشێ کە تەعەللوقی بە خۆیەوە بێ .
٣١ ـ بۆ ئیشی موهیم خوطبەخوێندن سونەتە .
٣٢ ـ بۆ تەجزی‌یەی موجریم شەکوا بردنەبەر خەڵق کە دەرحەق ئەو ـ ئەو جورمە کرابێ دروستە .
٣٣ ـ فەضلێکی زۆری تیا هەیە بۆ صەفوان کە خوا تەبری‌یەی ئەکا .
٣٤ ـ فەضلی سەعدی بنی مەعاذو ئوسەیدی بنی حوضەیر .
٣٥ ـ زۆر تێکۆشین بۆ دەفعی فیتنەو کووژاندنەوەی سونەتە .
٣٦ ـ تۆبە قەبووڵ بوون ، تەرغیب و تەشویق لەسەر تۆبە .
٣٧ ـ تەفویضی قسە بەگەورە .
٣٨ ـ ئیستیدلال بە قورئان .
٣٩ ـ موژدەدان بەو کەسەی کە بە نیعمەتێ گەیبێ یا موصیبەتێکی لەسەر لاچووبێ .
٤٠ ـ بەرائەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ لە ئیفك بە نەصی قورئان کەسێ شکی تیا پەیدا بکا مورتەد ئەبێ و کافر ئەبێ .

ئیبن و عەباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ژنی هیچ پێغەمەرێ ـ عليهم الصلاة والسلام ـ زینای لێ صادر نەبوە . خوا ـ عز وجل ـ بەوە ئیکرامی پێغەمەرانی خۆی گرتوە .

[خیانەتی ژنی (لـووط)و (نووح) - علیهـما الصلاة والسـلام - بە کوفرو ئینکاری ئەوان بوە بە زینا نەبوە ؛ چونکی قەومی لووط هەتیوباز بوون مێباز نەبوون . خوا - عز وجل - لە قورئانـا لە (قصـه)ی قەومی لـووطا - علیـه السلام - ئـەفەرمـوێ : کە مـەلائیکەکـان بۆ ئیمحـای قەومەکەی ، بوون بە میوانی ، قەومەکەی هوجوومیان کردە سەریان . حەزرەتی لووط - علیه السلام - فەرمووی : دەرحەق میوانەکانم ئابڕووم مەبەن ! ئەوە کچەکانم ، ئەوان عەرزیان کـرد : ئێمە دەخڵمـان نی یە بەسەر کچەکانتەوە ، خۆت ئەزانی مەقصوودمان چی یـە . . بەوە زۆر چاك دەرەکەوێ کە ئەو ژنە کافر بوەو (زانیە) نەبوە] .

٤١ - کە ئینسان نیعمەتێکی زائیلەی بۆ ئیعـادەکرایـەوە ئەبێ ئـەویش شوکرو حەمدی خوا تازەبکاتەوە .

٤٢ - فەضلی ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - .

٤٣ - صیلەی رەحم .

٤٤ - عەفوی گونەهکار .

٤٥ - کەسێ لەسەر کردن یا نەکردنی شتێك سوێنی خوارد لە دواییدا بۆی مەعلووم بوو کە خیلافی سوێنەکەی مەصلەحەتە سوننەتە ، حـەتا بـەعزێ وەقت فـەرزە ، سوێنـەکـەی بخـات مـوافیقی مەصلەحەتەکە موعامەلە بکا .

٤٦ - صەدەقەو خێرات سوننەتە .

٤٧ - فەضیلەتی زەینەب - رضي الله تعالى عنها - .

٤٨ - ئیهتیمام و دیقەتکردن لە شەهادەتا .

٤٩ - کـەسێ کەسێکی خـۆش بوێ ئـەبێ هەرچی تـەعەللوقی بـەو کەسەوە بێ ئیکرامیان بگرێ لەبەر خاتری مەحبووبەکەی خۆی .

٥٠ ـ خوطبە بە حەمدو ثەنای خوا دەست پێ بکرێ .
٥١ ـ دوای حەمدو ثەناو صەلاتو سەلامو شەهادەت وتنی (اما بعد) سوننەتە .
٥٢ ـ موسوڵمانان کە چاویان پێکەوت یا بیستیان کە بێحورمەتی لەگەڵ رەئیسەکەیان بکرێ ئەبێ هەموو غیرەتیان بزوێو بێنە حەرەکەو موعاوەنەتی بکەن .
٥٣ ـ دروستە جوێندان بە کەسێ کە موعاوەنەتی باطیل بکا . نووي . [١٠/٢٤٧ ـ ٢٥٠]

ئەم فەوائیدانە کە نەوەوی ـ رحمه الله ـ فەرموویەتی بەعزێکی مەنطوقی قورئانە ، بەعزێکی هی پێغەمەرە ـ ﷺ ـ بەعزێکی لە قسەو موعامەلەی عایشە ، بەعزێکی لە موعامەلەی صەفوان ، بەعزێکی لە موعامەلەی (ام مسطح) ـ رضي الله تعالى عنهم ـ موستەفاد ئەبێ .

## براءة حرم النبي ـ ﷺ ـ

١٣٢/١٠١٠ عن أنس [رضي الله تعالى عنه] أن رجلا كان يتهم بأم ولد رسول الله ـ ﷺ ـ : فقال رسول الله ـ ﷺ ـ لعلي ـ رضي الله تعالى عنه ـ إذهب فاضرب عنقه ! فأتاه عليٌّ ـ رضي الله تعالى عنه ـ فإذا هو في ركيّ يتبرَّدُ فيها . فقال له علي : اخرج ! فناوله يده ، فأخرجه ، فإذا هو مجبوب : ليس له ذكر ، فكفَّ علي عنه ، ثم أتى النبيَّ ـ ﷺ ـ فقال : يا رسول الله ! إنه لمجبوب ؛ ما له ذكر . م ـ ١٠/ ٢٥٠

تەرجەمە :

پیاوێ (متهم) بوو بە (ام ولد)ی پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمری بە ئیمامی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ كرد : بچۆ لە گەردنی بدە ! ئیمامی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی چوو ، كە تێفكری لە بیرێكا بوو خۆی فێنك ئەكردەوە ، فەرمووی : وەرە دەرەوە . دەستی گرت و هێنایە دەرەوە ، كە چاوی پێی كەوت ذەكەری برِرابوو ، وازی لێ هێناو ، چوو عەرزی پێغەمەری كرد ـ ﷺ ـ : یا (رسول الله) ئەو پیاوە ذەكەری برِراوە ، ذەكەری نی‌یە .

## حديث الأفك في أن علياً ـ رضي الله تعالى عنه ـ لم يكن في من قذف .

١٣٣/ ١٠١٠[1] عبدالله بن محمد قال : أملى عليّ هشام بن يوسف من حفظه ، قال : أخبرنا معمر عن الزهري قال قال لي الوليد بن عبدالملك [. . . .] : اَبَلَغَكَ أن عليا [رضي الله تعالى عنه] كان في من قذف عائشة [رضي الله تعالى عنها] ؟ قلت : لا [لأن عليا منزه عن أن يقول مثل قول أهل الأفك] ولكن قد أخبرني رجلان من قومك [قريش] أبو سلمة بن عبدالرحمن [بن عوف - رضي الله تعالى عنه -] وأبو بكر بن عبدالرحمن بن الحرث : أن عائشة - رضي الله تعالى عنها - قالت لهما : كان عليٌّ مُسَلِّماً [أي : ساكتا . مسلّما . أبو ذر] [مسيئا . نسخة] في شأنها ، فراجعوه [أي هشاما . عسقلاني أو الزهري . كرماني] فلم يرجع [ورواه ابن مردويه بلفظ : أن عليا ساء في شأني والله يغفر له] . خ - ٦/ ٣٣١

تەرجەمە :

عەبدوڵلای بنی محەمەد کە شێخی موسلیمە ئەڵێ : هیشامی کوڕی یوسف لەبەر پێی نووسیم : کە (معمر) لە محەمەدی کوڕی موسلیمی کوڕی شەهابی زوهری‌یەوە خەبەری داومێ ، کە زوهری ئەڵێ : وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك پێی‌وتم : ئایا ئەوەت پێگەییوە کە حەزرەتی عەلی - رضي الله تعالى عنه - لە ناو ئەوانەدا بوە کە قەذفی حەزرەتی عایشە - رضي الله تعالى عنها - یان کردوە ؟ زوهری ئەفەرموێ : وتم : خەیر . ئەمما دوو پیاو لە قەومی تۆ ، یەعنی لە قورەیش ، کە ئەبوو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمانی بنی عەوف و ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی حەرثە کە حەزرەتی (صدیقة) عایشە - رضي الله تعالى عنها - پێی فەرموون : کە عەلی - رضي الله تعالى عنه - دەرحەقی من بێدەنگ بوە .

(١) دانەر - خ - لێرەدا ژمارەی (١٠١٠)ی دووپات کردوەتەوە .

له ریوایه‌تی (ابن مردویه)دا فه‌رمووی : که عه‌لی ـ رضي الله تعالى عنه ـ ده‌رحه‌قی من خراپه‌ی کرد [که عه‌رزی پێغه‌مه‌ری کرد ـ ﷺ ـ خوا ـ عز وجل ـ ژنی بۆ تۆ قات نه‌کردوه] خوا لێی خۆش بێ .

حه‌زره‌تی عه‌لی ـ رضي الله تعالى عنه ـ به‌ری‌یه له‌وه‌ی که ده‌رحه‌ق مه‌حبووبه‌ی پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ قسه‌یێکی بێ مه‌عنا بکا ، ئه‌گه‌ر له‌وانه بوایه که قه‌ذفیان کردوه پێغه‌مه‌ر ـ ﷺ ـ ئیستیشاره‌ی پێ نه‌ده‌کرد ، حه‌زره‌تی عایشه نه‌یئه‌فه‌رموو : خوا لێی خۆش بێ .

وه‌لید به سه‌گێتی ئه‌م سوئاله‌ی له زوهری کردوه‌و زوهریش ـ رحمه الله ـ به غایه‌تی عاقلانه‌و ئه‌دیبانه جوابی داوه‌و ، ئیستیشهادی به ریوایه‌تی ذوو که‌س کردوه که وه‌لید ئیعتیمادی پێیان بوه . دووباره وه‌لید موراجه‌عه‌تی زوهری کردۆته‌وه جوابی نه‌دایه‌وه .

١٣٤/١٠١١ عن ابن أبي مليكة [عبدالله] عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ كانت تقرأ : «إذ تَلِقُونه بألسنتكم» وتقول : الوَلْق الكذب . قال ابن أبي مليكة : وكانت أعلم من غيرها بذلك ؛ لأنه نزل فيها . ح ـ ٣٣١/٦

ته‌رجه‌مه :

ئیبن و ئه‌بومولەیکه ئه‌لێ : حه‌زره‌تی عایشه ـ رضي الله تعالى عنها ـ له ئایه‌تی ئیفکا (تَلِقُونه)ی خوێندۆته‌وه . ئه‌یفه‌رموو : (وَلْق) به درۆ ئه‌لێن . ئیبن و ئه‌بی‌موله‌یکه ئه‌لێ : چونکی ئه‌م ئایه‌ته ده‌رحه‌ق به‌و نازڵ بوه ئه‌و له هه‌موو که‌س به مه‌عناو قیرائه‌تی عالمتر بوه .

١٣٥/١٠١٢ أم رومان هي أم عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت : بينا أنا قاعدة أنا وعائشة إذ ولجت امرأة من الأنصار ، فقالت : فعل الله بفلان وفعل . فقالت أم رومان : وما ذاكِ ؟ قالت : ابني فيمن حدَّث .

قالت : وما ذاكِ ؟ قالت : كذا . وكذا . قالت عائشة : سمع رسول الله ـ ﷺ ـ ؟ قالت : نعم . قالت : وابو بكر ؟ قالت : نعم . فخرَّت مغشيا عليها ، فما أفاقت إلا وعليها حمى بنافض [برعدة] فطرحت عليها ثيابها ، فغطيتها ، فجاء النبيُّ ـ ﷺ ـ فقال : ما شأن هذه ؟ فقلت : يا رسول الله أخذتها الحمى بنافض . قال : فلعل في حديث تُحُدِّثَ ؟ قالت : نعم . فقعدت عائشة ، فقالت : والله لئن حلفت لا تصدقوني ، ولئن قلت لا تعذروني ، مثلي ومثلكم كيعقوب وبنيه . «والله المستعان على ما تصفون» . قالت : وانصرف ولم يقل شيئا ، فأنزل الله عذرها ، قالت : بحمد الله لا بحمد أحد ولا بحمدك . ح ـ ٦/٣٣١

تەرجەمە :

(ام رومان)ی دایکی عائیشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرموێ : لە وەختێکا من و عایشە دانیشتبووین ژنێ لە ئەنصار هات وتی : خوا وا لە فلاّن و لو فلاّن بکا . (ام رومان) وتی : ئەوە چی بوە ؟ وتی : کورەکەی منیش لە ناو ئەوانەدایە کە ئەو قسە ئەکەن (ام رومان) وتی : ئەو قسەیە چی یە ؟ وتی : ئەوەیەو ، ئەوەیـە . عایشـە پرسی : پێغـەمەر ـ ﷺ ـ بیستوویەتی ؟ وتی : بەڵێ . وتی : ئەبوبەکـریش بیستوویـەتی ؟ وتی : بەڵێ . عائیشە کەوت و لەسەر خۆی چوو ، ئیفاقەی نەبوو ئیللا بە لەرزو تاوە نەبێ ! جلەکانم دا بەسەریاو داپۆشی .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی هات فەرمـووی : ئەمـە بۆچ وایـە ؟ عەرزمکرد : [یا رسول الله) لەرزوتا گرتوویەتی . فەرمـووی : رەنگە لەبەر ئەو قسەیە بێ کە ئەکرێ ؟ (ام رومان) وتی : بەڵێ . (ام رومان) ئەڵێ : ئەو وەختە عایشە دانیشت وتی : وەڵلاهی سوێنتان بۆ بخۆم پێم باوەڕ ناکەن ، عوذرتان بۆ بێنمەوە قەبووڵی ناکـەن ، مەثـەلی من و ئێوە

وەکوو یەعقووب و کورەکانیە . لەسەر ئەوەی کە ئێوە ئەیڵێن هەر خوایە کە ئیعانەی لێ طەلەب بکرێ .

(ام رومان) فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ گەرایەوە هیچی نەفەرموو . خوا عوذری بۆ عایشە نازڵ فەرموو . عایشە وتی : بە حەمدی خوا حەمد ئەکەم ، نە بە حەمدی خەڵق و نە بە حەمدی تۆ حەمد ناکەم .

ئەم حەدیثە لەگەڵ حەدیثەکەی پێشووا ئەبێ تەطبیق بکرێ . (علیه السلام)[1]

---

(١) دانەر ـ خ ـ (تەوفیق)ی نێوان ئەم دوو حەدیثەی بۆ مامۆستا مەلا سەلام بەجێ هێشتوە . کە ئەیشلێ (علیه السلام) مەبەستی ئەوەیە : سەلام بۆ ئەوە ، یا ئەو کارە لەسەر سەلام بێ . ئەندازێکیش کاغەزی سپی بۆ برداوە . بەڵام مامۆستا مەلا سەلام هیچی لەگەڵ نەکردوە .

# إسلام ابي ذر وفضائله
## ـ رضي الله تعالى عنه ـ

١٠١٣/١٣٦ أبو هريرة قال : قال لنا ابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] : ألا أُخبركم بإسلام أبي ذر ؟ قلنا : بلى . قال : قال أبو ذر [رضي الله تعالى عنه] : كنت رجلاً من غفار ، فبلغنا أن رجلا قد خرج بمكة يزعم أنه نبيٌّ . فقلت لأخي [أُنيس] : [إركب لي الى هذا الوادي ، فاعلم لي علم هذا الرجل الذي يزعم أنه يأتيه الخبر من السماء ، فاسمع من قوله] إنطلق الى هذا الرجل كلِّمه ، وأتني بخبره ، [فانطلق الآخر نسخة . حتى قدم مكة وسمع من قوله] . فانطلق فلقيه ثم رجع ، فقلت : ما عندك ؟ فقال : والله لقد رأيت رجلا يأمر بالخير وينهى عن الشر . [ولمسلم : رأيته يأمر بمكارم الأخلاق وكلاما ما هو بالشعر] . فقلت : لم تشفني من الخبر !

فأخذت جرابا وعصا ، [ولمسلم : أنه تزود وحمل شنة له فيها ماء] ثم أقبلتُ الى مكة ، فجعلت لا أَعْرِفُه ، وأكرهُ ان أسأل عنه ، وأشرب من ماء زمزم وأكون في المسجد [لـه ثاوى زەمزەم ئەخواردەوەو لە مزگەوتا ئەبووم] [الحرام] قال : فمرَّ بي عليّ [رضي الله تعالى عنه] فقال : كأن الرجل غريب ؟ قال : قلت نعم . قال : فانطلق الى المنزل . قال : فانطلقت معه لا يسألني عن شيْ ، ولا أخبره فلما أصبحت غدوت الى المسجد لِأسأل عنه ، وليس أحد يخبرني بشيئ عنه . قال : فمرَّ بي علي [رضي الله تعالى عنه] فقال : أما نال [آن] للرجل يعرف منزله بعد ؟ قال : قلت : لا . [فذهب به معه ، ولا يسأل واحد منهما صاحبه

عن شيْ ، حتى إذا كان اليوم الثالث فعل مثل ذلك . فأقامه علي معه ، ثم قال له : ألا تحدثني ما الذي أقدمك هذا البلد ؟ قال : إن اعطيتنى عهدا وميثاقا لترشدني فعلت . ففعل ، فأخبره . فقال : فانه حق ، وإنه رسول الله ـ ﷺ ـ فإذا أصبحت فاتبعني ، فإني إن رأيت شيئا أخاف عليك قمت كأني أريق الماء . م] ؟ ٨ ـ ١٨٢/٦ وفيه فروق لاضير فيها . فلا حاجة الى الاشارة اليها .

قال : إنطلق معي ، قال : فقال : ما أمرك ؟ وما أقدمك هذه البلدة ؟ قال : قلت له : إن كتمت علي أخبرتك . قال : فإني أفعل . قال : قلت له : بلغنا أنه قد خرج ههنا رجل ، يزعم أنه نبيٌّ ، فأرسلت أخي ليكلمه ، فرجع ولم يشفني من الخبر ، فأردت أن ألقاه ، فقال له : أما إنك قد رُشِدْتَ ؛ هذا وجهي اليه فاتبعني أُدْخلْ حيث اَدْخلُ ، فإني إن رأيت أحدا أخافه عليك قمت الى الحائط كأني أصلح نعلي ، وامض أنت ، فمضى ومضيت معه حتى دخل ودخلت معه على النبيِّ ـ ﷺ ـ .

فقلت له : اِعْرِضْ علي الاسلام ، فعرضه ، فأسلمت مكاني . فقال لي : يا أبا ذر اُكْتُم هذا الأمر ، وارجع الى بلدك ، فإذا بلغك ظهورنا فاقبل . فقلت : والذي بعثك بالحقِّ ! لاَصْرخَنَّ بِها بين أظهرهم ! فجاء الى المسجد ـ وقريش فيه ـ فقال : يا معشر قريش ! إني أشهد أن لا إله إلا الله ، وأن محمدا عبده ورسوله . فقالوا : قوموا الى هذا الصابئ ! فقاموا فَضُرِبتُ لِأموتَ ، فأدركني العباس [رضي الله تعالى عنه آخرا] فَاَكبَّ عليَّ . ثم أقبل عليهم ، فقال : ويلكم تقتلون رجلا من غِفار ومتجرُكم وممرُّكم على غِفار ؟ ! فأقلعوا عنيِّ . فلما إذ أصبحت الغد رجعت فقلت مثل ما قلت بالأمس . فقالوا : قوموا الى هذا الصابئ ! فَصُنِع مثلُ ما صنع بالامس ، وأدركني العباس ، فأكبَّ عليَّ وقال مثل

مقالته بالأمس . قال : فكان هذا أول إسلام أبي ذر ـ رحمه الله ـ ح ـ ٦/١٤ ـ ١٨٤ كمسلم بلا فرق . م ـ ٩/٣٨٤ بفرق يسير أشير الى بعضه .

**تەرجەمە :**

مەعنای حەدیثی ح ـ ٦/١٨٢ لأن فيه الفروق التي في مسلم ، ويفهم منه معنى هذا الحديث :

ئیبن و عەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی[1] : کە خەبەری مەبعەثی پێغەمەر ـ ﷺ ـ گەیی بە ئەبوذەڕی غیفاری ـ رضي الله تعالى عنه ـ بە ئونەیسی برای خۆیی وت : سواربە بچۆ بۆ ئەو (وادی) مەکەیە ، بۆم مەعلووم بکە ئەو پیاوەی کە ئەفەرموێ : کە پێغەمەرەو خەبەری لە ئاسمانەوە بۆ یێ و ، بەعزێ قسەی لێ ببیێ و لە دواییدا بێرەوە لام . براکەی رۆیی تا گەیی یە مەکەو قسەی لە پێغەمەر ـ ﷺ ـ بیست . لە دواییا گەڕایەوە بۆ لای ئەبوذەڕ ، وتی : وامدی کە ئەمر ئەکا بە مەکاریمی ئەخلاق و ، کەلامێکم لێ بیست کە شیعر نی یە . [لەگەڵ ئەنواعی شیعرا موقابەلەم کرد ، لەگەڵ هیچ نەوعێکیا رێ نەئەکەوت . وەڵڵاهی راستە لە ئیددیعاکەیا . م] ئەبوذەڕ ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : شیفای نەدام .

تێشووی کرد ، کونەلۆکەیێکی کۆنی هەڵگرت کە ئاوی تیا بوو ، رۆیی تا گەیی یە مەکە ، چوە (مسجد الحرام)ەوە ، گەڕا بۆ پێغەمەر ـ ﷺ ـ [نەیدۆزی یەوە ؛ چونکی] نایناسێ ، حەزیشی نەئەکرد کە لە

(١) لە سەرەتای حەدیثەکەوە دەفەرموێ : «ئیبن و عەباس فەرمووی : حەزئەکەن پێتان بڵێم ئەبوذەر چۆن موسوڵمان بوو ؟ ئەوانیش وتیان : بەڵێ . . .» دانەر ـ خ ـ ئەمەی نەنووسیبوو .

قورەیش بپرسێ ، تا شەوی بەسەرا هات ، پاڵکەوت ، ئیمامی عەلی ـ رضي الله تعالی عنه ـ چاوی پێی کەوت ، زانی کە غەریبە پێی فەرموو : وا بزانم کە پیاوێکی غەریبی ، ئەبوذەڕ ئەڵێ : وتم : بەڵێ . عەلی ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : لەگەڵما بێرەماڵەوە . لەگەڵیا چوە ماڵەوە ، هیچ کامێکیان لەوی تری نەپرسی کە کێی ، تا سبەینێ . لە دواییا ئەبوذەڕ ـ رضي الله تعالی عنه ـ مەتارەو تۆشوەکەی هەڵگرت و چووەوە بۆ مزگەوت .

ئەو رۆژە لەوێدا مایەوە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ نەیئەبینی ، تا ئێوارێ ئەبوذەڕ ـ رضي الله تعالی عنه ـ چووەوە ئەو جێیەی کە شەوی پێشوو لێی راکشابوو ، حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالی عنه ـ تەشریفی بەلایا رابورد فەرمووی : ئەو وەختە نەهاتوە کە پیاو جێگەو مەسکەنی خۆی بزانێ ؟ هەڵیسان و لە خزمەت خۆیا بردی ، هیچ کامیان لە رەفیقەکەی نەپرسی لە هیچ خوصووصێکەوە ، تا شەوی سێیەم . دیسان حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالی عنه ـ ئەو موعامەلەی پێشووەی لەگەڵ کردەوە ، لەگەڵ خۆیا رای گرت ، پێی فەرموو : بۆ پێم ناڵێی کە چی تۆی هێناوەتە ئێرە ؟ عەرزی کرد : ئەگەر عەهدو میثاقم لەگەڵ ئەکەی کە بمگەیێنی بە مەرامم پێت ئەڵێم . عەهدو میثاقی بۆ کردو ئەویش مەقصوودەکەی خۆی خەبەردایێ .

عەلی ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : کە ئەو حەقەو ، رەسوولوڵڵایە ـ ﷺ ـ کە رۆژت لێبوەوە شوێن من بکەوە ، ئەگەر شتێکی وام بینی کە لێی بترسم لەبەر تۆ ، رائەوەستم وەکوو ئیشی سەراوی بچکۆلە بکەم [وەك کەوشەکەم رێك بخەم] کە رۆییم دووبارە شوێنم بکەوەرەوە ، تا ئەچیتە ئەو جێیەی کە من ئەیچمێ . ئەبوذەڕ

ـ رضي الله تعالى عنه ـ واى كرد تا عەلى چوە حوزووری پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئـەبوذەڕیش ـ رضي الله تعـالى عنهما ـ لـە خذمـەتیا چـوە حـوزووری سـەعادەت ـ ﷺ ـ قسـەی لە پێغـەمەر ـ ﷺ ـ بیست هـەر لەو جێیـە موسوڵمان بوو .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمری پێ فەرموو : ئەمە کەتم بکە ، بگەڕێرەوە بۆ لای قەومەکەت خەبەریان بدەرێ ، تـا ئەمـری منت بۆ یێ ، کـە ئەوەت پێگەیی کە ئیشی ئێمە ظوهووری کردوە بێرەوە . ئەبوذەڕ ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ قەسەم بەو ذاتەی کە تۆی بە حەق ناردوە ! لەناویانا بە دەنگی بەرز بانگ ئەکەم . چوە دەرێ تا گـەیی یە مـزگەوت ، بـە دەنگی بەرز بـانگی کرد : ئـەی جەمـاعەتی قورەیش ! (أشهد أن لا إله إلا الله ، وأن محمدا رسـول الله) قورەیش وتیان : ئادەی هەڵسن بۆ ئەو لەدین وەرگەڕاوە ! هەڵسان و لێیان دا پاڵیان خست . [لە ریوایەتەکەی ترا : هەڵسان و لێیـان دام تا بمـرم] عەبـاس ـ رضي الله تعالى عنه ـ هات و خۆی دا بە سەریا ، فەرمووی : بە هیلاکا بچن ! بۆ نازانن کە ئەمە لە غیفارە ، رێی تیجارەتتان بۆ شـام بەسـەر ئەوانەوەیە ؟ نەجاتی دا لێیان .

لە دواییا سبەینێش وای کردو ، قورەیش هوجوومیان کردەسەرو ، حەزرەتی عەباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ خۆیی بەسەرا خست . [ئیبن و عەباس ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرمـوێ : ئەمـە ئەووەڵی ئیسـلامی ئەبوذەڕە] ئەبوذەڕ ـ رضي الله تعالى عنه ـ تـەشریفی گـەڕایەوە بـۆ ناو قەومەکەی . ئونەیسی برای و دایکی و گەلێ لە قەومەکەی موسوڵمان بوون ـ رضي الله تعالى عنهم ـ قسطلاني . ح ـ ٦/١٨٢

**١٠١٤/١٣٧ عبدالله بن الصامت قال : قال أبو ذر ـ رضي الله تعالى**

عنه ـ : خرجنا من قومنا غفار ، وكانوا يُحِلون الشهر الحرام [اى : يَكُوچون[1] تلك الأشهر . رشيد] فخرجت أنا ، وأخي أنيس ، وأمنا ، على خال لنا ، فأكرمَنا خالُنا ، وأحسن إلينا ، فحسدَنا قومُه ، فقالوا : إنك إذا خرجت عن أهلك خالف إليهم أُنيس ! فجاء خالنا فنثا [أى : أفشى] علينا الذي قيل له . فقلت له : أما ما مضى من معروفك فقد كدرتَهُ ، ولا جماع لك فيما بعد ، فقرَّبْنا صرمتنا [القطعة من الابـلِ ، وتطلق أيضا على القطعة من الغنم . نووي] فاحْتملنا عليها ، وتغطَّى خالنا ثوبه ، فجعل يبكي . فانطلقنا حتى نزلنا بحضرة مكة ، فنافر أنيس عن صرمتنا ، وعن مثلها . فأتينا الكاهن ، فخيَّر أُنيسا ، فأتانـا أُنيس بصرمتنا ومثلها معها . [المنافرة : المفاخرة والمحاكمة إلى من يُفَضِّل أحد المتحاكمين على الآخر . أو شعر أحدهما على شعر الآخر . من نووي]

قال : وقد صليت ـ يا ابن أخي ـ قبل أن ألقي رسول الله ـ ﷺ ـ بثلاث سنين . قلت : لمن ؟ قال : لله . قلت : فأين تـوجَّهُ ؟ قـال : أتوجه حيث يوجهني ربي ـ عز وجل ـ أصلي عشاء حتى إذا كان من آخر الليل أُلقيت كأني خفاء ، حتى تعلوني الشمس .

فقال أُنيس : إنَّ لي حاجةً بمكة فاكفني . فانطلق أنيس ، حتى أتى مكة . فراث عليَّ [أي : أبطأ] ثمَّ جاء . فقلت : ما صنعت ؟ قال : لقيت رجلا بمكة على دينك ، يزعم أن الله أرسله . قلت : فما يقـول الناس ؟ قال : يقولون : شاعر ، كاهن ، ساحر . . . وكان أُنيس احد الشعراء . قال أُنيس : لقد سمعت قول الكهنة فما هو بقولهم ، ولقد

---

(١) رەنگە هەر بۆخۆشی کۆچی کوردیی بە عەرەبی نووسیبێ ، دیارە هەر لەبەر ئەوەیشە ناوی خۆی نووسیوە ، کە کەم جار ئەمە ئەکا .

وضعت قوله على أقراء [طرقه] الشعر ، فما يلتئم على لسان أحد بعدي أنه شعر ، والله إنه لصادق ، وإنهم لكاذبون .

قال : قلت : فاكفني حتى أذهب فأنظر . قال : فأتيت مكة ، فتضعفت رجلا منهم ، فقلت : أين هذا الذي تدعونه الصابئ ؟ فأشار إليَّ ، فقال : الصابئ . فمال إليَّ أهل الوادي بكل مدرة وعظم حتى خَرَرْتُ مغشيا عليَّ . قال : فارتفعت حين ارتفعت كأني نصب أحمرُ . قال : فأتيت زمزم ، فغسلت عنيِّ الدماء ، وشربت من مائها ، ولقد لبثت ـ يا ابن أخي ـ ثلاثين بين يوم وليلة ما كان لي طعام إلا ماء زمزم ، فسمنت حتى تكسرت عُكَن بطني ، وما وجدت على كبدي سخفة جوع [ضعفه] فبينا أهل مكة في ليلة قمراء إِضْحيان [مضيئة] إذ ضرب على أسمختهم [اصمختهم] ، فما يطوف بالبيت أحد وامرأتين [وامرأتان . نسخة] منهم تدعوان أسافاً ، ونائلة . قال : فأتتا عليَّ في طوافهما . فقلت : أنكحا احدهما الاخرى . قال : فما تناهتا عن قولهما حتى . قال : فأتتا عليَّ ، فقلت : هَنَّ مثل الخشبة ، غير أنيِّ لا أُكَني ، فانطلقتا تولولان وتقولان : لو كان ههنا أحد من أنفارنا !

قال : فاستقبلهما رسول الله ـ ﷺ ـ وأبو بكر ـ وهما هابطان ـ قال : ما لكما ؟ قالتا : الصابئ بين الكعبة وأستارها . قال : ما قال لكما ؟ قالتا : إنه قال لنا كلمة تملأ الفم . وجاء رسول الله ـ ﷺ ـ حتى استلم الحجر وطاف بالبيت هو وصاحبه ، ثم صلى ، فلما قضى صلاته ـ قال أبو ذر ـ : فكنت أنا أول من حياه بتحية الاسلام . فقلت : السلام عليك يا رسول الله . فقال : وعليك ورحمة الله . ثم قال : من أنت ؟ قلت : من غفار . قال : فأهوى بيده ، فوضع أصابعه على جبهته ، فقلت في نفسي : كره أن انتميت إلى غفار . فذهبت آخذ بيده ، فَقَدَعني

صاحبه [اى : كفَّني] ـ وكان أعلمَ به مني ـ ثم رفع رأسه ثم قال : متى كنت ههنا ؟ قال : قد كنت ههنا منذ ثلاثين بين ليلة ويوم . قال : فمن كان يطعمك ؟ قال : قلت : ما كان لي طعام إلا ماء زمزم ، فسمنت حتى تكسرت عكن بطني ، وما أجد على كبدي سخفة جوع . قال : إنها مباركة ، إنها طعام طُعْم [أى : تشبع شاربها كما يشبعه الطعام]

فقال أبو بكر [رضي الله تعالى عنه] : يا رسول الله ائذن لي في طعامه الليلة . فانطلق رسول الله ـ ﷺ ـ وأبو بكر ـ رضي الله تعالى عنه ـ وانطلقت معهما ، ففتح أبو بكر [رضي الله تعالى عنه] بابا فجعل يقبض لنا من زبيب الطائف . فكان ذلك أول طعام اكلته بها ، ثم غبرت ما غبرت [بقيت ما بقيت] ثم أتيت رسول الله ـ ﷺ ـ فقال : إنه قد وجهتُ إلى أرض ذات نخل لا أُراها إلا يثرب ، فهل أنت مبلغ عني قومك ؟ عسى الله أن ينفعهم بك ، ويأجرك فيهم !

فأتيت أُنيسا ، فقال : ما صنعت ؟ فقلت : صنعت أني قد أسلمت وصدَّقتُ ، قال : ما بي رغبة عن دينك ، فإني قد أسلمت وصدَّقتُ . فأتينا أمنا ، فقالت : ما بي رغبة عن دينكما فإني قد أسلمت وصدقت . فاحتملنا [اي : حملنا أنفسنا ومتاعنا على إبلنا وسرنا] حتى أتينا قومنا غفارا ، فأسلم نصفهم ، وكان يؤمهم أيماء بن رحضة الغفاري ، وكان سيدهم ، وقال نصفهم : إذا قدم رسول الله ـ ﷺ ـ المدينة أسلمنا فقدم رسول الله ـ ﷺ ـ المدينة فأسلم نصفهم الباقي .

وجاءت أسلمُ فقالوا : يا رسول الله إخوتنا تُسْلِمُ على الذي أسلموا عليه ، فأسلموا ، فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : غفار غفر الله لها ، وأسلم سالمها الله . م ـ ٩/ ٣٧٩ .

وفي أخرى : قلت : فاكفني حتى أذهب فأنظر ، قال : نعم ، وكن على حذر من أهل مكة فإنهم قد شنفوا له وتجهموا . م ـ ٩/ ٣٨٤ . [أي أبغضوه وقابلوه بوجوه غليظة كريهة . نووي] .

وفي أخرى عنه : صليت سنتين قبل مبعث النبيِّ ـ ﷺ ـ وفيها : فتنافروا إلى رجل من الكُهَّان ، قال : فلم يزل أخي أُنيس يمدحه حتى غلبه ، فأخذنا صرمته ، فضممناها إلى صرمتنا ، وفيها : وصلى ركعتين خلف المقام . وفيها : قلت مذ خمسة عشر . وفيها : أتْحِفْني بضيافة الليلة . م ـ ٩/ ٣٨٤ .

وبين حديث عبدالله بن الصامت وحديث ابن عباس مباينة ظاهرة . ولا بد من التوفيق بينهما ؛ لأنهما صحيحان ، ولم يتكلم فيه النووي بكلمة ، وليس حديث عبدالله بن الصامت في البخاري . رشيد بابان .

تەرجەمە :

عەبدوڵڵای کوڕی صامیت ئەڵێ : ئەبو ذەڕی غیفاریی ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : قەومەکەمان ، کە غیفارە ، لە شەهری حەراما کۆچیان ئەکرد ، من و ئونەیسی برام و دایکم کۆچمان کرد لای خاڵمان دابەزین ، خاڵمان ئیکرامی گرتین ، چاکی ی لەگەڵ کردین ، قەومەکەی حەسەدیان پێ بردین ، وتیان : تۆ کە لەماڵ چوویتە دەرێ ئونەیس لە دوای تۆ چوە لای ئەهل و عەیالەکەت ، [یەعنی بۆ ئیشی خراپە] خاڵم هات ئەوی کە دەرحەق ئونەیس وترابوو لای ئێمە ئیفشای کرد . پێم وت : ئەو چاکی یەی کە تا ئێستە لەگەڵ ئێمەتا کرد لێڵت کرد . [یەعنی بە عەفوات دا ، قیمەتی نەما ؛ چونکی ئیفتیرای قەومەکەت ، کە لەبەر حەسەد بە ئونەیسیان کردبوو ، قەبووڵت کردو بە بێ ئەمە تەحقیقی

بکەی پێت بروا کردن داتەرِوومان] ئیتر لەمەولا لەگەڵ تۆ ئیجتیماعمان نابێتەوە ؛ [چونکی لێمان کەوتوویتە شوبهەوە] .

وشترەکانمان هێناو بارمان کردو سواری بووین ، خاڵم جلەکەی لە خۆیەوە پێچاو ، دەستی کرد بە گریان . رۆیین تا لە حەضرەتی مەکەدا دابەزین ، ئونەیس لەگەڵ شاعیرێکا گرەویان کرد لەسەر وەشترەکانمان و ئەوەندەی تر [یەعنی ئەگەر شیعری ئونەیس چاتر بوو بە قەد وشترەکانمان . وشترمان بداتێ ، ئەگەر شیعری ئەو باشتر بوو وشترەکانی خۆمانی بداتێ] چووینە لای کاهینێ ئونەیس هەر مەدحی ئەو کاهینەی کرد [یەعنی شاعیرەکەی تریش مەدحی کرد] کاهینەکە شیعری ئونەیسی پەسەن کرد . ئونەیس وشترەکانی خۆمان و ئەوەندەی تری بۆ هێناین .

عەبدوڵڵا ئەڵێ : ئەبو ذەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئەی کوری برای خۆم ! سێ ساڵ لە پێش ئەمە کە بە خلمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ بگەم . لە رایوایەتەکەی دواوە ئەفەرموێ : دوو ساڵ لە پێش مەبعەثی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ نوێژم ئەکرد [موناقاتیان نی یە ؛ چونکی وای لێ یێ کە دوو ساڵ لە پێش مەبعەثاو ساڵێکیش دوای مەبعەث کە ئەکا سێ ساڵ ، لە پێش بەحوضوورگەیین نوێژم کرد] (ابن الصامت) ئەڵێ : وتم : نوێژت بۆ کێ ئەکرد ؟ فەرمووی : بۆ خوا . عەرزم کرد : رووت ئەکردە کوێ ؟ فەرمووی : بۆ ئەو جێیەی کە خوا رووی پێ کردمە ئەوێ ـ عز وجل ـ نوێژی خەوتنانم ئەکرد تا ئاخری شەو ئەبوو . ئەو وەختە وەك جل لێی ئەکەوتم تا رۆژم بەسەرا بەرز ئەبۆوە .

[لێرەدا موناقات دەستپێ ئەکا ئاگامان لە خۆمان بێ بۆ دەفعی ـ بتوفیق الله تعالى ـ لە دوای ئەمە ، وەك لە حەدیثەکەی ئیبن و عەباسایە ، ـ رضي الله تعالى عنهما ـ کە ئەبو ذەر خەبەری مەبعەثی

گەیی پێ و بە ئونەیسی وت : بچۆ بۆ طەرەفی مەکە خەبەری ئەو پیاوە کە ئەفەرموێ : خەبەرم لە ئاسمانەوە بۆ یێ . . الـخ] ئونـەیس وتی : لە مەکە ئیشێکم هەیە تۆ ئیشی ئێرەم لە کۆڵ بخە . ئونەیس لێیدا رۆی بۆ طەرەفی مەکە ، درەنگی پێ چوو لە دواییدا هاتەوە پێم وت : چیت کرد ؟ [یەعنی خەبەری ئەو پیاوەت تەحقیق کرد یان نا ؟] وتی : پیاوێکم دی لەسەر دینی تۆیە ، ئەفەرموێ : کە خوا ـ عز وجل ـ ناردوویەتی . وتم خەڵق ئەڵێن چی ؟ وتی : ئەڵێن : شاعیرە ، کاهینـە ، ساحیـرە . . . ئونەیس خۆی لە شوعەرا بوو ، وتی : قسەی کوڵێنانیم بیستوە ، قسەی ئەو پیاوە وەك قسەی ئەوان نی یە . قسەکەییم تەطبیق کرد بەسەر ئەنواعی شیعرا ، لەگەڵ شیعری هیچ شاعیرێکی غەیری من رێناکەوێ کە شیعر بێ . [خۆمنیش لام موحەقەقە کە شیعر نی یە] وەڵڵاهی ئەو پیاوە راستەو ئەوان درۆزنن .

ئەبوذەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : بە ئونەیسم وت : تۆ ئیشی ئێرەم بۆ بگرەرە سەرخۆت ، تا بچم تێفکرم . فەرمووی : چوومە مـەکە ، لـە مەکـەیی پیاوێکم بـە ضەعیف زانی کـە نـەتـوانێ زەرەرم پێ بگەیێنێ . پێم وت : ئەو پیاوە کە ئێوە پێی ئەڵێن کە لە دین وەرگەڕاوە لە کوێیە ؟ ئەو پیاوە ئیشارەتی منی کردو وتی : ئەمە لە دین وەرگەڕاوەیە ! ئەهلی مەکە روویان تێکردم بـە هەمـوو بەردو ئێسقـان لێیان دام تـا بە بێهۆشی کەوتم ، وەختێ کـە هەڵسـام چۆن هـەڵسام ؟ وەك بتێ کـە حەیوانی بۆ سەرەبرن و خوێنی حەیوانەکەی تێ هەڵسوون . . لە خوێنا وا سوور بووبووم ! فەرمووی : چوومە لای زەمزەم ، خوێنەکەم لە خۆم

شتو له ئاوی زەمزەمم خواردەوە .

ئەی کوڕی برای خۆم ! سی شەوو ڕۆژ [یەعنی پانزەشەوو پانزە ڕۆژ] لەوێدا مامەوە غەیری ئاوی زەمزەم هیچ طەعـامم نەبـوو ، پێی قەڵەو بووم ، تا لـۆچی زکم داکەوت ، لـەسەر جـەرگم هیچ حیسی برسێتیم نەکرد . شەوێکی مانگەشـەوی ڕووناك بـوو ، ئەهـلی مەکـە هەموو مۆر نرابوو بەسەر گوێیاناو خەویان لیّ کەوتبوو ، هیچ کەس نەبوو کە طەوافی بەیت بکا . دوو ژنم دی لەوان لە طەوافا ، هاواریان ئەکردە (نائیلە)و (ئەساف) ـ کە دوو بتی مەکەیین ـ لێیان ئـەپاڕانـەوە . کە لـە طەوافەکەیانا گەیینە لای من ، پێم‌وتن : یەکێکیان لەوی تـریان مـارە بکەن !

ئـەبوذەر ـ رضي الله تعـالى عنه ـ فـەرمووی : بـەوە لـە قسـەو پاڕانەوەی خۆیان نەکەوتن . فـەرمووی : دووبـارە هاتنـەوە بەلامـا ، پێم‌وتن : هینێکی وەکـوو دار ڕەق ! ئەوەنـدەی هـەیـە بـە کینـایـەت نەموت . [یەعنی بە صەراحەت پێم‌وتن : کێرێکی ڕەقی وەك دارتان بە کوز !]

دەستیان کرد بە وەلوەلەو بانگیان‌کرد : ئاخ کاشکی یەکێکمان لە قەومەکانمان لە لا بوایە ! فەرمووی : لەو وەختـەدا پێغەمـەر ـ ﷺ ـ و ئـەبوبـەکر ـ رضي الله تعـالى عنه ـ لـە سەعیی بـەینی صەفـاو مـەروە ئـەهاتنـەوە ، پێغەمـەر ـ ﷺ ـ و ئەبـوبـەکـر ـ رضي الله تعـالى عنـه ـ بەرەوپیریان چوون . پێغەمەر ـ ﷺ ـ پێی فەرموون : چیتان لیّ‌قەوماوە ؟ وتیان : لەدین‌وەرگەڕاوێ وا لە بەینی کەعبەو سەتری کەعبەدا . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : چی پیّ‌وتن ؟ وتیان : کەلیمەییێکی وای پیّ وتین لە دەما جێی نابێتەوە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی هاتو دەستی موبارەکی

هێنا بەسەر (حجر الاسود) او طەوافی کرد . دوو رکاتی لە پشت مەقامەوە کـرد ، کە نـوێژەکـەی تەواوکـرد ئـەبـوذەر - رضي الله تعـالی عنـه - فەرمووی : ئەوەڵ کەسێ کە بە تەحییەتی ئیسلام تەعظیمی کردبێ من بووم . عەرزم‌کرد : (السلام علیك یا رسول الله) فەرمووی : (وعلیك ورحمة الله) . لە دواییا فەرمووی : تۆکێی ؟ عەرزم‌کرد کە : لە غیفارم . فەرمووی : کە وام‌وت دەست‌و پەنجەی نایە ناوچاوانی ، لەبەرخۆمەوە وتم : رەنگە لای ناخۆش بێ کە لە غیفار بم . چووم کە دەستی بگرم رەفیقەکەی مەنعی کردم نەیهێشت ؛ چونکی ئەو ئەوی لە من چاتر لێ مەعلووم بوو ، لە دواییدا سەری هەڵبری‌و فەرمووی : لە کـەیەکـەوە لێـرەی ؟ وتی : لـە سی شـەوو رۆژەوە [یـەعنی لــە پـانــزە رۆژەوە] فەرمووی : کێ طەعامی ئەدایتێ ؟ وتی : وتم : غەیری ئاوی زەمزەم هیچ طەعامم نەبوە ، قەڵەو بووم تا شۆلاوگەی زگم داکەوت ، لەسەر جـەرگم هیچ زەحمـەتی برسییێتیم نـەبوو . فـەرمووی : ئـاوی زەمزەم موبارەکە ، ئاوێکە ئینسان تێرەکا .

ئەبوبەکر - رضي الله تعالی عنه - عەرزی‌کرد : (یـا رسول الله) ئیذنم بدە ئیمشەو طەعامی بدەمێ . پێغەمەر - ﷺ - و ئەبوبەکر - رضي الله تعالی عنه - منیش لە خذمەتیانا ، چووین . ئەبوبـەکر - رضي الله تعالی عنه - قاپێکی کردەوە ، بە مست مێوژی طائیفی ئەداینێ . ئـەوە ئەوەڵ طەعامێکە لە مەکەدا خواردم . لە دواییدا ئـەوەندە مـامەوە کـە مـامەوە . لـە پاشـانا چـوومە خـذمەت پێغـەمەر - ﷺ - فـەرمووی : ئەرزێکی صاحیب خورمام پێ نیشان دراوە ، لام وایە غەیری مەدینە هیچ جێی تر نی‌یە . ئایا لە منەوە تەبلیغی قەومەکەت ئەکەی ؟ ئومێدم وایە کە بە واسیطەی تۆوە خوا نەفعیان بداتێ‌و ، لەوەدا ئەجریش بدا بە تۆ .

چوومه لای ئونەیس ، وتی : چیت‌کرد ؟ وتم : ئەوەم کرد که موسوڵمان بووم و تەصدیقم کرد . ئەویش وتی : هیچ شتێکی وام نی یە کە لە دینی تۆ ئیعراض بنێم ، منیش موسوڵمان بووم و باوەرم کرد . هەردوکمان چووینە لای دایکمان ، ئەویش وتی : هیچی وام لە دڵا نی یە کە لە دینی ئێوە لادەم ، منیش موسوڵمان بووم و تەصدیقم کرد .

بارمان‌کردو چووینە ناو قەومەکەمان کە غیفارە ، نیوەی موسوڵمان بوو ، ئیمای کوری رەحەضە ، کە رەئیسیان بوو ئیمامەتی بۆ ئەکردن . نیوەکەی تری وتیان : کە پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی چوو بۆ مەدینە موسوڵمان ئەبین . نیوەکەی تریشی کە پێغەمە ر - ﷺ - تەشریفی چوو بۆ مەدینە موسوڵمان بوون . ئەسلەمیش هاتن وتیان : (یا رسول الله) . غیفار لەسەر چی موسوڵمان بوون برادەرانی ئێمەیش لەسەر ئەوە موسوڵمان ئەبن . ئەوانیش موسوڵمان بوون . ئەو وەختە پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : غیفار خوا لێیان خۆش بێ ، ئەسلەم خوا سەلامەتیان بکا .

ئیمجا بێینەوە سەر موبایەنەتی ئەم حەدیثە لەگەڵ حەدیثەکەی ئیبن و عەباس - رضي الله تعالى عنهما - نەوەوی - رحمه الله تعالى - هیچ بەحثی لە ئیشکالی ئەم حەدیثە نەکردوە . لە بوخاریشا نی یە تا قەسطەلانی قسەی لێ بکا .

لەم حەدیثەدا ئەفەرموێ : ئەبوذەر لە (مسجد الحرام)ا بوو ، پێغەمەر و ئەبوبەکر - ﷺ ، ورضي عنه - تەشریفیان بۆ طەواف چوە (مسجد الحرام)و چاویان پێی کەوت و ، ئەبوبەکر - رضي الله تعالى عنه - بردنی یە ماڵێ و طەعامی دانێ . ئەفەرموێ : ئەو مێوژە ئەوەڵ طەعامێکە کە لە مەکەدا خواردوومە .

لە حەدیثەکەی ئیبن و عەباسا - رضي الله تعالى عنهما -

ئەفەرموێ : حەزرەتی عەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە مزگەوتا چاوی پێی کەوت و سێ شەو بردی یە ماڵێ ، تا سێ شەو بەم نەوعە ، شەوی سێیەم لێی پرسی ، کە زانی بۆ چی هاتوە بۆ سبەینێ بردی یە خـذمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ دیارە ئەو سێ شەوە حەزرەتی عـەلی ـ رضي الله تعالى عنه ـ میوانداریی کردوە ، گینا فایدەی چی یە بیباتە ماڵی خۆیان ؟

ئەگونجێ موڕادی حەزرەتی عەلی لە لەفظی سبەینێ ئاخری شەوی سێیەم بێ کە وەقتی سەحەرە ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ لەو وەختەدا تەشریفی چۆتە طەواف حەزرەتی عەلی لە (مسجـد الحرام)ا (زبیـری)[1] بردبێتـە خدمەتی ، نیهایەت تەصادوفی پێش تەشریفی پێغەمەر بووبێ ـ ﷺ ـ ئەو شەوە دوای ئەمە کە لە طەواف و نوێژ بوونەوەو نوێژی سبەینێ حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ دەعوەتی کردبنە ماڵەوە .

مەعنای ئەو پارچەپارچانەی کە موسلیم لە حەدیثەکانی ترا ریوایەتی ئەکا :

ئەبوذەر ئەفەرموێ : وتم : ئیشی ئێرەم بگرەرە سەر خۆت ، تا بچم تێفکرم . ئونەیس وتی : بەڵێ . ئەمما خـۆت بپارێـزەو وریا بـە ، چونکی ئەهلی مەککە ئەیبوغضێنن و بە شتی نالایەق موقابەلەی ئەکەن .

عەبدوڵڵای کوڕی صامیت ئەفەرموێ : ئەبوذەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئەی کوڕی برای خـۆم دوو ساڵ لـە پێش مەبعـەثی پێغەمەرا ـ ﷺ ـ نوێژم ئەکرد .

---

(١) هەروا نووسراوە بەڵام دیارە هەڵەیەو راستی یەکەی (ئەبو ذەر)ە . هەروەها دانەر وەك دڵی ئاوی نەخواردبێتەوە وایە ، بۆیە هەندێکی لە لاپەڕەکـە بە سپێتی برداوە .

چوونه لای پیاوێکی کوڵەنانی ، ئونەیس هەر مەدحی کرد تا بەسەر شاعیرەکەی ترا غاڵب بوو ، وشترەکانی ئەوی عەلاوەی وشترەکانی خۆمان کرد .

پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی هاتو ، طەوافی بەیتی کردو ، دوو رکات نوێژی لە پشت مەقامەوە کرد . چوومە خدمەتی و ئەوەڵ کەسێکم کە بە تەحی یەتی ئیسلام تەعظیمی کردبێ . وتم : (السلام عليك يا رسول الله) فەرمووی : (وعليك) تۆ کێی ؟

فەرمووی : لە کەیەکەوە لێرەی ؟ عەرزم کرد : لە موددەی پانزەوە . ئەبوبەکر فەرمووی : پێم ببەخشە کە ئیمشەو ضیافەتی بۆ بکەم .

حەدیثی زەیدی بنی عەمری کوڕی نوفەیلی ئامۆزای ئیمامی عومەر ، باوکی سەعید کە لە (عشرەی مبشرە)یە - رضي الله تعالى عنهم - . ئیختیلاف لە نوبووەتیا هەیە .

**١٠١٥/١٣٨** عن عبدالله بن عمر - رضي الله تعالى عنهما - أن النبي - ﷺ - لقي زيد بن عمرو بن نفيل بأسفل بَلْدَح [واد بمكة] قبل أن ينزل على النبي - ﷺ - الوحي ، فقدمت إلى النبي - ﷺ - سفرة [لقريش] فأبى [زيد - رضي الله تعالى عنه -] أن يأكل منها . ثم قال زيد : إني لا آكل مما تذبحون على نصابكم ، إلا ما ذكر اسم الله عليه . وإن زيد بن عمرو كان يعيب على قريش ذبائحهم ، ويقول : الشاة خلقها الله ، وأنزل لها من السماء الماء ، وأنبت لها من الأرض ، ثم تذبحونها على غير اسم الله ! إنكارا لذلك ، وإعظاما له . ح - ١٦٥/٦ ، ١٦٦ ، وفي الصيد والذبايح . ن .

١٣٩/١٠١٦ وعنه : أن زيد بن عمرو بن نفيل خرج إلى الشام يسأل عن الدين ، ويتبعه [ويبتغيه . كش] فلقي عالما من اليهود ، فسأله عن دينهم ، فقال : إني لَعليَّ اَن اَدين دينكم ، فأخبرني . فقال : لا تكون على ديننا حتى تأخذ بنصيبك من غضب الله . قال زيد : ما أفِرُّ إلاّ من غضب الله ، ولا أحمل من غضب الله شيئا أبدا وأنا أستطيعه ، فهل تدلني على غيره ؟ قال : ما أعلمه إلا أن يكون حنيفا . قال زيد : وما الحنيف ؟ قال : دين إبراهيم ؛ لم يكن يهوديا ولا نصرانيا ، ولا يعبد إلا الله ، فخرج زيد فلقيَ عالما من النصارى ، فذكر مثله ، فقال : لن تكون على ديننا حتى تأخذ بنصيبك من لعنة الله . قال : ما اَفِرُّ الاّ من لعنة الله ، ولا أحمل من لعنة الله ولا من غضبه شيئا أبدا وأنا مستطيع ، فهل تدلني على غيره ؟ قال : ما أعلم إلا أن يكون حنيفا ، قال : وما الحنيف ؟ قال : دين إبراهيم لم يكن يهوديا ولا نصرانيا ، ولا يعبد إلا الله . فلما رأى زيد قولهم في إبراهيم ـ عليه الصلاة والسلام ـ خرج ، فلما برز رفع يديه ، فقال : اللهم إني أشهد أني على دين إبراهيم ح ـ ٦/١٦٦ .

ئەم دوو حەدیثە مورسەلی صەحابین ؛ چونکە عەبدوللا ئەو وەختە لە دنیادا نەبوە .

١٤٠/١٠١٧ عن أسماء بنت أبي بكر [معلق ، وصله أبو بكر بن أبي داود] ـ رضي الله تعالى عنها ـ قال : رأيت زيد بن عمرو بن نفيل قائما ، مسندا ظهره إلى الكعبة ، يقول : يا معاشر قريش والله ! ما منكم على دين إبراهيم غيري . وكان يحي الموؤدة ، يقول للرجل ـ إذا أراد أن يقتل ابنته ـ : لا تقتلها اَنا أكفيكها مؤنتها ، فيأخذها ، فإذا ترعرعت [نشأت]

قال لأبيها : إن شئتَ دفعتها إليك ، وإن شئت كفيتك مؤنتها .
ح - ١٦٦/٦ .

[روى البزار والطبراني من حديث سعيد بن زيد خرج زيد بن عمرو وورقة يطلبان الدين ، حتى أتيا الشام ، فتنَصَّر ورقة ، وامتنع زيد ، فأتى الموصلَ ، فلقي راهبا فعرض عليه النصرانية ، فامتنع . . الحديث . وفيه : فسألت أنا وعمر رسول الله - ﷺ ، ورضي عنهما - عن زيد ، فقال : غفر الله له ورحمه ، فإنه مات على دين إبراهيم . [عليه الصلاة والسلام قسطلاني]

عامر بن ربيعة قال : قال لي زيد بن عمرو : إِني خالفت قومي ، واتَّبعت ملة إبراهيم وإسماعيل وما كانا يعبدان ، وأنا أنتظر نبيا من بني إسماعيل ، ولا أُراني أدركه ، وأنا أومِنُ به وأُصدقه ، وأشهد أنه نبيٌّ ، وإِنْ طالتْ بك حياة فاقرأه مني السلام . قال عامر : فلما أسلمت أعلمت النبيَّ - ﷺ - خبره ، قال : فرد عليه السلام وتَرحَّم عليه . وقال : لقد رأيته في الجنة يسحب ذيولا .

وفي رواية أبي أسامة : سئل النبيُّ - ﷺ - عن زيد ، فقال : يبعث يوم القيامة أمة وحده ، بيني وبين عيسى بن مريم .

وروى أبو عمرو : أنه كان يقول : يا معشر قريش إياكم والربا ! فإنه يورث الفقر .

وروى الزبير بن بكّار من طريق هشام بن عروة ، قال : بلغنا أن زيدا كان بالشام ، فبلغه مخرج النبيِّ - ﷺ - فأقبل يريده ، فقتل بميفعة من أرض البلقاء . وقال ابن إسحاق : لما توسط بلاد لخم قتلوه .
قسطلاني ١٦٦/٦و ١٦٧ .

**تەرجەمە :**

عەبدوڵلا. کوڕی عومەر - رضي الله تعالى عنهما - . . پێغەمەر - ﷺ - لە خوار (بەلدەح) ەوە ، کە وادیێکە لە غەربی مەکەوە ، لە پێش ئەمەدا کە وەحی بۆ نازڵ ببێ ، بە زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نەوفەل گەیی - رضي الله تعالى عنه - سفرەییکیان هێنایە خذمەت پێغەمەر - ﷺ - زەید - رضي الله تعالى عنه - لێی نەخوارد فەرمووی [بەوانەی کە سفرەکەیان هێنا] : لەو حەیوانانەی کە لەسەر بتەکان بە ناوی ئەوانەوە سەری‌ئەبڕن ناخۆم و نەمخواردوە . من هەر لەو حەیوانە ئەخۆم کە لە وەختی سەربڕینا ناوی خوای لەسەر هێنرابێ .

[لەم حەدیثەدا ئەوەی تیا نی‌یە کە پێغەمەر - ﷺ - لێی خواردوە یان نا . موعامەلەی زەیدیش - رضي الله تعالى عنه - بە رەئیی خۆی و ئیجتیهادی خۆیی کردوە . لە دینی حەزرەتی ئیبراهیما - عليه الصلاة والسلام - هەر مردارەوەبوو حەرام بوە ، ئەوی کە سەربررابێ - با ناوی خوایشی لەسەر نەهێنرابێ - خواردنی دروست بوە . (أشیا) یش لە پێش وروودی شەرعا نە پێیان ئەڵێن حەرامە ، نە پێیان ئەڵێن حەڵاڵە .] قسطلاني ح - ٦/١٦٥ .

عەبدوڵلای کوڕی عومەر - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : زەیدی کوڕی نوفەیل - رضي الله تعالى عنه - لە خوصووصی حەیوان سەربڕینی قورەیش بۆ بتەکانیان عەیبی لێ ئەگرتن ، ئەیفەرموو : خوا - عز وجل - مەڕی خەلق کردوە ، لە ئاسمانەوە ئاوی بۆ بارانوون بیخۆنەوە ، لە ئەرزا گیای بۆ روانوون بیخۆن ، کەچی ئێوە پێنن لەسەر غەیری ناوی خوا [یەعنی بە ناوی بتەکانتانەوە] سەریان ئەبڕن ! بەو فەرموودەی ئینکاری فیعلی قورەیشی ئەکردو ، بە قەباحەتێکی گەورەی ئەزانی . ح - ٦/١٦٦ .

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ :
زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی چوو بۆ طەرەفی شام ؛ لە دینی ئەپرسی و بۆ دین ئەگەڕا ، تووشی عالمێکی جوولەکە بوو ، لە خوصووصی دینی جوولەکەوە لێی پرسی ، فەرمووی : بەڵکو دینی ئێوە قەبووڵ بکەم ، ئەو عالمە پێی وت : تا حیصەی خۆت لە غەضەبی خوا وەرنەگری لەسەر دینی ئێمە نابی ! زەید ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : من هەر لە غەضەبی خوا هەڕا ئەکەم ، تا بتوانم و لە دەستم بێ هیچ شتێ لە غەضەبی خوا ناگرمە سەر خۆم . دینێکی ترم پێ نیشان ئەدەی کە قەبووڵی بکەم ؟ عالمەکە وتی : غەیری دینی حەنیف هیچ دینێ تر نازانم . زەید ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : حەنیف چی یە ؟ وتی : حەنیف دینی ئیبراهیمە ـ عليه الصلاة والسلام ـ نە یەهوودیی بووە نە نەصرانی . عیبادەتی غەیری خوای نەکردوە .

زەید ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی لەوێ چوە دەرێ ، تووشی عالمێکی گاور بوو ، چی بە عالمی جوولەکەکە فەرموو بەویش وای فەرموو . گاورەکە عەرزی کرد : تا بەشی خۆت لە لەعنەتی خوا وەرنەگری نایێتە سەر دینی ئێمە . زەید ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : من هەر لە لەعنەتی خوا فیرار ئەکەم ، تا لە دەست و تاقەت و تەوانامدا بێ هیچ شتێك نە لە لەعنەتی خوا ، نە لە غەضەبی هەڵناگرم ! دینێکی ترم پێ نیشان ئەدەی ؟ گاورەکە وتی : غەیری دینی حەنیف [یەعنی دینێکی راست کە لە باطیل لای داوە] هیچ دینێکی تر نازانم . زەید ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : دینی حەنیف چی یە ؟ گاورەکە وتی : دینی حەزرەتی ئیبراهیمە ، کە نە جوولەکە بووە و نە گاور . غەیری

خوا عيبادەتی هيچ کەسی تری نەکردوە .

کە زەيد ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە عالمە جوولەکەکەو عالمە گاورەکە شەئنی حەزرەتی ئیبراهیمی بیست ـ عليه الصلاة والسلام ـ تەشريفی چوەدەرێ ، کە لە مەڵبەنديان تێپەڕ بوو هەردوو دەستی هەڵبڕی ، فەرمووی : يارەبی من شەهادەت ئەدەم کە لەسەر دينی ئیبراهیمم ـ عليه الصلاة والسلام ـ ح ـ ٦/١٦٦ .

ئەم سێ حەديثە مورسەلی صەحابين ، بە موسنەدو مەرفووع حسێبين ؛ چونکی عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنه ـ با بەو وەقعەيش نەگەييبێ ، ئەبێ لە پێغەمەری بيستبێ ـ ﷺ ـ .

ئەسمای کچی ئەبوبەکری صەديق ـ خوايان لێ رازی بێ ـ فەرمووی : زەيدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەيلم دی ـ رضي الله تعالى عنه ـ پاڵی دابووەوە بە ديواری کەعبەوە ئەيفەرموو : ئەی جەماعەتی قورەيش وەڵڵاهی ! غەيری من هيچ کەسێ لە ئێوە لەسەر دينی حەزرەتی ئیبراهيم ـ عليه الصلاة والسلام ـ نی يە .

[ئەبونەعيم ـ زەيد ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەيفەرموو : خوای من خوای ئیبراهيمە . دينی من دينی ئیبراهيمە . ]

زەيد ـ رضي الله تعالى عنه ـ مەوئوودەی زيندووئەکردەوە [بەم نەوعە] پياوێ کە ئیرادەی بوايە کە کچی خۆی بکوژێ ، پێی ئەفەرموو : مەيکوژە من ئەرکی ئەوت لە کۆڵ ئەخەم . ئەو کچەی ئەگرتە لای خۆی بەخێوی ئەکرد ، کە گەورە بوو بە باوکەکەی ئەوت : وا کچەکەت پێگەييوە ، ئەگەر هەوەست هەيە بتدەمەوە . ئەگەر هەوەست هەيە

ئەركى ئەگرمە سەرخۆم . ح - ٦/١٦٦ .

ئەم ئەثەرە (معلق)ە ، ئەبوبەكرى كوڕى ئەبوداود وەصلى كردوە ، يەعنى هەموو سيسليلەكەى تا حەزرەتى ئەسما ذيكر كردوە .

[سەعيدى (من العشرة) كوڕى زەيد - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : من و عومەر - رضي الله تعالى عنه - لە دەرحەق زەيد - رضي الله تعالى عنه - لە پێغەمەرمان - ﷺ - پرسى ، فەرمووى : خواى لێ خۆش بێ و رەحمى پێ بكا لەسەر دينى ئيبراهيم وەفاتى كرد . قسطلاني]

عاميرى كوڕى رەبيعە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : زەيدى كوڕى عەمر - رضي الله تعالى عنه - پێى فەرمووم : من موخالەفەى قەومەكەى خۆمم كردوە ، تابيعى ميللەتى ئيبراهيم و ئيسماعيل - عليهما السلام - و ئەوەى كە ئەوان ئەيان پەرست بووم . ئێستە مونتەظيرى پێغەمەرێكم لە بەنى ئيسماعيل . بڕوام وا نىيە كە بيگەمێ ، ئيمانم پێى هەيە ، تەصديقى ئەكەم ، شەهادەت ئەدەم كە پێغەمەرە ، ئەگەر عومرت درێژ بوو لە منەوە سەلامى لێ بكە .

عامير - رضي الله تعالى عنه - فەرمووى : كە موسوڵمان بووم خەبەرم دا بە پێغەمەر - ﷺ - پێغەمەر - ﷺ - رەددى سەلامەكەى كردەوەو ، رەحمەتى بۆ ناردو ، فەرمووى : لە بەهەشتا چاوم پێيكەوت كە داوێنى لە ئەرز ئەخشان .

لە سەعيدى كوڕى يەوە - رضي الله تعالى عنهما - ريوايەت كراوە : كە زەيدو وەرەقە - رضي الله تعالى عنهما - تەشريفيان چوو ، بۆ دينى حەق ئەگەڕان ، تا گەيينە شام ، وەرەقە بوو بە نەصارى و زەيد نەبوو ، زەيد تەشريفى هاتە (موصل) ، تووشى راهيبێ بوو ، دينى نەصاراى پێ نيشان دا ، قەبووڵى نەكرد .

ئەبو ئوسامە ئەڵێ : زەیدیان لە پێغەمەر پرسی ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئومەتێکی تەنهایە لە بەینی من و عیسای کوڕی مەریەما .

ئەبوعەمر ئەڵێ : زەید ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەیفەرموو : ئەی جەماعەتی قورەیش سوود مەخۆن فەقیری ئێنێ .

زوبەیری کوری بەکار ئەڵێ : کە هیشامی کوڕی عوروە فەرمووی : بە ئێمە وا گەییوە کە زەید ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە شام بوو خەبەری خورووجی پێغەمەری ـ ﷺ ـ پێگەیی ، لەوێوە رووی کردە مەکە ، لە (میفعة) شەهید کرا . قسط ١٦٧/٦ .

# فضائل سلمان

## - رضي الله تعالى عنه -

١٤١ ١٠١٨ عن أبي هريرة [رضي الله تعالى عنه] قال : قال رسول الله - ﷺ - : لو كان الدين عند الثريا لذهب به رجل من فارس ، أو قال من أبناء فارس حتى يتناوله م - ٩/٤٣٨ .

**تەرجەمە :**

ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : کە پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : ئەگەر دین لە لای (ثریا) ی پیاوێ لە ئەهلی فارس ، یا فەرمووی : لە کوڕانی فارس ، ئەیگاتێ تا وەری ئەگرێ .

عولەما ئەم حەدیثەیان بە ئیمامی ئەعظەم تەطبیق کردوە .

فەضلی سەلمانی ئەوەندە تیایە کە خەڵقی فارس بوە .

١٠١٩/١٤٢ عن أبي هريرة - رضي الله تعالى عنه - قال : كنا جلوسا عند النبيّ - ﷺ - إذ أنزلت عليه سورة الجمعة ، فلما قرأ : ﴿وآخرين منهم لما يلحقوا بهم . . .﴾ قال : [قلت : من هم ؟ بخاري] من هؤلاء يا رسول الله ؟ فلم يراجعه النبي - ﷺ - حتى سأله مرة أو مرتين أو ثلاثا . قال : وفينا سلمان الفارسي ، قال : فوضع النبيُّ - ﷺ - يده على سلمان ، ثم قال : لو كان الايمان عند الثريا لَنالَهُ رجال من هؤلاء . م - ٩/٤٣٩ . ح - ٧/٣٦٦ .

**تەرجەمە :**

ئەبوهورەیرە - رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : لە خزمەت پێغەمەرا - ﷺ - دانیشتبووین سوورەتی (جومعە) نازڵبوو ، کە ئەوەی

خوێنەوە : ﴿وآخرين منهم لما يلحقوا بهم﴾ پرسی وتی : (يا رسول الله) ئەوانە کێن ؟ پێغەمەر ـ ﷺ ـ جوابی نەدایەوە ، تا جارێ ، یا دوو جار ، یا سێ جاری پرسی . سەلمانی فارسیمان لەناوا بوو . پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەستی موبارەکی نایە سەر سەلمانو فەرمووی : ئەگەر ئیمان لە لای (ثریا) بێ بەعزێ پیاو لەمانە ئەیگاتێ .

**عن سهل ـ رضي الله تعالى عنه ـ مرفوعا** : إن في أصلاب أصلاب **أصلاب رجال من أصحابي رجالا ونساء من أمتي يدخلون الجنة بغير حساب . ثم قرأ : «وآخرين منهم** ... الآية قسطلاني **(اللهم اجعلني وملا حسينا وأهلنا منهم)** .

**تەرجەمە :**

سەهل ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : لە نەتەوەی نەتەوەی نەتەوەی منا[1] هەن . بە بێ حساب ئەچنە بەهەشتەوە . لە دوایی دا ئەم ئایەتەی جومعەی خوێنەوە «وآخرين منهم . . .» .

ئەم حەدیثانە لە موعجیزاتی [illegible] ـ ﷺ ـ ؛ چونکی لە ئەبنای فارسا زۆر پیاوی گەورەی [illegible]

(۱) لێرەدا دانەر ـ خ ـ تەرجەمەی (رجل من أصحابي) لەبیر چوە ، مامۆستا مەلاسەلام قەلەمی تێبردوەو (امتي) داناوەو ئەمیش تەواو نی یەو دەبێ بنووسرێ : (پیاوانێ لە یارانی ...)

١٠٢٠/١٤٣ عن سلمان الفارسي [رضي الله تعالى عنه] أنه تَداوَلَهُ بضعة عشر من رب إلى ربٍّ . ح - ٦/ ٢٣٠ .

١٠٢١/١٤٤ وعنه - رضي الله تعالى عنه - يقول : أنا من (رام هرمز) [مدينة من فارس] .

١٠٢٢/١٤٥ وعنه [رضي الله تعالى عنه] قال : فترة عيسى ومحمد - ﷺ - ستمائة سنة . ح - ٦/ ٢٣٠ .

**تەرجەمە :**

سەلمان - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : دەو ئەوەنـدە منيان دەستاو دەست خستوە . لە سەيدێکەوە کـەوتوومـە دەست سەيـدێکی ترەوە .

ئەفەرموێ : خەڵقی (رام هورمز)م .

ئەفەرموێ : فەترەتی بەینی عیسـاو پێغەمـەر - ﷺ - شەشصـەد ساڵە .

[لە دەست باوکی هەرا ئەکا بۆ ئەمە کە دینی حەق بدۆزێتەوە ، لەسەر دینی مەجووس بوو ، چوە لای سێ راهیب ، یەك لە دوای یەك لەگەڵیان بوو تا مردن ، راهیبی دوایی خەبەری دایە کە : پێغـەمەری حەق ظوهووری کردوە . لەگەڵ بەعزێ عەرەبی بەرانی هات کە بچێ بۆ خذمەت پێغەمەر - ﷺ - غەدریان لێ‌کرد لە (وادي القرى) فرۆتیان بە جوولەکەیێ ، ئەویش فرۆتی بە جوولەکەیێکی تر لـە بەنی قـورەیظە ، بردی بۆ مەدینە .

کە پێغەمەر - ﷺ - تەشـریفی هیجرەتی فـەرموو بـۆ مەدینـەو ، = سەلمان = چاوی بە عەلامەتی نوبووەت کەوت موسوڵمان بوو ، پێغەمەر - ﷺ - ئەمری پێکرد کە خۆی لەو جوولەکەیە بکڕێتەوە ، موکاتـەبەی

لەگەڵ جوولەکەدا کرد لەسەر ئەمە کە سێصەد دار خورمای بۆ بڕوێنێ و چل ئوقیە ئاڵتوونی بداتێ .

پێغەمەر ـ ﷺ ـ بە دەستی موبارەکی خۆی هەمووی بۆ رووان ، لە دواییدا ئەمری بە ئەصحابی کیرام فەرموو : موعاوەنەتی برای دینیی خۆتان بکەن ، موعاوەنەتیان کرد تا هەموو پارەی جوولەکەیان (تأدیە) کرد .

بە بێ خیلاف دووصەدو پەنجا ساڵ ژیا ، بەعزێك ئەڵێن : سێصەدو پەنجا ساڵ ، بەعزێ ئەڵێن : گەییوە بە وەحی حەزرەتی عیسا ـ علیه الصلاة والسلام ـ لە تەئریخی سی وشەشی هیجرەتا وەفاتی کرد ـ رضي الله تعالی عنه ـ قسطلاني .

# سلمان ، وصهيب ، وبلال

١٠٢٣/١٤٦ عن عائذ بن عمرو : أن أبا سفيان أتى على سلمان وصهيب ، وبلال - رضي الله تعالى عنهم - في نفر فقالوا : والله ما أخذت سيوف الله من عنق عدو الله مأخذها . قال : فقال أبو بكر : أتقولون هذا لشيخ قريش وسيدهم ؟ فأتى النبيَّ - ﷺ - فأخبرهم . فقال : يا أبا بكر لعلك اَغْضَبْتهم ! لئن كنت أغضبتهم لقد اغضَبْتَ ربك ! فأتاهم أبو بكر ، فقال : يا اِخوتاه ! آغضبتكم ؟ قالوا : لا ، يغفر الله لك يا أخي . م - ٩/٤١١ .

تەرجەمە :

عائيذى كوڕى عەمر ئەفەرموێ : ئەبوسوفيان بە لاى سەلمان و صوهەيب و بيلالا رابورد ، لەگەڵ جەماعەتێكا بوون ، وتيان : شيرى خوا لە گەردنى دوشمنى خوادا جێى خۆيى نەگرت ! حەزرەتى ئەبوبەكر - رضي الله تعالى عنه - = فەرمووى = : ئايا ئەم قسە ناخۆشە بە شيخێكى گەورەى قورەيش ئەڵێن ؟ تەشريفى چوە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - ئەم قسەيەى عەرزكرد . پێغەمەر - ﷺ - فەرمووى : رەنگە رقت هەڵسانبن ! ئەگەر رقت هەڵسانبن ئەوە رقي خوات هەڵسانوە ! حەزرەتى ئەبوبەكر - رضي الله تعالى عنه - تەشريفى چووە لايان ، لێى پرسين : من هيچ رقى ئێوەم هەڵسان ؟ وتيان : خەير ، خوات لێ خۆش بێ ئەي براى دينيمان .

[ئەبوبەكر - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : نەهى كراوە لەم

نەوعە عیبارەتە کە بڵێی : «لا ، یغفر الله) یا (لا ، عافاك الله) ؛ چونکی وا ئەگەیێنێ کە دۆعالێکردنە نەك دۆعابۆکردنە . یا بڵێ : (عافاك الله ، رحمك الله) هیچی تری لێ زیاد مەکە ، یا بڵێ : (لا ، وغفر الله لك) یا (لا ، وعافاك الله . نووي)]

ئەم حەدیثە فەضیلەتێکی گەورەی تیایە بۆ ئەو سێ ذاتە ؛ پیاوی وەك ئەبوبەکر رقیان هەڵبستێنێ بەوە رقی خوای لێ هەڵەستێ .

**١٤٧/١٠٢٤ جابر بن عبدالله ـ رضي الله تعالى عنهما ـ قال : كان عمر [رضي الله تعالى عنه] يقول : أبو بكر [رضي الله تعالى عنه] سيدنا ، وأعتق سيدنا . يعني بلالا . ح ـ ١٣١/٦ .**

**تەرجەمە :**

جابیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : حەزرەتی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ گەورەمانەو گەورەی ئێمەی ئازادکرد = کە بیلالە = .

**١٤٨/١٠٢٥ عن قيس أن بلالا قال لأبي بكر [رضي الله تعالى عنهم ـ بعد وفاة النبي ـ ﷺ ـ وأراد بلال الخروج من المدينة ، فمنعه أبو بكر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ إرادة أن يؤذن بمسجد المدينة ، فقال بلال : لا أريد المدينة بعد النبي ـ ﷺ ـ] : إن كنتَ إنما إشتريتني لنفسك فأمسكني ، وإن كنت إنما إشتريتني لله فدعني وعمل الله ! ح ـ ١٣١/٦ .**

**تەرجەمە :**

قەیس ئەفەرموێ : کە بیلال بە ئەبوبەکری وت : [رضي الله تعالى عنهما ـ کە حەزرەتی بیلال لە دوای وەفاتی پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەمای بوو لە مەدینە بروا ، حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ مەنعی کرد ، بۆ خاتری ئەمە کە بانگ بدا لە مزگەوتی مەدینەدا ، بیلال عەرزی کرد :

له دوای پێغەمەر ـ ﷺ ـ حەز لە مەدینە ناکەم کە تیابم] : ئەگەر منت بۆ خۆت کریوە بەندم بکە لای خۆت ، ئەگەر بۆ خوایشت کڕیوم وازم لێ بێنە ـ کە عیبادەتی خوا بکەم .

إبن عباس = حديثه سبق في العلم ، ولد بالشّعب قبل الهجرة بثلاث سنين ، وحنكه ـ ﷺ ـ وسماه ترجمان القرآن . وتوفي بالطائف ٦٨ .

خالد بن الوليد حديثه سبق في الدلائل .

سالم بن معقل حديثه سبق في فضائل القرآن .

## زبير بن العوام
### ـ رضي الله تعالى عنه ـ

١٠٢٦/١٤٩ قال إبن عباس (معلق وموقوف وصله في سورة براءة) [رضي الله تعالى عنهما] : هو حواري النبيِّ ـ ﷺ ـ وسمي الحوار يون لبياض ثيابهم (وصله إبن أبي حاتم) ح ـ ١١٧/٦ . [وقيل : لصفاء قلوبهم . وعند الترمذي عن إبن عيينة : الحواري : الناصر . قسطلاني]

تەرجەمە :

ئیبن وعەباس ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : زوبەیر ـ رضي الله تعالى عنه ـ حەواریی پێغەمەر بوو ـ ﷺ ـ . بوخاریی ئەفەرموێ : حەواریی بۆیە پێیان ئەڵێن حەواریی ؛ چونکی جلیان سپی بوە [حەواریی بە گازرکەر ئەڵێن ، بەعزێك ئەڵێن : بۆیە پێیان ئەڵێن حەواریی ؛ چونکی دڵیان صاف بوە . ترمذی ئەڵێ : حەواریی بە یاریدەدەر ئەڵێن .]

١٠٢٧/١٥٠ مروان بن الحكم قال : أصاب عثمان بن عفان ـ رضي الله تعالى عنه ـ رعاف [سنة إحدى وثلاثين] سنة الرعاف ، حتى حبسه عن الحج ، وأوصى ، فدخل عليه رجل من قريش ، قال : إستخلف ، قال : وقالوه ؟ قال : نعم . قال : ومن ؟ فسكت ، فدخل عليه رجل آخر ، [قال مروان] : أحسبه الحرث [أخا مروان] فقال : إستخلف ، فقال عثمان : وقالوا ؟ فقال : نعم . قال : ومن هو ؟ فسكت . قال : فلعلهم قالوا الزبير . قال : نعم . قال : أما والذي نفسي بيده ! إنه لخيرهم ، ما علمت ، وإن كان لأحبَّهم الى رسول الله ـ ﷺ ـ ح ـ ١١٨/٦ . ن . عن معاوية .

تەرجەمە :

مەروان ئەڵێ :ساڵی نەخۆشی خوێنی لووت بەربوون حەزرەتی عوثمانی بنی عەفان ـ رضي الله تعالى عنه ـ تووشی خوێنی لووت بەربوون بوو ، حەتا مەنعی کرد لە حەج ، وەصیەتی کرد . پیاوێ لە قورەیش هاتە خزمەتی عەرزیکرد : کە یەکێ لە جێی خوت دابنێ ، فەرمووی : بۆ خەڵق وتوویانە ؟ پیاوەکە وتی : بەڵێ . فەرمووی : کێیان وتوە بیکەم بە خەڵەف ؟ پیاوەکە بێدەنگ بوو . پیاوێکی تر هات ، مەروان ئەڵێ : لام وایە کە ئەو پیاوی دووەمە حەرث بوو کە برای خۆیەتی ، ئەویش عەرزیکرد : یەکێ بنێرە جێی خۆت . فەرمووی : بۆ خەڵق وتوویانە ؟ وتی : بەڵێ . فەرمووی : کێیان وتوە کە بینێمە جێی خۆم ؟ ئەویش بێدەنگ بوو فەرمووی : ئیحتیمالی هەیە زوبەیریان وتووێ . وتی : بەڵێ . فەرمووی : قەسەم بەوەی کە نەفسی منی لە دەستایە ! ئەوی کە من ئەیزانم ئەوەیە کە زوبەیر چاکترینی ئەوانە . بە تەحقیق زوبەیر خۆشەویسترینی هەموویانە لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ .

[........]

١٥١/١٠٢٨ وعنه [قال] : كنت عند عثمان [رضي الله تعالى عنه] أتاه رجل فقال : إستخلف . قال : وقيل ذاك ؟ قال : نعم الزبير [رضي الله تعالى عنه] قال : أما والله إنكم لتعلمون إنه خيركم . ثلاثا .

ح ـ ١١٨/٦ .

تەرجەمە :

سێ دەفعە فەرمووی : وەڵڵاهی ئێوە ئەزانن کە زوبەیر چاکترینی ئێوەیە .

١٠٢٩/٥٢ عن جابر ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : قال النبي ـ ﷺ ـ : إن لكل نبيٍّ حواريَّ ، وإن حواريّ الزبير بن العوام . ح ـ ١١٨/٦ .

**تەرجەمە :**

پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : بۆ هەر پێغەمەرێ گەلێ حەواریی هەیە ، حەواریی من زوبەیری کوڕی عەوامە .

١٠٣٠/١٥٣ عن عبدالله بن الزبير [رضي الله تعالى عنهما] قال : كنت يوم الأحزاب جعلت أنا وعمر ابن أبي سلمة [رضي الله عنهما ـ ربيب النبيّ ـ ﷺ ـ] في النساء ، فنظرت فإذا أنا بالزبير على فرسه يختلف إلى بني قريظة مرتين أو ثلاثا ، فلما رجعت قلت : يا أبتِ رأيتك تختلف ، قال : أوَهل رأيتني يا بُنيَّ ؟ قلت : نعم . قال : كان رسول الله ـ ﷺ ـ قال : من يأت بني قريظة فيأتيني بخبرهم ؟ فانطلقت ، فلما رجعتُ جمع لي رسول الله ـ ﷺ ـ بين أبويه . فقال : فداك أبي وأمي . ح ـ ١١٨/٦ ، م ـ ١١٨/٩ ت ، ن ، جه .

**تەرجەمە :**

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : رۆژی ئەحزاب = کە سوپای ئەحزاب دەوری مەدینەیان گرت = من و عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە ـ رضي الله تعالى عنهم ـ لە ناو ژنانی پێغەمەرا بووین ـ ﷺ ـ ورضي عنهن ـ زوبەیرم دی بە سواریی ئەسپەکەی ، دوو جار یا سێ جار چوو بۆ (بەنی قورەیظە)و هاتەوە . کە چوومەوە ماڵێ وتم : بابە تۆم دی هەر ئەهاتی و ئەچووی . فەرمووی : بۆ کوڕی خۆم تۆ منت دی ؟ وتم : بەڵێ . فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : کێ ئەچێتە بەنی قورەیظەو خەبەریانم بۆ ئەهێنێتەوە ؟ من

چووم ، که گەرامەوە پێغەمەر - ﷺ - باوك و دایکی خۆی بۆ کۆکردمەوەو فەرمووی : باوك و دایکمت فیدابێ !

ئیبن وزوبەیر - رضي الله تعالى عنهما - لەو وەختەدا عومری دووسالو چەند مانگێ ، یا سێ سالو چەند مانگێ بوە . کە وابێ دروستە منال کە بە منالی ی حەدیثی بیستو گەورە بوو ئەو حەدیثە ریوایەت بکا ، لێی قەبوول ئەکرێ عومری هەرچەندێ بێ .

**١٥٤/١٠٣١ عن عروة بن الزبير [رضي الله تعالى عنه] أن أصحاب النبي - ﷺ - قالوا للزبير ، يوم وقعة اليرموك [في خلافة عمر - رضي الله تعالى عنه -] : ألا تشدُّ فَنَشُدَّ معك ؟ فحمل عليهم ، فضربوه ضربتين على عاتقه ، بينهما ضربة ضُرِبها يوم بدر ، وقال عروة : فكنت أدخِل أصابعي في تلك الضربات ، وأنا صغير . ح - ١١٩/٦ . وقد كان المسلمون خمسة وأربعين ، وقيل : ستة وثلاثين ألفا ، والروم سبعمائة ألف ، وكان مع جبلة بن الأيهم من عرب غسان ستون ألفا ، وكانت الدولة للمسلمين ، فقتلوا من الروم مائة ألف وخمسة آلاف ، وأسروا أربعين ألفا ، واستشهد من المسلمين أربعة آلاف . قسطلاني .**

**تەرجەمە :**

عوروە ئەفەرموێ : ئەصحابی پێغەمەر - ﷺ - رۆژی وەقعەی یەرمووك بە زوبەیریان وت : ئایا حەملە نابەی ئێمەیش لەگەڵتا حەملە بەرین ؟ زوبەیر - رضي الله تعالى عنه - حەملەی بۆ بردن ، دوو شیریان لە پشت ملی دا ، لە بەینی ئەو دوو شیرەدا شیرێکی تری لێدرابوو لە وەقعەی بەدرا . عوروە ئەفەرموێ : من منال بووم دەستم ئەکرد بە ناو ئەو جێ شیرانەدا ، یاریم پێ ئەکرد .

[لە وەقعەی (یەرمووك)ا موسوڵمانان چل و پێنج یا سی و پێنج هەزار

بوون رۆم حەو صەد هەزار بـوون . (جبله)ی بنی ئەیهـەم لە عـەرەبی غـەسان شـەصت هەزاری لـەگەڵ بـوو ، ئەو رۆژە طـالیع یاریـەی موسوڵمانانی دابوو ، صەدهەزاریان لە رۆم کوشت ، چل هەزاریـان لێ بەدیل گرتن ، لە موسوڵمان چوار هەزار شەهید بوو . قسطلاني] .

**وفي ح ـ ٦/٢٤٤ زيادة : فقال : إنِّي إن شددت كذبتم ! فقالوا : لا نفعل . فحمل عليهم حتى شق صفوفهم ، فجاوزهم وما معه أحد ، ثم رجع مقبلا ، فأخذوا بلجامه . قال عروة : وكان معه عبـدالله بن الزبير يومئذ ، وهو ابن عشر سنين ، فحمله على فرس وكَّل به رجلا .** ح/٦/٢٤٤ .

**تەرجەمە :**

زوبەیر فەرمووی : ئەگەر من حەملەبەرم ئێوە راست ناکـەن ! وتیان : خەیر درۆ ناکەین . زوبەیر ـ رضي الله تعالی عنه ـ حەملەی بۆ بردن ، صەفەکەی درین ، لێیان تێپەڕ بوو هیچ کەسی لەگەڵ نەبوو ، کە گەڕایەوە دەستە جڵەوەکەیان گرت ، دوو شیریان لێدا(1) . . . الخ

عوروە ئەفەرموێ : ئەو رۆژە عەبدوڵلای لە خزمەتا بوو ، دە ساڵ بوو ، سواری ئەسپێکی کردو دایە دەست پیاوێ کە موحافەظەی بکا .

**١٥٥/١٠٣٢ قال عروة : وقال لي عبدالملك بن مروان ـ حين قتـل عبـدالله بن الزبير ـ [رضي الله تعالى عنه] : يا عروة هل تعـرف سيف الزبير ؟**

---

(1) ئەگەر ئەم زیادەیە ـ لە «وفي ح ـ ٦/٢٤٤ زيادة . . .» تا «فأخذوا بلجامه» لە دوای «فحمل عليهم» ەوە بخوێنرێتەوە باشتر ماناکەی رێك دەکەوێ .

یا عورروه شیرەکەی زوبەیر ئەناسی‌یەوە[1] ؟

قلت : نعم .

وتم : بەڵێ .

قال : وما فيه ؟

وتی : چی تیایه ؟

قلت : فيه فَلَّةٌ فُلَّها يوم بدر .

وتم : کەلی‌یێکی تیایه که له بەدرا تێی بوو .

قال : صدقت . «بهن فلول من قراع الكتائب»

وتی : راست ئەکەی . ئەو بەیتەی خوێنەوە کە مەعنای وایە هیچ عەیبیان تیا نی‌یە ، ئەو عەیبە نەبێ کە شیرەکانیان لەبەر ئەوە کە زۆریان کێشاوە بە عەسکەری دوشمنا دەمەکەیان هەڵوەریوە .

ثم ردَّه :

لە پاشا دایەوە .

على عروة :

بە عورروه .

قال هشام :

هیشامی کوڕی عورروە وتی :

فاقمناه بيننا :

له بەینی خۆمانا نرخمان بری .

ثلاثة آلاف ، وأخذه بعضنا به :

(٢) لێرەدا تەرجەمەی سەرەتاکەی نەکرد کە ئەمەیە : عورروە ئەڵێ : کە عەبدوڵڵای برام کوژرا . عەبدولەلیکی کوڕی مەروان پێی‌وتم : ئەی عورروە . . .

به سێ هەزار ، بەعزێ لە ئێمە ، کە عوثمانی کوڕی عوروەیە ، لە باق (إرث) هەڵی گرت .

ولودِدْتُ أني كنت أخذته :

هیشام ئەڵێ : کاشکی من هەڵگرتایه ! ح ـ ٦/٢٤٣ .

١٠٣٣/١٥٦ عبدالله بن الزبير [رضي الله تعالى عنهما] قال : [لما كنت يوم الخندق . أخرى . م] كنت أنا وعمر بن أبي سلمة [رضي الله تعالى عنهما] يوم الخندق مع النسوة في أطم حسان ، [في الأطم الذي فيه النسوة ، يعني نسوة النبي ـ ﷺ ـ م . أخرى] فكان يطأطئ لي مرة فأنظر ، وأطأطئ له مرة فينظر ، فكنت أعرف أبي إذا مرَّ على فرسه في السلاح إلى بني قريظة .

قال [هشام] : وأخبرني عبدالله بن عروة عن عبدالله بن الزبير قال : فذكرت ذلك لأبي ، فقال ورأيتني يا بنيَّ ؟ قلت : نعم . قال : أما والله لقد جمع لي رسول الله ـ ﷺ ـ يومئذ أبويه ؛ فقال : فداك أبي وأمي م ـ ٩/٣١٤ .

تەرجەمە :

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : لە رۆژی غەزای خەندەقا من و عومەری کوڕی ئەبوسەلـەمە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لەناو قەڵای حەسانا بووین کە ژنەکانی پێغەمەری تیـابوو ـ ﷺ ـ ورضي عنهن ـ باوکمم ئەناسی یەوە کە بە سواری ئەسپەکەی چوو بۆ بەنی قورەیظە ، سەری بۆ دائەنەوانم تەماشام ئەکرد ، منیش سەرم

بۆی دائەنەوان و تەماشای ئەکرد[1] ئەوەم بۆ باوکم گێرایەوە ، وتی : ئەی کوری خۆم بۆ منت دی ؟ وتم : بەڵێ . فەرمووی : وەڵڵاهی ئەو رۆژە پێغـەمەر ـ ﷺ ـ بـاوك و دایکی خۆیی بـە یەکـەوە بۆ کـۆکـردمـەوە ، فەرمووی : باوکم و دایکمت فیدابێ !

١٠٣٤/١٥٧ جابر بن عبدالله [رضي الله تعالى عنهما] يقول : ندب رسول الله ـ ﷺ ـ الناس يوم الخندق ، فانتدب الـزبير ، ثم نـدبهم ، فانتدب الزبير ، ثم ندبهم ، فانتدب الزبير ، فقال النبي ـ ﷺ ـ : لكل نبي حواريّ وحواريَ الزبير . م ـ ٩/٣٣١ . ت ، ن ، جه .

**تەرجەمە :**

جـابیر ـ رضي الله تعـالى عنه ـ ئـەفەرمـوێ : رۆژی خەنـدەق پێغەمەر ـ ﷺ ـ سێ دەفعە خەڵقی بانگ کرد [کە یەکێ بنێرێ بۆ ئەحوالی بەنی قورەیظە] هەر سێ دەفعەکە زوبـەیر ـ رضي الله تعـالى عنه ـ بـە دەنگی یـەوە چوو . پێغـەمـەر ـ ﷺ ـ فـەرمـووی : هـەر پێغـەمـەرێ حەواریی و یاری یەدەری هەیە . حەواریی من زوبەیرە .

---

(١) دانـەر ـ خ ـ لێرەدا لێی تێکچـوەو پـاش وپێشـیك لـەوەرگێـرانـەکـەیـدا رووی داوە ، دەبوو دوای ـ رضي الله تعالى عنهن ـ بینووسیایە : «جارێك عومەر سەری بۆ دائەنەوانم و تەماشام ئەکردو ، منیش جارێك سەرم بـۆ دائەنەوان و ئەو تەماشای ئەکرد . کە تەماشام ئەکرد باوکم ئەناسی یەوە کە بە سواری ئەسپەکەیەوە ئەچوو بۆ بەنی قورەیظە . . . » مانای ئەم حەدیثە نزیکە لە مانای حەدیثی (١٥٣/ ١٠٣٠) وە .

# طلحة بن عبيد الله ، وسعد بن أبي وقاص

- رضي الله تعالى عنهما -

**١٠٣٥/١٥٨ عن أبي عثمان [عبدالرحمن النهدي - رضي الله تعالى عنه -] قال : لم يبق مع النبي - ﷺ - في بعض تلك الأيام [وقعة أحد] التي قاتل فيهن رسول الله - ﷺ - غير طلحة وسعد . عن حديثهما .**

**ح - ١١٩/٦ . م - ٣١٣/٩ .**

**تەرجەمە :**

ئەبو عوثمانی نەهەدیی - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : لە بەعزێ لەو غەزایانە کە پێغەمەر - ﷺ - حەربی تیائەکرد کە غەزای ئوحودە ، غەیری طەلحەو سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصی لە خزمەتا نەمایەوە . ئەم حەدیثەی لە سەعدو طەلحەوە ریوایەت ئەکا . (وإلا) ئیمامی عەلی ، ئەبوطەلحە ، عومەر ، ئەبوبەکرو ، کێ و کێی - رضي الله تعالى عنهم - لە خزمەتا مایەوە . وەك لە غەزای ئوحودا تەصریحی پێ ئەکرێ ، پێت (ان شاء الله) .

**١٠٣٦/١٥٩ عن قيس بن أبي حازم [قدم المدينة بعد وفاة النبي - ﷺ -] قال : رأيت يد طلحة التي وقى بها النبيَّ - ﷺ - قد شُلَّتْ .**

**ح - ١١٩/٦ .**

**تەرجەمە :**

قەیسی کوڕی ئەبوحازم - رحمه الله - ئەفەرموێ : چاوم کەوت بەو

ئەستێ طەلحەیە کە موحافظەی پێغەمەری - ﷺ - پێ کردبوو شەل بوویوو .

[طەلحە - رضي الله تعالى عنه - کە لە خزمەت حەزرەتی عایشەدا - رضي الله تعالى عنها - چوو کە حەرب لەگەڵ ئیمامی عەلیدا - رضي الله تعالى عنه - بکاو پەشیمان بوەوەو بێ ئەمە کە حەرب بکا گەڕایەوەو بە تیرێکی (لاعیە) شەهیدبوو . . ئیمامی عەلی - رضي الله تعالى عنه - لەسەر جەنازەکەی وەستاو ئەوەندە بۆی گریا تا بە فرمێسك ریشی موبارەکی تەڕ بوو ، فەرمووی : رجام وایە کە من و تۆ لەوانە بین کە خودا دەرحەقیان لە قورئانا ئەفەرموێ : «ئێمە حەسەدو بوغضمان لە دڵ هێنانە دەرێ ، وەك برا لەسەر تەخت لە بەهەشتا بەرابەر یەك دائەنیشن[1]» قسطلاني .

ئیمامی عومەر - رضي الله تعالى عنه - دەرحەق طەلحە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - وەفاتی فەرموو لە طەلحە راضي بو . ح - ٦/١١٩ .

ترمذیی ریوایەت ئەکا لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : لە پێغەمەرم بیست - ﷺ - فەرمووی : هەرکەسێ ئەیەوێ تەماشای شەهیدێ بکا کە بەسەر ئەرزا ئەگەڕێ تەماشای طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا بکا ، لەوانەیە کە ئایەتی : ﴿فمنهم من قضى نحبه﴾[2] دەرحەقی نازڵ بوە . یەعنی بەعزێ لە موهاجیر

(١) مەبەستی ئایەتی : «ونزعنا ما في صدورهم من غل إخوانا . . .» ، الحجر /٤٧ :

(٢) بڕوانە : سوورەتی : (الأحزاب) ئایەتی : ٢٣

ئەوانەن بێ ئـەمە نـەفعی دنیایی یـان دەست کەوتبێ مـوددەتی حەیـاتی بەسەربرد .

هەم ترمذیی ریوایەت ئەکا لە ئیمامی عەلی یەوە ـ رضي الله تعالىٰ عنه ـ ئەفەرموێ : هەردوو گوێم لە دەمی موبارەکی پێغەمەری بیست ـ ﷺ ـ ئەیفەرموو : طەلحەو زوبەیر لە بەهەشتا دراوسێی منن .

# سعد بن أبي وقاص
## - رضي الله تعالى عنه -

وفيه حديث يأتي - إن شاء الله تعالى - في الوصية .

١٦٠/١٠٣٧ سعيد بن المسيب - رحمه الله - قال : سمعت سعدا [رضي الله تعالى عنه] يقول : جمع لي النبيُّ - ﷺ - أبويه يوم أُحد ، فقال : فداك أبي وأُمي . ح - ٦/ ١٢٠ . م - ٩/ ٣٠٩ . ت ، ن . وعن علي بن أبي طالب - رضي الله تعالى عنه - نحوه . م - ٩/ ٣٠٨ . ح - ٥/ ٩٣ . ت . جه .

تەرجەمە :

سەعیدی کوری موسەییەب - رحمە اللە - ئەفەرموێ : لە سەعدم بیست - رضي الله تعالى عنه - ئەیفەرموو : پێغەمەر - ﷺ - دایك و باوکی خۆیی بەیەکەوە فیداکردم ، فەرمووی : باوك و دایکم فیدات بێ !

١٦١/١٠٣٨ عن عامر بن سعد عن أبيه ، قال : لقد رأيتني وأنا ثلث الاسلام . [أي : من الرجال .] ح - ٦/ ١٢٠ .

تەرجەمە :

سەعد - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : من چاوم بە خۆم کەوت کە سێیەکی ئیسلام بووم . یەعنی لە پیاوان .

١٦٢/١٠٣٩ سعيد بن المسيب [رحمه الله تعالى] يقول : سمعت سعد بن أبي وقاص [رضي الله تعالى عنه] يقول : ما أسلم أحد إلا في اليوم

الـذي أسلمت فيه ، ولقـد مكثت سبعـة أيـام وإني لثلث الاسـلام .

ح - ٦/ ١٢٠ .

**تەرجەمە :**

سەعدی بنی ئەبی وەقاص - رضي الله تعالى عنه - ئەیفەرمـوو : هیچ کەس موسوڵمان نەبوو لەو ڕۆژەدا نەبێ کە منی تیا موسوڵمان بووم . حەوت ڕۆژ وەستام من سێیـەکی ئیسلام بـووم . یەعنی بـە ئیعتیقادی خۆی ، گینا لە پێش ئەوا گەلێکی تر موسوڵمان بوون .

١٦٣/ ١٠٤٠ عن قيس قال : سمعت سعدا - رضي الله تعالى عنه - يقول : إني لأول العرب رمى بسهم في سبيل الله - تعالى - .

**تەرجەمە :**

سەعد - رضي الله تعالى عنه - ئەیفەرموو : من ئەوەڵ عەرەبێکم کە لە ڕێی خوادا تیری هاویتبێ .

[لە ئەوەڵ ساڵی هیجرەتا پێغەمەر - ﷺ - لەگەڵ شەصت سواری موهاجیـرا ناردی بـۆ (رابغ) کـە ڕێ بە کـاروانی قورەیش بگـرن ، لە (معية)ی عوبەیدەی کوڕی حەرثی کـوڕی موطـەلیبی کوڕی عـەبدی مەناف .]

وكنا نغزو مع النبي - ﷺ - وما لنا طعام إلا ورق الشجر ، حتى إن أحدنا ليضع كما يضع البعير أو الشاة ، ماله خلط . ثم أصبحت بنو أسد تعزرني على الاسلام . لقد خبت إذا وضلَّ عملي ، وكانوا وشوا به إلى عمر - رضي الله تعالى عنه - قالوا : لا يحسن يصلي . ح - ٦/ ١٢٠ .

ويأتي في الصلاة - إن شاء الله تعالى - بأتمَّ . وذكر في الأطعمة والرقاق . م - ١٠/ ٤٢٠ . ت ، ن ، جه .

تەرجەمە :

ئێمە لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ غەزامان ئەکرد غەیری گەڵای دار هیچ خۆراکمان نەبوو ، حەتا وابووین وەکوو وشتر یا مەڕ پشقلمان ئەکرد ! کەچی بەنوئەسەد لەسەر ئیسلامەتی عەیبم لێ ئەگرن . کە وابێ ئەبێ من لە هەموو خێرێ مەحرووم بم و رێم ونکردبێ . بەنوئەسەد شکایەتیان لە خزمەت ئیمامی عومەرا لێ کردبوو ؛ ئەیانوت : نازانێ نوێژ بکا ! (بە تەواوی ـ ان شاء الله ـ لە صەلاتا ذیکر ئەکرێ) .

**١٦٤/١٠٤١ سعدبن أبي وقاص [رضي الله تعالى عنه] يقول : نثل لي النبيُّ ـ ﷺ ـ كنانته يوم أحد ، فقال : إرم فداك أبي وأمي[1] .**

**تەرجەمە :**

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : لە غەزای ئوحودا پێغەمەر ـ ﷺ ـ تیرکەشەکەی خۆیی بۆ رۆکردم ؛ ئەیفەرموو : تیر بهاوە باوکم و دایکمت فیدابێ .

**١٦٥/١٠٤٢ عن سعد [رضي الله تعالى عنه] قال : كنا مع النبي ـ ﷺ ـ ستة نفر ، فقال المشركون : أُطرد هؤلاء لا يجترؤن علينا ! قال : وكنت أنا ، وابن مسعود ، ورجل من هذيل ، وبلال ، ورجلان لست أُسميهما . فوقع في نفس رسول الله ـ ﷺ ـ ما شاء الله أن يقع ، فحدَّث نفسه ، فأنزل الله ـ عز وجل ـ ﴿ولا تَطرِدِ الذين يدعون ربهم بالغداة والعشيِّ يريدون وجهه﴾[2] [الكهف] م ـ ٩/٣١٢ .**

---

(١) دانەر سەرچاوەی ئەم حەدیثەی نەنووسیوەو ، منیش نەمدۆزی یەوە .

(٢) بروانە : سوورەتی (الانعام) ، ئایەتی : ٥٢ . دیارە دانەر ـ خ ـ هەردوو جارەکە بەهەڵەدا چوە کە سوورەتی (الکهف)ی نووسیوە .

تەرجەمە :

سەعد - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : شەش کەس بووین لە خـزمـەت پێغـەمـەرا - ﷺ - منو ، ئیبنو مـەسعـوودو ، پیـاوێ لـە هوذەیلو ، بیلالو ، دوانی تر کە ناویان نابەم . موشـریکان عـەرزی پێغەمەریان کرد - ﷺ - کە ئەمانە دەربکە کە جورئەتمان بەسەرا نەکەن ! شتێك کە خوا ئیرادەی کردوە کە بێ بە دڵی پێغەمەرا - ﷺ - بەدڵیا هات . خوا - عز وجل - ئەم ئایەتـەی سوورەتی (الکهف)ی نـازڵ فەرمـوو : «ئەوانە دەرمەکە کـە ئێوارێو سبـەینێ مەحض بـۆ خوا عیبـادەتی خوا ئەکەن» .

١٠٤٣/١٦٦ عن عائشة [رضي الله تعالى عنها] قالت : أرِقَ رسول الله - ﷺ - ذات ليلة ؛ فقال : ليت رجلا صالحا من أصحـابي يحرسني الليلة ! قالت : وسمعنا صوت السلاح . فقال رسول الله - ﷺ - : من هذا ؟ قال : سعد بن أبي وقاص ، يا رسول الله جئت أحرسك . قالت عـائشة [رضي الله تعـالى عنها] : فنـام رسول الله - ﷺ - حتى سمعت غطيطه . م - ٣٠٧/٩ .

تەرجەمە :

حەزرەتی عایشە - رضي الله تعالى عنها - فەرمـووی : پێغەمـەر - ﷺ - شەوێ خەوی لێ تەقی ، فەرمووی : کاشکی پیاوێکی صالح لە ئەصحابم ببێو ئیمشەو پاسم بکا ! حەزرەتی عایشە - رضي الله تعالى عنهـا - فـەرمـووی : دەنگی سیـلاحمـان بیست ، پێغـەمـەر - ﷺ - فەرمووی : ئەوە کێیە ؟ وتی : سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصم ، (یا رسول الله) هـاتووم کـە ئێشکت بگـرم . عـایشـە - رضي الله تعـالى عنهـا - فەرمووی : پێغەمەر - ﷺ - نوست تا دەنگی پرخەپرخیم بیست .

١٠٤٤/١٦٧ وعنها قالت : سهر [بيّداريى كرد] رسول الله ـ ﷺ ـ مقدمه المدينة [له وەختىّ تەشريفى هات بۆ مەدينە] ليلة ، فقال : ليت رجلا صالحا من أصحابي يحرسني الليلة ! قالت : فبينما نحن كذلك سمعنا خشخشة سلاح [دەنگى سيلاح له يەك ئەخشا] فقال : من هذا ؟ قال : سعد بن أبي وقاص . فقال له رسول الله ـ ﷺ ـ : ما جاء بك ؟ [بۆچ هاتووى ؟] فقال : وقع في نفسي خوف على رسول الله ـ ﷺ ـ [ترسيّكم هات بە دلاّ بۆ پيّغەمەر ـ ﷺ ـ] فجئت أحرسه : [هاتم پاسى ئەكەم] . فدعا له رسول الله ـ ﷺ ـ ثم نام . [پيّغەمەر ـ ﷺ ـ دۆعاى بۆ كردو ئەمجا نوست] .[1]

١٠٤٥/١٦٨ عن سعد [رضي الله تعالى عنه] أن النبيَّ ـ ﷺ ـ جمع له أبويه يوم أُحد ، قال : كان رجل من المشركين قد أحرق المسلمين ، فقال له النبيُّ ـ ﷺ ـ : إرمِ فداكَ أبي وأُمي ! قال : فنزعت له بسهم ليس فيه نصل ، فأصبت جنبه ، فسقط وانكشفت عورته ، فضحك رسول الله ـ ﷺ ـ حتى نظرت إلى نواجذه . م ـ ٣٠٩/٩ .

تەرجەمە :

سەعد ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرمویّ : كە پيّغەمەر ـ ﷺ ـ دايكو باوكى خۆيى بۆ كۆكردۆتەوە لە رۆژى ئوحودا . پياوىّ لە موشريكان موسوڵمانانى سووتان [يەعنى زۆرى لىّ شەهيدكردن] پيّغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمرى پىّ فەرموو : تير بهاوە باوكو دايكم بە فيدات بىّ ! سەعد

(١) ئەم حەديثە زۆر لە حەديثەكەى پيّشوو ئەچىّ و ، هەنديّك جياوازى يان هەيە . بۆيە دانەر ـ خ ـ سەربەخۆ تەرجەمەى نەكردو تەنها جياوازى يەكانى نووسى .

- رضي الله تعالى عنه - فەرمووی : تیرێکی بێ پەیکانم بۆ دەرهێنا ، دام لە تەنیشتی و کەوت و عەورەتی دەرکەوت . پێغەمەر - ﷺ - پێکەنی تا تەماشای ددانی موبارەکی خرییم کرد .

لەم حەدیثانەدا موعجیزەی پێغەمەری تیایە کە (در عقب) دوعاکەی قەبوول بوو . سەعد - رضي الله تعالى عنه - دەزبەجێ هات و ئەو شەوە ئێشکی گرت . بە تیری بێ پەیکان پالەوانێکی موشریکانی کوشت .

فەضیلەتی سەعدی تیایە کە پێغەمەر - ﷺ - فەرمووی : پیاوێکی صالح بێ ئێشکم بگرێ ، سەعد - رضي الله تعالى عنه - هات . باوك و دایکی خۆی بەفیدا کرد .

دروستە مەسروور بوون بە عەیب دەرکەوتنی دوشمنی دین .
ئینسان بۆی دروستەو سوننەتە ئیهتیمام بە حیفظی خۆی لە تەنگانەدا .
ئێشك كێشان و ئێشك بێ كێشان سوننەتە .
تەلطیفی ئەهلی فەضل سوننەتە .

١٠٤٦/١٦٩ عن سعد [رضي الله تعالى عنه] أنه نزل فيه آيات من القرآن . قال : فحلفت أم سعد : أن لا تكلمه أبدا حتى يكفر بدينه ، ولا تأكل ولا تشرب ! قالت : زعمتَ أن الله وصاكَ بوالديك فأنا أُمك ، وأنا آمرك بهذا . قال : مكثتْ ثلاثا حتى غُشيَ عليها من الجهد . فقام اِبن لها يقال له : عمار ، فسقاها ، فجعلتْ تدعو على سعد ، فأنزل الله - عز وجل - في القرآن هذه الآية : ﴿ووصينا الانسان بوالديه حسنا وان جاهداك عليٍ أن تشرك بي ما ليس لك به علم ، فلا تطعهما ، وصاحبه!

في الدنيا معروفا . . . ﴾[1]

قال : وأصاب الرسول - ﷺ - غنيمة عظيمة فإذا فيها سيف ، فأخذته فأتيت به الرسول - ﷺ - فقلت : نفلني هذا السيف ، فأنا من قد علمت حاله ، فقال : ردّهُ من حيث أخذتَهُ ، فانطلقت حتى إذا أردْتُ أن أُلقيهُ في القبض [الموضع الذي يجمع فيه الغنائم] لامتْني نفسي ، فرجعت إليه ، فقلت : أعطنيه . قال : فشدُّ لي صوته : ردّهُ من حيث أخذته . قال : فأنزل الله - عز وجل - : «يسألونك عن الأنفال . . .»[2]

قال : ومرضتُ فأرسلتُ إلى النبيِّ - ﷺ - فأتاني ، فقلت : دعني أقسم مالي حيث شئت ، قال : فأبى . قلت : فالنصف ، قال : فأبى . قلت : فالثلث . فسكت . فكان بعدُ الثلث جائزا .

قال : وأتيت على نفر من الأنصار والمهاجرين ، فقالوا تعال نُطعمكَ ونُسقيك خمرا . وذلك قبل أن تحرم الخمر ، فأتيتهم في حُشٍّ . والحشُّ : البُستان . فإذا رأس جزور مشويٍّ عندهم ، وزقّ من خمر . قال : فأكلتُ وشربت معهم ، فذكرت الأَنصار والمهاجرين عندهم .

---

(١) ئەم ئايـەتە بـە هەڵـە نووسـراوە ، گەڕامـەوە بۆ (مسلم) لـەوێش هەروا نووسرابوو ، دوو ئايەت لەيـەكەوە نـزيكن ، لێرەدا تێكـەڵكراون . بـۆ ڕوونكردنەوە هەردوو ئايەتەكە بەڕاستى دەنووسم :

١ - ﴿ووصينا الانسان بوالديه حملته أمه وهنا على وهن ، وفصاله في عامين : أن اشكر لي ولوالديك إليّ المصير . وإن جاهداك على أن تشرك بي ما ليس لك به علم فلا تطعهما ، وصاحبهما في الدنيا معروفا . . .﴾ لقمان / ١٣ و ١٤ .

٢ - ﴿ووصينا الانسان بوالديه حسنا ، وإن جاهداك لتشرك بي ما ليس لك به علم فلا تطعهما ، إليّ مرجعكم . . .﴾ روم /٨ .

(٢) سوورەتى : ئەنفال . ئايەتى : (١) .

فقلت : المهاجرون خير من الأَنصار . فأخذ رجل أحدَ لحِي الرأس فضربني به ، فجرح بأنفي ، فأتيت رسول الله - ﷺ - فاخبرته . فأنزل الله - عز وجل - فيَّ يعني نفسه شأن الخمر : ﴿إنما الخمر والميسر والأنصاب والأزلام رجس من عمل الشيطان . . . ﴾[1] م - ٩/٣١٠

تەرجەمە :

سەعدی کوڕی ئەبووەقاص - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : لە قورئانا چەند ئایەتێکم دەرحەق نازڵ بوە . سەعد ئەفەرموێ : کە دایکی سوێنی خوارد تا بەو دینەی کە گرتوویەتی کافر نەبێ هیچ قسەی لەگەڵ نەکاو نەخواو نەخواتەوە ، پێیشی وت : تۆ ئەڵێی خوا [عز وجل] دەرحەق دایك و باوکت وەصیەتی پێ کردووی ، من دایکتم ، ئەمرت بەوە پێ ئەکەم . [ئەم پارچەیەی وا ئەگەیێنێ کە ئەووەڵی ئایەتەکە لە پێش ئەم حادیثەدا نازڵ بووبێ ، دووایی یەکەی لە دواییا نازڵ بووبێ (والله اعلم)] .

سەعد فەرمووی : دایکی سێ شەوو رۆژ بەو نەوعە وەستا تا لەبرسانا بێهۆش کەوت . عەمماری کوڕی هەڵسا ئاوی دایێ و ئەویش هەر دۆعای لە سەعد ئەکرد . خوا - عز وجل - لە قورئانا ئەم ئایەتەی نازڵ فەرموو . لە لوقمانا ئەفەرموێ : وەصیەتمان بە ئینسان کرد لە حەق دایك و باوکیا کە چاکەیان لەگەڵ بکا ، ئەگەر سەعیت لەگەڵ بکەن کە شتێك تۆ عیلمت پێی نەبێ بیکەی بە شەریکی خوا . . ئیطاعەیان مەکە ، لە دنیادا بە خۆشی لەگەڵیان رابیوێرە .

---

(١) سوورەتی : مائیدة ، ئایەتی : (٩٠) .

سەعد فەرمووی : پێغەمەر - ﷺ - غەنیمەتێکی زۆری گرت لەو غەنیمەتەدا شیرێکی باشی تیابوو ، شیرەکەم هەڵگرت بردمە خزمەت پێغەمەر - ﷺ - عەرزم‌کرد : ئەم شیرەم لە زیادە پێ عەطا بفەرموو ، من ئەوەم کە ئەزانێ بە حاڵی . فەرمووی : لە کوێت هێناوە بیبەرەوە لەوێ داینێرەوە . رۆییم تا تەمام بوو بیخەمەوە کۆگاکە ، نەفسم لۆمەی کردم ، دووبارە چوومەوە خدمەتی عەرزم‌کرد : ئەم شیرەم پێ عەطا بفەرموو ، بە توندیی فەرمووی : بیبەرەوە ئەو جێیەی کە لێت هێناوە ! خـوا ئەم ئایەتەی نازڵ کرد لە سوورەی ئەنفالا ، ئەفەرموێ : «دەرحەق ئەنفال لێت ئەپرسن . . . الخ»

ئەفەرموێ : نەخۆش‌کەوتم نـاردم بە شـوێن پێغەمـەرا - ﷺ - تەشریفی هات ، عەرزم‌کرد : مەنعم مەکە کە ماڵەکەم لەو شتانەدا کە ئیرادەم هەیە بەشی بکەم . . بەش بکەم . رەزای نەبوو . عەرزم‌کرد : ئەی نیوەی ؟ نـەیهێشت . عەرزم‌کـرد : سێیەکی ؟ بێـدەنگ بـوو [لە مـەنع‌کـردن . (والّا) لە ریـوایەتی = تـرا = ئەفـەرمـوێ : سێیـەك . سێیەکیش زۆرە] دوای ئەوە سێیەك دروستە . [ئەمما لـە سێیەك کـەمتر باشترە] .

سەعد - رضي الله تعالی عنە - ئەفەرمـوێ : بە لای قـەومێ لە ئـەنصـارو مـوهـاجیـرینـا رابـوردم ، وتیـان : وەرە شـەرابت بـدەینێ بیخۆرەوەو ، طەعامت بدەینێ بیخۆ . ئەوە لە پێش حەرامبوونی شەرابا بوو . چووم لە ناو باغێکا بـوون کەللەیێکی بـرژاوی وشترو کـونەیێ شەرابیان لە لا بوو . لـەگەڵ ئـەوان خواردم‌و خـواردمەوە ، بـەحثی موهاجیرو ئەنصاریان لەلا کرا ، من وتم : موهاجیر لە ئەنصار چاکترن ، پیاوێ ، یەعنی لە ئەنصار ، یەکێ لە چەنەی کەللەکەی هەڵگرت و بەوە

لێیدام ، لووتی بریندار کردم . چوومە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزم کرد ، ئایەتی سوورەتی مائیدە : ﴿إنما الخمر والميسر . . .﴾ نازڵ بوو . یەعنی شەرابو ، قومارو ، بتو ، فاڵگرتنەوە بە ئەزلام پیسیێ لە عەمەلی شەیتان نەبێ هیچی تر نین ، خۆتانی لێ بپارێزن ، بەڵکو بەو خۆپارازتنە نەجاتتان ببێ . شەیتان بە شەرابو قومارکردن هەر ئەوەی لە ئێوە ئەوێ کە دوشمنایەتیو بوغض بخاتە بەینتانو ، لە ذیکری خواو نوێژ کردن مەنعتان بکا . ئیتر ئێوە واز لەوانە ئەهێنن ؟

**وفي أخرى عن طريق شعبة : قال : فكانوا إذا أرادوا أن يطعموها شجروا فاها بعصا ، ثم أوجروها [أي : فتحوه ثم صَبُّوا فيه الطعام] وفيه : فضرب أنف سعد ففزره [أي : شقه] فكان أنف سعد مُفزَّرا . [أي : مشقوقا] م ـ ٩/٣١٢ .**

**تەرجەمە :**

لە موسلیما هەر ئەم دوو زیادە ریوایەت کراوە . نەوەویی ـ رحمه الله ـ مەرجەعی ضەمیرەکانی بەیان ناکا . دیارە ئەو ضەمیرە (مؤنث) انە راجیعن ئەلای شەراب . نابێ راجیع بنە ئەلای سەعد . ئەوەیش رێك ناکەوێ لەگەڵ لەفظی طەعاما . لە قەسطەلانیشا نەمدۆزییەوە . وەلحاصل تێی نەگەییمو نایزانم ، بەخێری خۆتان مەعنای لێ بدەنەوە .(١)

مەعنای زیادەکەی دوەم : بە یەکێ لە لاچەناگەی سەری وشترەکە لە لووتی سەعدیان داو لووتیان لەتکرد . سەعد ـ رضي الله تعالى عنه ـ بەکەلی ی مایەوە .

(١) منیش زۆری بۆگەرامو ، دواییش چوومە خزمەت مامۆستا مەلا عبدالكريمی مدرس هەر بۆمان ساخ نەکرایەوە .

## فضيلة اسماء بنت أبي بكر وابنها عبدالله بن الزبير
## - رضي الله تعالى عنهم - .

١٧٠/١٠٤٧ عن أبي نوفل قال : رأيت عبدالله بن الزبير [رضي الله تعالى عنهما] على عقبة المدينة [هي عقبة بمكة] قال : فجعلت قريش تمر عليه والناس ، حتى مرَّ عليه عبدالله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] فوقف عليه ، فقال : السلام عليك أبا خبيب ! السلام عليك أبا خبيب ! السلام عليك ابا خبيب ! أما والله لقد كنتُ أنهاك عن هذا ، أما والله لقد كنتُ أنهاك عن هذا ، أما والله لقد كنتُ أنهاك عن هذا . أما والله اِنْ كنتَ ما علمتُ صوَّاماً ، قوَّاماً ، وَصولا للرحم . أما والله لأمة أنت أشرُّها لأمة خير . ثم نفذ عبدالله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] . فبلغَ الحجَّاجَ موقفُ عبدالله وقولُه ، فأرسل اِليه فأُنْزِلَ عن جذعه فأُلقيَ في قبور اليهود ؟ ثم أرسل إلى اُمِّه أسماء بنت أبي بكر [رضي الله تعالى عنهما] فأَبَتْ أَنْ تأتيه ، فأعاد عليها الرسولَ : لتأتيني أو لأبعثنَّ اليكِ من يسحبكِ بقرونكِ ! قال : فأَبَتْ ، وقالت : والله لا آتيك حتى تبعث إليَّ من يسحبني بقروني ! قال : فقال : أروني سِبْتِيّ [نعل لا شعر عليها] فأخذ نعليه ، ثم انطلق يتوذف [يُسرِع] حتى دخل علَيها . فقال : كيف رأيتِني صنعت بعدو الله [بل هو حبيب الله] قالتْ : رأيتُكَ أفسدْتَ عليه دنياه ، وأفسد عليك آخرتك . بلغني أنك تقول له : يا ابن ذات النطاقين ، أنا والله ذات النطاقين . أما أحدهما فكنت أرفع به طعام رسول الله - ﷺ - وطعام أبي بكر - رضي الله تعالى عنه - من الدواب . وأمّا الآخر فنطاق المرأة الذى لا تستغني عنه . أما أن رسول الله - ﷺ - حدَّثنا أنَّ في ثقيف

كذابا ومبيرا [مهلكا] فأما الكذاب [وهو المختار بن أبي عبيد الثقفي ، إدّعى النبوَّةَ ، وأن جبريل عليه السلام يأتيه] فرأيناه ، وأمّا المبير فلا إخالك إلا إياه . قال : فقام عنها ولم يراجعها . م ـ ٩/٤٣٧ .

**تەرجەمە :**

ئیبن ونەوفەل ـ رحمه الله ـ ئەفەرموێ : چاوم بە عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ کەوت لەسەر عەقەبەی مەکە کە لەسەر ڕێی مەدینەدایەو ناوی عەقەبەی مەدینەیە ، جەسەدی موبارەکی لەوێدا بەدارا کرابوو ، قورەیش و خەڵق بەلایا رائەبوردن [یەعنی لە ترسی ئەو زاڵمە نەیان ئەوێرا قسە بکەن] عەبدوڵلای کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ یش بەلایا رابوردو لە لای وەستا ، سێ دەفعە فەرمووی : (السلام عليك أبا خبيب) سێ دەفعە فەرمووی : من نەهیم = لێ = ئەکردی لەم حاڵە . [یەعنی ئەمزانی دەرەقەتی ئەم زاڵمی لەخوانەترسانە نایێی] وەڵلاهی بە تەحقیق ئەوی کە من بیزانم ئوممەتێ کە تۆ خراپیان بێ چاکترینی هەموو ئوممەتن . وەڵلاهی ! تۆ ڕۆژووگر بووی ، شەونوێژکەر بووی ، صیلەی رەحم بەجێ هێنەر بووی ، لە دواییدا عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەشریفی ڕۆیی .

ئەم وەستانی حەزرەتی عەبدوڵلاو ئەم قسانەی ـ رضي الله تعالى عنه ـ بە حەجاج گەییوە ، ئەمری کرد لە دار دایانگرت و ، لە ناو قەبرستانی جوولەکەدا فڕێیان دا ! لە دواییدا ناردی بە شوێن دایکیدا کە ئەسمای کچی حەزرەتی ئەبوبەکرە ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئیبای کرد لەوە کە تەشریفی بچێتە لای ئەو زاڵمە ، دەفعەی دوایی ناردییەوە لای : ئەبێ بێی ، ئەگەر نەیێی ئەنێرم بە پرچ ڕاتبکێشن بتهێنن ! ئیبای کردو تەشریفی نەچوو ، فەرمووی : وەڵلاهی تا نەنێری بە پرچ ڕامبکێشن

نایێم ! ئیبن ونەوفەل ئەڵێ : حەجاج وتی : کەوشەکانم لە کوێیە ؟ کەوشەکانیان دایێ و لە پێی کردو بە لۆقە چوو ، تا گەیی یە خزمەت ئەسما ـ رضي الله عنها ـ وتی : خۆ چاوت پێم کەوت کە چیم کرد بە دوشمنی خوا ! .... ئەسما ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : چاوم پێکەوت کە تۆ دنیات لێ تێك دا ، ئەویش ئاخیرەتی لە تۆ تێك دا . وام پێگەییوەتەوە کە تۆ پێی ئەڵێی : ئەی کوڕی (ذات النطاقین) یەعنی کوڕی ژنی دوو پشتێندار . من وەڵڵاهی دووپشتێنم . یەکێکیان طەعامی پێغەمەر ـ ﷺ ـ و حەزرەتی ئەبوبەکر ـ رضي الله تعالى عنه ـ م پێ بەرزکردۆتەوە لە وڵاغ . ئەوی تریان ئەو پشتێنەیە کە ژنان ئیحتیاجی یان پێیەتی . خەبەرت بێ کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ قسەی بۆ فەرمووین کە لە ثەقیفا کەذذابێك و موبیرێکی تیایە [یەعنی : درۆزنێك و بەهیلاکبەرێکی تیایە] کەذذابەکەمان دی [کە موختاری کوڕی ئەبوعوبەیدی ثەقەفی یە ، ئیدیعای ئەکرد کە جیبریلی ـ علیه السلام ـ بێتە لا] موهلیکەکەیش شکم نی یە کە هەر تۆی هەڵساو ڕۆیی و جوابی نەدایەوە ....

## زيد بن حارثة وابنه أُسامة
## ـ رضي الله تعالى عنهما ـ

١٠٤٨/١٧١ عن سالم بن عبدالله عن أبيه [رضي الله تعالى عنه] أنه كان يقول : ما كنا نقول زيد بن حارثة إلا زيد بن محمد ـ ﷺ ـ حتى نزل في القرآن : ﴿أدعوهم لآبائهم هو أقسط عند الله . . ﴾[1] م ـ ٩/٣٢١ .

**تەرجەمە :**

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : زەیدی کوڕی حارثەمـان نەدەوت ، هـەر ئەمـانوت : زەیـدی کوڕی محەمەد ـ ﷺ ـ . تا لە قورئانـا نازڵ بـوو : کە خـەڵق بە نـاوی باوکی خۆیانەوە بانگ بکەن ، بە ناوی کەسی ترەوە بانگیان مەکەن ، ئەوە لە لای خوا زیاتر لەگەڵ عەدالەتا موناسەبەی هەیە .

[چونکی بە مرووری زەمان نەسەبی ئـەوانە ونئـەبێ تێکەڵ بـە نەسەبی غەیر ئەبێ ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ زەیدی کوڕی حاریثـەی کرد بـە ئەولادی خۆی ؛ بە کوڕی خۆیی بانـگ ئەکـرد . عەرەبیش ئـەوەیان ئەکرد ، ئەبو بە کوڕیو ئیرثی لێ ئەگرت . تا ئەو ئایەتە نازڵ بوو ئیتر خەڵق چوونەوە سەر نەسەبی خۆیان] .

---

(١) سوورەتی : ئەحزاب ، ئایەتی : ٥ .

١٧٢/١٠٤٩ وقال البراء عن النبيّ ـ ﷺ ـ أنه قال لزيد ـ وهو على المنبر ـ : أنت أخونا ومولانا . ح ـ ١٢٢/٦ . ويأتي ـ إن شاء الله ـ موصولا بتمامه .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ لەسەر مینبەر بە زەیدی کوڕی حاریثەی فەرموو : تۆ برای دینیمانی و مەولای [یەعنی موحیببی] ئێمەی .

١٧٣/١٠٥٠ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر [رضي الله تعالى عنهما] يقول : بعث رسول الله ـ ﷺ ـ بعثا وأَمَّر عليهم أسامة بن زيد ، فطعن الناسُ في إِمْرَتـه ، فقام رسول الله ـ ﷺ ـ فقال [وهو على المنبر . أخرى] : إن تطعنون في إِمْرَتِه فقد كنتم تطعنون في إِمْرَةِ أبيه من قبلُ . وأَيْمُ الله ! اِن كان لخليقا للامرة ، وإن كان لَمِنْ أحبِّ الناس اليَّ ، واِنَّ هذا لمن اَحبِّ الناس إليَّ بعده . م ـ ٣٢١/٩ ، ح ـ ١٢٢/٦ .

وفي أُخرى : وأَيْمُ اللهِ ! اِنْ كان لخليقاً لها . وايْمُ الله ! اِنْ كان لأحبَّ الناس إليَّ . وأَيْمُ الله ! اِنَّ هذا لها لخليق ـ يريد أُسامة ـ وايم الله ! إن كان لأحبهم إليَّ من بعده ، فأوصيكم به . فإنه من صالحيكم . م ـ ٣٢٢/٩ .

تەرجەمە :

پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەستەیێ لە ئەصحابی کیرامی نارد بۆ طەرەفێ ، ئوسامەی کوڕی زەیدی ـ رضي الله تعالى عنهما ـ کرد بە ئەمیریان ، خەڵق طەعنیان لە ئەمیریێتیی دا . [بەوە کە عەبدی ئازادکراوە ، چۆن ئەبێ بە ئەمیری ئەحرار ؟] پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی لەسەر مینبەر راوەستاو فەرمووی : ئەگەر ئێوە طەعن بدەن لە ئەمیریێتی ئوسامە (ذاتا) هەر

عادەتتان وایە ؛ لە پێش ئەوا طەعنیشتان دا لە ئەمیرێتی باوکی . قەسەم بە خوا ! زەید لایەق بوو بە ئیمارەت ، لەوانە بوو کە خۆشەویسترینی هەموو خەڵق بوو لە لای من . قەسەم ئەخۆم بە خوا ! کە ئوسامەیش لایەقە بۆ ئەمیری . قەسەم ئەخۆم بە خوا ! کە لە دوای زەید لە هەموو کەس خۆشەویسترە لای من . تەوصی یەتان پێ ئەکەم دەرحەقی ؛ چونکی ئوسامە لە صالیحانی ئێوەیە .

[زەید لە جاهیلی یەتا ئەسیر کرا ، حەکیمی کوڕی حیزام کڕی بۆ حەزرەتی خەدیجەی دایکمان ، کە پووری حەکیمە لە طەرەفی باوکەوە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ طەڵەبی لە حەزرەتی خەدیجە کرد ـ رضي الله تعالى عن أمنا ـ کە پێی هیبە بکا ، پێی هیبەکرد . باوك و مامی زەید ـ رضي الله تعالى عنه ـ تەمایان بوو کە بە فیدیە زەید بکرنەوە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ موخەیەری کرد ، عەرزیکرد : (یا رسول الله) هیچ کەس بەسەر تۆدا تەرجیح نادەم . قسطلاني ٦ ـ ١٢١ .]

**١٠٥١/١٧٤ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ قالت : دخل عليٌّ قائف [قبل نزول الحجاب ، وهو مجزِّز المدلجيّ] والنبيّ ـ ﷺ ـ شاهد ، وأسامة ، وزيد بن حارثة [رضي الله تعالى عنهما] مضطجعان ، فقال : إن هذه الأقدام بعضها من بعض . قال : فسرَّ بذلك النبيُّ ـ ﷺ ـ وأعجبه ، فأخبر به عائشة [رضي الله تعالى عنها] ح ـ ٦/١٢٣ . وأخرجه في النكاح . أيضا .**

**تەرجەمە :**

عوروە لە عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ وە ریوایەت ئەکا کە : فەرمووی : قائیفێ لە پێش نوزوولی حیجابا هاتەلام ، پێغەمەریش ـ ﷺ ـ حازر بوو ، ئوسامەو زەیدی کوڕی حاریثە ـ رضي الله تعالى

عنها ـ راكشابوون ، [مجززى مدلجى قائيف] وتى : ئەم پێيانە بەعزێكى لە بەعزێكيەتى . عورروە ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ بەوە مەسروور بوو ، (متعجب) بو ، خەبەرى دا بە عايشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ .

[ئاخرى ئەم حەديثە مورسەلە ، ئەبێ عورروە ئەمەيشى لە عايشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ بيستبێ ، بە قەرينەى ئەووەڵەكەى]

١٠٥٢/١٧٥ عن عائشة ـ رضي الله تعالى عنها ـ [زوج النبيّ ـ ﷺ ـ] أن قريشا أهمَّهم شأن المرأة المخزومية [فاطمة بنت الاسود] التي سرقت [في غزوة الفتح . أُخرى بخاري] فقال : ومن يكلم فيها رسول الله ـ ﷺ ـ ؟ فقالوا : ومن يجترئ عليه إلا أُسامة بن زيد حِبُّ رسول الله [ورضي الله تعالى عنهما] ؟ فكلَّمه أسامة [رضي الله تعالى عنه] فقال رسول الله ـ ﷺ ـ : أتشفعُ في حَدٍّ من حدود الله ؟ ثم قام فاختطب ، ثم قال : إنَّما أهلك الذين قبلكم أنَّهم كانوا إذا سرق فيهم الشريف تركوه ، وإذا سرق فيهم الضعيف أقاموا عليه الحدَّ ! وأيْمُ الله ! لو أن فاطمة ابنة محمد سرقت لقطعت يدها . ح ـ ٤٣٥/٥ . ح ـ ٣٨٥/١٢٣/٦ . م ـ ٢١٦/٧ . د ، ن ، جه أحمد .

وفي م ـ ٢١٨/٧ فأتي بها النبي ـ ﷺ ـ فعاذت بأم سلمة [رضي الله تعالى عنها] . . . بنحوه يكفي .

١٠٥٣/١٧٦ وعن عروة مثله ، ولفظه أنَّ امرأة سرقت في عهد رسول الله ـ ﷺ ـ في غزوة الفتح ، ففزع قومها إلى أُسامة بن زيد ، يستشفعونه . قال عروة : فلما كلمه أسامة فيها تلوَّن وجه رسول الله ـ ﷺ ـ فقال : أتكلمني في حد من حدود الله ؟ قال أُسامة : إستغفر لي يا رسول الله . فلما كان العشي قام رسول الله ـ ﷺ ـ خطيبا ، فأثنى على الله بما هو أهله ، ثم قال : أمَّا بعد : فإنما هلك الناس قبلكم ، [وللنسائى :

إنما هلك بنو إسرائيل] أنهم كانوا إذا سرق فيهم الشريف تركوه ، وإذا سرق فيهم الضعيف أقاموا عليه الحد ! والذي نفس محمد بيده ! لو أن فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت يدها . ثم أمر رسول الله ـ ﷺ ـ بتلك المرأة فقطعت يدها . [وللنسائي : قم يا بلال فخذ بيدها فاقطعها] فحسنت توبتها بعد ذلك وتزوجت ، قالت عائشة [وبهذا صار الحديث موصولا] ، [رضي الله تعالى عنها] : فكانت تأتيني بعد ذلك ، فأرفعُ حاجتها إلى رسول الله ـ ﷺ ـ [وعند أحمد ، أنها قالت : هل من توبة يا رسول الله ؟ فقال : أنتِ اليوم من خطيئتِكِ كيوم ولدتكِ أمكِ] .

ح ـ ٦/٣٨٥ .

تەرجەمە :

عوروە لە عایشەوە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ریوایەت ئەکا کە ژنێ لە خوزەیمە کە ناوی فاطیمەی کچی ئەسوەد بوو دزیێکی کرد ئەبوو دەستی ببرێ . ئەوە قورەیشی خستە هەمو غەمەوە . وتیان : کێ قسەی بۆ ئەکا لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ ؟ وتیان : غەیری ئوسامەی خۆشەویستی پێغەمەر نەبێ ـ ﷺ ـ کێ ئەتوانێ دەرحەقی لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ = قسەی = بۆ بکا ؟ ئوسامە ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ شەفاعەتی بۆ کرد . پێغەمەر ـ ﷺ ـ رەنگی گۆررا ، فەرمووی : تۆ شەفاعەت و قسە لە حەددێ لە حودوودی خواییدا ئەکەی کە ئیجرا نەکرێ ؟ ! ئوسامە ـ رضي الله تعالى عنه ـ عەرزی کرد : (یا رسول الله) ئیستیغفارم بۆ بکە .

کە ئێوارێ بوو پێغەمەر ـ ﷺ ـ تەشریفی راوەستاو دەستی کرد بە خوطبە ، لە دوای حەمدو ثەنای خوا بەوە کە لایەق بە شان و عەظەمەتی خوا بێ ـ عز وجل ـ فەرمووی : (أما بعد) ئەوانەی لە پێش ئێوەوە بوون

وەك بەنی ئیسرائیل هیچ بە هیلاکی نەبردوون ئەوە نەبیّ : کە ئینسانی گەورەو بەحورمەت دزیی کردبیّ ، دەخلّیان نەکردوە ، ئینسانی ضەعیفو بیّقەدر دزیی کردبیّ دەستیان بریوە ! قەسەم بەوەی کە نەفسی محەمەد لە دەستی قودرەتیایە ! ئەگەر فاطیمەی کچی محەمەد دزیی بکا دەستی ئەبڕم . ئەمری فەرموو کە دەستی ببڕن . لە نەسائیدا ئەفەرمویّ : فەرمووی : ئەی بیلال هەلّسەو دەستی بگرەو بیبڕە ، دەستیان بڕی .

ئەحمەد ـ رضي الله تعالى عنه ـ ریوایەت ئەکا کە ئەو ژنە عەرزی پیّغەمەری کرد : (یا رسول الله) هیچ بۆم هەیە کە تۆبە بکەم ؟ پیّغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : ئیمڕۆ تۆ لە خوصووصی ئەم گوناهەتەوە وەك ئەو رۆژە وایتە کە لەدایك بووی . ئەو ژنە لە دوای ئەمە کە دەستی بڕرا تۆبەیەکی باشی کردو ئیصلاحی حالّی کردو شووی کرد .

حەزرەتی عایشە ـ رضي الله تعالى عنها ـ ئەفەرمویّ : ئەو ژنە ئەهاتە لام و ئیحتیاجییکی ببوایە بۆم عەرزی پیّغەمەر ئەکرد ـ ﷺ ـ یەعنی بەجیّی ئەهیّنا .

۱۰٥٤/۱۷۷ عبدالله [بن دينار ـ رحمه الله ـ] قال : نظر ابن عمر [رضي الله تعالى عنهما] يوما ـ وهو في المسجد ـ إلى رجل يسحب ثيابه في ناحية من المسجد ، فقال : أنظر مَنْ هذا ، ليت هذا عندي ! قال له إنسان : أما تعرف هذا يا أبا عبدالرحمن ؟ هذا محمد ابن أُسامة . قال : فطأطأ ابن عمر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ رأسه ونقر بيديه في الأرض ، ثم قال : لو رآه رسول الله ـ ﷺ ـ لأحبَّه . ح ـ ٦/١٢٣ .

تەرجەمە :

عەبدوڵڵای بنِ دینار ـ رحمه الله ـ ئەفەرمویّ : رۆژیّ عەبدوڵڵای

كوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ لە مەسجیدا بوو تەماشای پیاوێکی کرد لیباسەکەی درێژ بوو لە ئەرزی ئەخشان . عەبدوڵـلا ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : تەماشاکە ئـەوە کییە ؟ کـاشکی لەلام بـوایە ! [یەعنی نەصیحەتم ئەکرد] یەکێ عەرزیکرد : (یا أبا عبدالرحمن) تۆ بۆ ئەمە ناناسی کە کێیە ؟ ئەمە محەمەدی کوڕی ئوسـامەیـە . ئیبنو دینار ـ رحمه الله ـ فەرمووی : ئیبن‌وعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ سەری داخست ، بە هەردو دەستی لە ئەرزی دا ، لە دواییا فەرمووی : ئەگەر پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەمەی بدیایە خۆشی ئەویست .

١٠٥٥/١٧٨ حرملة مولى أُسامة بن زيد ـ رضي الله تعالى عنهما ـ أنه بينما مع عبدالله بن عمر [رضي الله تعالى عنهما] إذ دخل الحجاج بن أيمن بن أم أيمن ، فلم يتم ركوعه ولا سجوده ، فقال : اَعِدْ فلمّا ولّى ، قال لي ابن عمر [رضي الله تعالى عنهما] : من هذا ؟ قلت : الحجاج بن أيمن بن أم أيمن . فقال ابن عمر [رضي الله تعالى عنهما] : لو رأى هذا رسول الله ـ ﷺ ـ لأحبَّه . فذكر حبه وما ولدته أم أيمن .

قال [البخاري] : وحدثني بعض أصحابي عن سليمان : وكانت حاضنة النبيّ ـ ﷺ ـ . ح ـ ١٢٤/٦ .

[بوخاریی ئەم میقدارەی لە سولەیمانی مامۆستای نەبیستوە] . وفي أخرى نحوه . وكان أيمن ابن أم أيمن أخا أُسامة بن زيد [لأمه ، عن عبيد قبل زيد ـ رضي الله تعالى عنهم ـ]

تەرجەمە :

حەرمەلەی مەولای ئوسامەی کوڕی زەید ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ : لە وەختێکا کە لـە خزمـەت عەبـدوڵڵای کـوڕی ئیمامی عومەرا [رضي الله تعالى عنهما] دانیشتبووم حەججاجی کوڕی ئـەیمەن

هاته مزگەوت [نـوێژی کـرد] ، روکووع و سـوجدەی تـەواو نەکـرد .
ئیبن وعومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی : نوێژەکەت بکەرەوە .
کە پشتی هەڵکرد عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنه ـ فـەرمووی : ئـەمە
کێیە ؟ عەرزم کرد : ئەوە حەججاجی کوڕی ئەیمەنی کوری أم ئەیمەنە .
عەبدوڵلا ـ رضي الله تعالى عنه ـ فەرمووی : ئەگـەر پێغەمـەر ـ ﷺ ـ
ئەمەی بدیایـە خۆشی ئـەویست . عەبـدوڵلا ـ رضي الله تعـالى عنه ـ
بەحتی فەرموو لە خۆشویستنی پێغەمەر ـ ﷺ ـ = بۆ = ئوسامەو ئەولادی
ئومم و ئەیمەن ـ رضي الله تعالى عنهما ـ .

بـوخاریی ـ رضي الله تعـالى عنه ـ ئـەفـەرموێ : بـەعـزێ لـە
ئەصحابم خەبەری داومێ کە : ئومم و ئەیمەن ـ رضي الله تعالى عنها ـ
دایـەنی پێغەمـەر بوە ـ ﷺ ـ ئـەیمەنیش بـرای دایکیی ئوسـامە بـوو لە
عوبەید ، کە پیاوێکە لە ئەنصار ـ رضي الله تعالى عنه ـ دوای ئەو پێغەمەر
ـ ﷺ ـ دای بە زەید ـ رضي الله تعالى عنه ـ .

# فضل أم أيمن

- رضي الله تعالى عنها - ظئر النبي - ﷺ -

**١٠٥٦/١٧٩ عن أنس [رضي الله تعالى عنه] قال : إنطلق رسول الله - ﷺ - إلى أم أيمن [رضي الله تعالى عنها] فانطلقت معه ، فناولتْهُ إناء فيه شراب . قال : فلا أدري أصادفتْه صائما أو لم يرده ، فجعلت تصخب عليه وتذمّر عليه [من باب نصر ، أو من التفعُّل ، أي : تصيح وتغضَب ؛ إدلالا عليه ؛ لأنها حَضَنَتْهُ وربّتْه - عليه الصلاة والسلام -]**

**تەرجەمە :**

ئەنەسی بنی مالیك - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : پێغەمەر - ﷺ - تەشریفی ئەچێ بۆ لای ئومم و ئەیمەن(1) - رضي الله تعالى عنها - قەدەحێكی هێنا شتی خواردنەوەی تیابوو ، ئەنەس - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : نازانم تەصادوفی ڕۆژووی پێغەمەری - ﷺ - كرد ، یا حەزی نەكرد بیخواتەوە ، ئومم و ئەیمەن - رضي الله تعالى عنها - دەستی كرد بە نەڕەنەڕ بەسەر پێغەمەرا - ﷺ - لێی توند بوو . [چونكی دایەنی بوو گەورەی كردبوو ، نازی بەسەرا ئەكرد . پێغەمەر - ﷺ - ئەیفەرموو : لە دوای دایكم ئومم و ئەیمەن دایكی منە .(2)] .

---

(١) بە گوێرەی دەقە عەرەبی یەكە دەبوو بینووسیایە : «ئەنەس ئەڵێ : پێغەمەر - ﷺ - چوو بۆ لای ئومم و ئەیمەن ، منیش لە خذمەتیا چووم . . .

(٢) ئەم وتەی دوایی : «پێغەمەر - ﷺ - ئەیفەرموو . . .» لە دەقە عەرەبی یەكەدا نی یەو گەڕامەوە بۆ سەرچاوەكەیش (مسلم) نەمدۆزی یەوە .

لەم حەدیثەدا ئەوەی تیا هەیە کە کەسێ چوە لای کەسێ ئەبێ ئیکرامی بگیرێ ، بۆ ئەو میوانەیش هەیە کە لە بەر عوزرێك نەیخوا . نووي .] م ـ ٣٦٣/٩ .

١٠٥٧/١٨٠ وعنه قال : قال أبو بكر [رضي الله تعالى عنه] بعد وفاة رسول الله ـ ﷺ ـ لعمر [رضي الله تعالى عنه] : إنطلق بنا إلى أم أيمن نزورها كما كان رسول الله ـ ﷺ ـ يزورها . فلما انتهينا إليها بكت . فقالا لها : ما يبكيكِ ؟ ما عند الله خير لرسوله ـ ﷺ ـ فقالت : ما أبكي أن لا أكون أعلم أن ما عند الله خير لرسوله ـ ﷺ ـ ولكن أبكي أن الوحي قد انقطع من السماء . فهيجتهما على البكاء ـ فجعلا يبكيان معها . م ـ ٣٦٤/٩ .

تەرجەمە :

ئەنەسی کوڕی مالیك ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : حەزرەتی ئەبوبەکر بە عومەری فەرموو ـ رضي الله تعالى عنهما ـ : وەرە بچینە لای ئوممو ئەیمەن زیارەتی بکەین ، وەك پێغەمەر ـ ﷺ ـ زیارەتی ئەکرد . کە گەیینە لای دەستی کرد بە گریان ، ئەبوبەکرو عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرموویان : سەبەبی گریانەکەت چیە ؟ ئەوی کە لە خذمەت خوادایە ـ عز وجل ـ چاترە بۆ پێغەمەری ـ ﷺ ـ ئوممو ئەیمەن ـ رضي الله تعالى عنها ـ فەرمووی : بۆیە ناگریم کە نەزانم ئەوی کە لە خذمەت خوادایە ـ عز وجل ـ چاترە بۆ پێغەمەری ـ ﷺ ـ بۆیێك ئەگریم چونکی وەحی مونقەطیع بوە لە ئاسمان . ئەم قسەی ئوممو ئەیمەنە ـ رضي الله تعالى عنها ـ حەزرەتی ئەبوبەکرو حەزرەتی عومەری ـ رضي الله تعالى عنهما ـ هێنایەگری ، ئەوانیش دەستیان کرد بە گریان لەگەڵ ئەو . ـ رضي الله تعالى عنهم ـ .

بۆ فەوتی مەقصەدی (أخروي) گریان دروستە .

ئەم حەدیثانە بۆ هەریەك لە : ئوسامەو ، زەیدو ، ئوممو ئەیمەن - رضي الله تعالی عنهم - چە فەضیلەتێکی گەورەی تیایە کە مەحبووبی پێغەمەرن - ﷺ - .

# فضائل عبدالله بن عمر
- رضي الله تعالى عنهما -

# فضائل عمار ، وحذيفة ، وابن مسعود
- رضي الله تعالى عنهم -

١٨١ /١٠٥٨ عن ابن مسعود - رضي الله تعالى عنه - قال : لما نزلت هذه الآية : ﴿ليس على الذين آمنوا وعملوا الصالحات جناح فيما طعموا إذا ما اتقوا وآمنوا . . الى آخر الآية [اي : وعملوا الصالحات ثم اتقوا ، وآمنوا ثم اتقوا ، وأحسنوا ، والله يحب المحسنين . مائدة][1]﴾ قال لي رسول الله - ﷺ - : قيل لي : أنت منهم . م - ٩/٣٦٩ .

**تەرجەمە :**

ئیبن و مەسعوود - رضي الله تعالى عنه - ئەفەرموێ : کە ئەم ئایەتە نازڵ بوو ، کە تەرجەمەی وایە : «لەسەر ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو عەمەلی صاڵحیان کردوە لەسەر ئەو حەڵاڵەی کە خواردوویانە هیچ گوناهیان نی‌یە ، بەو شەرتەی کە خۆیان لە حەرام بپارێزن ، ئیمانیان بێ بە حەرام و حەڵاڵ ، لە دواییدا لەسەر ئەو ئیمانەو تەقوایە ثابت بن ، عەمەلی چاکە بکەن ، ئەوانەی کە وابن موحسینن ، خوایش - عز وجل - موحسینی خۆشەوێ] کە ئەم ئایەتە نازڵ بوو پێغەمەر - ﷺ - پێی

(١) المائدة /٩٣ .

فەرمووم : کە پێیان وتم : تۆ [یەعنی ئیبن و مەسعوود ـ رضي الله تعالی عنه ـ] لەوانەی . یەعنی هەر سێ دەرەجەی تەقواو ئیمانت بەجێ هێناوە .

١٠٥٩/١٨٢ عن أبي الأحوص قال : كنا في دار أبي موسى مع نفر من أصحاب عبدالله ، وهم ينظرون في مصحف ، فقام عبدالله ، فقال أبو مسعود : ما أعلم رسول الله ـ ﷺ ـ ترك بعده أعلم بما أنزل الله من هذا القائم . فقال أبو موسى : أما لئن قلت ذاك ، لقد كان يشهد إذا غبنا ، ويؤذن له إذا حجبنا . م ـ ٩/ ٣٧٠ .

تەرجەمە :

ئەبولئەحوەص ئەفەرموێ : لەگەڵ چەند کەسێکا لە ئەصحابی عەبدوڵڵا لە ماڵی ئەبوموسادا بووین ـ رضي الله تعالی عنهما ـ ئەوان تەماشای (مصحف) یێکیان ئەکرد ، عەبدوڵڵا تەشریفی هەڵسا ، ئەبو مەسعوود ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : نازانم کە پێغەمەر ـ ﷺ ـ لە دوای خۆی کەسێکی بەجێ هێشتبێ کە لەو راوەستاوە عیلمی بە قورئان زیاتر بێ . ئەبو مووسا ـ رضي الله تعالی عنه ـ فەرمووی : تۆ وا ئەڵێی ، بە تەحقیق ئەو پیاوە لە خزمەت پێغەمەرا ـ ﷺ ـ حازر ئەبوو کە ئێمە لە خزمەتی غائیب ئەبووین ، ئەو ئیذن ئەدرا کە ئێمە مەنع ئەکراین بچینە حوزووری [یەعنی دیارە لە هەموو کەس عالمتر ئەبێ][1] .

---

(١) لەسەر داواو نووسینی دانەر ـ خ ـ لێرەوە پێنج حەدیثمان لە (١٨٣/ ١٠٦٠ تا ١٨٧/ ١٠٦٤) گواستەوە بۆ باسی فەضائیلی عومەر ـ خ ـ لەبەر ئەوەیش ژمارەکان نەگۆڕین لێرەدا هەر ئەو ژمارانەمان بوارد .

١٨٨/١٠٦٥ ذهب علقمة إلى الشام ، فلما دخل المسجد قال : اللهم يسِّر لي جليسا صالحا ! فجلس إلى أبي الدرداء ، فقال : أبو الدرداء : ممن أنت ؟ قال : من أهل الكوفة . قال : أليس فيكم ، او منكم صاحب السرِّ الذي لا يعلمه غيره ؟ ـ يعني حذيفة ـ قال : قلت : بلى . قال : أليس فيكم ، او منكم الذي أجاره الله على لسان نبيه ـ ﷺ ـ ؟ يعني من الشيطان ـ يعني عمّاراً ـ قلت : بلى . قال : أليس فيكم ، أو منكم صاحب السواك [او الوساد] او السراد ؟ قال : بلى . قال : كيف كان عبدالله يقرأ : ﴿والليل إذا يغشى ، والنهار إذا تجلّى . . .﴾[1] ؟ قلت : والذكر والأنثى . قال : ما زال بي هؤلاء حتى كادوا يستنزلوني عن شيئٍ سمعته من رسول الله ـ ﷺ ـ ح ـ ٦/١٢٦ .

وفي اخرى نحوها عن علقمة : قال : قدمت الشام [في نفر من أصحاب عبدالله . اخرى في تفسير والليل] فصليت ركعتين ، ثم قلت : اللهم يسر لي جليسا صالحا فأتيت قوماً فجلست إليهم فإذا شيخ قد جاء حتى جلس الى جنبي قلت : من هذا ؟ قالوا : ابو الدرداء . فقلت : إني دعوت الله أن ييسر لي جليسا صالحا فيسرك الله لي . قال : ممن أنت ؟ فقلت : من أهل الكوفة . قال : أو ليس عندكم ابن أم عبد صاحب النعلين والوساد والمطهرة ؟ والباقي كباقي الحديث الأول . ح ـ ٦/١٢٦ .

تەرجەمە :

عەلقەمە ئەفەرموێ : چوومە شام لەگەڵ چەند کەسێ لە ئەصحابێ عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود ـ رضي الله تعالى عنه ـ دوو

---

(١) سوورەتی : (والليل) ئايەتی : ١و٢ .

رەکعەت نوێژم کرد لە پاشا وتم : یا رەببی هاونشینێکی صالحم بۆ هەڵخەی لەگەڵی دابنیشم . تێفکریم پیاوێکی ئیختیار هات و لە تەنیشتمەوە دانیشت . پرسیم : ئەمە کێیە ؟ وتیان : (ابو الدردا)یە ـ رضي الله تعالی عنه ـ عەرزم کرد : کە لە خوا پارامەوە ئاونشینێکی صالحم بۆ بنێرێ ، خوا تۆی بۆ ناردم . فەرمووی : تۆ خەڵقی کوێی ؟ عەرزم کرد : خەڵقی کووفەم . فەرمووی : بۆ ئێوە کوڕی (ام عبد) تان تیا نی یە کە صاحیبی کەوش و سەرین و مەطارەی پێغەمەرە ـ ﷺ ـ کە ئیبن و مەسعوودە ؟

صاحیبی سیڕی پێغەمەر ـ ﷺ ـ تان تیا نی یە کە حوذەیفەیە ـ رضي الله تعالی عنه ـ ؟ بۆ ئێوە ئەو کەسەتان تیا نی یە کە خوا لەسەر زمانی پێغەمەری خۆی لە شەیطانی حیفظ کردوە کە عەممارە ؟ وتم : بەڵێ . [یەعنی کە وابێ چە حاجەت بەوە شت لە من بپرسی ؟] لە دواییدا فەرمووی : عەبدوڵلا «والليل إذا يغشى . . . » چۆن ئەخوێنێتەوە ؟ عەرزم کرد : «والذكر والأنثى» ئەخوێنێتەوە . فەرمووی : وەڵلاهی رەسولوڵلا ـ ﷺ ـ وای پێ خوێندووم ، دەمی بەدەممەوە بوە . ئێستە ئەمانە لەگەڵم خەریکن کە «وما خلق الذكر والانثى» بخوێنمەوە لەوە کە لە پێغەمەرم بیستوە ـ ﷺ ـ لابدەم .

ئەم قیرائەتی ئیبن و مەسعوودە شاذە ، ئەبێ ئەو قیرائەتی موتەواتەرە کە (وما خلق)ەی تیایە نەگەیبێ بە ئیبن و مەسعوودو (أبو الدرداء) ـ رضي الله تعالی عنهما ـ .

طالیبی عیلم لە دوای ئەوە کە ئەو عیلمەی لە شارەکەی خۆیایە و لە تەحصیلی بۆوە بۆ زیادکردن سونەتە بۆی بچێتە دەرێ .

[رەنگە ئەم حەدیثەم لە فەضائیلی قورئانا نووسیبێ ، شایەد

نووسیبێتم لێرەدا مەینووسن ، زیادییەکی بێ ئیشارەتی بکەن][1] .

١٨٩/١٠٦٦ عن عبدالله بن أبي مليكة ، قال : قال عبدالله بن جعفر لابن الزبير [رضي الله تعالى عنهم] : أتذكر إذ تلقينا رسول الله ـ ﷺ ـ أنا ، وأنت ، وابن عباس [رضي الله تعالى عنهما] ؟ قال : نعم . [قال ابن جعفر ـ رضي الله عنهما] : فحملنا وتركك . م ـ ٩/٣٢٣ .

تەرجەمە :

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر بە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیری فەرموو : لە فکرت بێ کە : منو ، تۆو ، ئیبن‌وعەبّاس ـ رضي الله تعالى عنهم ـ چووین بە پیر پێغەمەرەوە ـ ﷺ ـ ؟ (ابن الزبیر) ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی : بەڵێ . ئیبن‌وجەعفەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی : پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئێمەی هەڵگرت‌و تۆی هەڵنەگرت .

١٩٠/١٠٦٧ وعنه [رضي الله تعالى عنه] قال : كان رسول الله ـ ﷺ ـ إذا قدم من سفر تُلقِّيَ بصبيان أهل بيته . قال : وإنه قدم من سفر فسُبِق بي إليه ، فحملني بين يديه ، ثم جيئ بأحد ابني فاطمة [رضي الله تعالى عنهما] فأردفه ، قال : فأدخلنا المدينة ثلاثة على دابة واحدة . م ـ ٩/٣٢٣ .

تەرجەمە :

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ ئەفەرموێ :

---

(١) بەڵێ راست دەفەرمووی ، لە بەرگی یەکەمدا حەدیثی ژمارە (٨٩/١٠٥) وەك ئەم حەدیثە وایە ، بەڵام هەندێك جیاوازییان هەیەو ، لێرەدا ریوایەتی موسلیمەو لەوێ ریوایەتی بوخارییەو ، جیاوازیی لە نێوان ریوایەتەکاندا هەیە ؛ لەبەر ئەوەیش کە ژمارەکان تێك نەچن بەم ئیشارە دەسبەردار بووین .

پێغەمەر - ﷺ - کە تەشریفی لە سەفەرێ بهاتایەوە منالی ئەهل و بەیتی ئەچوون بە پیری یەوە ، فەرمووی : دەفعەیێ تەشریفی لە سەفەرێ هاتەوە ، من پێش کەوتم ، لە بەردەمی یەوە سواری کردم ، لە دواییدا یەکێ لە کورانی فاطیمەیان هێنا - رضي الله تعالى عنها - ئەویشی سواری پاشکۆی کرد . سێ کەس بە سواری تەنها حەیوانێ داخلی مەدینە بووین .

سێ وچوار کەس دروستە سواری حەیوانێ بین ، ئەگەر ئەو حەیوانە تەحەمولی بێ .

١٩١/١٠٦٨ عبدالله بن جعفر [رضي الله تعالى عنهما] قال : أردفني رسول الله - ﷺ - ذات يوم خلفه ، فأسرَّ إليَّ حديثاً لا أُحدِّث به أحدا .

م - ٩/٣٢٤ .

تەرجەمە :

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر - رضي الله تعالى عنهما - ئەفەرموێ : = ڕۆژێ = پێغەمەر - ﷺ - سواری پاشکۆی خۆیی کردم و بە دزی یەوە شتێکی پێ فەرمووم کە لای هیچ کەسێ نایڵێم .

ئەم سێ حەدیثە لە ئەوەڵیانا ئەوو ئیبن و عەباسی سوار کردوە ، لە دوەما ئەوی لە بەردەمی یەوەو حەسەن یاحسەین - رضي الله تعالى عنهما - ی لە پاشکۆیەوە . لە حەدیثی سێ یەما هەر تەنها ئەوی لە پاشکۆیەوە سوار کردوە .

تەلطیفی منال سوننەتە .

سیر نابێ ئیفشا بکرێ .

بەرەوپیرچوونی پیاوی گەورە ، با خوصووص بۆ ئەقریباو تەعەللوقاتی ، سوننەتە .

# إبن عمر

ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فيه حديث يأتي ـ ان شاء الله تعالى ـ في صلاة الليل

١٠٦٩/١٩٢ عن ابن عمر [رضي الله تعالى عنهما] قال : رأيت في المنام كان في يدي قطعة إستبرق ، وليس مكان أُريد في الجنة اِلاّ طارتْ بي إليه . قال : فقصصتُ على حفصة [رضي الله تعالى عنها] فقصتْهُ حفصةُ على النبي ـ ﷺ ـ فقال النبي ـ ﷺ ـ : أرى عبدالله رجلا صالحا .
م ـ ٣٨٨/٩ . ح ـ ١٢٥/٦ مختصرا .
ئەرجەمە :

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ فەرمووی : لە خەوما دیم کە پارچەیێ ئیستەبرەقم بە دەستەوە بوو ، بۆ هەر جێیێ بمویستایە لە بەهەشتا بەو ئیستەبرەقە ئەفریم بۆ ئەوێ . ئەو خەوەم بۆ حەفصە ـ رضي الله تعالى عنها ـ گێڕایەوە ئەویش عەرزی پێغەمەری کرد ـ ﷺ ـ فەرمووی : وا ئەبینم کە عەبدوڵڵا پیاوێکی صالحە .

[ئاخری ئەم حەدیثە لە بوخاریدا هەیە . عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ـ رضي الله تعالى عنهما ـ نۆ کوڕی بوە :

١ ـ عەبدوڵڵا ، دایکی ئەو صەفیەی کچی ئەبوعوبەیدەیە .

٢ ـ سالم ، دایکی ئومموەلیدە .

٣ ـ عوبەیدوڵڵا .

٤ ـ عەبدوڕەحمان .

٥ ـ عاصیم .

٦ ـ حەمزە .

٧ ـ واقید .

٨ ـ زەید .

٩ ـ بیلال .

عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالى عنه ـ لەگەڵ باوکی موسوڵمان بوو بە دە ساڵي ، بە منالی لە خذمەت باوکیا هیجرەتی کرد . دایکی یا زەینەبە ، یا رابیطەی خوشکی عوثمانی کوڕی مەظعوونە . غەیری ئوحودو بەدر لە هەموو غەزاییکا لە خذمەت پێغەمەرا بوە ـ ﷺ ـ . بە پانزە ساڵی لە غەزای خەندەقا بوو ، عالم بوە ، (متقي) بوە ، ناصیحی ئوممەت بوە ، هەشتاو شەش ساڵی عومر بو ، شەصت ساڵ فتوای داوە ، نافیعی مەولای عیلمێکی زۆری لێ نەشر کردۆتەوە ، لە ماڵی خۆی هەرچییێکی زۆر بە چاك بزانیایێ ئەیکرد بە صەدەقە . عەبدەکانی ئەوەیان ئەزانی ، زۆر جار لە عەبدەکانی یەکێکیان قولی لێ هەڵەکردو دەستی ئەکرد بە عیبادەت کردن ، عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالى عنه ـ کە بەو نەوعە ئەو عەبدەی بدیایە ئازادی ئەکرد . عەرزیان ئەکرد : ئەو عەبدە تەفرەت ئەدا ، ئەیفەرموو : هەرکەسێ کە بە عیبادەتی خوا من تەفرە بدا تەفرەی بۆ ئەخۆم .

نافیع ئەفەرموێ : عەبدوڵڵا ـ رضي الله تعالى عنه ـ تا هەزار ئینسانی ئازاد نەکرد وەفاتی نەکرد .

لە ساڵی دوەم یا سێیەمی مەبعەثا هاتە دنیاوە ، لە ئەوەڵی تەئریخی هەفتاو سێدا وەفاتی فەرموو .

هیچ ئەمارەتی لە هیچ کەسیّ تەودیع نەکراوە ، نە کەم نـە زۆر تیّکەڵ بە دنیا نەبوە . حەججاج رای‌سپارد کە رۆژی جەژن کە تیریّکی بە زەهـر ئاودراویـان دا لـە پشتی پیّی بـەوە شـەهیـد بـوو . قسـطلاني . ٦ ـ ١٢٤ ـ ١٢٦ .

# مناقب أبي عبيدة [عامر] بن [عبدالله] الجراح

## ـ رضي الله تعالى عنه ـ

دايكي موسوڵمان بوو ، باوكي كه جەڕڕاحه به كافريى له بەدرا كوژرا . ئەڵێن : كه ئەبوعوبەيدە ـ رضي الله تعالى عنه ـ خۆی كوشتی . له طەرەف ئیمامی عومەرەوە ـ رضي الله تعالى عنه ـ كرابوو به ئەمیری شام ، لەوێ له تەئریخی هەژدەدا بە طاعوون وەفاتی كرد . درێژو ضەعیف بوو ، ددانی پێشەوەی كەل بوو ، له غەزای ئوحودا بەو ددانه موبارەكەی دوو پەیكانی[1] له ناو چاوانی پێغەمەر ـ ﷺ ـ هێنایه دەرێ ، بەوە كەوتن . قسطلاني . ٦ ـ ١٢٧ .

**١٩٣/١٠٧٠ أنس بن مالك [رضي الله تعالى عنه] أن رسول الله ـ ﷺ ـ قال : لكل أُمَّةٍ أمين ، وإن أميننا ـ أيتها الأمة ـ أبو عبيدة بن الجراح . ح ـ ١٢٧/٦ . م ـ ٣١٧/٩ . ن .**

**تەرجەمه :**

ئەنەسی كوڕی مالیك ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : هەر ئوممەتێ ئەمینێكی هەیە . ئەمینی ئێمە ـ ئەی ئوممەت ـ ئەبوعوبەیدەی كوڕی جەڕڕاحه .

**١٩٤/١٠٧١ عن أنس ـ رضي الله تعالى عنه ـ أن أهل اليمن قدموا**

---

(١) ئەوەی له ریوایەتەكاندایه ئەوەیه كه دوو ئەڵقەی زرێی لەروومەتی پیرۆزی پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەرهێنا .

على رسول الله ـ ﷺ ـ فقالوا : ابعث معنا رجلا أمينا يعلمنا السنة والاسلام . قال : فأخذ بيد أبي عبيدة ، فقال : هذا أمين هذه الأمة . م ـ ٩/٣١٧ .

تەرجەمە :

ئەنەس ئەفەرموێ : ئەهلی یەمەن هاتنەخزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزیانکرد : ئەمینێکمان لەگەڵ بنێرە کە سوننەتو ئیسلامەتیمان فێر بکا ، پێغەمەر ـ ﷺ ـ دەستی ئەبوعوبەیدەی گرت فەرمووی : ئەمە ئەمینی ئەم ئوممەتەیە .

١٠٧٢/١٩٥ عن حذيفة ـ رضي الله تعالى عنه ـ قال : جاء أهل نجران إلى رسول الله ـ ﷺ ـ فقالوا : يا رسول الله ابعث إلينا رجلا أمينا ، فقال : لأبعثن إليكم رجلا أمينا حق أمين ، حق أمين . قال : فاستشرف لها الناس ، قال : فبعث أبا عبيدة بن الجراح [رضي الله تعالى عنه] . م ـ ٩/٣١٧ . ح ـ ٦/١٢٧ . ت ، ن ، جه . ح ـ ٦/٤٢٣ .

تەرجەمە :

حوذەیفە ـ رضي الله تعالى عنه ـ ئەفەرموێ : ئەهلی نەجران هاتنە خزمەت پێغەمەر ـ ﷺ ـ عەرزیانکرد : پیاوێکی ئەمینمان بۆ بنێرە . پێغەمەر ـ ﷺ ـ فەرمووی : پیاوێکی ئەمینی بەحەق ئەمینی بەحەق ئەمیتان بۆ ئەنێرم . خەڵق خۆیان بۆ بەرزکردەوە [بەڵکو ئەوان بنێرێ] پێغەمەر ـ ﷺ ـ ئەبوعوبەیدەی کوری جەڕڕاحی نارد .

ئەصحابی پێغەمەر ـ ﷺ ـ گەورەو بچووکیان ئەمین بوون ، خایەنیان نەبوە ، فەقەط ئەبو عوبەیدە ـ رضي الله تعالى عنه ـ لەو صیفەتەدا ئیمتیازێکی زۆری بوە ، وەك چۆن ئیمامی عوثمان ـ رضي الله تعالى عنه ـ لە حەیادا ئیمتیازی بوە بەسەر ئەصحابا ، لەگەڵ ئەمە هەموویان کانی حەیا بوون .

ئینسان ئیشی خۆی تەودیعی کەسێ بکا کە ئیعتیمادی پێی ببێ .

# بابەت و سەرباسەکانی ئەم بەرگە

بابەت | لاپەرە

# هەڵەی چاپو داوای لێبوردن

## خوێنەری خۆشەویست

چواردە مانگی رەبەقە ئەم بەرگەی ئەم کتێبە لە ژێر چاپدایەو ، لەم ماوە دوورو درێژەدا کاتو وزەیەکی زۆری تێدا بەخەرج دراوەو ، زۆریش بە تەنگی ئەوەوە بووم کە کتێبەکە لە جوانترین شێوەداو ، بێ هەڵە بگاتە دەستی تۆی خۆشەویست . بەلاٌم !! بە داخەوە کورد دەڵێ : « **چەپڵە بە دەستێک لێ** نادرێ » ، هەوڵو کۆششی ئێمەیش دەرژێتە ئەم قاڵبەوە ، بۆیە نەمانتوانی لە هەڵە قوتار بینو ، لەگەڵ داوای لێبوردندا چەند هەڵەیەك دیاریی دەکەینو ، ئەوانی دیکەیشی بە بیرو هۆشیاریی تۆ دە سپێرین :

| لا پەرە | دێڕ | هەڵە | راست |
|---|---|---|---|
| ٣٩ | ٩,٨ | نەفسی کەمت | نەفسیکمت |
| ١٣٥ | ١٦ | واللتان | واللتين |
| ١٣٧ | ٢١ | بۆ | بۆ یەی |
| ٣٩٠ | ٩ | مەریمەو | مەریەمەو |
| ٤٢٣ | ٢ | الله ...أهل | والله ...أهلي |
| ٤٦٦ | ٣ | عەبدوڵلا | عەبدوڵلای |
| ٤٧٢ | ١٧ | موعجیزەی پیغەمەرە ـ ص ـ | |
| ٤٧٢ | ١٨ | گەورەی تیا هەلکەوتوە | |

